


* مێژوو وەکو هۆکارێك بۆ ناکۆکییەکان
* بەشی کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا
* چەند لایەنێکی گرنگی بەرهەمەکانی وڵاتناسان بۆ دیرۆك و شارستانێی کوردی لە سەدەکانی ناوەڕاست
* نەورۆز جەژنی سەربەستی و شانازی باوك و باپیر و نەوەکان
* سوودەکانی مێژوو و سیفەتەکانی مێژوونووس
* ڕۆڵی کورد لە چالدێران
* شەڕەکانی خاچ دروشمەکان
* معايير نشأة المدن الكوردية
* الرموز العددية للآلهة في بلاد الرافدين القديمة



# مێژوو

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە
کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەریدەکات



ژمارە ٢
بەهاری ٢٠٠٧

گۆڤاری

# مێژوو

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە، کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەریدەکات




ژمارە (٢) سالی یەکەم بەهاری ٢٠٠٧




راوێژكاران

د. حەسەن جاف

د. جەوهەر سدیق شاوەیس

♦ گۆڤار : مێژوو

♦ ژمارە : [ ٢ ]

♦ تیراژ : [ ١٠٠٠ ] دانە

♦ چاپخانە : منارە

كوردستان / هەولێر - گەڕەكی تەیراوە ، نزیك قوتابخانەی ئەیوبیەی سەرەتایی تێكەڵاو

govari_meju@yahoo.com

govari_meju@maktoob.com

www.geocities.com\meju_govar

# پێرست

## ✓ سەروتار

✔ وەرگێڕان



✔ القسم العربي



✔ کەشکۆڵی گۆڤار

# زمانی نووسینی مێژوویی

یەکێك لەو خاڵانەی کە دەبێ لە کاتی نووسینی بابەتی مێژوویی چ بەشێوەی وتار یان نامیلکەو کتێب رەچاوبکرێ، زمانی نووسینی مێژوویی و پزیشکی و فەلسەفی و ئەدەبی و کۆمەڵناسی و جوگرافی...هتد،زۆر لە یەکتر جیاوازن، مێژوونوس دەبێ بەزمانێکی سادەو رەوان و راستەوخۆ دوور لە خەیاڵ بنوسێ، لە کاتێکدا ئەدیب بەتایبەتی شاعیر زۆر پێویستی بەخەیاڵ دەبێ لەنوسیندا، کەواتە ئەگەر شاعیر مێژوو بنوسێتەوە، وەکو ئەوە وایە ئەفسەرێك بکەی بە مامۆستای سەرەتایی کە دیارە هەردوو کارەکە سەقەت دەبن، جا ئەگەر سەردەمێك پێویستیمان بەوە بوو هەرکەسێك بەپێی توانای خۆی چەندی بۆ بکرێ لەسەر مێژووی کورد بنووسێ ئەوە ئەمرۆ قۆناغێکی نوێ لەئارادایە پێویستیمان بەوەیە بەشێوەیەکی زانستیانەو بەزمانی نووسینی مێژوویی راست و دروست بنوسین تاکو نوسینەکانمان نرخی ئەو کاغەزەی هەبێ کەلەسەری دەنوسرێ، بۆ پتر روونکردنەوە کە شاعیرێك دەڵێ (ئاوی سیروان لەچاوم دێ) لەوانەیە وێنەیەکی شیعری جوان بێ وەکو نیشانەیەك بۆ ئەوەی کە زۆر گریاوە، بەڵام ئایا ئەگەر مامۆستایەکی جوگرافیا بڵێ ئاوی سیروان لە چاوم دێ، نابێتە گاڵتەجاری!لەوانەیە ئەدیبێك بڵێ بەبرژانگی چاوی کوشتمی، بەڵام ئایا لەلای پزیشکێك دەکرێ باس لە کوشتن بەم ئامرازە بکرێ؟ پێویستە مێژوونوس خۆی بە دووربگرێ لەوەی لە

نوسینەکانی دروشم و جنێوو دەستەواژەی ناشیرین بەکاربهێنێ وەکو لەزۆر لە نووسینەکانی کوردی دەبینین ئەم کارە نازانستییە هەیە، چونکە لە گرنگترین مەرجەکانی ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی مێژوو بێ لایەنی مێژوونوسە بۆیە هەندێك دەڵێن زمانی مێژوونوسین دەبێ زمانێك بێت بە پلەی سفر دوور لە سۆز، جا چۆن کاتێك مرۆڤ قسە دەکات خەڵك لەقسەکردندا دەتوانن تا رادەیەك مرۆڤی زۆر بلێ و ڕاست گۆو درۆزن و دەم پیس و بەهات و هاوارو فشەکەرو....تد لەیەکتری جیابکەنەوە، بەهەمان شێوەش دەکرێ بەهەمان شێوەش لە ڕێگای هەندێ نوسینەوە سەبارەت بەبابەتی مێژوویی بزانین کە نووسەرەکە ڕاست گۆیان درۆزن یان زۆر بلێ یان دەم پیس یان فشەکەرە...تد، بەلام پێویستە خوێنەریش رووبکاتە ئەو نوسینە مێژووییانەی هەست بەڕاستگۆیی نوسەرەکانی دەکات و کات و توانای خۆی لە خوێندنەوەی ئەو نوسینانەی تر بە فیڕۆ نەدات کە بەزمانی نوسینی مێژوویی دروست نەنوسراون.

سەرنووسەر

# كاروانی مێژوو دۆستی بەرێوەیە

خاوەن ئیمتیاز
✍پ.د.ئەرسن موسا رەشید

ژمارە یەكی گۆڤاری مێژوو پێشوازییەكی گەرمی لە نێوەندی رۆشنبیری كوردی بە شێوەیەكی گشتی و نێوەندی زانكۆیی بە شێوەیەكی تایبەتی لێكرا، ژمارە دووی گۆڤارەكەش بەبەرهەمی پڕ بەهای مێژوویی تر دەبێتە یەكێك لەو زنجیرە دیاریانەی كۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی كوردستان پێشكەش بەكورد و رۆشنبیریی كوردی دەكا، هەروەها لەو ماوە كورتەی تەمەنی كۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی كوردستان تاكو ئێستا لە رۆژانی ١٢-٢٠٠٧/٣/١٣ زنجیرە كۆرێكی مێژوویی بۆ چەند پسپۆرێكی بواری مێژوو لە هۆڵی فەرهادی لە كۆلێجی ئاداب بەستراو بەهەوڵ و كۆششی بەردەوامی ئەندامانی كۆمەڵە بەتایبەتی دەستەی كارگێڕی كۆمەڵەو ستافی گۆڤاری مێژوو دڵی كورد خۆش و دڵی ناحەزان پەست دەكات، بەلآم سەرەڕای پیرۆزی ئەو هەنگاوانەی ئاماژەی پێكراو ئەوانەی لەڕێوەوەن بهاوێژرێن، كاروانی مێژوو دۆستیمان بەبێ ناڕەحەتی و زەحمەتی نەبووە، خەڵكانێك لەبەرئەوەی خۆیان بەكارەكە هەڵنەستاون، چاویان پێ هەڵنایەت و هەندێكی تر لەكاڵ فامی خۆیان لەگرنگی مێژوو ناگەن و دەستەیەكی تر هەن نایانەوێ تێبگەن وەكو دەشڵێن تێنەگەیشتن لەبەلآی خودا خراپترە، هەبوون دەیانووت كە ژمارەیەكی گۆڤارەكە ژمارەی تری بەدوادانایەت و هەرچیان

هەبووەو نەبووە لە ژمارە یەك دا بەو قەبارە گەورەیە بلاویان کردووەتەوە و ئەو کارە بەکەسانی پێش ئەوان نەکراوە بەئەوانەش ناکرێ، بەلام نەك هەر ژمارە دوو بەلکو ئێمە پێشەکی بابەتمان بۆ چەندین ژمارەی داهاتوو لەبەردەستدایە، ئەمەش لەبەر ئەوەی وەکو وتمان کاروانی مێژوو دۆستی بەرێوەیە.

یەکێك لەو راستییانەی کۆمەڵەکەمان سەلماندی ئەوەیە کەکورد بەپەرۆشە بۆ زانینی مێژووی خۆی بەلام ئەگەر بێت و بەرهەمی شایستەی پێشکەش بکرێ، ئەو رۆژنامەو گۆڤارانەی خوێنەریان نییە هۆیەکەی داروخانی رۆشنبیریی کوردی نییە وەکو هەندێ قەڵەم دەنوسن بەلکو لەبێ بەهایی ئەو نوسینانەیە کە بەشێکی بەرچاویان ئەگەر لەرووی رێزمان و رێنوسیشەوە تەواوبن بەلام زۆر بلێی هیچ نەگوتوون، چیتریش خوێنەری کورد ئامادە نیە کات و پارەی خۆی لەم شتە بێ سوودانە بەفیرۆبدات، ئەمرۆ سەردەم سەردەمی پسپۆرییە و نوسینی چاك و خوێنەری چاکیش هەن و رۆشنبیریی کوردیش ئاسۆیەکی روناکی لەبەردەم دایە، بارودۆخی نوسینی مێژوو لەکاتی ئێستا زۆر جیاوازە لە پێشتر ئێستا ژمارەی پسپۆران رۆژ لە دوای رۆژ لە پتربوون دایە، بۆیە ئەو پسپۆرانە دەتوانن مێژووی کورد بەشێوەیەکی زانستی بنووسن بەمەش قۆناغێکی نوێ لە نوسینی مێژووی کورد دەست پێدەکات کە جیاوازە لە قۆناغەکانی پێشووتر، کە خەڵکانی بیانی یان ئارەزوومەندانی مێژوو لە کورد مێژوویان دەنوسییەوە کە سەرەرای دڵسۆزی ژمارەیەك لەو بیانیانە و زۆربەی کوردەکان، بەلام نوسینەکانیان بێ کەم و کوڕی نەبووە.

# مێژوو وەکو هۆکارێك بۆ ناکۆکییەکان

د.سەلام حەسەن خۆشناو

لەم نوسینەدا باس لە سوودەکانی مێژوو ناکەین، چونکە نوسینی زۆر بە زمانی جۆر بەجۆر سەبارەت بەم لایەنە نوسراوە، بەلاَم هەولَ دەدەین تیشك بخەینە سەر لایەنێکی تری پەیوەندیدار بە مێژووەوە کە ئەویش مێژوو وەکو هۆکارێك بۆ ناکۆکییەکانە لەم رووەوەش نموونە یەکجار زۆرن بەلاَم ئێمە چەند نموونەیەکی بەرچاو دەخەینەروو.

لەم رووەوە ئەم ناکۆکییەی ئێستا لە نێوان شیعەو سونە لە عیراقدا هەیە هەر لەسەردەمی ئیمام حوسێن و خەلیفە یەزیدی کوڕی معاویە و دەولَەتی ئومەوی و عەباسی تاکو سەردەمی دەولَەتی عوسمانی و سەفەوی، کە عوسمانییەکان چەندین هەزار شیعەی عیراق و سەفەویەکان، چەندین هەزار سونەی عیراقیان کوشتووە، دیارە لەگەلَ دروست بوونی دەولَەتی عیراقی لە سالَی ١٩٢١ تاکو سالَی ٢٠٠٣ فەرمانڕەوایی عیراق پتر بەدەستی سونەکانەوە بووەو شیعە خۆیان پێ چەوساوە بووە بۆیە ئەو هەموو پێشینە مێژووییە پڕ لە ناکۆکییە کاریگەرییەکی زۆر خراپی لەسەر هەولَەکانی نزیك بوونەوەی نێوان هەردوو لایەندا هەیە.

هەروەها سەبارەت بە پەیوەندی نێوان کورد و عەرەب لە عیراقدا بەهەمان شێوە ئەو سیاسەتە ناعادیلانەی چەندین حکومەتی یەك لە دوای یەکی عیراقی کە پتر بە حکومەتی عەرەبی ناسراون بەرامبەر بەکورد وای کردووە کە ئەمڕۆ ژمارەیەك لە کورد هیچ متمانەیەکیان بە عەرەب نەبێ و داوای جیابوونەوەی تەواو لە عیراق

بکەن تەنانەت کارەکە بەوە گەیشتووە هەندێ کورد هەڵوێستی سلبی بەرامبەر بە کلتورو زمانی عەرەبیش وەربگرن، ئەگەر چی سەرکردایەتی کوردو ئەکادیمیانی کورد بە جۆرێکی دووربینانەتر دەڕواننە مەسەلەکەو کورد و عەرەب بە دوو نەتەوەی دراوسێی یەکتر دەزانن.

هەروەها پەیوەندی نێوان فەلەستینیەکان و عەرەب لەلایەك ئیسرائیل لەلایەکی ترەوە تاڕادەیەکی زۆر کەوتوەتە ژێر کاریگەری پەیوەندی سلبیانەی نێوان عەرەب و جوو هەر لەسەردەمی پێش ئیسلامەوە لە شاری یەثرب(مەدینە)و دواتر پەیوەندی نێوان پێغەمبەر(د.خ)و جوولەکەکان و دەرکردنی جوو لە نیمچە دوورگەی عەرەبی لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەطاب سلاوی خوای لەسەر بێ و لە دواتر بەڵێنی بەلفۆری ساڵی ١٩١٧و شۆڕشی فەڵەستینیەکان دژی ئیسرائیل و شەڕەکانی ١٩٤٨، ١٩٧٣ و شەڕەکانی دواتر، بەڕادەیەك کە هەندێك پێیان وایە کە ناکرێ پێکەوە ژیان لە نێوان هەردوولادا هەبێ، بۆیە هەندێ لە عەرەبەکان دروشمی توڕدانی جووەکانیان بۆ ناو ئاوی دەریا بەرزکردبووەوە و دەوڵەتی عیبریش هەوڵ دەدات بە چەکی ئەتۆمی خۆی لەدراوسێ عەرەبەکانی بپارێزێ یان بەهۆیەوە هێرش بکاتە سەریان.

هەر لەم رووەوەش ئەو دەنگانەی ناوەناوە لە تورکیا باس لە دەست تێوەردان لە بارودۆخی ناوخۆی عیراق و کوردستانی عیراق بە شێوەیەکی تایبەت تر دەکەن ناتوانن ئەو یادەوەرییە مێژووییانە لەیاد بکەن کە لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانی عیراق بەشێك بووە لەو دەوڵەتە.

ئەگەر بەشێوەیەکی لۆژیکیانە بڕوانیە مێژوو و پەیوەندی بەئێستاوە دەبێ ئەوەمان لەبەرچاوبێ کە گۆڕان یەکێك لە سیماکانی بوونە، بۆیە هەرچەندە پتر لە پێویست خۆ بەمێژوو ببەستینەوە بەبێ رەچاوکردنی ئەو گۆڕانانەی لە سەردەمی

ئێستادا روودەدەن تووشی شۆك و ناماقوڵی لە مامەڵەکردن لەگەڵ دەوروبەر دەبینەوە، زەقترین نموونەش لەم رووەوە مۆسۆلینی کاتێك ویستی لە سەدەی بیستەم ئیمپراتۆریەتی رۆمانی زیندوو بکاتەوە، یەکێك لە خراپترین رژێمە سیاسییەکانی جیهانی بەرهەم هێنا کە رژێمی فاشی بوو، لەساڵی ١٩٩٠کاتێك عێراق ویستی ئەو واقیعە مێژووییە زیندووبکاتەوە کە کاتێك کوێت بەشێك بوو لە عێراق لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی چ کارەساتێك بەسەر عێراق و کوێت دا هات.

بۆیە ئەگەرچی مرۆڤ پێویستە مێژوو بخوێنێتەوە و سوودی لێوەربگرێ بەڵام لەهەمان کاتدا پێویست بەوەش دەکا کۆنە قینەکان تاکو بکرێ لە یادبکرێن، مەرجیش نیە سنووری دەوڵەتان و میللەتان دوای تێپەربوونی هەزار و سەدەها ساڵ وەکو خۆی بەبێ زیاد و کەمی بمێنێتەوە ئەگەر واش نەبێ شەڕی لەسەر بکرێ، چونکە هەموومان دەزانین کە هیندییە سورەکان دانیشتوانی رەسەنی ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکان بەلام ئەمرۆ ئەوان کەمینەن لەو ولاتەدا و ناکرێ داوای گێرانەوەی واقیعی کۆن بکرێ، پێش ساڵی ١٤٥٣دانیشتوانی ئەستەمبۆڵ یۆنانی زمان و مەسیحی بوون بەلام ئەمرۆ شارەکە زۆربەی دانیشتوانی تورکن و شارێکی ئسلامییە، جا چۆن چەندین واقیعی جوگرافیا و سنووری دەوڵەتان لە جیهان وا گۆڕاوە باس کردن لە بارودۆخی عێراق بەتێڕوانینی سەردەمی عوسمانی ناماقوڵیەکی سیاسیە.

# مێژوویزمی دیاردەی کۆمەڵایەتی

✍پ.ی.د.رەشاد میران

ژیانی کۆمەڵایەتیی ئەندامانی کۆمەڵگا گەلێك لە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دەگرێتەخۆ، بگرە کۆمەڵگا خۆی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی - مێژووییە، ئەوەش بەو مانایەی کۆمەڵبوون و بەیەکەوە ژیانی خەڵك، کە کۆمەڵگا پێکدێنن، لە پڕێکدا نابێت، هەڵبەت ئەمە لە پرۆسەیەکی مێژوویی دوور و درێژدا روودەدا - بۆیە کۆمەڵگا زادەو بەرهەمی مێژووە،نەك هەر ئەوە، بەڵکو کۆمەڵگا کە دروست بوو، ئەوا شەقڵ و سیمای قۆناغە مێژووییەکانیش هەڵدەگرێ، ئەو قۆناغانەی لە رەوتی پرۆسە مێژووییەکەدا پێیاندا تێپەڕیووە، بۆیە کۆمەڵگا دیاردەیەکی تا ئەو پەڕی مێژووییە. لەم روانگەیەوە، میتۆدی مێژوویی(المنهج التاریخی)لە توێژینەوەی کۆمەڵناسیدا بایەخێکی زۆری هەیە - تۆژەر کە لەبابەتێکی کۆمەڵناسی دەکۆڵێتەوە، دەبێ پێشەکی قۆناغی مێژوویی ئەو بابەتە یان ئەو دیاردەیەو ماك و مۆرکی ئەو قۆناغە دەستنیشان بکات، تەنیا ئەو کاتە تۆژەر دەستی بەسەر بابەتەکەدا دەڕوا، خۆ ئەگەر بابەتەکۆمەڵایەتییەکە راستەوخۆ مێژوویی، واتە هی رابردووبوو، ئەو کاتە تۆژەری کۆمەڵناس بەبێ گەڕانەوە بۆ زانستی مێژوو هەرگیز هەڵناکات/وەکو بەرهەمی کۆمەڵناسی عیراقیی بەناوبانگ د.علی الوردی (لمحات اجتماعیه من تاریخ العراق الحدیث).

کەواتە، لەم گۆشەنیگایەوە، کۆمەڵناسی و مێژوو دوو زانستی تابلێی لێک نزیکن، بگرە تەواوکەری یەکدین، بەم بۆنەیەشەوە، زانای مێژوونووس ئیدوارد هالیت کار لە کتێبەکەیدا(ماهو التاریخ/ ت.ماهر الکیالی، بیروت١٩٧٦،ل٦١) باش ئەمەی دەربڕیووە و دەڵێ: هەرچەندی مێژوو کۆمەڵایەتی بێت و کۆمەڵناسیش مێژوویی، ئەوا لە بەرژەوەندیی هەردووکیان دەبێت.لێگەڕێن با سنوورەکانی نێوان هەردوو زانست بکرێنەوە.

مێژوو زانستێکی هەرگیز ئەبستراکت نییە، زانستێکە دەربارەی رابردوو و ئێستای خەڵک، جا ئەو خەڵکانە لەهەر قەوارەیەکدابن ـ کۆمەڵگا، خێڵ، میللەت، نەتەوە، کۆمەڵەی ئایینی، دەوڵەت...هەموو ئەو کۆمەڵبوونانەی خەڵکیش بەپێی یاسا سۆسیۆلۆژییەکان دەمێنن و بەڕیوەدەچن ـ هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان توخمێکی سەرەکیی پرۆسەی مێژوویین، بۆیە مێژوو دەبێ هەردەم کۆمەڵایەتی بێت، وەکو چۆن هەمیشە بەیەکێک لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان لەقەڵەم دەدرێ.

شایانی باسە، دەکرێ بە چەند نیشانە و ماکێك دیاردەیەك بە کۆمەڵایەتی پۆلێن بکەین، وەکو:

ـ مێژوویزم، واتە هیچ دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی لە پڕو لەخۆوە سەرهەڵنادات، بەڵکو هەر دیاردەیە و زەمینەی مێژوویی خۆی هەیە.

ـ گشتگیری، واتە دیاردەی کۆمەڵایەتی دەبێ بەسەر هەموو یان بەشی زۆری کۆمەڵگاکەدا زاڵبێ.

ـ بەردەوامی، واتە کاریگەریی بەردەوامی هەبێت لەسەر خەڵك.

- جەبریەت، واتە ئارەزوومەندانە نیە، خەڵك بێ ئەوەی بیەوێ مامەڵە لەگەڵ دیاردەی کۆمەڵایەتی دەکات.

- هەستپێکراوی، واتە دیاردەی کۆمەڵایەتی دیار و بەرچاو و هەستپێکراوە، بەتایبەتیش کاتێك شێوەی گرفتێك وەردەگرێ.

لێرەدا، بە پێویستی دەزانین لەسەر دیاردەیەك بوەستین کە لەکوردستاندا بووە بە گرفتێکی کۆمەڵایەتی، ئەویش کۆچکردنی بەکۆمەڵە بۆ هەندەران، وەکو ئاشکرایە هەموو دیاردەیەك زادە و بەرهەمی دووجۆر هۆکارە: بابەتی و زاتی، ئەمانەش هەردووکیان زەمینە و پاشخانی مێژوویی خۆیان هەیە، واتە دوو هۆکاری مێژوویین. ئەندامانی کۆمەڵگای کوردی لە کوردستان لەبەر ئەو هەلومەرجە نالەبارەی رەوشی ژیانیان وڵات بەجێدێڵن، ئەو رەوشەی ژیانیش سیمای قۆناغێکی مێژووییە کوردستان پێیدا تێدەپەرێ کە دەکرێ بڵێین(قۆناغی وەرچەرخانە)، ئەم قۆناغەش لە خۆوە دروست نەبووە، بەڵکو دەرئەنجامی پرۆسەیەکی دووردرێژی مێژوویی و سیاسی و کۆمەڵایەتی بووە... راپەرینی ساڵی ١٩٩١و رووداوە سیاسییەکانی دواتر، کە بنچینەی مێژوویی خۆیان هەبوو، ئەم رەوشەی ئێستاکەیان داهێنا.لە هەموو ماوەی مێژووی مرۆڤایەتیدا، لەم جۆرە قۆناغەدا، کۆچکردنی بەکۆمەڵ روویداوە - کەواتە،مێژوویزمی دیاردەی کۆچکردن لە قۆناغە مێژووییەکەوە سەرچاوەی گرتووە.

یان دیاردەی چەکداری، کە دیاردەیەکی دیار و بەرچاو و تابڵێی کاریگەریی هەیە لەسەر واقیعی کۆمەڵایەتی لە کوردستان، زۆربەی رووداوە دڵتەزێنەکانی کۆمەڵگای کوردی کە هەمیشە قوربانی زۆریان لێ دەکەوێتەوە

بۆ دیاردەی چەکداری دەگەڕێتەوە ـ بەردەستبوونی چەك کوشتار و خوێنڕشتنی بەدواوەیە.

بێگومان ئەو دیاردەیەش زەمینەی مێژوویی خۆی هەیە، خەباتی چەکداریی هێزە سیاسییەکان لە کوردستاندا مێژوویەکی درێژی هەیە بە رادەیەك کە مرۆڤی کوردی تەواو پابەندی چەك کردووە و ئێستاش دەسبەرداری نابێت.

لە کۆتاییدا، ئێمە هەموومان، دەرئەنجام و بەرهەمی پرۆسەیەکی مێژوویی دوور و درێژین، شەقڵ و سیمای قۆناغە مێژووییەکانیشمان هەڵگرتووە ـ ئەرکی سەرەکی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، بەتایبەتیش مێژوو و کۆمەڵناسی، بریتییە لە دەستنیشانکردنی ئەو شەقڵ و سیما مێژوویی ـ کۆمەڵایەتییانە.

# میرنشینی هەزبانی لەهەولێر

د.احمد عبدالعزیز محمود

شاری هەلێر بەر لە هاتنی هەزبانیەکان بۆ ئەم شارە سەر بە موسڵ بوو، بەڵام دوای هاتنی هەزبانیەکان و نیشتەجێ بونیان تیایدا بووە بنکەی میرنشینەکەیان بەمەش گرنگی ئەم شارە زۆر زیادی کردوو گەشەی سەند و زیاتر فراوانبوو، هەزبانیەکان لە سەرەتای سەدەی پێنجەمی کۆچی و بە درێژایی یەك سەددە دەسەڵاتیان بەسەر قەڵاو دەوروبەرەکەیدا دەڕۆیی میرنشینێکیان تیادا دروست کرد بۆ ماوەیەکی درێژ حوکمی ناوچەکەیان کرد بەڵام سەرچاوە مێژووییەکان زۆر بەدەگمەن ئاماژە بۆ رووداوەکانی سەردەمی هەزبانی لە هەولێر دەکەن و زۆرجار مێژووی هەزبانیەکان لەم شارەدا کەلێنی گەورەی تێکەوتووە .[1]

سەرەتای باسکردنی مێژووی هەزبانی دەگەرێتەوە بۆ کۆتایەکانی سەدەی سێیەمی کۆچی ئەوەتا سەرچاوەکان لە رووداوەکانی ساڵی (٢٩٣ك/٩٠٥ز) ئاماژە بۆ هێرش بردن و هەڵکوتانی کوردە هەزبانیەکان بۆ سەر مووسڵ و ناوچەکانی دەورووبەری دەکەن لەو سەردەمە خەلیفەی عەباسی المکتفی باللە (ابو الهیجاء عەبدولای حەمدانی) دامەزراندو کردیە والی موسڵ و دەورووبەری تا ئەو کاتە هۆزی هەزبانی سەری بۆ هیچ دەسەلاتێکی دەرەکی شۆر

نەکردبوو بەڵکو بەکاری تالآن و بڕینەوە خەریك بوون کاتێکیش کە هەستیان بە مەترسی بکردایە ئەوان پەنایان دەبردە بەر ناوچە شاخاویەکان و خۆیان

حەشاردەدا.[2]

وا دیارە هۆی ئەو کردارانەی هەزبانیەکان لە لایەکدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو رۆڵەی خەلیفەی عەباسی لە ناوچەکەدا بە حەمدانیەکانی بەخشیبوو لە لایەکی دی بۆ پشتگوێ خستنی هەزبانیەکان و کەمکردنەوەی دەسەڵاتیان لە ناوچەکەدا بۆیە دەبینین ئەبولهیجای حەمدانی شمشێری بەرووی هەزبانیەکاندا هەڵبڕی و ناچاری کردن زێدی باب و باپیرانان لە ناوچەی هەکاری بە جێبهێڵن بەلآم هەزبانیەکان بەسەرکردایەتی میر محەمەدی کوڕی بیلال لێی هەڵگەڕانەوە بۆیە میری حەمدانی کەوتە دوایان و لە نزك رووباری خازەر رووبەروویان بۆوە ئەوەبوو لە ساڵی (٢٩٣ك/٩٠٥ز) شەڕێکی توندو تیژ لەنێوان هەردوو لادا بەرپابوو لە ئەنجامدا بەشێك لە هەزبانیەکان ناچاربوون روو بکەنە ناوچەکانی دەوروبەری دەریاچەی ورمێ .[3]

بەلآم ئەوانی تر لە ناوچەکانی خۆیان مانەوە ومیر محەمەدی کوری بیلال لەگەڵ ئەوانەدا مایەوە لە ساڵی دواتر هەزبانیەکان ملکەچی خۆیان بۆ حەمدانیەکان راگەیاندو بۆ شارۆچکەی (حەزە) کە سەر بە شاری هەولێر بوو راگوێزران.[4]

دوای ئەم رووداوە سەرچاوە مێژوویەکان بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ ئاماژە بۆ ئەو بەشەی هەزبانیەکان ناکەن کە لەدەوروبەری دەریاچەی ورمێ نیشتەجێ بوون تاوەکو ساڵی (٤٢٠ك/١٠٢٩ز) لەو ساڵەدا ئاماژە بۆ

سەرهەڵدانی میرنشینی لە لایەن (عیسای کوڕی موسای هەزبانی) وەردەگیرێ [٥].

بەڵام دەبینین هۆزە کوردەکانی ناوچەکە وەك حەکەمیەکان و حەمیدیەکان پیلان بۆ لەنێو بردنی میر عیسای هەزبانی دادەڕێژن و لە ئەنجامدا لەسەر دەستی کورە براکەی کە سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ناوەکەی ناکەن دەکوژرێ و پاشان ئەو کەسە روو دەکاتە قەڵای هەولێرو داگیری دەکات و [٦] لەم کاتەدا (سالاری کوڕی موسا) برای میر عیسا لەلای خاوەنی موسڵ میر (قرواش کوڕی موقەلیدی عوقەیلی) دەژیا. لە ئەنجامی کوژرانی براکەی بە یارمەتی سوپایەکی گەورەی عوقەیلییەکان کە قراوش سەرکردایەتی دەکرد بەرەو هەلێر هات و قراوش توانی دەست بەسەر هەولێردا بگرێ و بیخاتە دەست میر سالاری هەزبانی[٧] دوای بیست ساڵ (ئیبن ئەلئەسیر) ئاماژە بۆ هەولێکی تری عوقەیلییەکان دەکات بۆ دستتێوەردان لە بارودۆخی میرنشینی هەزبانی لە جیاتی خەلیفەی عەباسی وەك هەوڵدانێك بۆ سەلماندنی دەسەڵاتی خۆیان لەسەر هەولێر ، بەڵام دەبینین هەزبانیەکان دەست لەسەر بەخۆیی خۆیان هەڵناگرن و هەر بە ئازادی دەمێننەوە دوای ئەمە وەك رووداوەکانی ساڵی (٤٨٩ك/١٠٩٥ز) نیشان دەدەن ئەو میرنشنە بەردەوام بووە لەحوکمڕانی کردن [٨] لەم ساڵەدا ئەبولهیجائی هەزبانی رۆلێکی بەرچاو لە پشتگیری کردن و پاڵپشتی کردنی (محەمەدی کوڕی شەرەفولدەولە موسلیم کوڕی قەریش) گێڕا لە کاتی ململانێی ئەمە لەگەڵ میر (عەلی کوڕی شەرەفولدەولە)ی برای بەڵام ئەو یارمەتییەی میر ئەبولهیجا گۆڕانکارییەکی ئەوتۆی بەسەر ململانێ ی نێوان

هەردوو برادا نەهێنا ئەوەبوو (کاربۆقا)[٩] توانی بۆ بەرژەوەندی خۆی لە ڕێگە ڕێکەوتنێکی رووکەشی لەگەڵ محەمەدی کوری موسلیم کۆتایی بەمەسەلەکە بهێنی بەپێی ئەو ڕێکەوتنە کاربۆقا بەڵێنی بە میر محەمەد داو کەوا لە دژی براکەی یارمەتی بدات بۆ ئەم مەبەستە لە نووسیبین گەیشتنە یەك . بەلاّم کاربۆقا لە بەڵێنەکانی پاشەگەزبۆوە محەمەدی موسلیمی کوڕی عوقەیلی دەستگیر کردو گەڕایەوە موسڵ.[١٠]

دوای ئەمە ئەبولهیجای هەزبانی لە چەند ڕووداوێکی تردا بەشداری کردووە ئەوەتا لەساڵی (٥٠٠ك/١١٠٦ز) هاوکاری (جگەرمش) ی کرد[١١] دژی هەڵمەتەکەی (جاولی سەقاو)[١٢] بۆ سەر شاری موسڵ جاولی بۆ ماوەبەك ئابلۆقەی مووسڵی داو وە لەدەرئەنجامی ئەمەدا جگەرمش هەردوو کوڕی خاوەنی هەولێر دەستگیر کران[١٣] لەڕووداوەکانی ساڵی (٥٠٢ك/١١٠٨ز) ئاماژە بۆ ڕۆڵی ئەبولهیجاء کراوە کەوا بەخۆی و سوپاکەی بەشداری کردووە لەگەڵ سوپای سوڵتانی سەلجوقی محەمەدی کوڕی مەلیکشا کەبە سەرکردایەتی (مەودود کوڕی ئاڵتونتەکین) بووە بۆ شەڕکردن لەگەڵ جاولی سەقاو رزگارکردنی ناوچەکە لە ژێر دەستیدا سوپاکە بەرەو ناوچەکانی ژێر دەستی جاولی کشا کە ئەو خۆی لە شاری موسڵ قایم کردبوو بەلاّم مەودود توانی دەست بەسەر موسڵدا بگرێ[١٤] جگە لەمە ئەبولهیجائی هەزبانی بەشداری لەو هەڵمەتە کردووە کەلەسەردەمی خەلیفەی عەباسی مسترشد بالله لە ساڵی (٥٢١ك/١١١٨ز)[١٥] لە ژێر سەرکردایەتی سوڵتان مەسعودی سەلجوقی ڕەوانەی سەر (دەبیسی کوڕی سەدەقە)ی میری حیللە کرا[١٦].

ساڵی (٥١٧ك/١١٢٣ز) ساڵێکی شوم و پڕ لە نەهامەتی بوو لە ژیانی میرنشینی هەزبانی لە هەولێر چونکە ئەو میرنشینە لە ئەنجامی دووربوونی میر ئەبولهیجاء میرنشینەکەی لە دەست هەزبانیەکان دەرچوو دووربوونی میری هەزبانی هەلی بۆ کوردە حەمیدیەکان بە سەرکردایەتی (ئەبو بەکر کوڕی میکائیل رەخساند بۆ ئەوەی دەست بەسەر هەولێردا بگرێ و کۆتایی بەدەسەڵاتی هەزبانیەکان لەم شارەدا بهێنێ [١٧] بەڵام ئەم بارودۆخە زۆری نەخەیاند ئەوەبوو والی موسڵ (عیزەدین مەسعود) میر ئەبووبەکر حەمیدی ناچار کرد کە میرنشینی هەولێر بداتەوە دەست فەزل و ئەبو عەلی کە کوڕی ئەبولهیجاء بوون[١٨] هەر لەو سەردەمەدا سەلجوقیەکان لە سەر شانۆی رووداوەکان دەرکەوتن و لەساڵی (٤٤٧ك/١٠٥٥ز) کۆتاییان بە دەسەڵاتی بوەیهییەکان هێنا جێگەی باسە هەزبانیەکانی هەولێر لە ململانێی نێوان سەلجوقیەکان و عوقەیلیەکان لە ناوچەکەدا بەبێ لایەنی مانەوە هەر لەو ماوەیەدا ناوی چەند میرێکی هەزبانی هاتووە بە تایبەتی میر (ئیبن موسەکی هەزبانی) ئەمەش لە رووداوەکانی ساڵی (٤٥٠ك/١٠٥٨ز) [١٩] ئەوەبوو لەم ساڵەدا (ئیبراهیم یەنال) [٢٠] هێرشی کردە سەر موسڵ لە دوای ئیبن موسەك فەرمانڕەوایەتی میرنشینەکە لە لایەن میر ئەبوعەلی هەزبانی برای وەرگیرا ئاماژەیەکی مێژوویی هەیە سەبارەت بەناردنی یەکێك لە میرانی هەزبانی لەلایەن سوڵتانی سەلجووقی (مەلیکشا)[٢١] بۆ لای خاوەنی دیار بەکر[٢٢] کە داوای لێکردووە بڕی ٣٠ هەزار بۆ سوڵتان بنێرێ بەرامبەر بەوەی سوڵتان دەست نەخاتە نێو کاروباری دەسەڵاتدارێتیەکەی [٢٣] لەم گێڕانەوەیەدا دەردەکەوێ کەوا ئەبولهیجائی هەزبانی لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی

مەلیکشا (٤٩٥-٤٨٥ك/١٠٧٢-١٠٩٢ن) حوکمی هەولێری کردووە و ئەمە روونده‌کاته‌وه کە هەزبانیەکان دوای ملکەچی خۆیان بۆ سەلجوقیەکان قەوارەیەکی تایبەتیان پێ رەوابینراوە وەك میری سەربەخۆ ماونەتەوە [٢٤] دوا بەدوای ئەمە ، لە میانەی پەیوەندی نێوان سەلجوقیەکان و عەباسیەکان لە ساڵی (٥٢٣ك/١١٢٧ن) ئەبولهیجائی هەزبانی بە خۆی و بە سوپاکەی لایەنگری خەلیفە ئەلموستەرشیدی کرد لە دژی سوڵتانی سەلجوقی [٢٥] لێرەدا مێژوونووس ئیبن ئەلئەسیر ئاماژە بۆ هەوڵێکی خیانەتکارانەی میری هەزبانی لە بەرژەوەندی سوڵتانی سەلجوقی و دژ بە خەلیفە دەکات [٢٦] بەڵام گومان لەو هەواڵە دەکرێ کە ئەو مێژوو نووسە دەیگێڕێتەوە بە بەڵگەی ئەوەی مێژوونووسێکی تر کە نزیکترە لە رووداوەکان ئەویش ئیبن ئەلجوزیە ئەوە دەردەخات کە (ئەبو لفەتح کوڕی وەرام)[٢٧] ئەم خیانەتەی کردووە و دەستەداری خەلیفەبووە [٢٨] بۆیە واپێدەچێ بە هەڵە ئەو تۆمەتە درابێتە پاڵ میری هەزبانیەوە.

## روخانی میرنشینی هەزبانی :-

لە دەورانی عیمادەدین زەنگی لە هەر یەك لە شارە جیاجیاکانی ناوچەی موسڵ و جەزیرە و باکوری وڵاتی شامدا میرەکان بە نیمچە سەربەخۆییەوە فەرمانڕەوایەتیان دەکرد، ئەو شارانە بەوە لە میرنشینە نێوخۆییەکان جیادەکرێنەوە کە میری شارەکە تەنها حوکمی ئەو شارەو چەند ناوچەیەکی کەمی دەوروبەری دەکرد دەسەڵاتدارانی ئەم شارانە هەردەم مەترسی لەنێو بردن و لە نێوچونیان لە سەردابوو بەتایبەتی کاتێك میرێکی بەهێزی خاوەن سوپایکی مەزن رووی دەکردە ئەو ناوچانەو دەستی بەسەردادەگرت.[٢٩]

عیمادەدین زەنگی لە ساڵی (٥٢١ك/١١٢٧ز) لە لایەن سوڵتانی سەلجوقی (محەمەدی کوڕی مەلیکشا) دەسەلاتی موسڵی وەرگرت هیواو ئاواتی عیمادەدین زەنگی پێکهێنانی قەوارەیەکی بەهێزو یەکگرتوو بوو بۆیە هەر زوو دەستی بە هەوڵەکانی کرد بۆ مل پێکەچکردنی دەسەلاتدارانی ئەو شارانە و پێکهێنانی دەوڵەتێکی فراوان [٣٠] بۆیە دەرکەوتنی عیمادەدین زەنگی سەرەتای لە نێوچوونی میرنشینە کوردییەکانی ناوچەکە بوو . بە جۆرێك کە توانی یەکە بەیەکەی ئەو میرنشینە کوردیانە لە ناوبەرێ مێژوونوسان لەسەر داگیرکردنی هەولێر لەلایەن عیمادەدین زەنگیەوە یەك ناگرنەوە دیارە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ گرنگی نەدانی ئەو مێژوونوسانە بەتایبەتی ئیبن قەلانس و ئیبن ئەلجەوزی بە مەسەلەکە هەرچەندە هاوسەردەم بوون لەگەڵ ڕووداوەکە جێگەی سەرنجە کە مێژوونووسی بەناوبانگ ئیبن ئەلئەسیر لەو سەردەمەدا ژیاوەو ڕووداوەکانی تۆمار کردووە [٣١] کە چی ئەویش گرنگی بە تۆمارکردنی ساڵی گرتنی شاری هەولێر لە لایەن عیمادەدین زەنگی نەداوە هەرچەندە بەدرێژی باس لە فراوانخوازیەکانی ئەو میرە دەکات و ئاماژە بۆ ساڵی گرتنی زۆربەی شارەکان بە تایبەتی گرتنی شارو ناوچە کوردیەکان دەکات وەك گرتنی قەلاَکانی کوردە حەمیدیەکان (ئاکرێ وشوش) لە ساڵی (٥٢٨ك/١١٣٣ز) و گرتنی شاری داقوق لە ساڵی (٥٣١ك/١١٣٩ز) و داگیرکردنی شارەزورو ئەو قەلاَیانەی لە ناوچەکەدا هەبوون لە (٥٣١ك/١١٣٩ز) بە هەر حاڵ [٣٢] . عیمادەدین زەنگی ئاگاداری بایەخی ئابووری و سەربازیەکەی هەولێر بوو بۆ شاری موسڵ بەوەی کە هەولێر وەك دەروازەی ڕۆژهەلاتی وایە لە نێوان موسڵ و ولاَتی فارس و ولاَتانی ڕۆژهەلاَت ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ

بەگرتنی هەولێر دەتوانێ کۆنترۆلی ناوچەکانی باشوری رۆژهەلاٌت بکات کە لە لایەکەوە موسڵ و حەلەب و بەیەکەوە گرێ دەدات[33] دەرکەوتنی عیمادەدین لەسەر شانۆی رووداوەکان مەترسی زۆری خستە سەر سلجوقیەکان بە بەڵگەی ئەوەی کە سوڵتانی سەلجوقی رێنمایی براو کورەکانی خۆی دەکرد داوای لێدەکردن کە ئاگادار و چاودێری فراوانخوازیەکانی عیمادەدین بکەن و هانی داون بەر لەوەی بارەکە بەرەو خراپی بچێ دەست بە فراوانکردنی سنووری دەوڵەتەکەیان بکەن رووداوەکان راستی پێشبینیەکانی سوڵتانی سەلجوقیان سەلماند ئەوەتا عیمادەدین زەنگی هەوڵی گرتنی شاری هەولێر دەدات بۆ رێگەگرتن لە بەردەم فراوانخوازی سەلجوقیەکان هەرچەندە ئەو کات هەولێر بەمولکی سوڵتان مەسعودی کوڕی محەمەدی سەلجوقی سوڵتانی ئازربیجان دەژمێردرا عیمادەدین هەلی هێرش بردنە سەر هەولێری بۆ رەخسابوو بۆیە لە ساڵی (٥٢٦ك/١١٢١ز) ئابلۆقەی خستە سەر شارەکە بەلاٌم شاری هەولێر خۆی نەدایە دەست و جێگری قەلاٌکە[35] لە نێو قەلاٌدا خۆی قایم کرد و دژی هەوڵە داگیرکارییەکانی عیمادەدین وەستا بۆیە عیمادەدین نەیتوانی بە رێگەی سەربازی دەست بەسەر هەولێردا بگرێت لە کاتی ئابلۆقەدا جێگری قەلاٌی هەولێر پەیوەندی بە سوڵتانی سەلجوقی کرد و هەواڵی ئابلۆقەدانەکەی پێگەیاند بۆیە سوڵتان بە خۆی و بە سوپایەکی زۆرەوە لە شاری مەراغەوە کەوتە رێ کە گەیشتە هەولێر عیمادەدین ئابلۆقەکەی هەلگرت و بریاریدا بەرەو موسڵ بکشێتەوە عیمادەدین لەگەڵ سوپاکەی بۆ پشوودان لە نزیك زێ ی گەورە وەستان وا دیارە لە وێوە دەستی بە نامە گۆڕینەوە کردووە لەگەڵ سوڵتانی سەلجوقی و هەردوو لا لە

سەر ئەوە ڕێکەوتن کە شاری هەولێر بخرێتە سەر ناوچەکانی زەنگی و بەرامبەر بەوەی گوێ ڕایەلی خۆی بۆ سولتانی سەلجوقی ڕابگەیەنێ دوای ئەمە عیمادەدین زەنگی شاری هەولێری دایە دەست سەرکردەی بەناوبانگی سوپاکەی (زەینەدین علی کوچك) لەمەدا دەردەکەوێ کاتێك کە عیمادەدین نەیتوانی بە زەبری هێز هەولێر بگرێ بۆ هێنانە دی ئامانجەکەی پەنای بردە بەر گفتوگۆکردن لەگەڵ سەلجوقیەکان و توانی لەم ڕێگەیەوە سەرکەوتن بەدەست بهێنێ [٣٦] هەندێك لە مێژوونووسان بێ ئەوەی هاوسەردەمی ڕووداوەکە بن دەڵێن هەولێر لە ساڵی (٥٢٢ك/١١٢٨ز) داگیرکراوە[٣٧] بەڵام مێژوونووس (ئیبن ئەلعبری) دەڵێ گرتنی هەولێر لە ساڵی (٥٢٠ك/١١٢٦ز) بە ئەنجام گەیەندراوە[٣٨] هەرچی (ئیبن واحلە) ئەوا ساڵی (٥٢٦ك/١١٣١ز) بۆ گرتنی هەولێر دیار دەکات و (سەبط ئیبن ئەلجەزوی)پشتگیری دەکات[٣٩].
بەڵام ئیبن خەلەکان کە هەرچەندە بە درێژی باس لە ڕووداوەکانی ئەو شارە دەکات و خۆی خەڵکی ناوچەکەیە کەچی بەهیچ شێوەیەك ئاماژە بۆ ساڵی گرتنی شارەکە لەلایەن عیمادەدینەوە ناکات چەند گێڕانەوەیەکی ترمان لەبەر دەستدا هەیە کە پێچەوانەی بۆچوونی هەندێك لە مێژوونووسانەن یەکێك لە مانە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەبولهیجائی هەزبانی تا ساڵی (٥٢٥ك/١١٣٠ز) زۆر لەوە نزیکە کە ساڵی خۆبەدەستەوەدانی شاری هەولێر بێ بەڵام ئەمە مانای لە ناوچونی تەواوی دەسەڵاتی نیە، چونکە چەندان دژو قەڵای جیاجیای ناوچەکە[٤١] بۆ ماوەی چەند ساڵێکی تر لە ژێر دەسەڵاتی هەزبانیەکان مابۆوە[٤٢] ئەوەبوو جێگری عیمادەدین زەنگی کەناوی (نەسیرەدین جقر) بوو دوای ئەوە دەستی بەسەر یەکە بەیەکەی ئەو قەڵایانە

داگرت و ساڵی (٥٣٤ک/١١٣٩ز) [٤٣] دواین ساڵی بوونی دەسەڵاتی سیاسی هەزبانیەکان بوو، بەگشتی دەتوانین بڵێین دەرکەوتنی سەلجوقیەکان وەك هێزێکی سەربازی و سیاسی نەك هەر تەنها لە رۆژهەڵاتدا بەڵکو لە بەشێکی فراوانی جیهانی ئیسلامی و هەوڵدانیان بۆ گەڕاندنەوەی ئەو هەرێمانەی لە ژێر دەسەلاتی خەلافەتی عەباسی دەرچووبو و فراوانکردنی دەسەلاتی خۆیان بە ماوەیەکی زۆر کەم و هەڕەشەی بەردەوامیان بۆ رۆمەکان زەنگی کۆتایی و روخانی میرنشینی هەزبانی بوو لە هەولێردا.

هۆکارێکی تری راستەوخۆی لەناوچوونی میرنشینی هەزبانی دەرکەوتنی عیمادەدین زەنگی بوو لە ساڵی (٥٢١ک/١١٢٧ز) کە دەستی بە هەوڵەکانی کرد لە پێناو پێکهێنانی قەوارەیەکی یەکگرتوو لە ناوچەکەدا ئەمەش وای دەخواست کە شارو میرنشینە ناوخۆییەکان لە ناوببات لەمەشدا سوودی لە لاوازی و بێهێزی و پەرتەوازەیی ئەو شارو میرنشینانە وەرگرت و ئەمە هاندەرێك بوو بۆ عیمادەدین تاوەکو کۆتایی بە میرنشینە کوردییەکانی ناوچەکە بهێنێ، دابین کردنی بارودۆخێکی لە بار بۆ پتەوکردن و فراوانکردنی دەسەلاتی خۆی، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە عیمادەدین خۆی ئامادەدەکرد بۆ چوونە نێو چەند شەڕێکی چارەنووسساز لەگەڵ خاچیەکاندا زەنگی بەبەکارهێنانی هێزو هەندێ جاریش بەفرت و فێڵی سیاسی توانی ئامانجەکانی خۆی بپێکێ ئەم دوو شێوازەی بە ئاشکرا بەرامبەر بە هەزبانیەکانی هەولێر بەکارهێناو لە ئەنجامدا توانی بۆ هەتا هەتایە پەردە بەسەر دەسەلاتی سیاسی هەزبانیەکان لە شاری هەولێردا بداتەوە.

## پەراوێز و سەرچاوەکان

١. د.محسن محمد حسين . أربيل في العهد الاتابكى-بغداد-١٩٧٦ ص ٣٥.ود.هاشم الجنابي-مدينة اربيل دراسة في جغرافية الحضر-الموصل ١٩٨٧.ص١٢.

٢. ابن الاثير.الكامل في التاريخ ٣٨٢/٩-٣٨٣-ابن خلدون.تاريخ ابن خلدون ٢٢٩/٤.

٣. ابن الاثير ٣٨٣/٩ ابن الوردى .تاريخ ابن الوردى ٤٨٦/١.ابن خلدون ٢٩٩/٤ سعيد الديوجى تاريخ الموصل١/٩١-٩٢.

٥. ابن الاثير ٥٣١/٩ ابو الفدا الايوبى المختصر فى اخبار البشر ١٦٨/٢، المؤيد فى الدين سيرة المؤيد في الدين داعي الدعاة ص١٧٩.

٦. هەمان سەرچاوەو لاپەڕەکان.

٧. ابن الاثير ٥٤٩/٩.ابن المستوفي .تاريخ أربل ق٦٩/٢.ابن خلدون ٢٦٤/٤، سعيد الديوەجى١/١٤٢-١٤٣.

٨. ابن الاثير ٢٥٨/١٠-٢٥٩ الباهر في تأريخ الدولة الاتابكية ص ١٥-١٦ ابن خلدون ١٧٨/٥.

٩. كاربۆقا، یەکێکە لە مەملوکەکانی سوڵتان مەلیکشای کوڕی ئەلب ئەرسەلان و لە دوای لە ناوچوونی دەسەلاتی عوقەیلیەکان لە ساڵی (٤٨٩ك/١٠٩٥ز) ئەو حوکمڕانی موسڵی گرتە دەست بڕوانە : ابن الاثير ،٢٥٨/١٠-٢٥٩، الباهر ،ص ١٥-١٦.

١٠. ابن الاثير ، ٢٥٨/١٠-٢٥٩.

١١. جگەر مش – ناوی شەمسولدەولەیە جگەر مش نازناویەتی کە ووشەیەکی کوردیە و جگەر مژە لە نێوان ساڵانی ٤٩٥-٥٠٠ك دەسەلاتی موسڵی وەرگرت بڕوانە شرفخان البدليسى : الشرفنامة في تاريخ الدول و الامارات الكردية ص٣٣.

١٢. جاولی سەقاو . یەکێکە لە سەرکردەکانی سوپای سوڵتان محەمەدی کوڕی مەلیکشای سەلجوقی کە دەسەلاتی موسڵی لە نێوان ساڵانی ٥٠٠-٥٠٢ك گرتە دەست .بڕوانە ابن الاثير: ٤٢٢/١٠-٤٢٣ ابن خلدون ٣٧/٥.

١٤. ابن الاثير ١٠/٤٥٧-٤٥٨. ابن خلدون ٣٩/٥ . محمد امين زكى ، خلاصة تاريخ الكرد و كردستان ١٤١/١. د. رشيد الجميلى . امارة الموصل فى العصر السلجوقى ص١٢٠ Tom premir:Recueilded Historiens Croisades. P.254-258

١٥. ابن الاثير ١٠٠/٥٣٩-٥٤١، ابن خلدون ٤٥/٥-٤٦

١٦- دەبیس کوری سەدەقە، یەکێك لە میرانی موزەیدیەکانە کەلە شاری حیللە حوکمرانیان دەکرد بۆ زیاتر زانیاری بروانە: عبدالجبار ناجی، الامارة المزيدية ،٣٨٧-٥٥٨ك/٩٩٧-١١٦٢ز، ص٧-٩٦

١٧- ابن المستوفى، تاريخ اربل ق٢/٤٦٢.

ابن الاثير١٠٠/٦٧٥والباهر ص٣٠، ابن المستوفى ق٢/٤٦٢.

١٩- ابن الاثير ٩/١٦٣٩ المؤيد فى الدين، سيرة المؤيد، ص١٧٩.

٢٠- ئیبراهیم یەنال، زڕ برای سوڵتان تەغرول بەگەلەلایەنی دایکەوە، بروانە: ابن الاثير٩/٦٣٩. عبدالمنعم محمد حسين، سلاجقة ايران والعراق،ص ٣٦.

٢١- مەلیکشا لە گەورەترین سوڵتانەکانی دەوڵەتی سەلجوقیەو ئەو دەوڵەتە لەسەردەمی مەلیکشا گەیشتە ئەو پەری بەهێزی و هەر لەدەریاچەی خوارزم لە باکورەوە تاوەکو سنوری یەمەن لەباشوور و لەسنوری چین لە رۆژهەڵاتەوە تاوەکو کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست لە رۆژئاوادا درێژبووە و ناوی لە خوتبە و لەسەر پارە لەوزەوییە بەرفراوانە دادەهات بڕوانە: ابن خلكان، وفيات الاعيان ٥/٧١-٧٤، عبدالمنعم محمد حسين- سلاجقة ص٨١.

٢٢- خاوەنی دیار بەکر، میرنزا مەدین، ئەبولقاسم کوڕی نەسرولدەولە ئەحمەدی کوڕی مەڕوانی کوردی، بڕوانە: محمود ياسين، التكريتى الامارة المروانية فى ديار بكرص٩٤.

٢٣- اسامة بن منقذ، الاعتبار، ص٨٧، الفارقى، تاريخ الفارقى، ص١٨٧-٢٠١.

٢٤- ابن خلدون، تاريخ ابن خلدون٥/١٧، سعيد الديوەجى تاريخ الموصل .

٢٥- ابن الاثير، الباهر ص٣٠-٣٢، د.ارسن موسى، الهذبانيون، ص١١-١٢.

٢٦- الكامل ١٠/٦٢٣-٦٣٧. والباهر ، ص٣٠-٣٢.

٢٧- ئەبولفەتحی کوڕی وەرام، پێشڕەوی کوردە جاوانیەکان بوو لایەنگری بەسیاسی و بزووتنەوەکەی بوو، سوڵتان تەغرول بەگ لەساڵی(٤٥١ك-١٠٥٩ز) دەستیگیری کرد، بڕوانە: ابن الاثیر ٦٤٩/٩. ١٠/٢٧-٤٢.

٢٨- المنتظم ٣٠/١٠.

٢٩- د.عمادالدین خلیل، عمادالدین زەنگی، ص٦٩.

٣٠- ابن واصل مفرج الکروب، ٣١/١.د.عمادالدین زنطی، ص٦٩" د.محسن محمود حسینی، اربل فی العهد الاتابکی.ص٤٠.

٣١- د.محسن محمد حسین، هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

٣٢- ابن الاثیر، ١٤/١١، والباهرز، ص٤٢، ابن العدیم، زبدة الحلب، ٢٥٤/٢، ابو الفدا، المختصر ١٨/٣ ابن تغری بردی، النجوم الزاهدة١٦/٦.

٣٣- د.عمادالدین خلیل، عمادالدین زنکی، ص٧٥.

٣٤- د.عمادالدین خلیل، هەمان سەرچاوە، ص٧٥.

٣٥- لە بەر نەبوونی هەواڵی ڕاست و دروست سەبارەت بە سروشتی حوکمڕانی لە شاری هەولێر لەلایەن کوڕانی ئەبولهیجانی هەزبانی کە لەو سەردەمە حوکمیان دەکرد بۆیە دەتوانین بڵێین ئەوان جێگری سوڵتان سەلجووقی بوون بە بەڵگەیی ئەوەی هەردەم پاڵپشت و پشتگیری سەلجوقیەکانیان دەکردو هەرگیز دژیان نەوەستان.

٣٦- ابن واصل، مفرج الکروب، ٩٧/١، د.ارسن موسی، الهذبانیون ص١٣، د.عصام الدین عبدالرؤوف، بلاد الجزیرة فی اواخر العصر العباسی، ص٢٠-٢١.

٣٧- الدواداری، کنز الدر، ص٥٠٢،. ابن قاضی شهبة الکوثی الدریة، ص٩٣.

٣٨- تاریخ الدول السریانی، ترجمة اسحق السریانی، مجلة المشرف العدد(٤٦)١٩٥٠٠، ص٣٠٦. د.محسن محمد حسین،اربیل ص٣٨.

٣٩- مفرج الکروب٩٨/١ مراة الزمان، ١٨٩/٨. د.عصم الدین، هقمان سترضاوة، ص٢١.

٤٠- ئەم لە ژیاننامەی ئەبو بەکر محەمەد قازی شارەزوری،٤٥٣-٥٣٨ك/١٠٦١/١١٤٣ز)داهاتووە کە ابن المستوفی بەدەستخەتی خۆی ئەمەی

لێوەرگرتووە، لەدیوانی میر عیزەدین مومەهیدو لدەولە ئەبولهیجائی هەزبانی خوداشکۆداری بپارێزی ئامادەبووم، ئەوەبوو فەرمانێکی لە ساڵی(٥٢٥ك/١١٣٠ن) بۆ مەسیحیەکی شاری هەولێر دەرکرد) ئەم دەقە هەموو دەقەکانی تر رەت دەکاتەوە کە ئاماژە بۆ گرتنی شاری هەولێر دەکەن، ئەوە دەردەخات کە ئەبولهیجا تاوەکو ساڵی(٥٣٥ك–١١٣٠ن) حوکمرانی هەولێری دەکرد و ئەو ریوایەتە پشتی پێدەبەستریٚ چونکە لە کەسێکی هاوسەردەمی ئەبولهیجائی هەزبانی وەرگیراوە، بڕوانە: ابن المستوفی، ق١/٢٠٦. بڕوانە :ابن الاثیر ١١٠/٧٥–٧٦ ابن واصل١/٥٥–٥٦.

٤٢– ابن الجوزی، المنتظم١٠/٣٠–٣٥.

٤٣– ابن الاثیر ١١/٧٥–٧٦.

# لە بارەی سەرەتاکانی دەرکەوتنی دەسەڵاتی سیاسی کوردی لە سەردەمی ئیسلامی دا

د.قادر محمد حسن پشدەری

**دەروازە:**

پاش ئەوەی کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە وولاتی کوردان بلاّوبۆوە و بەرە بەرە لەپرۆسەیەکی بەکاوە خۆ و تاڕادەیەك درێژماوەدا بەچەندان سالّ بەشی زۆری کوردان بوون بە موسولّمان، ئیدی ناوچەکە وەرچەرخانێکی گەورەی شارستانی بە خۆوە دیتن و گۆڕانکاری سەرجەم بوارەکانی ژیانی فەرهەنگی وکۆمەلاّیەتی و ئابوری و سیاسی گرتەوە

لەسالاّنی بەرایی دەسەلاّتی خەلافەتی ئیسلامی لە هەرێمە کورد نشینەکاندا[1] خامۆشیەکی سیاسی وهەروەها شارستانیش هەست پێدەکرێ، ئەمەش پێمان وایە بۆ سروشتی بەرەبەرە دەست بەردار بوونی زۆربەی کورد لە ئاینە کۆنەکانیان و بڕوا هێنان بە ئاینی ئیسلام دەگەڕێتەوە، تاوەکو ئەوەی سەردەمی هەژان و گۆڕانکاری گەورە لە پاش سالّی ١٧ك هەتاوەکو سەدەی یەکەمی کۆچی بڕانەوەو نەوەی نوێی گۆش بوو بە ئاینە نوێیەکە پەیدا بوو ئەوجا لە سەرخۆ و پەیتا پەیتا ڕۆلّ ونەخشی کوردان لەمێژووی ئیسلامیدا دەردەکەوێ، بەشی زۆری مێژووی پێشتری وولاّتی کوردان ڕەنگرێژی دەولّەتی ئومەوی بۆ ناوچەی موسلّمانەکان و هەروەها هەلّکوتانە

سەر یاخی و ناڕازیانی ناوچەکەو ئەمەو وێڕای بوونی هەندێك ناوچەی كورد نشینی بەمۆلگەو پەناگەی خەوارجی و عەلەویان کە شەڕی بەردەوامیان لەگەڵ سوپای دەوڵەتی ئیسلامی هەبوو.

لەسۆنگەی ئەوەی کە شۆڕشی عەباسیەکان، گورو تینی خۆی لە ناوچەی خوراسان وەرگرت بوو، ڕێی تێدەچێ بڵێین شۆڕش و بەرەنگاری هەرێمەکانی ڕۆژهەلاتی ئیسلامی بە هەرێمە کوردیەکانیشەوە بوو لە دژی ستەم وئەغزی ئومەوییەکان و سەرەنجام کوردیش چالاکانە بەشداری لەو گۆڕانکاریانە کردوو سەرکردەیەکی وەکو ئەبوموسلیمی خوراسانی بەپێی سەرچاوە ئیسلامییەکان لە هەمووان کاراترو کارامەتر و لێوەشاوەترو مشور خۆرتر فەرماندەی عەباسییەکانی کردو ئەوانی گەیاندە دەسەلات. هەر بۆیە دەکرێ ئەو شۆڕشە وەکو ڕابوونێکی سیاسی و فەرهەنگیانەی لە لای موسڵمانانی ناعەرەب (موالی) دابنرێ و کوردیش لەو بەرخودانەدا پشکی خۆی پێ دەبڕێ.

کەواتە سەردەمی عەباسییەکان، ماوەی دەرکەوتنی بەرچاوی کوردانە لە مێژووی سیاسی ئیسلامدا چونکە وێڕای ئەو هەل و مەرجە سیاسیە تارادەیەك لە بارەی هاوشانی پێکهاتنی خەلافەتی عەباسی هاتە گۆڕێ. ئەوا ماوەی درێژی دەسەلاتی عەباسیان پەرەسەندنی سیاسی و سەربازی و کۆمەلایەتی و ئابوری ئەو تۆی لێکەوتەوە کە دەسەلاتی ناوەندی بێ هێزو، تواناو جیاخوازی هەرێم و ناوچە جیاجیاکانی بەهێز کردوو، لەو سۆنگەیەوە هەل ومەرجی بابەتی لەبار لە کوردستانی ئەوحەلەدا بۆ دەرکەوتنی دەسەلاتی سیاسی خۆماڵی خەملاً و ڕسکا. یەکەمین قۆناغی ڕابوونی

سیاسیانەی کورد لە سەردەمی عەباسیان بە ئاشکرا لەسەرەتای سەدەی سێیەمی کۆچی /نۆیەمی زاینی دەست پێدەکات پاش ئەوەی کورد لە عەباسییەکان دڕدۆنگ دەبێت و تێدەگەن کە دەوڵەت بە هۆی ئەو گەندەڵی وبێ بڕستی یەی کە تێی کەوتووە لە ئاستی داواکارییەکانی خەڵك دانییەو بۆیە ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەی نەیارانی تۆکمە تر دەبێ و کوردیش بە هەڵوێستی جیاجیا بەشی زۆریان خۆیان لەو بەرەیەدا دەبینییەوە بە بەشداری کردنیان لە ڕاپەڕین وچالاکیە سەربازیەکانی خەوارج لە جەزیرەو هەروەها جار جارەش هی عەلەوییەکان.

بەلآم هەر لەو سەردەمەدا تێبینی ئەوە دەکرێت کە کورد بزوتنەوەو ڕاپەڕینی تایبەت بەخۆی هەیە واتا بەمۆرکێکی تەواو کوردانە. ئەویش وەکو نارەزایی دەربڕینی بەرامبەر بە سیاسەتی هەندێك خەلیفەو ئەو والی وکاربەدەستانەی حوکمی ناوچە کانیان دەکرد. لە وێدا هەست بەگۆڕانێکی مێژووی دەکرێ وێڕای بەشداری کردن لەو بزوتنەوە ئۆپۆزسیۆنە گشتیانەی کەدژی خەلافەت و سیاسەتەکانی بوون، ئەوا بزوتنەوەی تایبەتی کوردی هەیە کە هۆش و گۆشێکی سیاسیان لە کوردستاندا هێنایە گۆڕێ و بوون بە سەرەتا بۆ دروست بوونی دەسەلآتی سیاسی کوردی لەو سەردەمەدا .

دەشێ هەوەڵێن دەسەلآتداریەتیە سیاسیە کوردیەکانی ئەو سەردەمە ئاوا پۆڵێن بکرێ:-

## یەکەم: ئەو دەسەلآتداریەتیانەی بە شارو ناوچەکان ناسراون

مەبەست ئەو دەسەلآتداریەتیەیەکە هەندێ شارو ئاوەدانی کوردستانی ئەو کات دەرکەوتوون و هەر بە دەسەلآتدارییەتێکی شارو ناوچەکان ناسراون

ونـاوی مـیرو دەسـەلأتدارانیان ئاشـکرانی یـەو مـاوەی سـەربەخۆ بـوون و دەسەلأتداریەتیانەی دیارو ڕۆشن نی یە .

ناوچەی شارەزوور کە یەك لـە ناوچـە هـەرە بەناوبانگـەکانی سـەردەمی ئیسلامی کوردستانە، بەپێی هەندێك نوسراوی مێژووی هەر لە سـالّی ٢٩٧ك / ٩١٠ز تاوەکو سالّی ٣١٧ك/٩٢٩ز وە سەربەخۆ بووە بە بەلّگـەی ئـەوەی هـەم والی عەباسیەکانی لێ نەبووە و هەم لـە مـاوەی ئـەم بیـست سالّەدا هـیچ بـاج وسەرانەیەکیان بۆ دەولّەتی خەلافەت نەناردووە[٢]

دوای ئەمە شارەزوور بۆ ماوەیەك لە ژێر دەسـەلأتی خەلافـەتی عەباسـی دەمێنێتەوە بەلأم وادیارە جارێکی دیکە سەربەخۆ بۆتـەوە و هـەتا لـە سـالّی ٣٤٣ك/ ٩٥٤ز بوەیهیەکانیش پێیان داگیر نەکراوەو پاش شـەڕێکی زۆر ناچـار پاشەکشەیان کردووە چونکە شارەکە قایم بـووە و خەلّکەکەشـی زۆر دلێرانـە بەرگریان لێ کردووە[٣]

بۆیە پێدەچێ بەدرێژایی نیوەی یەکەمی سەدەی چـوارەمی کۆچـی/ دەیـەمی زاینی تـا دروسـت بـوونی میرنـشینی حەسـنەوی ناوچـەی شـارەزوور هـەر لـە دەرەوەی دەسـەلأتی خەلافـەت بـووە. بـە بەلّگـەی قـسەی ئـەو ولأتناسـە موسلّمانانەی ئەوکاتەی سەردانی شارەزووریان کردووە کە یاداشتیان کردووە کەوا شارەزوور یاخی بوون و هیچ میرو سەردارێکی خەلیفەی لێ نییە[٤].

هـەروەها شـاری (نـەرین) کـە لەهـەرێمی ئازەربێجـان لـە نزیـك شـاری ئەردەبیل هەلّکەوتووە. لەلایـەن کوردەکـانی خێلـی بـەناوبانگی هەزبانییـەوە فـــەرمانڕەوایی کـــراوە و هـــەر لـــەنیوەی یەکـــەمی ســـەدەی چـــوارەمی

کۆچی/دەیەمی زاینی کوردەکانی ئەویَ بەسەربەخۆی پەرەیان بە ئاواکردن و فراوانکردنی شارەکە داوە(٥).

وە شاری سەهرەورد کە زۆرجاران لەگەلَ شارەزوور نێوی هاتووە شارۆچکەیەکی هەرێمی جیبال لەنزیك شاری زنجان بووە، بەیەك لەشارە شورەدار و قایمەکان ناسراوە و لەو سەردەمەدا کورد سەربەخۆییانە حوکمی وێیان کردووە و پاراستویانە(٦)

## دووەم: ئەو دەسەلأتداریەتیانەی بەسەرکردەکان ناسراون.

لەمێژووی نیوەی یەکەمی سەدەی چوارەمی کۆچی/ دەیەمی زاینی هەندیَ کەسایەتی سەربازی و سیاسی کورد لێهاتوویان نیشانداوە و توانیانە لە هەندێك ناوچەدا دەسەلأتداریەتی سەربەخۆ پێك بهێنن. یەك لە بەناوبانگترینی ئەو کەسایەتیانە ( دەیسەمی کوڕی ئیبراهیمی کوردی)کە لە ئازەربێجان و هەندێك ناوچەی تاران و ئەرمینیا توانیویە دەسەلأتێکی بەهێز و کارا بنیات بنێت. ئەو کە پێشتر جێگری والی ئازەربایجان بوو توانی دوای کوژرانی والیەکە خۆی بکاتە سەرداری هەرێمەکە و وێرای بەرگریکردن هەلَپەی فراوانخوازیش بکات و هەر لەسالَی ٣١٥ك/٩٢٦ز، سەربەخۆیانە فەرمانڕەوایی بکات(٧)

هەرچەندە دەسەلأتی دەیسەم خودان سوپایەکی مەزن و بەهێز و پشت و پەنای خەلَکی ناوچەکە بوو بەلأم لەماوەی فەرمانڕەوایەتیەکەی بەردەوام لەژێر هەڕەشەی دوژمنە دەرەکییەکان دەبوو بەتایبەت موسافیریەکان کە دەیانەویست حوکمی هەموو ئازەربێجان بکەن بەلأم دەست ڕۆیشتووی

کوردان لەماوەی فەرمانڕەوای دەیسەم دا زۆربوو بەشێکی زۆری سوپاکەی لەوان پێك دەهات. هەروەها لەیەك لە کۆنترین دەسەلاتدارە سیاسیە کوردەکانە کە خاوەن دام و دەزگای دەوڵەت بووە لە وەزارەت و سیستەمی کارگێڕی و سەرزەمینێکی بەرفراوانی جوگرافیو هەروەها لێدانی دراو و پارەی تایبەت بەخۆی دەسەلاتداریەتیبەکەی تاوەکو ساڵی ٣٤٢ك/٩٥٣ز بەردەوام بوو و لەوسالأنە لەلایەن موسافیریەکان ڕوخێنراوە[٨].

وە هەر لەناوچەی ئازەربایجان سەرکردەیەکی دیکەی کوردان دەسەلاتێکی سەربەخۆی لەشاری سلماس (شەلماش) لە دەوروبەری ساڵی٣٣٢ك/٩٤٤ز بنیات ناوە. ئەویش سەرکردە (جەعفەری کوڕی شەکەوەی کوردیە[٩] بەلأم نازانرێت کەنگی و چۆن ئەو دەسەلاتە کۆتایی پێی هاتوە و چارەنوسی ئەو سەرکردە کوردە چی بووە.

## سێیەم: دەسەلاتی میرنشینایەتی

هاوکات لەگەڵ فراوانبون و هەڵکشانی ئەو دوو جۆرە دەسەلاتە سیاسیانەی پێشتر باسمان کرد. لەهەرێمە کوردەکاندا دەسەلات لەشێوە میرایەتی سەریهەڵداو ئیدی مۆرکی خۆی بە مێژووی سیاسی کوردی ئەو سەردەمەدا ناو قۆناغێکی نوێی لە دەسەلاتداریەتی سیاسی کوردیدا دروست کرد.

کۆنترین دەسەلات لەشێوەی میرایەتی کە بەشێوەیەکی زۆر کورت و ناڕۆشن زانیاری مێژوویی لەسەرچاوەکاندا لەسەر یاداشت کراوە، میرنشینی عەیشانیە کە نێوی تیرەیەکی کوردیە سەر بەهۆزی گەورەی بەرزیکانی بووە.

مێــژونووس (ابــن الاثــیر) لــە ڕوداوەکــانی ســاڵ ٣٥٠ک ٩٦١ز ئامــاژە بــە عەیـشانیەکان دەکـا و نێـوی دوو میریـان دێنـێ بـەناوەکانی ونـداد و غـانم کوڕەکـانی ئەحمـەد و خـودان سـوپایەکی چـەند هەزارکەسـی بـوون و شـارو ناوچـەکانی دینـەوەر و هەمـەدان و نەهاوەنـد هـی دیکـە، لـەبن دەسـتدابووە یاداشت کراوە کە ماوەی ٥٠ ساڵە ئـەوان فـەرمانڕەوایی دەکـەن کـەوابێ ئـەو میرنشینە سەرەتایەکانی بۆ ساڵی ٣٠٠ک/٩١٢ز دەگەڕێتەوە [١٠] .

بەم شێوەیە میرنشنایەتی لە هەرێمە کوردنشینەکاندا دەست پێدەکات و بەرەبەرە میرنشینی دیکە دەردەکەون وەکو میرنشینی ڕوادی ٣٣٧ک/١٠٤٨ز، میرنشینی شەدادی ٣٤٠ک/٩٥١ز وە میرنشینی حەسنەوی ٣٤٨ک کـە دەبێتـە میراتگری میرنشینی عەیشانی و میرەکانیان خاڵۆزا و پورزای یەکتربوون ئیدی میرنشینی دیکە دواتر دەردەکەون[١١] کوردستانی ئەو وەختە وەرچەرخانێکی گــەورەی شارســتانی لەهــەموو بوارەکــانی ژیانــدا بــەخۆوەدەبنیێ و خۆشــگوزەرانی و ئــاوەدانی و خانــەدانی لەســایەی دەســەڵاتی سیاســی سەربەخۆی کوردی لە وڵاتی کوردەواریدا دەدرەوشێتەوە ئەو ڕاستیە مێژوییە دەچەسپێ لە هەر سەردەمێك کە کورد بۆ خـۆی فـەرمانڕەوایی وڵاتـی خـۆی کردبێ ئاوەدانی و کامەرانی باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشاوە.

<u>پەراوێزو سەرچاوەکان</u>

(١) ئەو هەرێمانەی کە لەکن وڵاتناسانی ئیسلامی ناویان هاتووە بەسەر یەکەوەن و ئەو ناوچانەی ناو هەرێمەکان کە بەشی زۆر و سەرەکی ئاکنجیەکانی کورد بوون

(١٠) الكامل، ج٧، ص١٠١

(١١) بۆ زیاتر زانیاری لەو بارەیەوە بڕوانە قادر محمد حسن، الامارات الكردية في العهد البويهي دراسة علاقاتها السياسية و الاقتصادية ، رسالة ماجستير مقدمة الى مجلس كلية الاداب جامعة صلاح الدين غير منشورة، اربيل، ١٩٩٩، ص٢٤-ص٤٤.

# بەشی کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا

م . فارس قادر فەقێ عەبدوڵڵا

هەندێ کەس پێیان وایە کە کورد نابێ مێژووی دراوسێکانی بخوێنێ و بخوێنێتەوە، پاساویش بەمەدەهێنینەوە کە دەبێ هەموو هەوڵ و کۆششەکانی تەرخان بکرێن بۆ نوسینەوەو لێکۆڵینەوە لەسەر مێژووی کورد نەك مێژووی دراوسێکانی، بەڵام ئەگەر ئەوانە بەباشی ئاگاداری وردەکارییەکانی مێژوو و نووسینی مێژوویی بن و تایبەتمەندی بارودۆخی کورد و کوردستان و مێژووەکەی بزانن، بۆیان دەردەکەوێ کە شارەزابوون و خوێندنەوەی مێژووی دراوسێکانی کورد رێگرنییە بەرامبەر بەگرنگیدان بە مێژووی کورد بەڵکو یارمەتی دەریشی دەبێ، چونکە لە کاتێك کورد خۆی کەم گرنگی بەتۆمارکردنی مێژووی خۆی داوە بەتایبەتی کە کیانی سیاسی وابەهێزو سەقامگیری کەم بووە کە هاندەری نووسینی مێژووی کوردبێ، بۆیە ناچار دەبین بۆ پڕکردنەوەی ئەم کەلێنە پەنا ببەینە بەر گەڕانێکی چڕوپڕ بەدوای بەشی کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا چونکە کورد لە رووی سیاسی و سەربازی و رۆشنبیری بەشداری دیاری لە مێژووی چەندین دەوڵەتی بەناوبانگی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەبووە رۆژدوای رۆژ ناوی پترى کەسایەتی کوردی ناودار لە دەوڵەتی عەباسی و فاتیمی و عوسمانی و سەفەوی ....تد

بەدیاردەکەوێت.

بۆیە یەکێك لە ئەرکە نەتەوەییەکانی کورد ئەوەیە کە لە کتێب و ئەرشیفەکانی عەرەب و فارس و تورك و ئێرمەنی و ئاشوری بکۆڵێتەوە بۆ ئەوەی زانیاری پتر دەربارەی کورد و کوردستان لە مێژوودا بەدەست بهێنرێت تاکو بەتێپەڕبوونی کات و گۆڕانی ئەو کەرستەوسەرچاوانەی لەبەردەستدان مێژووی کورد بەبەردەوامی لەسەر لەنوێ نوسینەوەدابێ، چونکە سەر لەنوێ نوسینەوەی مێژووی کورد یان وەکو هەندێ کەس پێی دەڵێن دووبارە نوسینەوەی مێژووی کورد بەفەرمان دەرکردن و بەستانی کۆڕو سیمینار و هات و هاوارکردن نابێ، بەڵکو پێویستە لیژنەیەك لە کەسانی پسپۆڕ پێك بهێندرێ بەلایەنی کەم بۆ چەند مانگێك بنێردرێن بۆ تورکیا و ئێران و ئەرمینیا و میسر و سوریا و ئوردن و چەندین وڵاتی عەرەبی تر تاکو کەرستەی پتری نوسینی مێژووی کورد لەگەڵ خۆیان بەدیاری بۆ کوردستان بهێننەوە دڵنیاش بن ئەگەر بێتو ئەو لیژنەیە لەکەسانی دڵسۆزو شایستە پێك بێت،چەندین تەن لە بەڵگەنامە و کتێبی پڕ بەها، تەژی بەزانیاری نوێ سەبارەت بە قۆناغە جۆر بەجۆرەکانی مێژووی کورد لە رووی سیاسی و سەربازی و شارستانی کۆدەکەنەوە، کەواتە هەرچی زووە بابەهاوکاری هەموو لایەك هەنگاوی یەکەم لەم کاروانە پیرۆزە بهاوێژین و با نەوەکانی داهاتووش چەندین هەنگاوی تری بەدوادابهاوێژین و دەست خۆشیمان لێ بکەن، نەك بەکەم تەرخەممان بژمێرن.

# کەسایەتی شوێنەوارناس لە نێوان لێکدانەوەی مێژوو و بەڵگە شوێنەواریەکاندا

*سروود طالب محمد طاهر

لەوانەیە شتێکی سانا بێت کە هەر کەسێك وەکو خوێنەر ، رووداوەکانی مێژوو بە شێوەی زنجیرە یاخود چیرۆك بخوێنەتەوە ، جگە لەوەی توانای مانەوەی رووداوە مێژووەکان بەم شێوەیە لە مێشکی خوێنەردا زیاترە و بەڵکو لەوانەیە پەندیشی لێوەرگرێت هەروەکو زانراوە شتێکی ئاساییە کە مێژوو پەند وەرگرتنە .

بەڵام کاتێك کە دێینە سەر کەسایەتی شوێنەوارناس و کەسایەتی مێژوو نووس تێکەڵاویەکی تاڕادەیەك زۆر خۆی بەرجەستە دەکات ، وەخاڵی پابەند بوونمان بەم تێکەڵاوییەوە لە کاتێك دادەبێت کە هەردوولا باس لە رووداوە مێژووییەکان دەکەن بەتایبەتی رووداوە سیاسییەکان و ئیداریەکان کە ئەمانە رووکارە گشتییەکانی شانۆی رووداوەکە لەو سەردەمەدا دەردەخەن واتە دیدگەیەکی بەربلاو هەمەلایەنمان لە لادروست دەکەن دەربارەی چۆنیەتی ژیان لەو سەردەمەدا ، بۆیە لێکدانەوەی ئەم رووکارانە و پێکەوە بەستنیان کارێکی زۆر گرنگە و ساناننییە . ئەگەر بمانەوێ رێبازێکی ئەکادیمی تەواو جێ بەجێ بکەین ، ئەم ئەرکە ناکەوێتە سەر کەسی شوێنەوارناس ، بەڵکو دەکەوێتە سەر مێژوونووس بە شێوەیەکی فراوانتر ، هەرچەندە دەکرێ کە

مێژوونوس لە ئامانجی بەڵگە شوێنەواریەکان بەو شێوەیە ئاگادار نەبێ ، بەڵام کاتێك کەسی شوێنەوارناس خۆی هەڵدەستێت بە دیاری کردنی بەهای شارستانی و مێژوویی بەڵگەیەکی شوێنەواری و پاشان گەیاندنی پەیامی ئەو پاشماوەیە وەکو وەرگێرانی تێکستە مێخییەکان بۆ نموونە، پاشان بەستنەوەی ئەم کارە بە رووکارە گشتییەکانی ژیانی ئەو سەردەمەوە و دەرهێنانی گرنگترین ئەنجامەکانی کەخۆی پێ ی گەیشتووە وەکو شوێنەوار ناس ، ئەمە خۆی لە خۆیدا دەبێتە ماددەیەکی گرنگ بۆ مێژوونوس کە بە وردی کاری لەسەر بکات بە مەبەستی تەواو کردن و لێکدانەوەو پێکەوە بەستنەوەی سەردەمەکان و رێکخستنی رێرەوی مێژوو کەئامانجی هەمووانە ، واتە مەرج نیە بەتایبەتی لە دەرخستنی رووداوە سیاسییەکاندا شوێنەوارناس هەر خۆی رۆڵی مێژوونوس وەربگرێ و هەموو کارەکان خۆی جێ بەجێ بکات کە هەرگیز کارێکی ورد دەرناچێت ، هەروەکو لە زۆربەی سەرچاوە عەرەبیەکاندا دەبینین کە زۆرجار شوێنەوار ناس خۆی رۆڵی مێژوونوس دەگێرێ و ئاراستەیەکی تایبەتی کەخۆی دەیەوێ دەیداتە رووداوەکان لە پاڵ پێشبینی و بۆ چوونی خۆیداو بەبێ بەڵگە .

بۆیە مەرجە کاتێك شوێنەوارناس بەم جۆرە کارە هەڵدەستێت سنووری پسپۆرییەکەی خۆی بپارێزێت و تەواوکارییەکەی بۆ پسپۆرییەکی دیکە بەجێ بهێڵێ و، لە پێناو بەجێهێنانی کارێکی ئەکادیمی زانستی بە سوود .

قوتابی ماستەر لە بەشی شوێنەوار

# راپەڕینی یەزدان شێر (١٨٥٤ - ١٨٥٥ز)

د. نسرین محمود الاربلی

عوسمانیەکان دەمێك بوو زوڵم و زۆریان بەرامبەر کوردەکان دەکرد ، ئەو زوڵم و زۆریەی لە نیوەی یەکەمی سەدەی ١٩ هەمدا گەیشتە لوتکە ، ئەوەبوو چەندان میرنشینی کوردیان روخاند و فەرمانبەری تورکیان بەسەر دا سەپاندن ، یەکێك لەو میرنشینانە ، میرنشینی بۆتان بوو لە جزیرە کە لە لایەن بنەماڵەی بەدرخانیەکانەوە حوکمداری دەکراو لە تەمموزی ١٨٤٧ز لەسەر دەستی عوسمانیەکان لە ناوبرا.

یەزدان شێر ئامۆزای میر بەدر خان بەگی بۆتان بوو، لەو کاتەوەی دەوڵەتی عوسمانی بەشەڕی (قرم ١٨٥٣ - ١٨٥٦) لەگەڵ روسیای قەیسەری خەریك بوو ، هێزەکانی خۆی لە کوردستان کێشایەوە بەرەکانی شەڕو هەروەها رووسیاش لەنزیکەوە دەستی دەخستە ناو کاروباری کوردستان و پەیوەندی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری سەرۆك عەشیرەتە کوردەکان کردوو بە پارەو پوول بەخشینی پایەی شەر بۆلای خۆی راکێشان ئەوەبوو لەم کاتەدا یەزدان شێر دەستی کرد بە راپەرینە جەماوەرییەکەی ، کەوا لەراستیدا یەزدان شێر بەپێ ی ئەو رێکەوتنەی کە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا کردبوو، لە سەرو بەندی میرنشینی بۆتاندا پشتی لە میر بەدرخانی ئامۆزای کردبوو

١

پاڵی دابووە پاڵ عوسمانیەکان ، لە پاداشتی ئەوە عوسمانیەکان کردبوویان بە سەرداری جەزیرە و هەکاری و بەرواری .

سەرچاوە مێژووییەکان بیرو رای جیاوازیان لەسەر ئەم خیانەتەی یەزدان شێر هەیە لێرەو لەوێ باسی لێوە دەکەن ، سەرچاوەی ئەوتۆ هەن کێشەکە دەبەنە سەر ئەو ململانێیەی کە لەو کاتەدا لە نێوان زۆربەی بنەماڵە فەرمانڕەواکانی کوردستاندا، لە سەر دەسەلاّت لەئارادا بوو ، جا لەو کاتەدا یەزدان شێریش سەرکردەیەکی سەربازی زیرەك و ئازا بوو خاوەن کەسایەتیەکی کۆمەلاّیەتی بەرزبوو ، هەمیشە لەرەفتارو کردارو خواردن و رابواردنی وەك میرو پاشایان دەژیا، بەوەش مەترسی لەسەر دەسەلاّتی میر بەدرخان پەیدا کردبوو، بۆیە میر بەدرخان لێی دردۆنگ بوو خستویەتیەوە بەندیخانەوە ، بەلاّم سەرچاوەی تر هەن ئەو کێشەیە دەبەنە سەر ئەوەی کاتی خۆی یەزدان شێر فەرمانێکی میر بەدرخانی سەبارەت بە قەتل و عام کردنی ئاشووریەکان پشت گوێ خستبوو . ئەوەش وای لە میر کرد کە یەزدان شێر زیندانی بکات .

بەلاّم هەندێ سەرچاوەی تر یەزدان شێر بە کابرایەکی پولەکی و چاو چنۆك لەقەلەم دەدەن ، گوایا خۆی بەو پارەیە پابەند کردووە ، کەکاتی خۆی عوسمان پاشای سەرکردەی عوسمانی بەرامبەر ئەم کردەوەی پێشکەشی کردبوو..

هەر چۆنی بێ ، لە زستانی ساڵی ١٨٤٧ز عوسمان پاشای سەرکردەی سوپای عوسمانیەکان لە دیاربەکر و سیواسەوە بە لەشکرێکی زۆرەوە بەرەو جەزیرەی ئاوای ، لەم کاتەدا میر بەدرخان لە دەوروبەری ورمێ خەریکی

سەرکوت کردنی نەیارەکانی بوو ، تا میر بەدرخان ئەم هەواڵەی پێ گەیشت و یەکسەر گەڕایەوە. یەزدان شێر کاری خۆی کردبوو ، جەزیرەی دابووە سوپای عوسمان پاشا ، بەڵام میر بەدرخان توانی دووبارە جەزیرە ئازاد بکاتەوە و تورکەکانی لێ دەرپەڕێنێ.

بۆیە عوسمان پاشاش بە یارمەتی یەزدان شێر و سوپایەکی گەورە گەمارۆی توندی خستە سەرجزیرە ، میر بەدرخانیش خۆی لە قەڵاتی (ئارۆخ) قایم کرد ، دوای هەشت مانگ موقاوەمەت و بەرگری ، بەهۆی کەم بوونی ئازووقەو تەقەمەنی و بڵاببوونەوەی نەخۆشی ، ناچاربوو لە تەمموزی ١٨٤٧ز خۆی دابەدەستەوە.

ئەوسا کە تورکەکان وەك تاکتیکێك بۆ هێورکردنەوەی کوردستان، یەزدان شێریان کردە سەرداری هەرێمی جەزیرەو هەکاری و بەرواری ، ئەویش لە ماوەی شەش ساڵ سەرداریەتی خۆیدا ، سەرەڕای ئەو کۆسپ و شەڕفرۆشتن و بیانوانەی کە تورکەکان بۆیان دەدۆزییەوە، بەڵام بە رێك وپێکی کارەکانی بەڕیوەبرد و توانی خەڵکی ناوچەکە لە خۆی رازی بکات، ئەوە بوو پەیوەندی خۆی لەگەڵ مارشەمعونی سەرۆکی ڕوحانی مەسیحیەکان کە لەسەردەستی بەدرخان دەرەبەدەر کرابوو، وەموڵکەکانی زەوت کرابوو، ئاسایی کردەوە بەوەش توانی تاڕادەیەك سەرنجی ئاشورییەکان بۆ لای خۆی ڕابکێشێ.

ئەم سیاسەتەی یەزدان شێر لەلای مێژوونوسانەوە وا شرۆڤە دەکرێت کە یەزدان شێر سەرکردەیەکی لێهاتوو پێشکەوتونخواز بوو بەهۆی هەستی ئاینیەوە هیچ چەشنە ڕقێکی بەرامبەر مەسیحیەکان نەبووە هەندێکی تر ئەو

سیاسەتەیان بەتاکتیك لە قەڵەم دەدا بۆ ئەوەی لە ڕێی ڕاکێشان و هاوپەیمانیەتی ئاشورییەکانەوە ستراتیژی ئینگلیزەکان کە لەم سەردەمەدا دەسەڵات و نفوزێکی بەربڵاویان لە دەوڵەتی عوسمانی و ناوچەکەو جیهاندا هەبوو، بۆلای خۆی زامنی بکات وەك ئامرازێك بۆ گەیشتن بەمەرام و ئامانجە سیاسییە دوورەکانی بە کاریان دەهێنا .

بەم شێوەیە یەزدان شێر شەش ساڵ حاکمی کوردستان بوو ، بەلأم بەهۆی ئەو بارودۆخەی کەشەری قرم لەناو قەڵەمرەوی دەوڵەتی عوسمانی دروستی کرد، هەروەها پراکتیزەکردنی ستراتیژیەتی بە سەنتەرکردنی دەوڵەتی عوسمانی و بزووتنەوەو چالاکیە سەربازەکان و کارو کردەوە چاکەکانی یەزدان شێر، تورکەکان دڵی لێ پیس دەکەن و لە ساڵی ١٨٥٤ز بە بریارێك شەرعیەتی دەسەڵاتەکەی لێ دەسەنەوە ، بەوەش یەزدان شێر ورووژا،ئەوەبوو (٢٠٠) سواری کۆکردەوە پەلاماری بایەزیدو هەکاری و بۆتان و دەوروبەرەکەی داو ناوچەی جەزیرەی کردە پایەختی خۆی، دواتر پەلاماری شاری وانیشی داو لە پاشان دەستی کرد بە یارمەتی دانی خەڵکی ناوچەکە بە ئاسانی پاشماوەی سوپای عوسمانیان لێ دەرپەڕاند .

تورکەکان بۆ تێکدانی یەکێتی ریزەکانی شۆڕشگێران، هەستان دوو کوڕی میر بەدرخانیان لە دەربەدەری و دەستبەسەری هێنایەوەو بە پارەو پولێکی زۆرەوە ناردنیانەوە کوردستان بۆ ئەوەی خەڵکە راپەریوەکە لە دەوروبەری یەزدان شێر بتەکێنن.

بەلأم ئەو دوو کوڕەی میر بەدرخان بە پێچەوانەی خواست و ویستی داگیرکەران دایانە پاڵ شۆڕشگێران و سوودیان لەو پارەیەش بینی، کە

لەگەڵ خۆیان هێنابوویان ، ئەوەندەی نەبرد ئاسوری و ئەرمەنی و یۆنانی و عەرەبەکانی ئەنادۆلیش دایانە پاڵ راپەڕینەکە. تورکەکان بۆ بەرایی گرتنی راپەڕینەکە لەشکرێکیان بەسەرکردایەتی عەزمی پاشا نارده سەر جەزیره، بەلأم هەر زوو بەزوو تێکشکێنران لە ١٨٥٥ز یەزدان شێر بە(٣٠) هەزار سوارەوە پەلاماری بردە سەر شاری موسڵ و داگیری کردو دەستی بەسەر خەزێنەو کارگەی دروست کردنی ئاردی ئەم شارەدا گرت، بەمەش لایەنی دارایی و دەرامەتی راپەڕینەکەی بوژاندەوە، دواتر کوردە یەزیدیەکان بە رابەرایەتی حسین بەگ هاتنە ریزی شۆڕشەکەو هێرشیان بردە سەر شاری (سرت) و هێزێکی (٥)هەزار چەکداری تورکیان تێك و پێك شکاندو شارەکەیان ئازاد کردو عوسمان بەگی قائم قامیان کوشت و پێنج تۆپیان دەست کەوت.

تورکەکان بەم کارانە شلەژان و بڕیاریاندا سوپایەکی گەورە لە بەغداوە بهێنن بۆ ئەم مەبەستە بە سەرکردایەتی (کینغام پاشا) بەڕێ بکەوێ و بچێتە سەر راپەڕیوەکان. بەلأم ئەوانەش شکان تا مانگی شوباتی ساڵی ١٨٥٥ز ژمارەی چەکدارە راپەڕیوەکان گەیشتە(١٠٠)هەزار کەس.

ئەوجا یەزدان شێر بۆ دابین کردنی پشتیوانی دەرەکی (٥) نامەی بۆ سەرۆکایەتی سوپای سەربازی روسەکان لە قاوقاز نارد، بەلأم روسەکان بەهۆی هەرەشەکانی بەریتانیاو بێ متمانەیان بە کوردەکان و وەلأمی هیچ یەکێك لەو نامەو داواکاریانەی کوردیان نەدایەوە، پاشان لە مانگی ئازاردا یەزدان شێر بڕیاریدا بەلەشکرێکی گەورەو بەرفراوان هەڵبکوتێتە سەر ئەرزەرۆم.

ئەمە بەریتانیای خستە مەترسیەکی جدییەوە، بۆیە ویستی دووبەرەکی بخاتە نێوان کوردەکان، ئەوجا هەڕەشە و گوڕەشەی لە یەزدان شێریش کرد، کە بەدەسیەی روسەکان ئەم ئاژاوەی ناوەتەوە. یەزدان شێر کە هەڵوێستی دوژمنکارانەی ئینگلیزی بەم شێوەیە بینی و روسیاش پشتی نەگرت و ئێرانیش بە هۆی پابەند نەبوونی بەبەندەکانی رێکەوتنامەی دووەمی ئەرزەڕۆم بێ پشتو پەنا مایەوە، بۆیە ورەی بەرداو بڕیاریدا خۆی و کەس و کارەکانی لە گوندی(حسراگیل) لە خوارووی گۆمی وان دابنیشێ، ئەوجا کونسولی بەریتانیا لە موسڵەوە دەستی کرد بە نامەناردن بۆ یەزدان شێر، تا قەناعەتی پێکرد کە بۆ گفتوگۆیەك لەگەڵ تورکەکان بچێتە موسڵ.

## سەرچاوەکان

١ – جەلیلی جەلیل، کوردەکانی دەوڵەتی عوسمانی.
٢– دکتۆر عەبدوللا عەلیاوەیی، کوردستان لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانی.
٣– عەلائەدین سەجادی، شۆڕشەکانی کورد و شۆڕشی تەمموز.

# چەند لایەنێکی گرنگیی بەرهەمەکانی وڵاتناسان بۆ دیرۆك و شارستانێتی کوردی لە سەدەکانی ناوەڕاست

✍د.حکیم احمد مام بکر

## پێشەکی

ئـەم باسـە کـە سـەردێڕەکەی (چـەند لایـەنێکی گرنگـی بەرهەمـەکانی وڵاتناسان بۆ دیرۆك و شارسـتانێتی کـورد لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـت)، چـەند تەوەرەیەك لەخۆ دەگرێت:

لـە تـەوەری یەکەمـدا تیـشك خراوەتـە سـەر سـەرەتاکانی سـەرهەڵدانی زانستی وڵاتناسی و پەیوەندی بەدیرۆکەوە لـە ڕووی هاوکـاتی سـەرهەڵدانیان و، هەروەها ئاماژە کـراوە بـەڕۆڵی فارسـەکان لـە سـەرهەڵدان و گەشـەکردنی وڵاتناسـی و نـەبوونی ڕۆڵـی کـورد لـەم بـوارەدا، لەگـەڵ خـستنە ڕووی هۆکارەکانی ئەمە.

هەروەها بەکورتی ئەم بەرهەمانەی وڵاتناسـان خراونەتـە ڕوو کـە هـەر لـە سـەدەی سـێیەمی کۆچـیەوە / نۆیـەمی زاینیـەوە کـە لـەدایکبوونی یەکـەم بەرهەمی بەخۆیەوە بینیەوە کە کتێبی (المسالك والممالك)ی وڵاتناسی فـارس (أبن خرداذبة)یە، دواتر بەرهەمەکانی سەدەی چوارەم و پێنجەم و شەشـەمی کۆچی/ دەیەم و یازدەهەم و دوازدەهەمی زاینی، کە گرنگترینیـان کتێبـەکانی (الأصطخری) و (أبن حوقل) و (المقدسی)ن، تاوەکو نیوەی یەکەمی سـەدەی حەوتـەمی کۆچـی و دوانزەهـەمی زایـنی کـە بەچـڵەپۆپەی بەرهەمـەکانی

ولاتناسی دادەنرێن، بەدەرکەوتنی ئەنسکلۆپیدیای ولاتانی ناسراو بە(معجم البلدان) کە دانراوی (یاقوتی حموی)یە.

تەوەری دووەم تایبەتە بەدیاریکردنی گرنگی بەرهەمەکانی ولاتناسان لە دەستنیشانکردنی پێگەی کوردستان لە حەوت هەرێمە گەردوونییەکە و دیاریکردنی هەرێمەکانی کوردستان و ئەو هەرێمانەی تریش لە دەرەوەی سنووری کوردستان کە کوردیان تێدا نیشتەجێ بووە وەکو هەرێمەکانی فارس و خوراسان و کرمان.

لە تەوەرەی سێیەمیش دا گرنگی ئەم بەرهەمانە دیار کراوە لە باسکردنی چەندەها دیاردەی بیناسازی و شارستانی وەکو قەلا و شورە و قایمکارییەکان و مزگەوتەکان و کلێساکان و پەرستگاکانی ئاگر و بازاڕەکان.

لە دواتەوەرەشدا گرنگی ئەم بەرهەمانە خراوەتە ڕوو، لە لایەنی دەستنیشانکردنی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد و چەند لایەنێکی کۆمەلایەتی و ئایین و ئاینزاکان لە کوردستان و پەیوەندی نێوان پەیڕەوکارانی ئەم ئاین و بیروڕایانە.

## تەوەرەی یەکەم :

### سەرهەڵدانی ولاتناسی

لە کلتوری ئیسلامیدا ناوی کتێبە جوگرافییەکان بە(الکتب البلدانیە) هاتووە و نووسەرەکانیشیان بە(بلدانی) واتە ولاتناس ناسراون. هەرچی خودی زانستەکەیە ئەوا ولاتناسی (علم البلدان)ی پێ دەگوترێت.

دەتوانین بڵێین مێژووی سەرهەڵدانی ئەم زانستە هاوکاتە لەگەڵ سەرهەڵدانی نووسراوە مێژووییەکان بەواتایەکی تر لە هەمان کاتدا نووسراوە مێژووییەکان و نووسراوە جوگرافییەکان پەیدا بوون، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پەیوەندییە پتەوەی کە هەر دوو لا بەیەکەوە گرێ دەدات، ئەگەر زانیمان کە جوگرافیا گۆڕەپانی ڕووداوە مێژووییەکانە و بەڵکو هەر جوگرافیایە کە ئەم ڕووداوانە ئاڕاستە دەکات،بەپێی لێکدانەوەی جوگرافیانە بۆ مێژوو، کە یەکێکە لە تیۆرە فەلسەفیە دیارەکانی لێکدانەوەی مێژوو.

دەربارەی وڵاتناسانی ماوەی مێژوویی ئەم باسەش تێبینی دەکەین کە ژمارەیەکی زۆریان فارس بوون، بەڵکو یەکەم وڵاتناس کە پاشماوە نووسراوەکەی مابێت لە ڕێگەی کورتکراوەی کتنبەکەی، فارسە، کە ئەویش (أبن خرداذبة)یە، خاوەنی کتێبی (المسالك و الممالك) کە دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی سێیەمی کۆچی/سەدەی نۆیەمی زاینی. لەوانەیە هۆکاری ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕیشە مێژوویەی شارستانیەی فارسەکان دایانکوتاوە، دیارە ئەوان بە رلە ئیسلام زلهێزێکی سەردەمی خۆیان بوون و قورسایی سیاسیی و شارستانی خۆیان هەبووە، وە کەم لایەنی مەعریفی هەبووە کە ئەسپی خۆیان تێدا تاونەدابێت.

پاش هاتنی ئیسلامیش دوابەدوای ڕووخانی ئیمپراتۆریەتەکەیان و ئاوا بوونی ئەستێرەکەیان لە ڕووی سیاسییەوە زۆری پێنەچوو هەستانەوە سەر پێ و جارێکی تر و بەپۆشاکێکی تر گەڕانەوە گۆڕەپانی ڕووداوەکان و لە ڕووی شارستانیەوە دیارترین ڕۆڵیان بینی.

ئـــەوە بـــوو بەشـــێوەیەکی گـــشتی ئیجابیانـــە مامەڵـــەیان لەگـــەڵ دەرهاوێـشتەکانی هـزر و شارسـتانێتی نوێیـان کـرد، کـە لـە ئیـسلامدا خـۆی بەرجەستە دەکرد، زۆر بەگورجیش پشکدارییان لە بنیادنانی ئەم قوللە نوێیـە کـرد، کـە دروسـتکردنی تـەنها قـۆرخ نـەکرابوو لەسـەر ڕەگـەزێك جیـا لـە ڕەگەزەکانی تر، بەڵکو دەرگا واڵا بوو بـۆ هـەمووان، دیـار بـوو فارسـەکان لـە پێشەوەی هەمو ئەو ڕەگەزانە بوون کە ئاینی ئیـسلامییان قـەبوڵ کردبـوو لـە دروستکردنی کاریگەری خۆیان بەسەر ئەم شارستانیە نوێیە و بەدیارخـستنی جێپەنجەی خۆیان لە سەرجەم بوارەکان، لەوانەش بواری وڵاتناسی.

هـەر چـی کـورد بـوو، دوای هاتنیـان بـۆ نێـو ئیـسلام و قـەبوڵ کردنـی پرێنـــسیپەکانی و کـــارتێکردنی ئیجابیانـــەیان لەگـــەڵ ئـــەم ئاینـــە و شارستانێتیەکەی ئەوانیش ڕۆڵی خۆیان بینی، بەڵام کەمتر لە ڕۆڵی فارسەکان و بەتێپـەڕبوونی کـات چـەندەها زانـا و ناودارییـان لـەناو ڕسـکا و دەرکـەوت، لەوانەیە هۆکـاری دواکەوتنیـشیان لـە بەخـشش لـەناو شارسـتانێتی ئیـسلامی بگەڕێتەوە بۆ پێـشینە مێژووییەکـەیان کـە قەوارەیـەکی سیاسـیی سـەربەخۆ نەبوون، بەڵکو وڵاتەکەیان لەژێر ڕکێفی فارسەکان و ڕۆمەکان دابەش بوو بوو، لە ڕووی سیاسـیی و شارسـتانیەوەش زیـاتر وەك پاشـکۆ وابـوون و توانـستە داهێنانی ژیارییەکانیان لەدەست دابوو، یاخود بەلایەنی کەمەوە لاواز بوو بوو و هەروەها لە نێو قەوارە داگیرکەرەکاندا توابوویەوە.

شـیاوی باسـە لـەم مـاوە مێژوویـیـەی ئـەم باسـە لێـی دەتوێژێتـەوە هـیچ وڵاتناسـێك یـاخود گەڕیدەیـەکی کـورد نابینـدرێن کـە بایـەخیان بـەجوگرافیا دابێت و نووسراویان لەم بوارەدا هەبێت، یاخود سەرقاڵی گەڕان و سووڕان و

سۆراغ کردن بووبن لە وڵاتان، لەوانەیە هۆکاری ئەوەش وێڕای ئەوەی لە پێشەوە باس کرا بگەڕێتەوە بۆ سروشتی جوگرافی وڵاتەکەیان، کە مۆرکی شاخاوی بەسەریدا زاڵە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا تەگەرەیەکی گەورەی لەبەردەم پەیوەندی بەستن لەگەڵ خەڵکانی تر دروست کردووە، مامەڵەی کۆمەڵایەتی و ئابووری لە نێوان مرۆڤەکان لە چوارچێوەیەکی بەرتەنگدا دەهێڵێتەوە، ئەمەش بێ گومان ڕەنگدانەوەی لەسەر سروشتی مرۆڤەکان و شێوازی بیرکردنەوەیان و خاسیەتە دەروونییەکان دەبێت، کە لە حەز کردن لە تێکەڵاوی و پەیوەندی دروستکردن لەگەڵ خەڵکانی تر دووریان دەخاتەوە. بەپێچەوانەشەوە حەزنەکردن لە گەشتیاری بەمەبەستی ئاشنا بوون لەگەڵ میللەتانی تر و شارەزا بوونی بارودۆخیان و شێوازی ژیانییان.

بێگومان بوونی ئەم جۆرە ئارەزووە فاکتەرێکی هەرە گرنگە بۆ سەرهەڵدانی ولاتناسان و نووسراوی لەم بابەتە، ئەمە لە لایەك و لە لایەکی تریشەوە کورد بەحوکمی بونیادی کەسایەتی و دەروونی کە هەڵقوڵاوی واقیعێکی مێژوویی دێرینە، زیاتر لایەنی سۆزیان بەسەردا زاڵە، ئەمەش وای کردووە هەر دوای قەبوڵکردنی ئیسلام، زۆر بەپەرۆشەوە وەریگرتووە و بایەخدانەکانی تاکی کورد و کۆمەڵگەی کورد زیاتر بەلایەنی ئاینی دابووە لەبەر ئەوە پشکدارییان لە شارستانێتی ئیسلام زیاتر لە بواری زانستە ئاینییەکان بووە، سەرچاوە مێژووییەکان و سەرچاوەکانی تایبەت بە ژیننامەی ناوداران گەواهی ئەوە دەدەن کە ژمارەیەکی زۆر لە زانایانی کورد لە سەدە جیاجیاکاندا لە بوارە ئاینییەکان دەرکەوتوون و خزمەتی بێوێنەیان پێشکەش کردووە.

یەکەم کتێبی وڵاتناسان کە کورتکراوەکەی بەردەست بێت و لە فەوتان ڕزگاری بووبێت، کتێبی (المسالك و الممالك)ی (أبن خرداذبة)یە کە پۆستی نامەناردن و هەواڵنێری پێ سپێردرابوو لە بەشێکی کوردستان. بەپێی بۆچوونی (دی گویە) کە ئەم کتێبەی بڵاوکردۆتەوە، (أبن خرداذبة) لە ساڵی (٢٣٢)ك/ (٨٤٦-٨٤٧)ز، ئەم کتێبەی داناوە کە دواساڵی حوکمی خەلیفەی عەباسی (الواثق)ە و بەردەوام بۆی زیاد کردووە تاوەکو دانەی دووەمی لێ دەرچووە و لە ساڵی (٢٧٢)ك / (٨٨٥-٨٨٦)ز.(١)

لە ڕاستیدا هیچ کتێبێك لە کۆتاییەکانی سەدەی سێیەمی کۆچی بە ڕادەی ئەم کتێبە بەربڵاو نەبووە.(٢) بەڵام بەداخەوە ناتوانین قەوارەی ڕاستەقینەی ئەم کتێبە بزانین بەهۆی ونبوونی دانە ڕەسەنەکەی و مانەوەی کورتەیەکی.(٣) گرنگی ئەم کتێبەش لەوە دایە کە خاوەنەکەی لە نووسینیدا پشتی بەبەڵگەنامە ڕەسمییەکان و تۆمارەکانی دیوانەکان و ئەو زانیاریانەی لە دیوانی خەلافەت دەستی کەوتوون بەستووە. بەحوکمی پایە فەرمی و دیارەکەی لە هەرێمی چیاکان کە بەشێکی کوردستان پێکدەهێنێت، لەبەر ئەوە ئەو زانیارییانەی باسی کردوون بەگشتی وردییان پێوە دیارە، بەتایبەتی ئەوانەی تایبەتن بەماوەی نێوان ناوچەو شارەکان هەروەها کاروباری دارایی.(٤) بەدووریش نازانرێت کە (أبن خرداذبة) سوودی لە کتێبێکی فارسی کۆن دەربارەی ئێران وەرگرتبێت و کتێبەکەی خۆی پێ دەوڵەمەند کردبێت.(٥)

سەرباری ئەوەی وڵاتناسانی سەدەکانی دواتر کەم یان زۆر زانیاریان لە کتێبەکەی (أبن خرداذبة) وەرگرتووە و نەیانتوانیوە خۆیان لە کاریگەری ئەو

ڕزگار بکەن، لە هەمان کاتدا زۆرێك لە ڕۆژهەڵاتناسان ئەم کتێبەیان بەپێزەوە لە نووسینەکانیان هەڵسەنگاندووە.(٦)

هەر چەندە ئەم کتێبە زانیاری گرنگی لە بارەی کوردستان لە ڕووی سرووشتیەوە تێدایە، بەڵام تەنها سێ جار بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئاماژەی بەوشەی کورد (ألأکراد) کردووە.(٧)

هەر لە هەمان سەدەدا چەند وڵاتناسێکی تریش بەرچاو دەکەون، وەکو (البلاذري) لە کتێبی (فتوح البلدان) کە بەدرێژی باسی پرۆسەی فتوحاتی کردووە و لەوانەش فەتحکردنی کوردستان، کە زانیاری پڕ بەهای تێدایە،هەروەهایەعقوبی لە کتێبی (البلدان) شەش جار ناوی کوردی هێناوە و باسی زۆر لایەنی سروشتی و ئابووری کوردستانی کردووە.(٨) هەروەها (أبن رستە) لە کتێبی (الآعلاق النفیسة) دوو جار ناوی کوردی هێناوە.(٩) و (أبن الفقیة الهمذانی) لە کتێبی (مختصر کتاب البلدان) دوو جار ناوی کوردی هێناوە، یەکێکیان لە میانی باسکردنی شاری (سیسەر)ی کوردی و دووەمیشیان لە کاتی ئاماژە کردنی بە(زوم)ە کوردییەکان لە فارس.(١٠)

## وڵاتناسانی سەدەی چوارەمی کۆچی / دەیەمی زاینی

ئەم کتێبە جوگرافیانەی لە ماوەی ئەم سەدەیە دانراون زۆر دەوڵەمەندترن لە کتێبەکانی سەدەی پێشوو،هەروەها زیاتر باسی کوردیان کردووە و ڕواڵەتە سروشتی و مرۆییەکانیش بەشێوەیەکی وردتر و فراوانتر باسیان لێوە کراوە، بەتایبەتیش کتێبی (المسالك والممالك)ی (الآصطخری) و کتێبی (صورة الارض)ی (أبن حوقل) و کتێبی (مروج الذهب)ی (مسعودی) و

گەشتنامەکەی (أبو دلف مسعر بن مهلهل الخزرجی) و کتێبی (أحسن التقاسیم فی معرفه الاقالیم)ی (مقدسی)..

لە بارەی ناوهێنانی کوردیش لەم کتێبانە، تێبینی دەکەین لە کتێبی (الآصطخری) هەژدە جار ناوی کورد هاتووە و(١١) لە کتێبەکەی (أبن حوقل)یش بیست و یەك جار (١٢) و لە کتێبەکانی (مسعودی)یش زیاتر لە بیست جار(١٣) و لە گەشتنامەکەی (أبن مهلهل) سەرەڕای کورتی ناوەڕۆکەکەی پێنج جار و، ناوی پێنج هۆزی کوردیشی هێناوە(١٤)، لە کتێبەکەی (مقدسی)یش هەشت جار(١٥)، سەرباری ئاماژەکردنیان بەبوارە سروشتی و مرۆیی و ئابوورییەکانی ناوچە کوردنشینەکان بەشێوەیەکی بەرچاو.

## ولاتناسانی سەدەکانی دواتر

زۆربەی ئەو ولاتناسانەی لە دوای سەدەی ٤ك / ١٠ ز، سەریانهەڵداوە تا ڕادەیەکی زۆر لاسایی ئەوانەی پێش خۆیان کردۆتەوە و لە نووسینی کتێبەکانیان پشتیان بەزانیارییەکانی ئەوان بەستووە، نابێ ئەوەشمان لە بیر بچێت کە سەدەی چوارەم گەشەسەندنێکی شارستانی فرەلایەنی بەخۆوە بینیوە، هەر چەندە ئەمە مانای ئەوە نییە کە هیچ کام لە ولاتناسان و گەڕیدەکانی سەدەی پێنجەم و شەشەمی کۆچی هیچ زانیاریەکی نوێیان لە کتێبەکانیان تۆمار نەکردووە، بەتایبەتیش (ئیدریسی) کە خاوەنی چەند کتێبێکی جوگرافیە بەناوبانگترینیان (نزهه المشتاق) کە تیایدا شەش جار ناوی کوردی هێناوە(١٦)، هەروەها (ناصر خەسرو) کە هەر چەندە لە

گەشتنامەکەیدا ناوی کوردی نەهێناوە، بەڵام ئاماژەی بەچەند لایەنێکی بیناسازی و ئابووری چەند شارێکی کوردی کردووە، کە گرنگی خۆیان هەیە(١٧)، هەروەها (أبن جبیر) لە گەشتنامەکەیدا باسی چەند لایەنێکی ئابووری و بیناسازی و ڕامیاری چەند شارێکی کوردی لە هەرێمی جەزیرە کردووە و(١٨) تەنها یەك جار ناوی کوردی هێناوە، ئەویش بەشێوەیەکی سلبی بووە(١٩).

لە کۆتایی ناوهێنانی وڵاتناسان و بەرهەمەکانیان، ئاماژە بە(یاقوت الحموی) دەکەین، کە لە ئینسکلۆپیدیا جوگرافیەکەی (معجم البلدان) وڵاتناسی ی گەیاندە چڵەپۆپە و بەڕادەیەك دەوڵەمەندە بەزانیاری نەك تەنها هەر جوگرافیا بەڵکو لە لایەنەکانی تریش بێ وێنەیە، لە بارەی کوردیش، باسی سەدەها شار و دێهاتی کوردستانی کردووە، دەیەها جار ناوی (کورد) لە هەشت بەرگەکەی ئەم ئینسکلۆپیدیایەدا هاتووە.

## تەوەرەی دووەم

## گرنگی بەرهەمەکانی وڵاتناسان لە دەستنیشانکردنی پێگەی کوردستان لە حەوت هەرێمەکە و دیاریکردنی ئەو هەرێمانەی کوردیان تێدا نیشتەجێیە

وەك تێبینی کرا، زۆرێك لە وڵاتناسە موسڵمانەکان لە بەرهەمەکانیان زاراوەی (ئیقلیم)یان بەکارهێناوە و کردوویانەتە ناونیشانی یاخود بەشێکی ناونیشانی کتێبەکانیان، وەکو (کتاب الاقالیم) و (صور الاقالیم) و (احسن التقاسیم فی معرفه الاقالیم). جیاوازیش هەیە لە بیروبۆچوونەکان سەبارەت

بە بنەچەی ئەم وشەیە کە ئایا عەرەبیە یان یۆنانی یاخود فارسی؟ کە ئێرە شوێنی باس کردنیان نییە.(٢٠)

دیارە یۆنانییەکان و فارسەکان زەویان دابەش کردبوو بۆ حەوت هەرێم، بەپێی ئەم دابەشکردنەش کوردستان کەوتۆتە هەرێمی چوارەم، واتە ناوەڕاستی حەوت هەرێمەکە، ئەمەش گرنگیەکی گەورەی هەیە بەهۆی ئەو خاسیەت و تایبەتمەندییانەی ئەم هەرێمە هەیەتی، ئەوەتا (مەسعودی) باسێکی تایبەتی هەیە لەسەر فەزڵ و گرنگی ئەم هەرێمە بەسەر هەرێمەکانی تر، بەناونیشانی (فضل الاقليم الرابع على سائر الاقاليم) کە تیایدا دەڵێ: "هەرێمی چوارەم دەکەوێتە ناوەڕاستی حەوت هەرێمەکە و لە هەمووشیان باشتر و ڕێکترە".(٢١) هەروەها ڕۆژهەڵاتناس (بارتۆڵد) ئەم هەرێمەی بەسەرچاوە و کانیاوێکی شارستانی دەوڵەمەند وەسف کردووە، کە دەڵێ: "ئەم هەرێمە گونجاوترین هەلومەرجی تێدا کۆبۆتەوە بۆ ژیانی ئادەمیزاد و کارەکانی، ئەمەش بەپێی یاسای سروشت دەخوازێت لە زۆربەی بەشەکانی تری سەر زەوی شارستانیتر بێت، بۆیەشە مەڵبەندە شارستانیە ئیسلامیەکانی وەکو بەغدا و ئەسفەهان کەوتوونەتە ناو ئەو هەرێمە".(٢٢)

سەبارەت بەم هەرێمە جوگرافیانەش کە کوردستانیان بەسەردا دابەش کراوە، دەبینین وڵاتناسەکان فاکتەرە سرووشتی و ڕامیارییەکانیان لەبەرچاو گرتووە و کەمتر حسێبیان بۆ فاکتەری ئیتنی کردووە.

ئەو هەرێمانەی کە بەمەڵبەندی سەرەکی نیشتەجێبوونی کورد دادەنرێن، ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان و هەرێمی جزیرە و هەرێمی ئازربایجان و ئەرمینیا و ئاڕانن، کە سنوورەکانیان لە سەرچاوەکانی وڵاتناسان دیاری کراون و جۆرێک

لە تێکچڕژانییان پێوە دیارە، هەروەها ناوی ژمارەیەکی زۆر لە شار و دێهات و مەڵبەندەکانی نیشتەجێبوونی کورد لەم سەرچاوانەدا هاتوون، ئەوەی تێبینیش دەکرێت لەم ناوانەدا هەندێکیان مۆرکی فارسی و عەرەبیان پێوە دیارە، کە دەگەڕێتەوە بۆ باڵادەستی ڕامیاری و شارستانی ئەم نەتەوانە لە سەردەمە مێژووییەکاندا.

لێرەدا نامانەوێت باس لەم هەرێمانە و پێکهاتەکانیان بکەین، بەڵام ئەوەی کە جێی جەخت لەسەر کردنەوەیە، وڵاتناسە موسڵمانەکان ئاماژەیان بەبوونی کورد لە چەند هەرێمێکی تر کردووە، کە لە دەرەوەی سنووری سرووشتی کوردستانن، بۆ نمونە:

**لە هەرێمی فارس:**

کوردەکانی نیشتەجێی ئەم هەرێمە ناوی شوێنەکانی نیشتەجێبوونیان لە لایەن وڵاتناسانەوە بە(زموم) هاتووە(٢٣)، بنەچەی زمانەوانی ئەم وشەیەش هەندێك دەیگەڕێننەوە بۆ عەرەبی(٢٤) هەندێکیش بۆ فارسی(٢٥) هەندێکیشیان بۆ کوردی دەگەڕێننەوە(٢٦).

یەکەم وڵاتناس کە تا ڕادەیەك بەدرێژی باسی ئەم (زوم)انەی کردبێت، (الاصطخری)ە کە هەر یەکەیانی بەشانشینی چوواندووە و ناوی دەسەڵاتدەرەکەشی بەپادشا هێناوە(٢٧).

هەر یەك لەم (زوم)انە لە چەندەها شار و دێهات پێکهاتووە و ئەم سەرۆکە کوردەش کە بەرپرسیارێتی کۆکردنەوەی خەراج و پارێزگاری کردنی ڕێگەکانی هاتوچۆ و بازرگانی وبەهاناهاتنی دەسەڵاتداری گشتی ناوچەکەی لە کاتی تەنگانە لەئەستۆ بووە، بەو سیفەتەی کە جێگری ئەوە لە

(زوم)ەکە(٢٨). ولاّتناسانی دواتریش ئەم زانیاریانەیان کەم یا زۆر دووپات کردۆتەوە(٢٩).

ژمارەی ئەم (زوم)انە (أبن خرداذبة) بەچواری داناون، (الاصطخری و أبن حوقل و مقدسی)یش بەپێنج زوم(٣٠)، کە بریتی بوون لە زومی جیلویە(رەمیجان) و زومی شەهریار(مازنجان) و زومی دیوان و زومی لەوالجان و زومی کاریان(٣١)، لە لایەکی تریشەوە ئاماژە بەژمارەی پیاوانی سوپای هەر زومێك کراوە، کە لە نێوان هەزار تا سێ هەزار کەس بووە و حوکمداری هەر زومێکیش یان بەرێگەی پشتاوپشت بووە یاخود بەهێز زەوت کراوە(٣٢)، هەروەها ناوی هەندێك لە پادشا کوردەکانی ئەم زومانە لە سەرچاوەکاندا هاتووە(٣٣).

سەرەڕای بوونی ئەم زومانە لە هەرێمی فارس سەرچاوەکانی ولاّتناسان باس لە چەندەها ئاوایی کوردی دەکەن لەم هەرێمەدا، کە ژمارەیان زیاتر لە (١٠٠) ئاوایی بووە، تێکڕای ماڵەکانیان (٥٠٠,٠٠٠) ماڵ بووە، هەر ئاواییەکیش خاوەنی (١٠٠٠) سوارچاك بووە(٣٤)، واتە کۆی سوارچاکانی ئاواییەکان زیاتر لە (١٠٠,٠٠٠) بووە.

ئەگەر شیمانەی ئەوە بکەین کە ژمارەی ئەندامانی هەر ماڵێك لەم ماڵانە (٥) کەس بووبێت ، کە ئەم ژمارەیە کەمیشە، زۆر نییە بۆ کۆمەڵگەیەکی ئەو سەردەمە، ئەوا کۆی دانیشتوانی کوردەکانی ئەم ئاواییانە گەیشتۆتە (٢,٥٠٠,٠٠٠) کەس، ئەمەش قورساییەکی مرۆیی گەورەیە بۆ سەردەمی خۆی، هەر چەندە لەوانەیە ئەم ژمارانەی سەرەوە جۆرێك لە زیادەڕۆیی تێدابێت، بەلاّم هەر چۆنێك بێ، پێدەچێت کوردەکانی ئەم زوم و ئاواییانە کە لە بارێکی

ئابووری باش دابووبن و (٣٥)، هێزێکی ناوچەیی وایان پێکهێنابێت کە شایانی حسێب بۆ کردن بووبێت، لە بوارەکانی کارگێڕی و سەربازی و ئابووری و ئاسایشەوە.

### کورد لە هەرێمی خوراساندا

هەندێك لە وڵاتناسانی سەدەی (٤)ی ك / (١٠)ی ز، ئاماژەیان بەبوونی چەندەها شار و گوند و دەشت کردووە، کە کوردیان تێدا نیشتەجێ بووە، وەك شاری أشترگ و ئندخد و قریە ألاکراد (٣٦).

### کورد لە هەرێمی کرمان

کرمان ئوستانێکی بەناوبانگ و ئاوەدان بووە، چەندەها ئاوایی و شار و دێهاتی لەخۆ گرتبوو، کەوتۆتە نێوان فارس و مکران و سیستان و خوراسان(٣٧)، (أبن حوقل) جیا لە وڵاتناسانی تر، ئاماژەی بەبوونی کورد لەم هەرێمە کردووە، لە دەوروبەری شاخەکانی (قفص) کە لە حەوت وەچە پێکهاتبوون و هەر یەکەیان سەرۆکێکی هەبوو کە سەرپەرشتی هەر ئاواییەکی دەکرد و بەپێی گوتەی خەڵکی ناوچەکە ژمارەی هەر یەکەیان (١٠,٠٠٠) کەس دەبوو، کە یەکگر و دەستڕۆیشتوو بوون لە ناوچەکە و ملکەچی دەسەڵاتی مەرکەزی نەبوون و مەترسیان هەبوو بۆسەر ڕێگاوبانەکان، تاوەکو سەرەنجام بەزەبری هێز ملکەچ کران و گێڕدرانەوە بۆ ژێر سایەی دەسەڵات(٣٨).

## تەوەرەی سێیەم

## گرنگی بەرهەمەکانی وڵاتناسان لە دەستنیشانکردنی دیاردەی بیناسازی و شارستانییە کوردیەکان

دیارە دیاردەبیناسازییەکان، سەربازی بن یان مەدەنی، یەکێکن لەم لایەنانەی کە جێی سەرنج و بایەخپێدانی ولاتناسان و گەڕیدەکان بوون، بەحوکمی زەقی و بەرچاوییان لە لایەك و پێویستی سەردەمی کۆمەڵگەش لە لایەکی تر، لە دیارترین ئەم دیاردانەش:

**أ: قەڵا و شوورەکان:**

بەهۆی گرنگیان بۆ شار و ئاواییە کوردییەکان لە پێناو خۆڕاگرتنی و مانەوەیان وەستان بەرامبەر هەر هێرشێك و مەترسییەك، کوردەکان بەشێوەیەکی بەرچاو گرنگییان بەدروستکردنی قەلا و شوورەکان داوە، تەنانەت ناونیشانی کتێبی ونبووی مەدائینی (القلاع و الاکراد)(٣٩)، خۆی لەخۆیدا بەڵگەی ئەو پەیوەندییە بەهێزەیە کە کورد بەقەلا دەبەستێتەوە و هەستکردنیانە بەو هەڕەشە و مەترسیانەی کە هەمیشە لە سەریان بووە و سووربوونیانە لەسەر بەرگری لەخۆ کردن و مانەوەیان.

شایەنی باسە وڵاتناسەکان ئاماژەیان بەدەیەها قەڵای کوردی کردووە، لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان و شانبەشانی ناوهێنانی ئەو هۆزە کوردانەی کە خاوەنی ئەم قەڵایانەن، بەتایبەتی یاقوت لە ئینسکلۆپیدیا تایبەتەکەی بەوڵاتان لە وڵاتان لە زۆربەی بەرگەکانی کتێبەکەی ناویان هێناوە(٤٠). وێڕای وەسفکردنی هەندێك لەو قەڵایانە و ئەو مادادانەی کە قەلا و شوورە

قایمەکانیان لێ درووست کراوە(٤١)، شایانی باسە هەندێك لەو شوورانە زۆر بەوردی و ڕێکی وێنا کراوە، ئاماژەی بەبەرزی و ئەستووری و جۆری ئەو بەردانەی لێی دروست کراوە دراوە(٤٢).

ب: مزگەوت و بازاڕەکان:

مزگەوت و بازاڕەکان دوو مەرجی سەرەکی شارن، کە هەمیشە لە نزیك یەکەوە بوون، بەزۆریش مزگەوت لە ناوەندی بازاڕ درووست کراوە، ولآتناسان ئاماژەیان بەچەندەها مزگەوت و بازاڕ لە شارە کوردییەکان کردووە(٤٣)، وەسفی هەندێك لە مزگەوت و بازاڕەکانیان کردووە، لە ڕووی گەورەیی و فراوانی ئەو ماددانەی لێیان درووست کراون، چۆنیەتی گەیاندنی ئاو بۆ مزگەوتەکان و، چۆنیەتی بەکارهێنانی بۆ دەستنوێژ و شوێنی دەستنوێژ شووتن، کە تیایاندا بایەخ دان بەپاك و خاوێنی دەردەکەوێت(٤٤).

ج: لایـــــــــەنی تر:

ولآتناسان و گەشتیارە موسڵمانەکان ئاوڕیان لە چەندەها لایەنی بیناسازی تر داوەتەوە، وەکو کۆشك و تەلارەکان و گەرماوەکان و خانەکان و پردەکان، وەکو گەرماوەکانی موسڵ و(٤٥)، خان و گەرماوەکانی میافارقین(٤٦) و خانەکانی ماردین(٤٧)، گەرماوە بەناوبانگ و تەلارە پتەوەکانی نوصیبین و گەرماوە باشەکانی شەنگال(٤٨).

بێگومان ئەو ئاماژە زۆرانەی ولآتناسان بەو لایەنە بیناسازی و مەدەنییانە بەڵگەی ئاستی گەشەسەندووی کۆمەڵگەی شارنشینی کوردین، لە سەدەکانی ناوەڕاست و دەیسەلمێنن کە کورد تەنها دەوارنشین نەبووینە.

## تەوەری چوارەم

## گرنگی بەرهەمەکانی ڕۆژهەڵاتناسان لە دەستنیشانکردنی ڕەچەڵەکی کورد و لایەنە کۆمەڵایەتییەکان

زۆر جار باس دەکرێت کە (مەسعودی) بنەچەی کورد بۆ جنۆکە دەگێڕێتەوە، دیارە (مەسعودی)یش کە لە سەدەی چوارەمی کۆچی و دەیەمی زایىنی ژیاوە و بەیەکێك لە وڵاتناسان و گەڕیدەکان دەژمێردرێت، وێڕای مێژوونووسی.

جێی باسە عەرەبەکان هەر لە کۆنەوە بایەخێکی زۆریان بەڕەگ و ڕەچەڵەك داوە و لەم بوارەدا هاوێنەیان نەبووە، جا لەبەرئەوەی کوردستان لە ولاتە بەراییەکانی فەتح کردن بووە و عەرەبە موسڵمانەکان خۆیان لەبەردەم ڕەگەزێکی تردا بینیوەتەوە، هەوڵیان داوە کە بیانناسن و پردێك لە ئاشنابوون و لە یەکتری شارەزابوون درووست بکەن، دوای ئەوەی وڵاتە فەتح کراوەکان بوون بەشێك لە دەوڵەتی خەلافەت.

لە ڕاستیدا مەسعودی ئەو ڕاوبۆچوونانەی خستۆتە ڕوو کە دەربارەی بنەچەی کورد گوتراون و جەخت لەسەر ئەوەش دەکاتەوە کە ناکۆکی لەم بارەیەوە لە ئارا دایە، لە سەرەتای خستنە ڕووی هەر ڕایەکیش بە"هەندێك وای بۆ دەچن" دەست پێ دەکات(٤٩)، واتە ئەوانە ڕای تایبەتی خۆی نیین، ڕاوبۆچوونەکانیش بەکورتی ئەمانەن:

١ـ هەندێك پێیان وایە بنەچەی کورد دەگەڕێتەوە بۆ (ربیعە کوڕی نزاری کوڕی معد کوڕی عدنان کوڕی وائیل) کە لە بارودۆخێکی نادیار و پێویستدا ڕوویان کردۆتە کێو و هەردەکان و بەهۆی دروستبوونی دراوسێتی لەگەڵ

نەتەوە غەیرە عەرەبەکان لە عەجەم و فارس، زمانی خۆیان لەبیر کردووە و زمانیان بۆتە بیانی(٥٠).

٢- هەندێك وای بۆ دەچن کە بنەچەی کورد دەگەڕێتەوە بۆ (موزەڕی کوڕی نزار) و ئەوان ڕۆڵەی کوردی کوڕی مەردی کوڕی سەعسەعەی کوڕی هەوازنن، بەڵام بەهۆی ململانێ و ناکۆکیان لەگەڵ هۆزی غەسان دوور کەوتوونەتەوە.

٣- هەندێك وای دەبینن کە بنەچەی کورد دەگەڕێتەوە بۆ ڕەبیعە و موزەڕی عەرەبی و بۆ دەستەبەرکردنی ئاو و لەوەڕگا ڕوویان لە شاخ کردووە و بەتێپەڕبوونی کات، زمانی عەرەبیان لەبیر چۆتەوە و زمانەکانی نەتەوە دراوسێکانیان وەرگرتووە.

وا دیارە ئەم سێ بۆچوونە ڕەچەڵەکی کورد بۆ ڕیشەی عەرەبی دەگێڕنەوە بەبێ ئەوەی بەبەڵگە پشت ئەستوور بن، بەمەش لە سۆزەوە نزیکن و دوورن لە عەقڵ و لۆژیك، چونکە مێژوو و هۆکاری ئەم کۆچانە دیار نەکراوە و، زیاتر مەبەست ئەوە بووە کە کورد لە ڕەسەنایەتی دابڕنێ و بنەچەیەکی عەرەبی بۆ دابتاشرێ، تەنهاش لەبەر ئەوەی کە کورد نەتەوەیەکە نە عەرەبە و نە فارسە.

جێی باسە مەسعودی بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەم بۆچوونە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هۆزێکی کوردی وەك شوهجان کە لە دینەوەر و هەمەدان نیشتەجێ بوون، هیچ گومانێکیان لەوە نییە کە ڕۆڵەی ڕەبیعەی کوڕی نزاری کوڕی مەعەدن، هەروەها لە شوێنێکی تر ئاماژە بەووتەی چەند پیاوماقوڵ و شارەزایەکی کوردی سەردەمی خۆی دەکات، کە پێیان ڕاگەیاندووە ڕۆڵەی کوردی کوڕی مەردی کوڕی سەعسەعەن(٥١). لە ڕاستیشدا هیچ بەڵگەی

عەقڵی بۆ ڕاستی ئەم بۆچوونانە نییە(٥٢)، بەڵکو تەنها هەوڵدانێکی عەقڵیەتی عەرەبیە بۆ لکاندنی نەتەوەیەکی خاوەن تایبەتمەندی بەخۆیەوە و ئەوەی کە ئەم هەوڵەشی تێپەڕاندووە ئەم بارودۆخە بووە کە کوردی تێدا ژیاوە، کە زیاتر بوونێکی پاشکۆیی و ملکەچی هەبووە لە لایەك و لە لایەکی تریش بەهۆی زاڵبوونی لایەنی دەروونی و سۆز بەسەر لۆژیکدا، لای کورد ئاسایی بووە کە ڕازی بێت بەقبوڵکردنی ڕەچەڵەکێکی عەرەبی، بەحوکمی ئەوەی خودی پێغەمبەر(د.خ) عەرەب بووە و گەیەنەرانی بەرایی پەیامی ئیسلامیش عەرەب بوون، بۆیە ئەم ڕەچەڵەکەیان بەشەڕەف و گەورەیی زانیوە، زیاد لەوەش زۆر بەشانازیەوە تەئکیدی ئەم ڕەچەڵەکە هەڵبەستراوەیان کردۆتەوە و خۆیان پێ هەڵکیشاوە بێ ئەوەی هەست بکەن بەوەی پرسەکە زۆر لەوە گەورە ترە. نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێت کە بەحوکمی هۆکاری ئاینی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشدا کەسانێك هەن لەناو کورد و غەیری کورد کە بەرگری لەم بۆچوونە دەکەن، هەروەها ئەمەش زۆر جار بۆتە هۆی ئەوەی دەسەڵاتدارانی عەرەب وەك هەلێك بۆ ستەم کردن لە نەتەوەی کورد بیقۆزنەوە، زیاد لەوەش دەشێین بێژین هەندێ لە دەسەڵاتدار و قەلەم بەدەستانی کورد لە ماوە مێژووییە جیاجیاکاندا بیرۆکەی ئەم بۆچوونەیان قبووڵ کردۆتەوە، بەبانگەشەکردنی ڕەچەڵەکی عەرەبی بۆ خۆیان و نەتەوەکەیان، وەکو (المعز اسماعیل بن سیف الاسلام بن تغطکین بن ایوب) پادشای ئەیوبی لە یەمەن، بانگەشەی قورەیشی بوون و ئومەوی بوونی بۆ خۆی دەکرد، هەروەها (ابو الفدا)ی شای حەما و شەڕەفخانی بەدلیسی(٥٣).

٤ـ هەڵبەستنی گێڕانەوەیەکی ئەفسوناوی سەردەمی سلێمان پێغەمبەر، کە گوایە کورد بەرهەمی جووتبوونی شەیتانە لەگەڵ کەنیزەکە دووڕووە دەرکراوەکانی حەزرەتی سلێمان، کاتێ حەزرەتی سلێمان فەرمانی دوورخستنەوەیانی داوە بۆ کێو و هەردەکان (اكردوهن الى الجبال)!، بەلام ئایا پێغەمبەر سلێمان عەرەب بووە تاوەکو ئەم گوتەیە بەکاربێنێت؟، بێگومان ئەو بۆچوونەش لەبەردەم هیچ هەڵسەنگاندنێکی زانستی خۆی ناگرێت و، جگە لە ئەفسانەیەکی هەڵبەستراو هیچی تر نییە(٥٤).

٥ـ هەندێك وای بۆ دەچن کە کورد نەوەی (کاوە)ن، کە لە ستەمی زوحاکی خوێنرێژ ڕزگار بوون، ئەمەش هەروەها ئەفسانەیەکی کۆنی فارسەکانە و لای هەمووان ناسراوە(٥٥).

٦ـ بۆچوونێکی فارسی تر، بنەچەی کورد دەگەڕێنێتەوە بۆ کوردی کوڕی ئەسفەندیاری کوڕی مەنوشەهر، ئەمەش هەڵبەستانی پەیوەندییەکی (ناویی)یە لە نێوان (کورد) وەك نەتەوە و (کورد) وەك ناوی کەسایەتییەکی فارس، کە هاوشێوەی بۆچوونە عەرەبییەکەی پێشووە کە کورد دەگەڕێنێتەوە بۆ کەسایەتییەکی عەرەبی بەناوی (کوردی کوڕی مەرد).

هەردەم ئەم ڕاوبۆچوونە نادروستانە لە نێوان خەڵك بڵاو بوون و تاوەکو سەدەی هەشتەمی کۆچی /چواردەی زایینی کە تیایدا وڵاتناسی ناودار (أبن فضل اللە العمری) دەرکەوت و کۆتایی بەم مشتومڕە هێنا و لە بارەی بنەچەی کورد دەڵێت: "الأكراد جنس خاص(٥٦)".

جێی ئاماژەیە کە وڵاتناسانی تری وەك (الاسطخري و أبن حوقل و البكری) کەم یان زۆر بۆچوونەکانی سەرەوەیان دووپات کردۆتەوە(٥٧).

**ئاین و بیروباوەڕە ئاینییەکان**

ولاّتناسان بەڕێژەی جیاجیا لە بەرهەمەکانیان باسیان لە چەندەها لایەنی تایبەت بەئاین و ئاینزا و بیروباوەڕەکان کردووە، هەروەها ناوی ژمارەیەك لە شوێنەکانی پەرەستنیان هێناوە و وەسفیان کردوون، وەکو مزگەوتەکان و خانەقاکان و کڵێساکان و ئاتەشگاکان، هەروەها ئاماژەیان بەچەند مەزارگەیەکی پیاوچاکان کردووە، کە لە چەند ناوچەیەکی کوردیدا هەبوون و هاموشۆیان کراوە(٥٨).

لە بارەی ئاتەشگاکان، پێدەچێت تاکو سەردەمی عەباسییش لێرە و لەوێی ناوچە کوردییەکان هەبووبن و، خەڵکانێك ڕوویان تێکردبن، کە بەردەوام بووینە لەسەر ئاینی زەردەشتییان. بەپێی یاسا و شەرعی ئیسلامیش خاوەن ئاینەکانی تر مافیان هەیە لەسەر ئاینی خۆیان بمیننەوە بەمەرجێك جزیە بەدەوڵەتی خەلافەت بدەن. نمونەی ئەو ئاتەشگایانەش کە ولاّتناسان ئاماژەیان پێ کردوون، ئاتەشگای جەمشید لە هەمەدان(٥٩)، ئاتەشگای شیز و چەندانی تر لە حەلوان و ئەلیشتەر و هەولێر(٦٠)، هەروەها چەند بیروباوەڕێکی ئاینی تریش لە چەند ناوچەیەکی کوردی هەبوون، وەکو خورەمی کە درێژە پێدەری ئاینی مەزدەکی پێش ئیسلام بووە و، چەندەها بنکەیان لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان هەبووە، وەکو هەمەدان و دینەوەر(٦١) و، چەند شاخێك لە ناوچەکە بەشاخی خورەمی یاخود خورەمدینی ناسرابوون(٦٢)، هەروەها (اصطخري) دەڵێ: هەر چەندە مزگەوت لە گوندەکانیان هەبووە و قورئانیان تێدا خوێندراوە، کەچی لە ڕاستیدا تەنها

باوەڕیان بەئیباحییەت هەبووە(٦٤).

سەبارەت بەئاینی مەسیحیش ئەوا ژمارەیەکی بەرچاوی دانیشتوانی کوردستان لەسەر ئەم ئاینە ماونەتەوە و وڵاتناسەکان ئاماژەیان بەدەیەها کڵێسە و دێر کردووە، کە مەسیحیەکان پەرستشی ئاینی خۆیانیان تێدا ئەنجام داوە، بۆیە هەست دەکرێت گیانی لێبووردەیی و یەکتری قەبوڵکردن لە نێوان هەڵگرانی ئاین و مەزهەبە جیاوازەکاندا بەرقەرار بووە، تەنانەت هەندێك جار وا بووە کە مزگەوت و کڵێسا لە نزیك یەکەوە بووینە(٦٥) و یاقوتی حەمەوی باسی ژمارەیەکی زۆری ئەم کڵێسایانەی لە کوردستان کردووە(٦٦)

## دەرئەنجامەکان

١- سەرچاوە وولات ناسەکان بەدەولەمەنترین سەرچاوەکان دادەنرێن بۆ دیرۆکو شارستانی کورد و تەواو کەری سەرچاوە مێژوویەکانن بەلکو گرینگیان لەرووی ژیاریەوە لەوان زیاترە

٢- بایەخ دانی وولات ناسان و گەریدەکان بەکوردستان لەمیانەی بایەخدانیان بەتێکرای وولاتانی ئیسلامی دا هاتووە.

٣- ئەم زانیاریانەی سەرچاوەکانی سەدەکانی سێیەم وچوارەمی کۆچی – نۆیەم ودەیەمی زاینی دا دەربارەی کورد هاتوون لەسەرچاوەکانی سەدەکانی دوواتر دووپات کراونە تەوە .

٤- بایەخ دانی وولات ناسانی سەدەی سێیەمی کۆچی نۆیەمی زاینی زیاتر بەلایەنەسروشتیەکان بووە کەچی وولات ناسانی سەدەی چوارەمی کۆچی بەشێوەیەکی زیاتر بایەخیان بەچالاکیە ئابووریەکان و لایەنە کۆمەلایەتیەکان داوە .

٥- مسعودی یەکەم وولات ناسو مێژوو نوسە کەبەدرێژی راو بۆ چونە جیاوازەکانی لەبارەی رەچەلەکی کورد خستۆتە روو بێ ئەوەی خۆی لێیان بکات بەخاوەن.

٦- کورد بوونێکی بەرچاوی لە چەند هەرێمێکی دەرەوەی سنووری سرووشتی خۆی هەبووە بەتایبەتیش لەهەرێمی فارس.

٧- کورد تارادەیەکی باش لەشارەکان خاوەنی چەندەها دامەزراوی مەدەنی ( شارستانی) بووە واتا کوردەکان لەسەدەکانی ناوەراست تەنها رەوەند نەبوون .

## پەراوێز و سەرچاوەکان

١ـ كراتشكوفسكى، تاريخ الادب الجغرافى، ق١، ص١٥٦. مينورسكى، الجغرافيون والرحاله المسلمون، ص٨. لسترنج، بلدان الخلافه الشرقيه، ص٢٦.

٢ـ ابراهيم شوكت، الجغرافيه العربيه حتى نهايه القرن العاشر الميلادى، ص٨٢.

3- hudud alalam, p.13

٤ـ المقدسى، احسن التقاسم، ص٢١.

٥ـ جمال الفندى، الجغرافيه عند المسلمين، ص١١٨.

٦ـ بۆ نمونە بڕوانە: مينورسكى، مرجع سابق، ص٨. كراتشكوفسكى، مرجع سابق، ص١٥٨. دائره المعارف الاسلاميه، ماده جغرافيه، ج١٢، ص١١٨.

٧ـ المسالك والممالك، ص٢٧، ص٥١.

٨ـ كتاب البلدان، ص١٠، ص٣٩، ص٤٠، ص٤٤.

٩ـ الاعلاق النفيسه، ص٦٣، ص٨٣.

١٠ـ مختصر كتاب البلدان، ص٢٢٠.

١١ـ المسالك والممالك، ص:٦١-٦٨-٧١-٧٢-٧٨-١٠٧-١١٨-١٥٣-١٥٥-١٥٨.

١٢ـ صوره الارض، ص:١٩٥-٢٤٠-٢٦٩-٢٨٣-٢٨٩-٢٩١-٣٠٧-٣١٤-٣١٥-٣٧٠-٣٧٧.

١٣ـ مروج الذهب، ج٢، ص١٣٣-١٣٥. التنبيه والاشراف، ص٧٨-٧٩.

١٤ـ الرساله الثانية، ص: ١٤-١٨-١٩-٢٥.

١٥ـ

١٦ـ نزهه المشتاق، ص:٢١٩-٢٢٣.

١٧ـ سفرنامه، ص٦٩.

١٨ـ رحله ابن جبير، ص٢١٤-٢١٨.

١٩ـ المصدر نفسه، ص١١٥.

٢٠ـ بڕوانە معجم البلدان، ج١، ص٣١. كراتشكوفسكى، مرجع سابق، ص١٢٦.

٢١ـ التنبيه والاشراف، ص٤٨.

٢٢ـ تاريخ الحضارة الاسلاميه، ص٥٠.

٢٣ـ ابن خرداذبة، مصدر سابق، ص٥١. ابن الفقيه الهمدانى، مصدر سابق، ص٢٣٦-٢٣٩. المقدسى، مصدر سابق، ص ٣٢٥،٣٢٩.

٢٤ـ جرجى زيدان، تاريخ التمدن الاسلامى، ج٤، ص٧٨.

٢٥ـ مينورسكى، مرجع سابق، ص١٧.

٢٦ـ ارشاك بولاديان، الاكراد حسب المصادر العربيه، ص٩٢.

٢٧ـ الاصطخري، المصدر السابق، ص٨٧.

٢٨ـ م.ن.ص.

٢٩ـ ابن حوقل، مصدر سابق، ص٢٣٩. ياقوت الحموى، مصدر سابق، ص٤٢٣.

٣٠ـ بڕوانە: المسالك والممالك، ص٥١. صوره الارض، ص٢٣٦. احسن التقاسيم، ص٣٣٩.

٣١ـ هەمان سەرچاوەکانی پێشوو.

٣٢ـ الاصطخري، مصدر سابق، ص٧٨.

٣٣ـ المصدر نفسه، ص٨٧-٨٨.

٣٤ـ المصدر نفسه، ص٧٢.

٣٥ـ م.ن.ص.

٣٦ـ م.ن.، ص١٥٣. ابن حوقل، مصدر سابق، ص٣٧٧.

٣٧ـ ياقوت الحموى، مصدر سابق، ج٧، ص١٣٢.

٣٨ـ مصدر سابق، ص٢٧٠.

٣٩ـ ابن النديم، الفهرست، ص.

٤٠ـ بۆ نمونە بڕوانە: ياقوت الحموى، مصدر سابق، ج٢، ص٢٥٣-٢٥٦-٢٩٧. ج٣، ص٦٩-٢٦١. ج٤، ص٢٨٨. ج٨، ص٤٢٢-٤٧٦-٤٨٦.

٤١ـ بڕوانە: ناصر خەسرو، مصدر سابق، ص٨-٩. ابن مهلهل، مصدر سابق، ص١٩.

٤٢- م.ن.ص.

٤٣- الاصطخری، مصدر سابق، ص١١٨. ابن حوقل، مصدر سابق، ص٣١٢. المقدسی، مصدر سابق، ص٣٠٠-٣٠١.

٤٤- م.ن.ص.

٤٥- المقدسی مصدر سابق، ص١٢٢.

٤٦- ناصر خەسرو، مصدر سابق، ص٩.

٤٧- یاقوت الحموی، مصدر سابق، ج٧، ص١٩٤.

٤٨- ابن حوقل، مصدر سابق، ص٢٠٢.

٤٩- مروج الذهب، ج٢، ص٢٤٩-٢٥٠.

٥٠- م.ن.ص.

٥١- التنبیه والاشراف، ص٤٧.

٥٢- مصطفی جواد، جاوان القبیله الکردیه المنسیه، ص٨.

٥٣- بڕوانە: ابو الفدا، المختصر فی اخبار البشر، ج١، ص١٣٢. ج٢، ص١٩٢. شرفخان البدلیسی، الشرفنامه، ص٤٧-٥٠.

٥٤- مروج الذهب، ص٢٥٠.

٥٥- م.ن.ص.

٥٦- مسالك الابصار فی ممالك الامصار، ج٤، ص١٢١.

٥٧- المسالك والممالك، ص٧٢. صوره الارض، ص٣٤٠. المسالك والممالك، ص٣٤٣-٣٤٤.

٥٨- الهروی، الاشارات الی معرفه الزیارات، ص٦٥. یاقوت، مصدر سابق، ج٧، ص١٩٤.

٥٩- ابن الفقیه، مصدر سابق، ص٢٢٦.

٦٠- ابن خرداذبة، مصدر سابق، ص١٠٦.

٦١- یاقوت الحموی، مصدر سابق، ج١، ص٤١١.

٦٢- الیعقوبی، مصدر سابق.

٦٣- الاصطخری، مصدر سابق، ص١٢٠. المقدسی، مصدر سابق، ص٣٠٦

٦٤- الاصطخري، مصدر سابق، ص١٢٠.

٦٥- المقدسي، مصدر سابق، ص٨٩.

## سەرچاوەكان :

الآدريسي : ا بو اسماعيل محمد ين محمد ادريس ( ت ٥٦٠هـ / ١٢٣٧م )

١. انس المهج وروضة الفرج ، تحقيق فؤاد سزكين ،( فرنكفورت: ١٩٨٧)

٢. نزهة المشتاق في اختراق الافاق ، ( طبعة ليدن : ١٩٧٠م )

٣. نزهة المشتاقفي اختراق الافاق ( قسم الجزيرة و العراق ) ، تحقيق ابراهيم شوكة ، مطبعة الحكومة ( بغداد : ١٩٦٣م )

الاصطخري : ابو اسحاق ابراهيم بن محمد الفارسي ( ت ٣٤٦هـ / ٩٥٧م )

٤. المسالك والممالك ، تحقيق محمد جابر عبدالعال الحسيني ، مراجعة محمد شفيق غربال ، دار المعلم ( القاهرة : ١٩٦١م )

البكري : ابو عبيد عبدالله بن عبدالعزيز الآندلسي ( ت ٢٨٧هـ / ١٠٩٥م )

٥. المسالك والممالك ، (مراكش : د. ت )

البلاذري : احمد بن يحيى بن جابر ( ت ٢٧٩هـ / ٨٩٢م )

٦. فتوح البلدان ، دار ومكتبة الهلال ، ط١ ، ( بيروت : ١٩٨٣م )

البلخي : ابو زيد احمد بن سهل ( ت ٣٢٢هـ / ٩٣٢م )

٧. صور الاقاليم ، مخطوطة في مكتبة الدراسات العليا ، كلية الاداب ، جامعة بغداد .

ابن حوقل : ابو القاسم محمد بن علي النصيبي ( ت ٣٦٧هـ / ٩٧٧م )

٨. صورة الارض ، دار مكتبة الحياة ، ( بيروت : ١٩٧٩ )

ابن خرداذبة : ابو القاسم عبيدالله بن عبدالله ( ت ٣٠٠هـ / ٩١٢م )

٩. المسالك والممالك ، وضع مقدمته وهوامشه وفهارسه : محمد مخزوم ، دار إحياء التراث العربي ، ط١ ( بيروت : ١٩٨٨ )

ابن رسته : احمد بن عمر ( ت بعد ٣١٠هـ / ٩١٢م )

١٠. الاعلاق النفيسة ، دار احياء التراث العربي ، ط١ ، ( بيروت ١٩٨٨)

ابن فضل الله العربي : شهاب الدين احمد بن يحيى ( ت ٧٤٩هـ / ١٣٤٨م )

١١. مسالك الابصار في ممالك الامصار ، مخطوط مصور عن نسخة مكتبة احمد الثالث ، طبق بوسراى اسطانبول ، اصدار فؤاد سزكين ، المجمع العلمي العراقي ، رقم ٣٠٠ / ٢٩٠ جـ .

ابو الفدا : عماد الدين اسماعيل بن نورالدين ( ت ٧٣٢هـ / ١٣٣١م )

١٢. المختصر في اخبار البشر ، علق عليه ووضع حواشيه محمود ايوب ، دار الكتب العلمية ، ط١ ، ( بيروت : ١٩٩٧م )

ابن الفقيه الهمذاني : ابوبكر احمد بن محمد ( ت ٣٥٦هـ / ٩٧٥م )

١٣. مختصر كتاب البلدان ، دار احياء التراث العربي ، ط١ ( بيروت : ١٩٨٨م )

مسعر بن مهلهل : ابو دلف الخزرجي ( ت ٣٨٤هـ / ٩٩٤م )

١٤. الرسالة الثانية ، عني بنشرها وترجمتها وتعليقها : بطرس بولغاكوف وانس خالدوف ، دار النشر للاداب الشرقية ، موسكو : ١٩٦٠م )

ابن الندع : محمد بن اسحاق ( ٣٨٣هـ / ٩٩٣م )

١٥. الفهرست ، ( بيروت : د/ ت )

ياقوت : شهاب الدين ياقوت بن عبدالله الحموي ( ت ٦٢٦هـ / ١٢٢٩م )

١٦. معجم البلدان ، دار احياء التراث العربي ، ط١ ( بيروت ١٩٩٧م )

اليعقوبي : احمد بن ابي يعقوب اسحاق بن واضح ( ت ٢٩٢هـ / ٨٩٥م )

١٧. كتاب البلدان ، دار احياء التراث العربي ، ط١ ، ( بيروت : ١٩٨٨م )

ژێدەرەکان :

بارتولد ، ف

١٨. تاريخ الحضارة الإسلامية ، ترجمة عن التركية : حمزة طاهر ، مطبعة المعارف ، ط٥ ، ( القاهرة : ١٩٨٣م )

بولاديان ، ارشاك

١٩. الاكراد حسب المصادر العربية ، نقله الى العربية : خشادور قصباديان و عبدالكريم ابا زيد ، ( يريڤان : د / ت )

شوكة ، ابراهيم

٢٠. الجغرافية العربية حتى نهاية القرن العاشر الميلادى ، ترجمة صالح حسن الهيتي وخلدون داؤد صبري القيسي ، ( بغداد : ١٩٩٠م )

زيدان ، جرجي

٢١. تاريخ التمدن الإسلامي ، دار مكتبة الحياة ، ( بيروت : د / ت )

الفندي ، جمال

٢٢. الجغرافيا عند المسلمين ، ( بيروت : ١٩٨٢م )

كراتشكوفيسكي ، اغناطيوس

٢٣. تاريخ الادب الجغرافي العربي ، ترجمة صلاح الدين عثمان هاشم ، ( القاهرة : ١٩٥٧م )

لسترنج ، جي

٢٤. بلدان الخلافة الشرقية ، نقله الى العربية : بشير فرنسيس و كوركيس عواد ، مطبعة الرابطة ، ( بغداد : ١٩٥٤م )

مينورسكي ، ف

٢٥. الجغرافيون والرحالة المسلمون ، ( الكويت : ١٩٨٥م )

چەردەیەکی خێرا لە بارەی :

# مێژووی قوبرس

## لەسەردەمەکانی پێش مێژووەوە تاکو داگیرکاری سەربازیی تورکی١٩٧٤

م . کامران محەمەد حاجی

**دەروازە**

قوبرس یەکێکە لە دوورگەکانی دەریای ناوەراست و دەکەوێتە لای باکووری رۆژهەڵاتی دەریاکەوە، نزیکەی٦٥کم لە کەنارەکانی تورکیا و ٨٥کم لە کەنارەکانی سوریا دوورە، رووبەری دوورگەکە ٩,٢٥١کم دەبێت و پایتەختەکەشی نیکۆسیا ( Nicosia ) یە [١] . بە پێی سەر ژمێری ساڵی ١٩٩٧ ژمارەی دانیشتوانی سەر دوورگەکە نزیکەی ٦٦٢ هەزار کەس بووە، رەگەزی یۆنانی ٨٤٪ و رەگەزی تورکیش ١٢٪ ی رێژەی دانیشتوانی دوورگەکە پێك دەهێنن ، جگە لە چەند کەمایەتیەکی تری وەکو ئەرمەنی و رۆمانی. [٢]

لەبارەی بنچینەی ناوی (قوبرس) ( Cyprus ) و ماناکەی ، بیروڕای جیاواز هەیە بۆنموونە : (الحمیَری) پێی وایە ناوی دوورگەکە لە ناوی شارێکی سەر دوورگەکە بە ناوی (قەبرو) وە هاتووە ، یانیش لەناوی (قابرس) ی یەکێك لە خواوەندەکانەوە هاتووە کە لەکۆنەوە لەلایەن خەڵکانی سەر دوورگەکەوە پەرستراوە. [٣] بەڵام بەگشتی لێکۆڵەران لەسەر ئەوە کۆکن کە

ناوی (قوبرس) لە ووشەی ( Cyprus ) یۆنانی هاتووە کە مانای (مس) دەگەیەنێت[٤] چونکە لە کۆنەوە کانزای مس بە رێژەیەکی زۆر لەسەر دوورگەکە هەیەو بازرگانی پێکراوە و بۆ ناوچەکانی دەوروبەریش بەتایبەتی (میسر و ئیجە و سوریا) نێردراوە. [٥]

دورگەی قوبرس گرنگی ستراتیژی خۆی هەیە ، چونکە وەکو پردێك بۆ کەشتیگەلی دەولەتان لە رێگای دەریای ناوەراستدا لە رۆژئاوا بۆ رۆژهەلات ، بە پێچەوانەوەش هەروەها لە ئەورووپاوە بۆ ئەفریقیا بە پێچەوانەوەش . [٦]

## قوبرس داگیرگەی هێزە رکابەرەکان :

لێکۆلەرە مێژوویی و شوێنەوارناسەکان وای بۆ دەچن کە لە دەوروبەری هەزارەی چوارەم و هەزارەی سێیەمی پێش زایینیدا قوبرس شارستانییەتێکی پێشکەوتووی بە خۆوە بینی بێت دواتریش بە شارستانیەتی رۆژهەلات وئینجا شارستانیەتی یۆنانی کۆن (گریك) کاریگەر بووە [٧]، سەرەتا یۆنانیەکان داگیریان کرد ، دواتریش دوچاری پەلامار و داگیرکاری یەك لە دوای یەکی (فینیقیەکان،میسریەکان،ئاشوریەکان،فارسەکان، و ئەسککەندەری مەکدۆنی)بووە ، تاکو لە سالی (٥٨ پ.ز) کەوتە ژێر دەسەلاتی رۆمەکان [٨]، پاش سەرهەلدانی ئایینی مەسیحی ، لەسەر دەستی(قەدیس پۆلس و بریانا) ئایینەکە لە نێو دانیشتوانی سەر دوورگەکە بلاوکرایەوە. [٩]

لە سەردەمی دەولەتی ئیسلامیدا (معاویە کوری ئەبوسوفیان (٤١ – ٦٠ك) (٦٦٠ – ٦٧٩ز) لە سالی (٢٧ك – ٦٤٧ز) پەلاماری دوورگەکەیدا ، پاشان رێککەوتن ئەنجام درا، لەسەر ئەو بنەمایەی کە دانیشتوانی سەر دوورگەکە (جزیە) بە دەولەتی ئیسلامی بدەن ، بەلام خەلکی دوورگەکە لە دەولەتی

ئیسلامی هەڵگەڕانەوە و یارمەتی ڕۆمانەکانیان دا دژی دەوڵەتی ئیسلامی، بۆیە جارێکی تر لە ساڵی (٣٢ك – ٦٥٢ز) معاویە پەلاماری دوورگەکەی دایەوە دەستی بەسەر داگرت (١٠) .

لە ماوەی لەشکرکێشیەکانی خاچ دروشمەکاندا، دوورگەکە بووە بنکەو وێستگەیەکی گرنگ بۆ حەسانەوە و پشتگیری خاچ دروشمەکان ، بەتایبەتی کە کەنارەکانی دوورگەکە شوێنێکی گونجاو بوو بۆ لەنگەرگرتنی کەشتییەکانیان (١١) بۆ نموونە لە کاتی لەشکرکێشی سێیەمدا لە ساڵی (١١٩٢ز) (ریچاردی شێردڵ) دەستی بەسەرداگرت(١٢) لە کاتی لەشکرکێشی حەفتەمیشدا ، لە ساڵی (١٢٤٨ز) (لویسی نۆیەم) ی پاشای فەرەنسا، لە وێوە کەشتیگەلی ئاراستەی کەنارەکانی باکووری میسر کرد (١٣) پاشان دوورگەکە کەوتە ژێر دەسەلاتی ڤێنیسیەکان. (١٤)

پاش لەشکرکێشەکانی سەلاحەددینی ئەیوبی (٥٣٢ – ٥٨٩ك)(١١٣٧ – ١١٩٣) بۆ سەر وولاتی شام ، بەتایبەتی بۆ سەر شاری (قودس) سوارەکانی قەدیس یوحەننا، کە زووتر (ئەبستارییەکان) یان پێ دەگوتن، لە قودسەوە رایانکرد دەچوونە دورگەی قوبرس و چالاکی چەتەگەرییانەی دەریاییان لە دژی کەشتیگەلی بازرگانی و حاجییەکان ، لە کەنارەکانی ئاسیای بچووك و باکووری ئەفریقیا ئەنجام دەدا . (١٥)

لە ئاکامی ئەمەدا ، بە مەبەستی سنووردانان بۆ مەترسی هێرشەکانیان و سوود وەرگرتن لەو دوورگەکە وەکو بنکەیەك بۆ بەربەرەکانی کردنی پێگەی پورتوگالیەکان لەو ناوچەکەدا، بیری لەگرتنی دوورگەکە کردەوە، ئەوە بە یارمەتی دارایی جوولەکەکان ، عوسمانییەکان خۆیان کۆکردەوە بۆ

داگیرکردنی دوورگەکە . (١٦)

لە ساڵی (١٥٧٠ز) لەشکرکێشی عوسمانی بۆ سەر دوورگەکە دەستی پێکرد ، گەمارۆیان دا، هەرچەندە پاپا (بیۆسی پێنجەم) کۆششی زۆری کرد بۆ رازی کردنی ئیسپانیا و ڤێنیسیەکان ، تا بەیەکەوە رووبەرووی لەشکر کێشی عوسمانی ببنەوە ، بەڵام لە هەوڵەکانیدا سەرنەکەوت ، بۆیە ڤێنیسەکان لە ژێر پەلاماری عوسمانیدا بەتەنیا مانەوە ، ئیتر لە ماوەی نێوان ئابی ساڵی ١٥٧٠ز تاوەکو ئابی ساڵی ١٥٧١ز زۆربەی شارەگەورەکانی سەر دوورگەکە گیران ، بەتایبەتی شارەکانی نیکۆسیا و فاماگۆستا ( Famagusta ). (١٧)

هەرچەندە پاش داگیرکردنی دوورگەکە لەلایەن عوسمانیەکانەوە ، ئەوروپاییەکان بەسەرکردایەتی (دۆن جوان) لە ساڵی ١٥٧١ز دا لە شەری لیبانتۆ( Lebanto ) توانیان سەرکەوتنێکی گەورە بەسەر کەشتیگەلی عوسمانی بەدەست بێنن ، بەڵام ئەمە کۆتایی بەدەسەڵاتی عوسمانیەکان لەسەر دوورگەکە نەهێنا ، ئەوەبوو لە مارتی ساڵی ١٥٧٣ز دا ، ڤێنیسیەکان لەگەڵ عوسمانیەکان رێکەوتنیان ئەنجامدا ، کە بەو هۆیەوە ڤێنیسیەکان وازیان لە دورگەی قوبرس هێنا لە بەرژەوەندی دەوڵەتی عوسمانیدا (١٨) .

بەم شێوەیە داگیرکردنی دورگەی قوبرس لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە ، بەسەرەتای دەرکەوتنی رەگەزێکی نوێ و ئایینێکی تر لەسەر دوورگەکە دادەنرا، واتە رەگەزی تورکی و ئایینی ئیسلام ، کە دواتر بەشدارییان لە پێکهاتەی رەگەزی و ئایینی سەر دوورگەکە کرد .

جێگای باسە، ئەسقەفییەی سەر دوورگەکە وەکو نوێنەری رۆمە (ئۆرسۆدۆکس)ییەکان ، لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە دانی پێدانرابوو ، ئەم دەسەڵاتە فراوانەشی تاکو بیستەکانی سەدەی نۆزدەهەم بۆ مایەوە .[19]

## سەدەی نۆزدەهەم و کێشەی قوبرس :

ناوچەکانی حەوزی دەریای ناوەراست ، بەدرێژایی مێژوو، چ لەسەدەکانی پێش مێژوو، دواتریش سەردەمە کۆنەکان، ئینجا سەدەکانی ناوەراست، نوێ و هاوچەرخ، هەمیشە شانۆی ململانێ و گۆرەپانی رکابەریتی هێزە جیاوازەکان بوو، ئەم ناوچەیە جگە لە پێشینە شارستانییەکەی، خاوەنی رۆلێکی گەورە بوو لە ئاراستەکردنی سیاسەتی جیهانی بەرەو ئاشتی یا شەڕ، دورگەی قوبرسیش یەکێکە لەو ناوچانە .

گرنگی دورگەی قوبرس لەسەدەی نۆزدەهەمدا زیاتر ئاشکرا بوو بەتایبەتی دوای ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی بەرەو لاوازی چوو بە (پیاوە نەخۆشەکە*)ی ئەوروپا ناسرابوو، ئەمەو هەوڵەکانی رووسیای قەیسەری و مرخ خۆشکردنی لە موڵکەکانی دەوڵەتی عوسمانی، زیاتر و زیاتر بەریتانیای هاندا بۆ کۆشش کردن لە پێناو کۆنترۆلکردنی رۆژهەلاتی ناوەراست تاکو بەهۆیەوە رێگا لە هەوڵەکانی رووسیا بۆ خزینی بۆ نێو ئاوە شلەتێنەکان، چ لەرێگای خاکی ئاسیای عوسمانی یا بەلقانەوە بێت بگرێت . کردنەوەی کەناڵی (سوێس) یش لە ساڵی ١٨٩٦ز، هۆکارێکی سەرەکی بوو کە تەرکیزکردنی سیاسەتی بەریتانیای بۆ سەر دوورگەکە زیاتر کرد . چونکە دوورگەکە کەوتبووە سەر ئەو رێگایەی کەبەرەو دەروازەی باکووری کەناڵی سوێس دەچێت .

ئەمەش وایدەکرد کە دەریاوانی بەریتانی بتوانێت کۆنترۆڵی کردارییانەی دەریاوانی نێوان رۆژهەلآت و رۆژئاوا بکات (بە دەستگرتن بەسەر دەریای سوور و کەناڵی سوێسەوە)، بەتایبەتی کە بەریتانیا بنکەیەکی تری لە (عەدەن) لەنزیکی دەروازەی باشووری دەریای سوورەوە لای (بابولمەندەب*) هەبوو. [٢٠]

هەلگیرسانی شەری رووسی – عوسمانی لە سالآنی (١٨٧٧ – ١٨٧٨) [٢١] دەرفەتی باشی بۆ نزیکبوونەوەی بەریتانیا لە دەوڵەتی عوسمانی رەخساند . بەتایبەتی دوای لاوازبوونی هەڵوێستی دەوڵەتی عوسمانی و سەرکەوتنەکانی رووسیا، ئەمەش بەریتانیای هەراسان کرد . ئەوەبوو یاداشتێکیان بۆ حکومەتی تزاری نارد، کەتیایدا، وەکو هەرەشەیەك، ئاگاداری رووسیان کردەوە لەوەی نەکات (ئەستانبۆل)، گەرووەکان(بۆسفۆر و دەردەنێل)، یان کەناڵی سوێس و میسر داگیر بکات [٢٢]، واتە ئەو ناوچانەی کە بە بەرژەوەندییەکانی تاجی بەریتانی بەسترابوونەوە .

سەپاندنی پەیماننامەی (سان ستیڤانۆ*) ( Sanstevano ) لە ٣ی ئاداری ١٨٧٨ لە لایەن رووسیاوە بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا، کە بەهۆیەوە دەسەلآتی رووسەکانی بەسەر ئاوەکانی عوسمانی و چەند ناوچەیەکی تری ووشکانی لە ئاسیا و ئەوروپا بالآ دەست دەکرد (٢٣)، بەریتانیای زیاتر هاندا تاکو بێتە گۆرەپانی ململانێیەکەوە، هەرەشەی لە رووسیا کرد لە بەجێگەیاندتی بەندەکانی پەیماننامەکە، بەوەی کەبەهێز وەلآمیان دەداتەوە، ئەوەبوو دوای چەند مووشاوەرەیەك و چەند کارێکی دیپلۆماتی نێو دەوڵەتی، دواجار پەیمانی (سان ستیڤانۆ) بە پەیماننامەی (بەرلین) گۆردرا، کەلە ٣ی

حوزەیرانی ١٨٧٨ واژوو کرا. ئەوەی کە کەمێك لە هێزو دەسەڵاتی ڕووسەکانی بەسەر موڵکەکانی دەوڵتی عوسمانیدا، بەبەراورد لە گەڵ (سان ستیڤانۆ) ، کەمترکردەوە .(٢٤)

ئەوەی زۆر گرنگ و کاریگەر بوو، ئەوەبوو کە بەریتانیا ویستی لاوازی هەڵوێستی دەوڵەتی عوسمانی بقۆزێتەوە، ئەوەبوو داوای لە سوڵتان (عبدولحەمیدی دووەم ١٨٧٦-١٩٠٩) ی سوڵتانی عوسمانی کرد، کە بنکەیەکی دەریایی پێبدات، تا بیکاتە مەڵبەندێك بۆ پتەو کردنی پێگەی خۆی لە دەریای ناوەراست و تا بەو هۆیەوە بتوانێ بەرگری لە ئاسیای بچووك و ئەرمینیا بکات، لە دژی هەر هەڕەشەیەکی ڕووسی چاوەڕوانکراودا، ئەوەبوو دوای چەند مشتومڕو تاوتوێکردنێکی مەسەلەکە، گەورە بەرپرسانی بەریتانی لەسەر ئەوە رێککەوتن دورگەی (قوبرس) بکەنە ئەو مەڵبەندەی کە مەبەستیان بوو، بۆ ئەو مەبەستەش لایارد ( Layard) ی باڵیۆزی بەریتانیا لە ئاستنبوڵ پرۆژەکەی بەریتانیای بۆ داگیرکردنی دورگەی قوبرس، پێشکەش بە سوڵتانی عوسمانی کردو داواشی لێکرد کە دەبێ لە ماوەی (٤٨) کاتژمێردا رەزامەندی لەسەر دەرببڕێت .(٢٥)

لە ٤ی حوزەیرانی ١٨٧٨ دەوڵەتی عوسمانی رەزامەندی خۆی لەسەر پرۆژەکە دەربڕی وازی لە دوورگەکە هێنا بۆ بەریتانیا بەوەی کە یارمەتی سەربازی پێشکەش بە دەوڵەتی عوسمانی دەکات، ئەگەر لە لایەن رووسیاوە دوچاری هەر هەڕەشەیەك بۆوە . دوورگەکەش بۆ ئەنجامدانی ڕووبەڕووبونەوە کە بەکاردێنی.(٢٦) بەم جۆرە داگیرکردنی دورگەی قوبرس لەلایەن بەریتانیەکانەوە دەسەڵاتی بەریتانیای بەسەر پرۆسەی دەریاوانی لە دەریای

ناوەراست پتەوترکرد. بەتایبەتی کە بەریتانیا بنکەی تری لە (ماڵتە،جبل طارق،سەنگافوورە،هۆنگ کۆنگ، و کەناڵی سوێس) هەبوو .[٢٧] بەدەست هێنانی دورگەی قوبرس لەلایەن بەریتانیاوە، دەستکەوتێکی هێندە گەورەبوو بۆ وولاتەکە، سەرۆکی وەفدەکەیان پاش گەڕانەوەیان بۆ وولات، بە پێشوازیکەرانی راگەیاند (ئاشتی و شەرەفمەندێتیمان هێناوە) .[٢٨]

لە کۆتایی ئەم تەوەرەیە ئەوە ماوە بڵێین، هەرچەندە بەریتانیا بەڵێنی بە دەوڵەتی عوسمانی دا، ئەگەر هەر کاتێك رووسەکان لەو ناوچانە کشانەوە کە داگیریان کردبوو ئەوا ئەوانیش لە دوورگەکە دەکشێنەوە [٢٩] بەلام ئەوەی چاوەرواندەکرا رووی نەدا، بەڵکو بەریتانیا زیاتر دەستی بەدوورگەکەوە گرت، هەروەکو لە رووداوەکانی دواییدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە .

شیاوی باسە لە ساڵی ١٨٨٢ بەریتانیەکان ئەنجومەنێکی یاسادانانیان لە قوبرس دامەزراند و دەستورێکیش دانرا . ئەنجوومەنەکە لە (١٥) ئەندام پێك دەهات . شەش ئەندام بەریتانی، شەش ئەندام لە قوبرسییە یۆنانییەکان و سێ ئەندامیش لە قوبرسییە توورکەکان بوو. لەو کاتەشدا قوبرسییە یۆنانییەکان (٧٥٪) و قوبرسییە توورکەکانیش (٢٥٪) دانیشتوانی دوورگەکەیان پێك دەهێنا، بەلام دواتر ئەم رێژانە گۆڕانیان بەسەر دەهات و وەکو خۆیان نەمانەوە .[٣٠]

## سەدەی بیست و تیژبوونی ململانێ هەرێمایەتی و نێو دەوڵەتییەکان لە بارەی پرسی قوبرسەوە

گرنگی ستراتیژی دورگەی قوبرس لە سەدەی بیستەمدا هێندە زیاتر بوو بەلای بەریتانیەکانەوە، لەوەدا نەبوو دەستی لێ هەڵگرن، چونکە :

١- دوای کشانەوەی هێزەکانی بەریتانیا لە کەناڵی سوێس، (قوبرس) بووە بنکەیەکی سەرەکی بۆ هێزەکانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا .

٢- بوونی کۆگای زۆر و شوێنی تایبەت بۆ خەزنکردنی پەترۆل، ئەمەش وزەی پێویستی، بۆ ماوەیەکی درێژ، بۆ هێزەکانی بەریتانیا دابین دەکرد .

٣- نزیکی دوورگەکە لە دەروازەی باکووری کەناڵی سوێس و نزیکی لە کەنارەکانی فەلەستین و سوریا و لوبنان و تورکیا، یاریدەی بەریتانیای دەدا بۆ کۆنترۆڵکردنی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست .

٤- وەکو بنکەیەکی سیخوری و بانگەشە سیاسیکانی بەریتانیا لە ناوچەکە ڕۆڵی خۆی دەبینی .

٥- بوو بە مەڵبەندێکی کۆکردنەوەی جولەکەکان، دواتریش ناردنیان بەرەو فەلەستین .

٦- لەبەر ئەوەی قوبرس دوورگەیەك بوو لە نێو پانتاییەکی ئاوییدا، بۆیە داگیرکردنی ئاسان نەبوو .

٧- بەریتانیا مەترسی کشانی دەسەڵاتی ڕوسەکانی هەبوو بۆ نێو ئاوی دەریای ناوەراست، بەتایبەتیش پاش ئەوەی (ئەلبانیا) کەوتە نێو بازنەی سۆڤیەتەوە. بەمەش هەڕەشەی زیاتر بۆ سەر دورگەی (ماڵتە) دروست بوو . بۆیە بەریتانیەکان گرنگی سترتیژی قوبرسیان زیاتر بۆ دەرکەوت .

٨- لە پەنجاکانی سەدەی بیست و بەدواوە، قوبرس بوو بە بنکەیەکی دواوە لە ریزبەندی ئەو بنکە و پێگانەی بەریتانیا کە دەیانتوانی ئامانجە ستراتیژییەکانی پەیماننامەی (بەغدادی ١٩٥٥) بەدی بهێنن . چونکە بەریتانیا ئەندامێکی سەرەکی پەیماننامەکەبوو ... هتد .[٣١]

ئەم هۆکارانەی سەرەوە، لەگەڵ هۆکاری تر، پاڵیان نا بە بەریتانیاوە بۆ جەختکردنەوە لەسەر مانەوەی خۆی لە سەر دوورگەکەدا.

ئەوەبوو لەماوەی شەری یەکەمی جیهانیدا، پاش ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی شەڕی لە دژی هاوپەیمانان راگەیاند، بەریتانیا راستەوخۆ لە (٥ ی تشرینی دووەمی ١٩١٤) لە لای خۆیەوە لکاندنی دوورگەکەی بە موڵکەکانی خۆی راگەیاند .[٣٢] پاش گرێدانی کۆنگرەی (لۆزان ١٩٢٢-١٩٢٣) بە پێی بریارێك تورکیا وازی لە دورگەی قوبرس هێنا لە بەرژەوەندی بەریتانیا [٣٣] ئینجا لە ساڵی ١٩٢٥ بە شێوەیەکی فەرمی راگەیەندرا، کە دورگەی قوبرس کەوتە نێو بازنەی داگیرگاکانی ژێر تاجی بەریتانیاوە .[٣٤]

بەم شێوەی باسکرا، دورگەی قوبرس بوو بە نێوەندێکی کاراو گرنگی چالاکیەکانی کەشتیگەلی بەریتانی لە ناوچەکەدا، بەتایبەتی کە تا ئەو کاتە هێزەکانی بەریتانیا لە میسر و فەلەستین و عیراق و رۆژهەلاتی ئوردن مابۆوە. ئەوبوو لە (٢٦ ی تشرینی یەکەمی ١٩٣١) حەفت فرۆکەی بەریتانیا، کە چەند ئەفسەرێکی سەربازیشیان هەلگرتبوو، لە میسرەوە گەیشتنە (نیکۆسیا) .[٣٥] شیاوی باسە، لە (٣٠ ی تشرینی یەکەمی ١٩٣١) راپەرینێك بە رێنمایی کلێسەی ئورسۆدۆکسی قوبرسی، بە مەبەستی بەدیهێنانی یەکێتی لەگەڵ یۆنان ( Inosis *سەر دوورگەکە هەلگیرسا، بەلام بەریتانیەکان بە توندی وەلامیان دانەوە . ژمارەیەك لە سەرکردەکانیشیان دوورخستنەوەو ئەنجوومەنی یاسا دانانەکەشیان لە کارخستن .[٣٦]

لە ساڵی ١٩٣٥دا دورگەی قوبرس سەنگێکی سیاسی سەربازی زیاتری وەرگرت. ئەوەبوو کە لەم ساڵەدا (ئیتالیا) دەستی کرد بە جێ بەجێکردنی

سیاسەتی فراوانخوازی لە ئەفریقا، نزیکی دورگەی (مالّتە) ش لە کەنارەکانی ئیتالیا، بەهای ستراتیژی ئەم دوورگەیەی دوایی لای بەریتانیەکان کەمترکردەوە . بۆیە بەریتانیەکان گرنگی دورگەی قوبرسیان، وەکو بەدیلێکی مالّتە، زیاتر بۆ دەرکەوت .(٣٧)

لە سالّی ١٩٤٧، بەریتانیەکان پێشنیازی دامەزراندنی‌دەسەلاّتێکی نوێیان بۆ بەڕێوەبردنی دوورگەکە خستە روو، بەلاّم ئەم پێشنیازە لە لایەن زۆرینەی دانیشتوانی دوورگەکە رەت کرایەوە، بەلّکو داوای یەکێتیان کرد لەگەلّ یۆناندا، گوایە قوبرسییەکان لە رووی رەگەز و زمان و ئایینەوە لەگەلّ یۆنانییەکان هاوبەشن . ئەمەی دوایی زیاتر بەریتانیای دڕدۆنگ کرد، کێشەکەش زیاتر وروژا لە کاتێك قوبرسییە تورکەکانی سەر دوورگەکە دەستیانکرد بە نانەوەی پەشێوی و ئەنجامدانی جموجۆلّ .(٣٨)

شیاوی باسە لەسەرەتای پەنجاکانەوە بە هەلّبژاردنی قەشە (مەکاریۆسی سێیەم) بۆ پۆستی ئەسقیفییەی کلّێسەی ئۆرسۆدۆکسی قوبرسی، دۆزو پرسی قوبرس گرنگیپێدانێکی زیاتری نێو دەولّەتی بۆ لای خۆی راکێشا بە تایبەتی چونکە قەشە (ماکاریۆس) کەسێکی لێهاتوو چالاك بوو دەیتوانی بە چاوێکی واقیع بینانە مامەلّە لەگەلّ رووداوەکان و پێشهاتەکاندا بکات .(٣٩)

چوونە ناوەی تورکیاو یۆنان بۆ نێو پەیمانی باکووری ئەتلّەسی ( Nato ) لە سالّی ١٩٥٢ و ئینجا بۆ نێو پەیماننامەی بەلّکان* لە سالّی ١٩٥٣ جۆرێك لە نزیك بوونەوە لە نێوان هەردوو ولاّت هێنا کایەوە بەلاّم ناکۆکییەکانی دوایی ئەم پەیوەندییانەیان بۆ ململانێیەکی توند گۆری .

ڕووداوەکانی نێوان سالآنی (١٩٥٤–١٩٥٩) زۆر خێراو توندو تیژ بوون ئەوەبوو ـلەم ماوەیەدا چالآکیەکانی ڕێکخراوی (ئیۆکا)( Eoka ) یان ڕێکخراوی نەتەوەیی جەنگاوەرە .قوبرسیەکان) وەکو ڕێکخراوێکی سەربازی یۆنانی قوبرسی نهێنی بە دیار کەوت . ئامانجی ڕێکخراوەکە بریتی بوو لە هەڵسان بە خەباتی چەکداری ، لە پێناو سەربەخۆیی قوبرس و بەدیهێنانی یەکێتی لەگەڵ یۆناندا، لەبەرامبەر ئەوەشدا تورکەکان ڕێکخراوێکی توندڕەوییان بەناوی (ڤۆلکان) واتە (بورکان) پێك هێنا . ئامانجی سەرەکی ئەم ڕێکخراوە دابەش کردنی دوورگەکە بوو[٤٠] واتە دژایەتی کردنی ئامانجەکانی ڕێکخراوی (ئیۆکا) ئامانجی سەرەکی ڕێکخراوی (ڤۆلکان)بوو .

واپێدەچێ زۆر بوونی چالآکیەکانی ڕێکخراوی (ئیۆکا) و جموجۆڵی زۆری (مەکاریۆس) بەریتانیای هاندابێت بۆ ئەوەی هەوڵبدات تا هەریەك لە تورکیا و یۆنان لێك نزیك بکاتەوە .

دیارە ئامانجی سەرەکی بەریتانیا لەم مەسەلەیە بریتی بوو لەبەدیهێنانی جۆرێك لە هاوسەنگی لە نێوان تورکیاو یوناندا، لەبارەی کێشەی قوبرسەوە، لێرەشدا دیسان تورکیا وەکو لایەنێکی پەیوەست بەکێشەکە یا بڵێین وەك جەمسەرێکی کیشەکە هاتەوە گۆرەپان پاش ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٢٣و بەپێی بریارێکی کۆنگرەی (لۆزان) وازی لە مافەکانی خۆی لە دوورگەکە هێنابوو لە بەرژەوەندی بەریتانیادا.[٤١]

لە رۆژانی (٦–٧ ی ئەیلولی ١٩٥٥ هێرش کرایە سەر کونسولخانەی تورکیا لە (سلامیك) دواتریش وەکو کاردانەوەیەك بۆ ئەم ڕووداوە، تورکەکان هێرشیان کردە سەر کلێساکانی یۆنانی و ئەرمەنی و زیانی زۆریان پێ

گەیاندن [٤٢] لە ئاکامی ئەوە بوو کە بەریتانییەکان تەنگو تاوییان لە سەر دوورگەکە راگەیاندو دواتریش لە مارتی ١٩٥٦ (مەکاریۆس) یان بۆ دوورگەکانی (سیشیل) دوورخستەوە ، بەلآم دواتر لە ساڵی ١٩٥٧ دووبارە هێنایانەوە بۆ دورگەی قوبرس .[٤٣]

هەر لەو ماوەیەدا شان بەشانی بەریتانیا، ئەمریکاش رۆڵی خۆی لەسەر شانۆی رووداوەکانی تایبەت بە کێشەی قوبرس دەگێڕا، لە نێوەندە سیاسییەکانی ئەمریکا باس لەوە دەکرا گوایە هۆکاری راستەقینەی پێداگرتنی تورکیا لەسەر دەست بەسەرداگرتنی کەمایەتیە تورکەکانی قوبرس ، بۆ ئارەزووی تورکیا لە بەدەست هێنانی قەرزی زۆر لە ئەمریکا دەگەڕێتەوە، چونکە لەو ماوەیەدا کەرتی ئابووری تورکیا لاواز بوو. بەلآم راڕایی ئەمریکا لە دابین کردنی قەرزی پێویست بۆ تورکیا جۆرێك لە ساردیی خستە پەیوەندی نێوان هەردوو ولآتەوە .[٤٤]

ئەو قەیرانانەی کە لە پەنجاکاندا لە بارەی کێشەی قوبرسەوە سەریان هەڵدا، بەوە کۆتایی هات، کە هەردوو لایەنی تورکی و یۆنانی، بە هاوبەشی نوێنەری تورکە قوبرسییەکان و یۆنانییە قوبرسییەکان بە پشکداری نوێنەری بەریتانیا، گەیشتنە رێکەوتنێك کە لە (١٩ ی شوباتی ١٩٥٩) لە (زیورنخ) واژووکرا[٤٥] بە پێی رێکەوتنەکە دان بە سەربەخۆیی دوورگەکە دانرا . ئەوەبوو لە (١٦ ی ئابی ١٩٦٠) سەربەخۆیی دوورگەکە راگەیەنرا و قەشە (مەکاریۆس) بە سەرۆك کۆمار و (فازل کوچك) یش لە لایەنی تورکە قوبرسییەکانەوە بە جێگری سەرۆك دانران . هەر بەپێی رێککەوتنەکە، بەریتانیا چەند بنکەیەکی لەدوورگەکە بۆ مایەوە .[٤٦]

بە کۆتاییهاتنێکی کێشەی قوبرس، حکومەتە تازەکە چەند چاکسازییەکی لە بواری ئابووری و کۆمەلآیەتی ئەنجام دا، هەولّی دا لە دەولّەتە عەرەبییەکان نزیك بێتەوە، دانی بە دەولّەت و قەوارەی (ئیسرائیل) نەنا و پشتگیری خۆی بۆ فەلّەستینیەکان لە مافەکانیان لەسەر خاکی خۆیان دەربڕی . هەروەها حکومەتەکە (مەکاریۆس) هەولّیدا لە ولآتانی بێ لایەن نزیك بێتەوە .[٤٧]

لە شەستەکانی سالّی رابردوو جارێکی تر شەرو پێکدادان لە نێوان هەردوو رەگەزی تورکی و یۆنانی سەر دوورگەکە سەری هەلّدایەوە، سەرۆك کۆمار (مەکاریۆس) بەمەبەستی راگرتنی شەرو پەشێوی ناچار بوو داوا لە بەریتانیا بکات تا یارمەتی بدات . دواتریش لە سالّی ١٩٦٤ هێزەکانی دەزگای نەتەوە یەککگرتووەکان، بۆ هەمان مەبەست هاتنە سەر دوورگەکە .[٤٨]

شیاوی باسە، لەو ماوەیەدا هەولّەکانی ئەمریکا بۆ نزیککردنەوەی هەردوو لایەنی ناکۆك بەردەوام بوو . ئەوەبوو کە لە هاوینی سالّی ١٩٤٦ دا بە سەرپەرشتی نەتەوە یەکگرتووەکان و بەشداری (دێن ئەچیلسۆن) ی سکرتێری سەرۆکی ئەمریکا بۆ کاروباری دەرەوە، هەردوو لایەنی تورکی و یۆنانی دەستییان بە وتوێژ کردەوە . هەر لەو کاتەشدا پلانی ئەچیسۆن لە لایەن ئەچیسۆنەوە خرایە روو، کە تیایدا داوای یەککگرتنی قوبرس و ولآتی یۆنانی دەکرد . ئەمەش لە بەرامبەر ئەوەی کە یۆنان واز لە دورگەی (کاستیلۆ ریزۆن) بهێنێ بۆ تورکیا، بەلآم تورکیا ئەم پلانەی وا لێك دایەوە کە پلانێکی ئەمریکاییە لە دژی بەرژەوەندیەکانی تورکیادا .[٤٩] لە بەرامبەر ئەم هەلّوێستەی دوایی تورکیادا، ئەمریکا ئاگادارییەکی ئاراستەی (عیسمەت ئینینۆ) ی سەرۆك وەزیرانی تورکیا کرد، لەوەی کە نەکات پەنا بباتە بەر

بەکارهێنانی هێزو دوورگەکە داگیر بکات، لە ساڵی ١٩٦٧ یش هەمان چەشنە ئاگادری ئاڕاستەی تورکیا کرایەوە .[٥٠]

ئەم هەڵوێستەی دوایی ئەمریکا لە ئاکامی ئەوەوە هات، کە لەماوەی ئەو ساڵانەدا واتە (١٩٦٤-١٩٦٧) حکومەتی تورکیا دووجار بە تەواوی ئامادەباشی خۆی ئەنجام دابوو، بەمەبەستی داگیرکردنی دورگەی قوبرس، بەڵام ئەوەبوو کە ئەمریکا دەستی خستە نێو مەسەلەکەو سەرۆکی رێکخراوی (ئیۆکا) ی لە دوورگەکە دوورخستەوە بەمەش رەوشەکە کەمێك هێور بۆوە .[٥١] هەرچەندە کە لە نیوەی دووەمی شەستەکانی سەدەی رابردوو، لە ئاکامی نزیك بوونەوەی تورکیا لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشو[٥٢] و رازینەبوونی تورکیا بۆ بەکارهێنانی خاکی وڵاتەکەی وەکو بنکەیەکی سەربازی لە بەرژەوەندی قەوارەی جولەکە لە ساڵی ١٩٦٧دا، جۆرێك لە ساردی کەوتە نێوان هەردو وڵاتی (تورکیا و ئەمریکا) بەڵام دیاربوو ئەم هەڵوێستەی دوایی تورکیا جۆرێك بوو لە مانۆری سیاسیی ، بە مەبەستی فشار خستنە سەر ئەمریکا تاکو نەرمی بنوێنێت لە بەرامبەر داخوازیەکانی تورکیا سەبارەت بە ئایندەی قوبرس . چونکە هەر دوای ئەمەو لە ساڵی ١٩٦٩ چەند رێکەوتنێك لە نێوان هەردوو وڵات واژوو کرا .[٥٣]

بەتایبەتی کە بەلای ئەمریکاییەکانەوە تورکیا بەهایەکی سەربازی و گرنگی ستراتیژی گەورەی هەبوو .[٥٤]

رووداوەکانی حەفتاکانی لە سەر دورگەی قوبرس کاریگەری زۆریان بۆ سەر دۆزو کێشەی قوبرسەوە هەبوو بە تایبەتی کاتێك ناکۆکی لە نێوان سەرۆکی قوبرس(مەکاریۆس) و رێکخراوی (ئیۆکا) ی نەهێنی و ئەفسەرانی

حکومەتی پاسەوانی نیشتمانی رووی دا . (مەکاریۆس) دەسەڵاتدارانی حکومەتی یۆنانی بە لەپشتەوەبوونی ئاڵۆزی و گرژییەکان تۆمەتبار کرد بەوەی کەیارمەتی رێکخراوی (ئیۆکا) دەدات .

دیارە لەو ماوەیەدا چینێکی سەربازی لە یۆنان دەسەڵاتیان گرتبووە دەست، کە توندڕەو بوون و ئارەزووی یەکگرتنی هەردوو وڵات (یۆنان) و (قوبرس) یان هەبوو. هەر بۆیەش (مەکاریۆس) ئەوانی بە نانەوەی پەشێوی و ئاژاوە لە سەردوورگەکە تۆمەتبار کرد . هەرچۆنێك بێت زۆری نەبرد لە (١٥ ی تەموزی ساڵی ١٩٧٤) کودەتایەکی سەربازی ئەنجام دراو (مەکاریۆس) لێ خرا [٥٥] ، یەکێك لەو کەسانەی کەسەر بەچینی سەربازی دەسەڵاتداری یۆنان بوو، بەناوی (نیکۆلاس سامبسۆن) خۆی کرد بە سەرۆك کۆماری قوبرس. ئەم پیاوەی دوایی کەسێکی توندڕەو بوو، ئامانجی یەکگرتنی (یۆنان و قوبرس) ی هەبوو. [٥٦]

هەڵوێستی حکومەتی تورکیا لە سەرەتادا، بریتی بوو لە ئیدانەکردنی کۆدەتاکە و تۆمەتبارکردنی حکومەتی یۆنان بە لەپشتەوەبوونی مەسەلەکە. هەروەها ژمارەیەك لە وڵاتانی تریش ئیدانەی کۆدەتاکەیان کرد . [٥٧]

جێگای سەرنجە بەپێی ئەو راپۆرتانەی کە لەوماوەیەدا لە (پنتاگۆن) دەرچوو بوون، وایان نیشان دەدا کە ئەمریکا دەستی هەبووە لە ئەنجامدانی کودەتاکەی تەمموزی ١٩٧٤، لەدژی حکومەتەکەی (مەکاریۆس)دا گوایە مەکاریۆس لە سەربازگەی سۆڤیەتی نزیك ببۆوە، دژایەتی دامەزراندنی بنکەی سەربازی و سیخوری ئەمریکایی لە سەر دوورگەکە کردبوو. هەروەها دژ بە هەنگاوەکانی (پەیمانی باکوری ئەتڵەسی) کاری کردبوو. [٥٨]

کودەتاکەی تەمموزی ١٩٧٤ کاردانەوەیەکی بەهێزی لە لایەن تورکەکانەوە لێکەوتەوە، ئەوەبوو لە ٢٠ی تەممووزدا حکومەتی تورکیا هێزی خۆی لەسەر دوورگەکە دامەزراند و (بولنت ئەجاوید)ی سەرۆك وەزیرانیش ڕایگەیاند کەوا کێشەی قوبرس بەئاشتی چارەسەر ناکرێت و تورکیاش لەگەڵ ئەوەدایە کە قوبرس لە چوار چێوەی دەسەڵاتێکی فیدراڵیدا بمێنێتەوە. ئەم هەنگاوەی دوایی تورکیا شەڕی نێوان هێزەکانی تورکی و پاسسەوانانی نیشتمانی قوبرسی لێکەوتەوە و ناکۆکییەکانی نێوان تورکیاو یۆنانیش گەیشتە پۆپە.

وڵاتی یۆنان باری تەنگەتاوی لە وڵات ڕاگەیاند و هێزەکانی خۆی لەسەر سنوور کۆکردەوە تورکیاش بەهەمان شێوە باری تەنگەتاوی ڕاگەیاندو هێزە چەکدارەکان ڕێك خستەوە ئامادەباشی خۆی ئەنجامدا. ئەمەش بەرەو ئەوە دەچوو کە شەڕێك لە حەوزی دەریای ناوەراست ڕوویدات. ئەوەبوو بەریتانیا هێزی زیاتری ناردە سەر دوورگەکە و (مەکاریۆس)ی گوێزایەوە بۆ دورگەی (ماڵتە).[٥٩] پاشان بە لێك نزیککردنەوەی هەردوو لایەن (تورکیا و یۆنان) ڕۆڵی خۆی بینی، چونکە سەقامگیربوونی بارودۆخی سەر دوورگەکە لە بەرژەوەندی خۆی دابوو.[٦٠] ئەوەبوو کە لە ٢٢ تەموزی ١٩٧٤ ڕێکەوتنی ئاگربەست ڕاگەیەندرا و پاشان دیلەکان گۆڕدرانەوە، بەڵام گفتوگۆکانی نێوان نوێنەرانی ڕەگەزە تورکییەکان و ڕەگەزە یۆنانییەکانی سەر دوورگەکە، کە لە(ژنێف) بەرێوەچوو هیچ ئاکامێکی ئیجابی لێنەکەوتەوە.[٦١]

شیاوی باسە، پاش دابەزینی هێزەکانی تورکیا لەسەر دوورگەکە، ئەمریکا گەمارۆی سەربازی خستە سەر تورکیا، لەبەرامبەریشدا، تورکیا دەستی کرد

بەداخستنی بنکەو دامەزراوەکانی ئەمریکا لەسەر خاکەکەیدا و راشی گەیاند کە لەلای خۆیەوە (ریکەوتنی بەرگری هاوبەشی)ی هەڵوەشاندۆتەوە. ئەو رێکەوتنە کە لە نێوان هەردوو وڵات ئەنجام درابوو.[٦٢] بەڵام دیارە ئەم هەڵوێستانەی دوایی هەر یەك لە ئەمریکا و تورکیا، دیسان هەروەکو مانۆری سیاسیی وابوو، چونکە زۆری نەبرد لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٧٦-١٩٧٨)چەند رێککەوتنێکی ئابووری و سەربازی لەنێوان تورکیاو ئەمریکا واژووکرا.[٦٣]

جێگەی باسە پاش رووخانی حکومەتە سەربازییە دەسەڵاتدارەکەی یۆنان، لە(٢٣ی تەموزی ١٩٧٤) حکومەتێکی سڤیلی هاتە سەردەسەڵات و جێگای حکومەتە سەربازییەکەی گرتەوە. هاو کات لەگەڵ ئەمەشدا، لە قوبرسیش کودەتاچییەکان لەسەر دەسەڵات نەمان. گفتوگۆو دانووسانەکانی نێوان تورکیا و یۆنانیش بەردەوام بوو.[٦٤] بەڵام بێ ئەوەی رێگاچارەیەکی تەواو و گونجاو بۆ کێشەی قوبرس بدۆزنەوە.

لە کۆتاییدا ئەوە ماوە بڵێین، کە کێشەی قوبرس لەگەڵ ئەوەی کە رەنگدانەوەی جیاوازی باری رەگەزیی و ئایینی دانیشتوانی سەر دوورگەکەیە. لە هەمان کاتدا، بوارێکی لەباری ململانێ و رکابەرێتی نێوان بەرژەوەنییەکانی وڵاتە هەرێمی و زلهێزەکانی جیهانە. لە نێوان ئەم سێ ئاراستە(جیاواز و پەیوەست بەیەکەوە)شدا، کێشەی قوبرس وەکو دۆزێکی هەڵپەسێردراو و کاریگەر بە رووداو پێشهاتە هەنووکەییەکان ماوەتەوە.

## پەراوێز و سەرچاوەکان

١- المنجد فى اللغة والاعلام، قسم الاعلام، بيروت، ١٩٨٦، ص٤٣٣.

٢- ابو بكر، عبدارحمن مەلا حەبیب، جوطرافیای سیاسی جیهان، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠١، ل٤٩.

٣- الحميرى، محمد بن عبدالمنعم، الروض المعطار فى خبر الاقطار، ط٢، ،مطابع هيدلبرغ، بيروت، ١٩٨٤، ص٤٥٤.

٤- الحموي، ياقوت،معجم البلدان، المجلد الرابع، دار الصادر، بيروت، ١٩٧٩، ص٣٠٥، هەروەها بروانە : الخوند، مسعود، الموسوعة التاريخية الجغرافية، جلد الرابع عشر، ط٣، بيروت، ٢٠٠٥، ص٣٦٣.

٥- بروانة :الخوند،م .س، ص٣٦٦.

٦- حسن، د.جرجيس، تركيا فى الاستراتيجية الامريكية بعد سقوط الشاة، ط١، دون مكان الطبع، ١٩٩٠، ص٧٢، زناد، موسى، القواعد العسكرية الاجنبية، دار القادسية، بغداد، ١٩٨٥، ص٤٧.

٧- لجنة من العلماء والباحثين، الموسوعة العربية، دار الشعب، القاهرة، دون سنة الطبع، ص١٣٦٨-١٣٦٩.

٨- الخوند، م.س، ص١٣٦٩.

١٠- الحميرى، م.س، ص٤٥٤، بۆزانیاری زیاتر بروانە: البلاذرى، احمد بن يحيى بن صابر، كتاب فتوح البلدان، القسم الاول ، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، دون سنة الطبع، ص١٨١-١٨٢.

١١- الدسوقى، د.محمد كمال، الدولة العثمانية والمسألة الشرقية، القاهرة،١٩٧٦،ص٧٨.

١٢- المطوى، محمد العروسى، الحروب الصليبية فى المشرق والمغرب، دار العرب الاسلامى، بيروت،١٩٨٢، ص٨٩.

١٣- م.ن،ص١١٨.

١٤- لجنة من العلماء والباحثين، م.س، ص١٣٦٩.

١٥- الدسوقى، م.س، ص٧٨.

١٦- مصطفى، احمد عبدالرحيم، فى اصول التاريخ العثمانى، الطبعة الاولى، دار الشروق، بيروت، ١٩٨٢، ص١٤٦.

١٧- الدسوقى، م.س، ص٧٩-٨٠.

١٨- م.ن، ص ٨٢، هەروەها بڕوانە : المحامى، محمد فريد بك، تاريخ الدولة العثمانية، دار الجبل، بيروت، ١٩٧٧، ص١١٢.

١٩- الخوند، م.س، ص٣٦٦.

*پیاوە نەخۆشەکە، وەکو زاراوەیەك بۆ یەکەم جار لە لایەن تزاری رووسیا نیکۆلای یەکەم ( I Nicholas ) (١٨٢٢-١٨٥٥)، لە ساڵی ١٨٥٣ بەکارهات. بڕوانە :

Marrios Andre,A History of EnglandK Newyork, 1960,P.443.

* گەروویکە دەکەوێتە نێوان دەریای سور لە باکوور و کەنداوی عەدەن لە باشووردا.

٢٠- عبدالحميد، لواء محمد كمال، الشرق الاوسط في الميزان الاستراتيذى، الطبعة الرابعة، مطبعة الفتنية الحديثة، القاهرة، ١٩٧٢، ص٤٥٣.

٢١- بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی ئەم شەڕە، بڕوانە : الدسوقى، م.س، ص ٢٤٨ ومابعدها، المحامى، م.س، ص٣٥٢ وما بعدها.

٢٢- الدسوقى، م.س، ص٢٥٠.

* دێ یەکە لەسەر کەناری دەریای مەرمەرە.

٢٣- لە بارەی بەندەکانی پەیماننامەکە، بڕوانە : المحامى، م.س، ص٣٧٠-٣٧٩.

٢٤- لە بارەی بەندەکانی پەیماننامەکە، بڕوانە : المحامى، م.ن، ص٣٩١-٤٠٤.

٢٥- الدسوقى، م.س، ص٢٥٤-٢٥٥.

٢٦- بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی ئەم شەڕە، بڕوانە: المحامى، م.س، ص٣٨٥-٣٨٧.

٢٧- على، اورخان محمد، السلطان عبدالحميد الثانى( حياتة واحداث عهدة)، الطبعة الاولى، دار المكتبة الانبار، الرمادى، ١٩٨٧،ص١٤٠-١٤١.

٢٨- الدسوقى، م.س، ص٢٦٠.

٢٩- مصطفى، م.س، ص٢٤٥.

٣٠- الخوند، م.س، ص٣٦٧.

٣١- بروانە: عبدالحميد، م.س، ص٤٥٤-٤٥٨.

٣٢- بڕوانە: عبدالله، علی، قبرص صراع التاریخ والجغرافیا، مجلة المعرفة، العدد١٤١، الینایر٢٠٠٧.www.almarefah.com

٣٣- أحمد، د.ابراهیم الخلیل و د.خلیل علی مراد، ایان وترکیا (درسة فی التاریخ الحدیث والمعاصر)، دار الکتب للطباعة والنشر، الموصل،١٩٩٢،ص٢٣٥، بۆ زیاتر زانیاری، بڕوانە: مجموعة من الباخثین، ترکیا المعاصرة، دار الکتب، الموصل، ١٩٨٨،ص٤٠.

٣٤- لجنة من العلماء والباحثین، م.س، ص١٣٦٩، هەروەها بڕوانە: www.borrova.edu.tr/neypras

٣٥- حسن، م.س، ص٧٣

*ئیفۆنیس، تەعبیرێکی یۆنانییە، هێمایە بۆ بیرۆکە و بزاڤی بانگهێشت بۆ یەکێتی نێوان دوورگەی قوبرس و یۆنان لەسەر بنچینەی پەیوەستەگی نەتەوەیی. سەرەتای ئەم بانگەوازە بۆ ساڵی ١٨٢٩ دەگەڕێتەوە. بڕوانە: الخوند، م.س، ص٣٦٨.

٣٦- م.ن، ص.

٣٧- عبدالحلیم، م.س، ص٤٥٤.

٣٨- لجنة من العلماء والباحثین، م.س، ص١٣٦٩.

٣٩- م.ن، والصفحة، م.س، ص١٣٦٩.

* ئەم پەیماننامەیە لە نێوان تورکیا و یۆنان و یوگسلافیا واژووکرا، بەڵامبەهۆی ناکۆکی نێوان هەردوو وڵات (تورکیا و یۆنان) لە سەر کێشەی قوبرس، پەیماننامەکە تەنها ساڵێك ڕووناکی بەخۆیەوە بینی و هەڵوەشایەوە. بۆ زیاتر زانیاری، بڕوانە: مجموعة من الباحثین، م.س،ص٢١٣-٢١٤، احمد، ود.خلیل علی مراد، م.س، ص٢٧٦.

٤٠- الخوند، م.س، ص٣٦٨.

٤١- م.ن، ص.

٤٢- احمد، ود.خلیل علی مراد، م.س، ص٢٧٦.

٤٣- الخوند، م.س، ص٣٦٨.

٤٤- عبدالحمید، م.س، ص٤٥٩.

٤٥- بڕوانە: www.almarefah.com

٤٦- حسن، م.س، ص٧٣.

٤٧- عبدالحميد ، م.س، ص٤٦٠.

٤٨- لجنة من العلماء والباحثين، م.س، ص١٣٦٩.

٤٩- سليم، نبيل محمد، العلاقات التركية الامريكية، بحث مقدم الى المؤتمر الاول للدراسات التركية، الموصل، ١٩٨٩، ص٣٧.

٥٠- احمد، ود.خليل على مراد، م.س، ص٢٣٤-٢٣٥.

٥١- الخوند، م.س، ص٣٧٠.

٥٢- بڕوانە: السامرائى، السيد محمود سالم، الاستراتيجية التركية واثرها على علاقة الخارجية، بحث مقدم الى المؤتمر الاول للدراسات التركية، الموصل، ١٩٨٩، ص١٠.

٥٣- سليم ، م.س، ص٣٧.

٥٤- زناد ، م.س، ص٦٠.

٥٥- احمد، فروز، صنع تركيا الحديثة، سلمان داود الواسطى ود.حمدى حميد الدورى، المطبعة العربية، بغداد،٢٠٠٠، ص٣٦٨، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: الخوند، م.س،ص٣٧٠.

٥٦- الخوند، م.س، ص٣٧٠.

٥٧- مجموعة من الباحثين، م.س، ص٦٢-٦٥.

٥٨- زناد، م.س، ص٧٤.

٥٩- مجموعة من الباحثين، م.س، ص٦٥.

٦٠- زناد، م.س، ص٤٩.

٦١- مجموعة من الباحثين، م.س، ص٦٥.

٦٢- احمد، ود.خليل على مراد، م.س، ص٢٣٥.

٦٣- بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: سليم، م.س، ص٤١، عبدالحميد،م.س، ص٤٤١.

٦٤- بڕوانە: الخوند، م.س، ص٣٧١.

# نەورۆز جەژنی سەربەستی و شانازی باوك و باپیر و نەوەكان

د.احمد عبدالعزیز محمود

نەورۆز جەژنی سەركەوتن و شانازی باب وباپیرانمان و نەوەكانمان .هەموو نەتەوەیەك جەژنی نەتەوەیی تایبەتی خۆی هەیە كە بابەتی یادكردنەوە و ئاهەنگ گێرانیەتی ،ئاهەنگ دەگێڕین بەو شێوەی كە بگونجێ لە گەڵ قەبارەی شانازی پێ كردنی گەلەكانی ئاری وەكو هەموو ئەو گەلآنەی دەژیان لەسەر زەوی شانازیان بەجەژنە نەتەوەییەكانیان و نیشتیمانیەكانیان دەكرد ، وە گرنگترین ئەو ئاهەنگانە ئاهەنگی جەژنی نەورۆزە ئەم جەژنە زۆر كۆنەو لە ڕووداوە كۆنەكانی مێژووە ،وە گەلی كوردیش سەر بە(ئاری) یە بێ گومان بۆیە ئەم جەژنە گونجاوە نەتەوەیی یە زیندو ئەكاتەوە هەموو ساڵێك ئاهەنگی بۆ ئەگێرێ هەر لە كۆنەوە، كۆتایی دێت بە لە دایك بوونی چیرۆكێكی بەناو بانگ لەلایەن گەلی كوردەوە كە ئەویش پاڵەوانێكی كوردی ئازا كە ناوی كاوەی ئاسینگر(١) بوو پاشایەكی لە سەر كورسی هێنایە خوارەوەو بە لەناو بردنی مێژووی ڕازاندەوە و ئاسمانی شانازی و پاڵەوانی رووناك كرد ،ڕوناكاییەك لە ناوەراستی لەشی نەتەوەی كورد كە زولم و

زۆرداری تەفروتواناو گۆڕ بە گۆر کرد (٢)وە هەموو شێوەیەکی کۆیلایەتی و زۆرداری نەهێشت (٣)،ئەمەش کە پاشایەکی ستەم کار(٤) و زۆردار کە ناوی (زوحاك)(٥)بوو ژیانی لەسەر مژینی خوێنی سەری مرۆڤی بێتاوان بوو کە ئەم بێ تاوانانە دەبونە قوربانی بۆ ئەم ستەم کارە ،وە ئەم پاڵەوانە ژیانی ئەم ستەم کارەی کۆتای پێهێنا بە شێوەیە کی وا کە لە مێژودا سەیری وانەبووە وەرێرەوی ژیانی نەتەوەی کوردی ئەو کاتەی گۆری بۆیە تا ئێستاش بەم شێوەی ئێستا یادی دەکرێتەوە چیرۆکەکە بەم شێوەیە دەست پێ دەکات (زوحاکی ستەم کاردوو ماری لەسەر هەردوو شانی پەیدا دەبێت بە کاری(٦) خوای گەورە وەخواردنیان لەسەر مێشکی مرۆڤی کورد بەتایبەتی لاوەکان ئەددا بەم دوو مارە ئەم کارە پیسە بەردەوام بوو وە خەلکەکەی زۆر بێزار کرد بوو بەلام پاڵەوانێك کە پەیدا بوو لە ناو نەتەوە ئەویش کاوەی ئاسنگەر(٧) بوو کە تۆڵەی هەزاران لاوی کوردی کردەوە بە هۆی کوتکەکەی کە لەسەری پاشای ستەم کاریدا گیانی تیا نەهێشت هەتا هەیایە ،ئەو رۆژە کە (٢١)ی ئادار بوو بووە جەژنێکی نەتەوەی کە گەلی کورد شانازی پێوە دەکات(٨) هەتا هەتایە وە لە سەر ئەم بنچینەیە جەژنی نەورۆز ڕەگی خۆی دا کوتاوە هەر لە کۆنەوە . لەنێوان هەنگاوە یەك لە دوای یەك و خێراکان لە ڕووداو ونوێ کردنەوە لە ژیان گۆردرا بۆ روداو لە پیشکەوتن و هاتو چۆ لە دواکەوتویی بە هۆی خراپی باری کۆمەلایەتی .بەلگەی یەکجارەکی کە پەیوەندی بە نەورۆزە وە هەبێت ئەوەیە کە وشەی نەورۆز بەواتای رۆژی نوێ (٩)دوو جۆرە یەکێکیان کراسی تایبەتی لەبەر دەکات ئەوی تریان گشتی (١٠).رۆژییەکەم لە مانگی فارسی کە مەشهورە بە بورجیفەرەیدون کە بەرامبەر مانگی نیسان دێت کە تیشکی رۆژ دەگاتە بورجی(١١) هەلگرتنی

دوانزه کە ئەڵێن ڕۆژی یەکەمی وەرزی بەهارە(١٢) . وە قسەیەکی دوور لە ڕاستەقینە باوە کە ئەلێ خوای گەورە جیهان نوێ ئەکاتەوە بۆیە ناونراوە ڕۆژی نوێ(١٣).

بەڵام تێڕوانینی ترەیە لەمبارەیەوە جگە لەمەی باس کرا کە (جەمشید ) ی یەکەم پێش زوحاك ناوەکەی بریتی بوو لەیەك پارچەی لەیەکەم کە (جم) یان پێدەوت پێش زیاد کردنی پارچەی دووەم لە بۆی کە (شید) بوو بە زیاد کردنی پارچەی دووەم شید یەکەم ناوەکە بووە دوو برگە کە هەردوکیان بەیەکەوە ناوێکی لێکدراو دەرچوو (جەمشید ) ئەم پیاوە واتە ( جەمشید ) زۆر تەماحی هەبوو تاوەکو سەربکەوێ بۆ سەرەوە (١٤)، نەك هەر بۆ سەرەوە بەڵکو لە شوێنێکی بەرز روبەروی ڕۆژ هەڵات کە گەیشتێ لە سەری دانیشت تاجێکی لە سەرنا بەنرخترین جۆری خشڵ کە سەری بەرز کرد ، بەڵام ڕۆژ تیشکەکانی ڕەوان دەکرد بۆ ئەوەی بیکەوێنێ لە سەر تەخت وتاج بەڵام بە پێچەوانەوە (١٥)بوو کە خۆی بەجوانترین و نوێ ترین شت نیشاندا لە رەونەق وجوانی ، ڕێکی ئەم روانگەیە دڵخۆشکەر بوو لەلایەن ئەو جەماوەرەی کە لە دەورو پشتی کۆ ببووە کە ناویان لێنا (ڕۆژی نوێ) (١٦).وشەی دووەم کە (شید ) ی فارسی بوو مانای تیشکی ڕۆژ بە زیاد بوونی لەبۆ وشەی (جم ) (١٧)وشەیەکی زۆر نوێی پێك هێنا کە (جەمشید ) بوو . ئاهەنگ گێڕانێکی زۆر ڕێك و پێك ڕۆژی دانیشتنی لە عەرش کە وەسفی کرا پێش ئێستا دەی کرد کەڕۆژێکی نوێ بێت کە ئەم ڕۆژە ناونرا نەورۆز(١٨) . جەژنێکی نەتەوەی گەورە کە هەموو ساڵێ(١٩) ئاهەنگ دەگێر درێ(٢٠) لە ٢١ ی ئادار بەم بۆنەیەوە(٢١) . زیادە لە سەر ئەمانەی باسمان کرد دکتۆر( حمد معین) لە وتەکەیدا فەرمویەتی ((نەورۆز جەژنی نوێ یە بریتی یە لە دوو

جەژنی گەورەی بنەرەتی هەر لە دێر زەمانەوە ئاریەکان ساڵیان کردۆتە دوو موسم ((الحی القی ))یەکەمیان دە مانگ دووەمیان ئەو ماوەی کە ماوە بریتی یە لە دوو مانگ بەڵام رۆژ لە دوای رۆژ و ساڵ لە دوای ساڵ گۆڕانکاری تێکەوت ئەمیش وەرزی هاوین بوو بە حەوت مانگ وە پێنجەکەی تر بووە بەشی وەرزی زستان وە ئاریەکان وایان دادەنا کە سەرەتای هەر وەرزێك لەم دوو وەرزە سەرەتای ساڵێ نوێ یە هەڵدەستان بە ئاهەنگ گێرانی پڕ خۆشی و شادی یەکەم جەژن دەستی پێ دەکرد (٢٢)لە سەرەتای وەرزی گەرم ئەوکاتەی کە گیانلەبەرەکان بچکۆڵەکانیان دەردەهێناو بۆ ناو پوش و پەلاش رویان لە پوش و پەلاش و گژوگیا دەکرد ئەم ماوەیە(٢٣) بەردەوام دەبوو تاوەکو ئەم پوش و پەلاشە نەدەما بەرەو کۆتایی دەرۆیشت ئینجا جەژنی دووەم دەست پی دەکات(٢٤) .

گیاندارەکان دەگەڕێنەوە لانەکانیان و بۆ ئەوەی لانەکانیان گەرم بکەنەوە ژیانیان ببەنە سەر وە دکتۆرێ کە ناومان هێنا لە سەرەوە ئاماژە بەوە دەکات وشەی نەورۆز واتە رۆژێکی نوێ کە ساڵێکی نوێ ی پێ دەکرێتەوە . جگەلە وانەی لە پێشەوە باسکرا مێژوونووس (الجاحظ)(٢٥) لە پەرا وەکەی خۆیدا (المحاسن والأضداد) هەروەها لە کتابەکەی البیرونی ((الاثار الباقیة في القرون الخالیة ))(٢٦) کە لە سەر هەمان بابەتی پێشوو قسە دەکات کە سەر توێژی هەموو قسەکە لەوەدێ کە ئەو جەمشیدەی باس کرا لە پێشەوە مانگی فرودینی (٢٧)کردە شەش بەش بەشی یەکەم کەشەش ڕۆژ بوو بۆ ئاهەنگ گێران بە گەورەکان و ڕووە پاکەکان و ئەوانەی کە شوێنی بەرزیان هەبوو لە ناو پیاوان .وەبەشی دووەمی کە ژمارەی ڕۆژەکانی پێنج ڕۆژ بوو تەرخان کرا بۆ وەرگرتنی سامان لەسەر ئەو کەسانەی شایەنی ئەوەن لە گەڵ

وەر گرتنی خەڵات لە کارەکانیان بە بۆنەی جەژنی نەورۆز وەبەشی سێەم تەرخان کرابوو کە ژمارەی رۆژەکانی پێنج رۆژ بووبۆ رێزگرتن لە دەورو پشتەکەی کە ئەمیش خەلاتی بەنرخی دابەش دەکرد بەسەریان بەلام بەشی چوارەم کە ئەمیش ژمارەی رۆژەکانی پێنج رۆژ بوو تەرخان کرا بوو بۆ ئەو کەسانەی کە خزمیەتی وە خەلاتی دابەش دەکرد بە سەریان دا ئەوانەی شایەنی ئەوە بوون وەبەشی پێنجەمی دیاری کرد بەهەر پێنج رۆژەکەیەوە بۆ پیاوانی سوپا وەرێزگرتن لە پلە و پایەیان بە شێوەیەك(٢٨) کە دەرون فێنك دەکات وە دڵ کەیف خۆش دەکات لەو خەلاتە بەنرخانەی کە دابەش دەکرایە سەریان بەلام بەشی شەشەم بە هەر پێنج رۆژەکەیەوە بۆ هەموو گەلەکەی بوو کە دەگەڕا لە ناویان بۆ ئەوەی حالیان بزانێت و کە راستیەکانیان لە سروشت بەدەر دەخات ئەوانەی کە ستەم کارن و زۆردارن تاوەکو ڕاستەڕێ بن لە ژیان بۆ ئەوەی چارەسەری تەواوو خاوێن شوێنی پیسی بگرێتەوەو ڕەوڕەوەی ژیانیخاوێن بسورێ تاوەکو بەرهەمی ماندوبون بێنن لە گەڵ قەوارەی وەلام دانەوەی چاکایەتی(٢٩) .

ماددەکان وئەخمینیەکان زۆر بایەخیان بە نەورۆز دەدا وەهیچ رۆژێك پەیوەندیان نەپچرێ لەم بابەتەوە وەکو کەسانی تر کێشی تەواویان دایێ کە شایەنی شوێنەکەی بێ لە ناو دلّیان بایەخ دان بە نەورۆز و ئاهەنگ گێڕان بۆی و ڕازاندنەوە بۆی لە چەرخەکانی ژیانی ئاریەکان زۆر بە ئاشکرا خۆی نیشان دەدات کە زۆر بایەخیان بە نەورۆز داوە وە رۆژەکانی نەورۆز جیاوازە لە گەڵ هەموو ڕۆژەکانی تری ساڵ .قەبارەی بایەخ دان بە نەورۆز لێکچونە لەگەڵ قەبارەی رێزگرتنیان بۆی وە پاشماوەکانی بابلیە کۆنەکان شایەدی بەوە دەدات چونکە زەخیرەیەکی مێژوویی کە گیانی لە لەشیەتی ،

وەهەروەها ئەخەمینیەکان (٥٢١-٤٨٦) پ.ز لە پەرستگای مردۆخ ئەم جەژنەیان زیندو کردۆتەوە وە ئاهەنگیان بۆ گێراوە وە ماندووبوونێکی تایبەبەتیان دەکرد(٣٠) بۆ بەرێوەبردنی برگەکان و زیندووکردنەوەی ئەم جەژنە جگە لەپێشکەش کردنی یارمەتی دارایی و ورە بەرزکردنەوە بۆ هەژاران ولێ قەومان وبێ کەسان(٣١) .لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکرێ کە ئەم جەژنە بەختێکی گەورەی هەیە لە سەر دڵی ئاریەکان کە توشی ماندو بوون و مەشەقەتێکی زۆر دەبوون لە کاتی سەفەر کردن لە ئێرانەوە بۆ بابل هەموو سالێك تاوەکو رێو رەسمی جەژنی نەورۆز نوێ بکەنەوە (٣٢).ساسانیەکانیش زۆر زۆر بایەخیان بە نەورۆز دەدا هەڵس و کەوتیان لە گەڵ دەکرد بەتەواوی وەك ئاریەکان وە نەورۆز شوێنی لە ناو دڵی هەموو لایەکیانی گرتبووە وەبەڵێ ئاهەنگ گێران وهەڵپەرکێ و زەرد و سور لەبەرکردن و لەوشوێنەی کەتیایدا دەژیان دە گەیشتە بەرزیی ئاسمان ئەمانە هەر لەناو دڵیانەوە گەورە بیاندابووە ئەم جەژنە وەگەورەییان دابووە رێو رەسمی ئەم بۆنەیەبە بەرزترین پلەی بایەخ دان(٣٣) کەخۆیان دە ڕازاندە وە بەجوانترین ملوانکەی لەمل و زێروزیو وە خۆ دیارخستنی ئەو کەسانەی کەماڵیان زۆر بو و ، وەهەروە ها کەئاگریان دەکردە وە بڵێسەی ئەگەیشتە بەرزی ئاسمان شەوی هاتنی ئەم جەژنە ڕووی دەکردە هەموو ماڵێك لەماڵەکانی ئاریەکان (٣٤)بەبێ جیاوازی لەگەڵ خۆشی و ئاهەنگ گێڕان و تام وەرگرتن تاوەکو ئەم جەژنە(٣٥) لەنێوانیان دەما باشترین و جوانترین جل وبەرگیان(٣٦) لەبەردەکرد خۆشترین و بەلەزە ترین خواردنیان دروست دەکرد (٣٧)وە هەروەها شیرنەمەنی و شلە مەنی لەگەڵ ئەوئاهەنگ گێڕانەی کەپڕ لە زەوق و شەوق بوو (٣٨)وەلەو ئاریانەی کەزۆر شانازیان

ـ بەنەورۆز دەکرد (فارس و کورد و تاجیك وئەفغان و ـ...... هتد)(٤٠) وەئەوەی شایەنی باسە پاشایەکانی فارس دووجار حەڵتیان بۆ دەهات هەمووساڵێك بەبۆنەی نەورۆزو میهرەجان پێش هەڵاتنی ...کایی ئیسلام لە هەموودونیا جگە لەو باجە تایبەتیانەی کە وەریان ـەگرت لەچالاکیەکانی کشتوکالی بۆ بەهێز کرد نی باری ئابووری ،ئەوکاتەی ـینی نوێ واتە (ئیسلام ) باڵی کێشا لەسەر(بقاع و اصقاع)گەلی کوردیشی گرتەوە کەلقێکی بنەڕەتی ئاریە دەستی کرد بەبایەخ دان بەنەورۆز .

وەئەوەی لەئاینی نوێ هاتبوو نەدەتواندرا هەردوو کی بەیەکەوە جێ بە جێ کرایە بەلاّم ئەم دوو لایەکیە ناتوانێ ئەم دوو جمکە یەك بکات لە ژێر سێبەری نوێی بۆ ژیانێکی لە سەرە خۆو بێ دەنگ کە خۆشی و بەختەوەری بلاّو کاتەوە ئەوە بوو وای لە ئاریەکان کرد کە توشی تەنگ نەفەسیەك و وە تەسکاییەکی خنکێنەربن لە جەژنی نەورۆز کە جیاوازیان بکاتەوە ئەوانەی کە شانازی بە نەورۆز دەکەن لەگەڵ نەورۆزدا (٤١)کە وردە وردە وای لێ دەهات ئەو کەسانەی کە باوەری قوڵیان بە نەورۆز هەبوو دەریان بهێنێ لەو بازنەیە ئەوە سالانی خایاند وە ئەو هۆکارانە گەیشتە ئەو رادەیەی کە تحکم بکات بەرێورەسمی نەورۆز بۆ وێنە کردنی سنورێکی جیاواز لە مابەینی نەورۆز ولە مابەینی ئەو دلاّنەی کە پری بوو لە زەوق و شەوقی نەورۆز ،تا وای لێ هات وابکرێت زۆر بایەخ بە ئاگری نەورۆز نەدرێت لەلایەن ئاریەکان کاتێ کە پێشوازی ساڵی نوێ دەکرێت ئەمە هۆکاری ئایینی ئیسلام بوو وە باشترین بەڵگەش ئەوە بوو کە خەلیفە فاروق ئەم خەلاّت و باجانەی کە پەیوەندی بەو بیرەوەریە هەبوو رەتی کردەوە و نەیهێشت وە هەروەها گیشتە ئەو رادەیە کە رێو رەسمی نەورۆز قەدەغە بکرێت(٤٢) لە بەر ئەوەی بیرو باوەریان وابوو

کە خەلکەکە بەرە وشێتی دەبات وردە وردە ئەو تەیارە نوێ یە وای کرد کە جەژنی نەورۆز وەك جاران لە ناو پەرستگای دلأنی شانازی پێ کراوان بە نەورۆز نەمینێت نەك بەلابردنی بیرو باوەر بەلکو بە هۆیەکی تر (٤٣).

بەلأم ئەم رێگرتنە و کەند وکۆسپە وردە وردە بەرەو کەمی دەرۆیشت لە پێش ئاریەکان بە تایبەتی ئەوانەی کە دوبارە دەورەیان دا لە یادگاریەکانیان کە نەورۆز بوو وا حەماسیان وردە وردە دەستیان بەزیاد بوونی کردەوە ماوەیان بە وەفایی بۆ کەلتورەکانیان کە دەستی بەبلێسەو نەتەوەیی کرد وە لە سەر دەمی رۆژانی خەلیفە ((علی کوری ابی تالیب )) هەندێك رێگا خۆش بوو بۆ جێ بەجێ کردنی ئاوات بۆ نوێ کردنەوە و یاد کردنەوەی ئاهەنگەکانی باب و باپیران جارێکی تر ،وە ئەم ماوەیە کەمە زۆر خۆش بوو لەلای ئاریەکان وە فراوانتر بوو لە سەردەمانی پێشووە زۆر بایەخ درا بە نەورۆز وەهەندێك شل و پەیتی درایە و ئابلو قەدان کە خرابوە سەر شانازی کەرانی نەورۆز لە پێش ئەم شل و پەیتییە وای کرد کە پالەوان ((علی کوری ابی تالیب )) (د.خ) خەلأتی بەنرخ ئامادە بکات بۆ ئەم مەبەستەوە هەروەها رێگا بدات بە دابەش کردنی شیرنەمەنی و خواردەمەنی لە سەر نوێژکەرەکان لە مزگەوتی کوفە بە بۆنەی هاتنی بەرەبەیانی رۆژی نەورۆز لە سەر ئەو کەسانەی کە ئارین، وە هەروەها غەیری ئاری (٤٤).

ئەوەی لە پێشەوە باس کرا ئەوە بەدەردەخات کە جارێکی تر وردە وردە جەژنی نەورۆز خۆی دەرازێنێتەوە بە زێرو زەبەن بۆ خۆ ئامادە کردن بۆ ئاهەنگ گێران لە لایەن ئاریەکان زۆر بەرێزەوە ،ئەبێ ئەوەش بزاندرێت کە خەلیفەکانی ئەمەوی بە شێوەیەکی جیاواز بایەخیان دا بە جەژنی نەورۆز ،یەکەم خەلیفەی ئەمەوی ((معاویە کوری ابی سفیان ٤١-٦٠ ك/٦٦١-٦٧٩

ـ ٤٥) باجی نەورۆزی بەهارو ڤیستیڤالی پایزی زیندووکردەوە بەهۆی تەنگ و چەڵەمەی باری دارایی جەژنی نەورۆز هەنگاوی تەواوی بۆ نەهاوێشترا ٤٦)لەلایەن کارگێری دەوڵەتی ئیسلامی و یەخسیر کرا بوو وەك ئێسقانێك کە گۆشت و پێستی لە دەورو پشتی نەبێت واتە رووت و قوت بێت وا بوو بەڵام ((حەجاج کوری یوسفی سەقەفی )) بایەخێکی زۆری دا بە نەورۆز لە کاتی خەلافەتی (عبدالملك کوری مروان ٦٥-٨٦ ك /٦٨٤-٧٠٥ ز )(٤٧)وە پێشوازیەکی باش کرا لەلایەن پیاو ماقولانی ئەو سەردەمەو خەڵاتی زۆر بەنرخ دابەش دەکرا بەم بۆنەیەوە ،وەساڵ لە دوای ساڵ ئەم جەژنە پڕ خێرو بەرەکەت دەبوو بەرز دەکرایەوە و رێزی لیّ دەگیرا(٤٨) .بەڵام ئەم جەژنە باڵی داخست و جوولەی زۆر کەم بوو(٤٩) ، بەلکو قەدەغە کرا لە سەردەمی خەلیفە((عومەری کوری عەبدولعەزیز ٩٩-١٠١ ك/ ٧١٧-٧١٩ ز))(٥٠)بەڵام لە سەردەمی خەلیفە ((یزید کوری عەبدوالمەلیك ١٠١-١٠٥ ك/٧١٩-٧٢٣ ز )) جەژنی نەورۆز (٥١) گیانی هاتەوە بەرو جەژنە پیرۆزە دەکرا لە نێوان هاولاّتیان و بەخشینی خەلاّت لە نێوان بەر پرسان و جەماوەر و گەرانەوەی باجی تایبەت بە نەورۆز ، لە سەردەمی عەباسییەکان بە تایبەتی سەردەمی خەلیفە ((مەئمونی کوری هارون ئەلرە شید١٩٨-٢١٨ك/٨١٣-٨٣٣ ز))) و سەرکردەی سوپا ((عبداللە ی کوری تاهیر )) زۆر بایەخ بە جەژنی نەورۆز دراو بەرزترین پلە و پایەی پێدراو بیرەوەرییەکی زۆر بەرێز بوو لە سەر دڵی یاوەرانی جەژن ، زۆر بەخۆشی یەوە وەرگرتنی یەدەگەکی تەواو بۆ پیشوازی نەورۆز وەر دەگیرا و خەلاّتی شایانی خەلیفە بوو بێت پێشکەشی دەکرا لە لایەن ئاهەنگ گێران(٥٢) .

بایەخ دانی ((عبدالله کوری تاهیر )) دوو بایەخ دان بوو یەکێکیان بە شداری دەکـرد لەگـەڵ گشت ئاهەنگ گێڕان و ئـەوی تریـان ئاهەنگ گێـران بوو لـەم بەشەی کە دەکەوتە ژێر کارگێڕی و دەسەڵاتی خۆی راستەوخۆ(٥٣) .

خەلیفە ((متوکل علی الله ٢٣٢-٢٤٧ك /٨٤٦-٨٦١ ز))) ئەم بیرەوەریەو جەژنە پیرۆزەی بەتەواوی قەدەغە کرد لە سەرەتای حوکم گێرانی بەڵام پاش ماوەیەك بڕیارەکەی خستە پشت گوێ و بڕیارێکی تری دەرکرد کە ڕێگا بدرێت بە جەماوەر ئاهەنگ بگێرن(٥٤) .

وە لە سەردەمی خەلیفە (الراضی٣١٢-٣٢٩ك /٩٢٤-٩٤١)(رازی )بایەخ دان بەجەژنی نەورۆز گەیشتە ئەو پەری فراوانی و داوەت و داوەت کاری دەکراو ژەمانی تایبەت و گەورەو پوختە ئامادە دەکرا (٥٥)لە دوای خۆشی شەوی نەورۆز بە ئاگر کردنەوەی گەورە کە دەگەیشتە پلەیەکی مەزن و گونجاو وەهەروەها لە وولآتی میسریش(٥٦) زۆر بایەخ بە نەورۆز لەلایەن قبتیەکان دەدرا کە دەیان ووت نەورۆز قبتی (قبطی) وەیەکەم رۆژی ساڵی نوێی قبتی بوو(٥٧) .

مەمالیکیش زۆر نەورۆزیان خۆش دەویست (٥٨)و رەگ و ڕیشەی گەیشتبووە دڵیان کە لە هەموو کەسانێکی تر بایەخیان پێ دەدا ، هەر مەزهەبەك بایەخی بەم یادوەری یە دەدا بەو شێوەیەی کە خۆی دەی ویست وخواردنی پوختەی ئامادە دەکرد بۆ شەوی جەژنی نەورۆز بۆ ئەوەی لە دوای ڕۆژهەڵات دەست بە خواردنی بکەن ،وە هەروەها رۆیشتنیان کۆمەڵ کۆمەڵ لە رێگەو شەقامەکانی قاهیرە وە بە جێ هێنانی چالاکی و یادی کردنەکان وەك ئاو ڕشاندن و مسافەحە بە پێست .

ـەـ چالاکیانە کە دەکرا جیاوازی هەبوو لە نێوان ناوچەیەك بۆ ناوچەیەکی ـیـ دەست دەکرا بە ئامادە کردنی شیرنەمەنی ئینجا خواردەمەنی تا ـەگەیشتە ئاهەنگ گێران وە ئامادە کردنی خواردەمەنی میوانان لە ئەنجامی ـوەت و داوەت کاری بەرامبەر یەك لە نێوان پارچەکانی گەلانی میسری بە ـیەخ دانێکی زۆر بەهێز بۆ ئەم جەژنە بەشێوەیەك کە ئەو رۆژە دەکرا بە ـتـو سەرتاسەری هەموو جمو جۆلێکی رەسمی و نارەسمی تاوەکو خەڵك هەمووی بگاتە ئەم خۆشیە وەلەزەتی لێ وەربگرێ هەریەکە بەرێگەی خۆی ـەو شێوازەیکە تام و بۆنێکی تەواوی هەبوو بێ بە تایبەتی لە چەرخی ـسولتان فەرەج کوری بەرقوق ))(٥٩) .

ئەم جەژنەیە بە گوێرەی رووداوەکانی مێژو وەبە درێژایی کات گەراوە ـەر بایەخ نەدان وەنزم بونەوەی ئاستی لە سەردەمی عوسمانیەکان وە زۆر تەسکایەتی بە خۆیەوە دی تا وای لێهات هەر بایەخی پێ نەدەدرا لە ئەنجامی ئەم ژیانە تەنگەیە و قورسایی ژیان بەهۆی تەنگ و چەلەمەی ئابووری کە دوور بوو لە چارەسەر کردن لە ئەنجامی ئەو ئاژاوەی کە پەیدا بوو لە بینی عوسمانیەکان و سەفەویەکان ئەمە لەلایەك هەروەها دوو بەرەکی کوردی لەگەڵ یەکتری لە لایەکی تر وە گۆرانی جەژنی نەورۆز لە شانازی پێ کردنی لەلایەن خاوەنی بۆ گۆرەپانی چالاکی خوێناوی بەرامبەر لە هەموو لایەك وە بەبێ جیاوازی بەلام قوربانی گەورەی نەورۆز خاوەنەکەیەتی لەم باروو دۆخەی کە تیا بوون(٦٠) .

رەوڕەوەی ژیان هەموو کاتێك هەر لە گۆرانکاریەیە وە بە گوێرەی جەژنی نەورۆزیش بەهێزی وپوختەیی گەراوە گۆرەپان لە سەردەمی ((بەهائی یەکان ))کە جل و بەرگی رەونەق داری لەبەرکرد رەونەقیەکی بێ وێنە کە

گەورەترین جەژن نەورۆزیش دەستی پێ کرد لەلایان ناویان لێنا جەژنی ((رضوان)) لەپاش ئەوەی کەزۆر بەفراوانی بایەخیان پێدا تاوای لێهات نۆزدە رۆژی نەورۆز بەرۆژو بن لەبەرە بەیانی رۆژهەلاتی ئەم جەژنە دەست کرا بە ئاهەنگ گێران بەبێ پچران بە تایبەتی (٦١)لە سەردەمی میر محمد رەواندزی (پاشای کوێرە ))(٦٢) وەمیری کوردی خاتوو ((خانزادی سۆران )) کە مافی جەژنی نەورۆزیان دەدا وە بەوە فا بوون لە گەلی وە ئاوازی ریز گرتن و گەورەیی دەنگی دەداوە هەموو ناوچەکانی دەوروپشت کە ئاوازی نەمری لە ئاگر کردنەوەی نەورۆز بە دەردەکەوت و شانازیان پێوە دەکرد و بە شێوەیەك کە مندالّ لە زگی دایکی هەستی پێ دەکرد لە کات وساتی ئەم میرە بەرێزە واتە ((خانزادی میری سۆران ))لە هەردوو شوێنی چیای سەفین و دەشتی حەریر وەلە گوندی ((خرواتان)) ئەوە کە پەیوەندی بە نەورۆز هەبێت لە میر نشینی سۆران(٦٣) .

بەلاّم ئەوەی کە پەیوەندی بە میر نشینی بابان هەبێ جیاواز بوو بە جیاوازیەکی تەواو بە هۆی سروشتی ئەو بارو دۆخەی کەلە هەردوو کاتی هەردوو میرنشیندا لە کاتی میرنشینی دووەم گۆرا لە ئەنجامی ئەو بارو دۆخەکە پڕ بوو لە بەر بەرەکانی لە نێوان بابانیەکان (٦٤)و دوژمنەکانیان وە ساردایيەکی زۆر پەیدا بوو بۆ بیرەوەری ئەم جەژنە کاتێك کە وەرزی بەهار نزیك دەبۆوە وەرزی زستان دەرۆیشت چونکە نیشانەی شەڕو شۆرو جەنگ بە سەریەوە دیار بوو کە جارێکی تر تێك چون ومالّ وێرانی ناوچەکەی گرتبۆوە کە نەدەتواندرا ئەم جەژنە مافی خۆی بدرێتێ بە گوێرەی قەبارەی خۆی .(٦٥)

ئەوەی ئاشکرایە ئەم بیرەوەریە نەتەوەییە نەمرە جیاواز بوو لە کاتێك بۆ کاتێکی تریان لە سەردەمێك بۆ سەردەمێکی تر بە گوێرەی هێزو هەستایەتی بۆیو وە بە گوێرەی رێگادان بە ئامادە بوون بۆی لە هەموو بارو دۆخێك وە کۆری بوێژو شاعیران کە جێگای شانازیان بوو بۆ خوێندنەوەی هەلبەستی جۆراوجۆر وە بایەخ دان بەم بیرەوەریە بیرەوەی نەمری جەژنی نەتەوەیی کورد کە کۆری (٦٦)هەلبەستی بەتام و بە لەزتیان ئامادە دەکرد بۆ ئەم جەژنە هەر وەکو هەلبەستەکانی نەتەوەیی کوردی کە بەلگەیەکە لە سەر شانازی پێوە کردن وەك شاعیر مەلای جەزیری و حاجی قادری کۆیی و گۆران وپیرەمێرد و وە ژمارەیەکی زۆر لە بوێژان و شاعیرانی تر .

لە سەرەتادا دەست پێ دەکەین بە شاعیر مەلای جەزیری (٦٧)کە لەم دێرەدا دەلێ:.

ئەو نورو سقالا دلە دائم لویَ قالا دلە

نـەورۆز سـەر ســالا دلــە

وەقتی هەلیــتن ئەو ســراج

وەئەحمەدی خانی(٦٨) لەم دێرە هۆنراوەیە دەلێ:.

رۆژا کورد بویە ئعیدی نەورۆز

تعظیم ژبو دمال دل ئەفرۆز:

حاجی قادری کۆیی(٦٩)) ئەم دێرە هۆنراوە یەدا دەلێ:

رۆژانەی ئەی بای نەورۆزێ لەبن بەفری گران

کانـــی پـیـــێ ســڕ بـــوو

چناریش دەستی چوو پەنجەی تەزی

وەسالم (٧٠)بە سەرکردەی ڕاستی جەژنی نەورۆز دادەنریت دەلێ:.

صبحی نەورۆز وەختی بەزمی شراب

الصـــبوح الصـــبوح یا أصـــحاب

وەگۆران دەربارەی هۆنراوەکەی کە تایبەتە بە نەورۆز دەڵێ :

نورۆز ئەکەم

| | |
|---|---|
| نەورۆز ئەکەم | نەورۆز ئەکەم |
| نەورۆزێکی | بە سۆز ئەکەم |

وەپیرە مێرد(٧٢) بەبۆنەی جەژن دەڵێ :.

ڕۆژی تازە ساڵی تازەی ئێمە هات

ڕۆژ هەڵات ڕۆژی هەڵات سەرما هەلات

## پەراوێز و سەرچاوەکان

١- علاءالدین سجادی:.مێژوی کورتی نەورۆز گۆڤاری هیوا ژمارە((٣٢))نیسان ١٩٦١ل٢ شێخ محمد مردۆخ مێژوی کوردو کوردستان گۆرینی لە فارسییەوە محمد فدا ،بەشی (٢)ضاث کراوی طۆظاری هیوا (بةغدا١٩٥٢) ،ل٤

٢- نزار جرجيس علي : دراسات كوردية ،الجمهورية العراقية الامانة العامة للثقافة والشباب مطبعة اوفسيت المشرق (بغداد ١٩٨٢ )ل١١٣ .

٣- حلمي علي شيرف :ملحمة نوروز كوردستان ،جمهورية العراق ،دار الثقافة والنشر الكوردية ،(بغداد ١٩٩١م ) ل٢٤، ٢٩,٣٠،عبدالرقيب يوسف : شوێنەوارەکانی نەوی لە شاخی سورین ، وەزارەتی رۆشنبیری هەرێمی کوردستان ((هەولێر : ١٩٩٤ ) ل٥٠ –٥١ .

٤- عن الضحاك : تسمية الحجم (بيوراسف ) ينظر :

١)ابو حنيفة الدينوري (ت٢٨٢ ه / ٨٩٥م )الاخيار الطوال ، المكتبه العربية ،(بغداد لصاحبها نعمان الاعظمى ) ص٩، المسعودى :ابو الحسن علي بن الحسين بن علي : التنبيه والاشراف ،تحقيق محمد محي الدين عبدالمجيد الطبعه الثانيه مكتبة الخياط ١٩٦٥م ل٨٥- ٨٦ وأن كلمة الضحاك اتخذت صيغا مختلفا منها ( ئةذديهاك ،ئاذى دياك ،ئاذى دةهاك ،ئةذى دةهاك ،ئةذدةهاك ،ئاستيار ،ئاستياكز ) و (( وردت كلمة اذهى دهاك )) ولقب الضحاك ((بيفر أسب)) ينظر : دكتر ذبيع الله صفا حما سة سرأي در أيران ،أز قد يمترين عهد تاريخى قرن اردهم هيجري تهران تحقيق دركيفين تكوين و تدوين روايات علي منظم انها بلهجات

داستانها ی ملی ل٤٢٤– ٤٢٥ علي اكبر دهفدا : لغت نامه ،تهران سالی ١٣٢٨هـ البيرونى الاثار الباقية عن القرون الخالية المتوفي ((٤٤٠ هجري /١٠٤٨ م))بغاية أدوار سخو ليزيك ١٩٢٣م ل١٠٣ يقول عن الضحاك الضحاك بن علوان العمالقة وهو بيوراسب بن أرونداسب أبن ((دينكاو بن برينش بن غار أبن اغرواك بن سيماك)) ينظر عن الضحاك : القلشقندي : أبو العباس أحمد ت ((٨٢١ هجري /١٤١٨ م)):نهاية الارب في فنون الادب طبعه . مصر .الجزء الاول ل٧.

٥– سيد برسي سايكيس : تاريخ ايران :سيد محمد تقر تهران ١٣٤٣ هجري ج١ /١٨٧ .

٦– حلمي علي شريف : ملحمة نورۆز ل ٢٤ –٢٩ عبدالرقيب يوسف :شوێنه واره كانى :ل٥٠ –٥١

٧– اليعقوبي :أحمد اسحاق بن جحفر بن وهب ابن واضع اليعقوبي ،((ت٢٩٢ هجري /٩٠٤ م ))تاريخ اليعقوبي ،علق عليه ووضع حواشيه حليل منصور ، دار الكتب العملية ((بيروت ،دار صادر . دار بيروت ج١/ ١٥١))

٨– الطبري :ابو جحفر محمد بن جرير الطبري ((ت٣١٠ هجري /٩٣٢ م ))تاريخ الرسل والملوك ،تحقيق :محمد ابو الفضل ابراهيم الطبعه الرابعة دار المعارف ،((القاهرة ١٩٦٦ م ))ج١/ ١٩٤ .المسعودي :مروج الذهب و معادن الجوهر ج١ /٢٢٣ – ٢٢٤ ج٢ / ١٢٢ –١٢٤ .ابن الاثير : عزالدين ابي السعن علي بن محمد بن عبدالكريم الجرزي ((ت٦٣٠ هجري /١٢٣٣م )):الكامل في التاريخ دار صادر ،دار بيروت للطباعة والنشر (١٩٦٥ م /١٣٨٥ هجري /ج١ /٧٤ –٧٥ –٧٦ .)ياقوت

لحموي :شهاب الدين ابي عبدالله ((ت٦٢٦ هجري /١٢٢٨ م))معجم البلدان دار صادر دار بيروت ((د. ت )) ج١/ ١٢٨ / ٢٠٧ .

٩- حسن بيدينا : تاريخ مختصر ايران انقراض ساسانيان ((منير دولة سابق )) تهران مطبعة مجلس سنة ١٣٠٨ هجري /ل٥٦ .

١٠- محمد حسين خلق تبريزي متخلص بيرهان ،فرهنك برهان قاطع جلد جهارم صفحة ٢١٨٧ -٢١٩٣

١١- المسعودي :التنبيه والاشراف ل ٢١٥ -٢١٦

١٢- حسن محمود حمه كريم : نه ورۆز خوێندنەوەیەکی نوێ یه وەکو ریشەی مێژوویدا ، گۆڤاری رامان ژمارە (٤٦ ) نیسانی (٢٠٠٠ ز) ل٣١ -٤٤

١٣- الطبرى : تاريخ الرسل والملوك ج١ /١٩٧ . ياقوت الحموي :معجم البلدان ج١ /١٢٨ -٢٠٧ . المسعودى : التنبيه ل١٢٨ -٢١٥

١٤- اذربيجان : وحد أذربيجان من برذعة مشرقا الى اذربيجان مغربا : ينظر ياقوت الحموي ج١ /١٢٨ .

١٥- جمال بابان : مێژوی نەورۆز ، رۆژنامەی ژین ژمارە ((١٥١٩)) ساڵی (٢٥) سێ شەمە ٤/٤/١٩٦٠ ز ل٦ . حلمی علی شریف ملحمە نەورۆز ل٨.

١٦- القلشقندى :نهاية الارب ج١/١٨٧.

١٧- احمد زەردەشت : کاوە نەورۆز ، ئەفسانەو بیری نوێ ، جمهورية العراق وزارة الثقافة والاعلام دار الثقافة والنشر الكردية دار الحرية والطباعة ((بغداد ١٩٩٩م ) ل١٦٤،

١٨- القلشقندي : نهاية الارب ج١/ ١٨٥ .

١٩- ابن الاثير :الكامل في التأريخ ج١/ ٧٤ -٧٥ .

٢٠- القلشقندى : نهاية الارب ج١ /١٨٥.

٢١- المسعودى : مروج الذهب ج١ ٢٢٣ .

٢٢- أحمد زەردەشت : كاوە نەورۆز ل١٥٠- ١٥١ .

٢٣- حەمە بۆر : خانی لەپ زێرین وەقەڵای دم دم کە هێشتا دەست نووسە (٣) ل٢٢٣.

٢٤- ف .کەڕ .پۆفسکی : نهێنی کۆنترین مێژو جەلال تەقی ، چاپخانەی ڕاپەڕین ..سلیمانی ١٩٨٠ ز ل١٧ .

٢٥- الجاحظ : عمرو بن البحر (( ت ٢٥٥ ك / ٨٦٨ ك )) المحاسن والاضداد باعتنا محمدأمين الخانجي طبعة القاهرة ١٣٠ ك /ل٣٢٣ .

٢٦- البيرونى : الاثار الباقية عن القرون الخاليه ل١٠٣ .

٢٧- أحمد زەردەشتی : كاوە و نەورۆز ل ١٥٤ .

٢٨- محمد التونجى : فەرهەنگی خلانی : المحجم الذهبي (فارسی عەرە بی ) دار العلم للملايين الطبعة الاولى (بيروت ١٩٦٩ م) وةرطيَراوة .

٢٩- حلمى على شريف : ملحمه نەورۆز ل ١٢ .

٣٠- ئەم بیرە لە ئاکامی خوێندنەوەی کتێبی مێژویی باستانی حەسەن بیرنیاوە لە لایەن حمە بۆەوە وەرگێراوە احمد زەردەشت کاو ە و نەورۆز ل١٦٩ بروانە گۆڤاری هەتاو ژمارە (٢٥) ی (!) ی (٢٠) ی مارت ١٩٥٥ ز ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١٤) ی (٨) ی ئازادی ١٩٧١ بکە .

٣١- شاكر فتاح : له نەورۆزدا چی بکەین ، رۆژی نوێ،ژمارە (١) خاكه لێوه (نەورۆز ) ٢٥٧٢ ی نیسان ١٩٦٠زسالّی (١) لاپەرە ٢١، ٢٢ ز .

٣٢- هەمان سەرچاوەی پێشو .

٣٣- القلشقندی : نهاية الارب في فنون الادب ج١ ١٨٦ احمد زەردەشت كاو ه و نەورۆز ل١٩٧ .

٣٤- بۆچی كورد له نەورۆزدا ئاگر دەكاتەوە ، رزگاری ژمارە (١) سالّی یەكەم یەك شەمه ، (٢٠) ی نیسان ١٩٩٦ ز ل ٥٠ : عومەر ابراهيم عزيز دياری نەورۆز له پەخشانی كوردیدا . بەشی یەكەم ١٩٣٥ -٩٦٩ز مطبعة الفنون ١٩٨٩ ز .بغداد ل٢٨٧ .

٣٥- برروا : خۆزگه له نەورۆزدا . رۆژنامەی بدروا ژمارە (٢٩) سالّی (٢) رۆژی شەمه ٢/١٧ /١٩٦١ زل٤ .

٣٦- اليعقوبی : تاريخ البعقوبی ج١/١٥١ .

٣٧- د . شاكر خصباك : الاكراد مطبعة شفيق بغداد ١٩٧٢ م .ل٥٠٠ .

٣٨- بدروا : خۆزگه له نەورۆزدا ، هەمان ژمارە هەمان لاپەرە ، رۆژنامەی ژین ١٠ربيع الثاني ١٣٦٣هـ ، ١٥نیسان ١٩٤٣ زسالّی ١٧ زنجیرە ژمارە (٧٠٣) ،٣ و٤ .

٣٩- معروف خەزنەدار : جەژنی خەبات و ئازادی و گولّ، گۆڤاری شەفەق ،ژمارە (١٣) سالّی دووەم شباگ ١٩٦٠ لاپەرە ١٥ و١٩ وەرگێراوە .

٤٠- هەندێ زانیاری تازەی مێژویی لەبارەی نەورۆزوە گۆڤاری ژمارە (٥٤) ی ١٩٨٧ زل ١٨ : احمد زەردەشت كاوە و نەورۆز ل١٩٧ -١٩٨ .

٤١- احمد زەردەشت : كاوە و نەورۆز ل ١٩٧ -١٩٨

٤٢- احمد زەردەشت :کاوة ل١٩٧ -١٩٨ کاروان ژمارە (٥٤) ی ١٩٨٧ ز . ب١٨.

٤٣- هەمان سەرچاوەکانی پێشو .

٤٤- هەمان سترضاوةكانى ثيَشو .

٤٥- گۆڤاری کاروان ژمارە (٥٤) ی ١٩٨٧ ز ل١٨ -١٩ احمد زەردەشت کاوە و نەورۆز ل١٩٨ - ١٩٩ : گۆڤاری رۆشنبیری نوێ . ذمارة (١٠١ ) کوردایەتی جەژنی نەورۆز .

٤٦- گۆڤاری کاروان (٥٤) .ل ١٩ . احد زەردەشت : کاو ە ل١٩٩ : حسن محمود حمە کریم : کاو ە و نەورۆز لەنێوان ئەفسانەو ئایین دا چاپی دووەم سلیَمانی ١٩٩٩ ز ل٤٧ ٤٨ ،شاهنامەی فیردوسی : راست کردنەوەی زول و مول چاپی پێنجەم . ١٣٧٤ ە انتشارات سفن .

٤٧- احمد زەردەشت : کاوە ونەورۆز ل١٩٧ .

٤٨- شوکر مستةفا : دەفتەری کوردەواری ، ژمارە (٢) سالّی ١٩٧٠ ز.

٤٩- حلمی علي شريف : ملحمة نورۆز ل ١٤ - ١٣ د. كامل بصير: رۆشنبیری نوێ ژمارە (١٠١ ) ئازادی سالّی ١٩٨٤ ز محمد عبدالرحمن زەنگەنە نەورۆز نامە چاپخانەی الجاحظ ،بغداد ١٩٨٧ ز ، ل٩ .

٥٠- طؤظاری کاروان ذمارة (٥٤) ی ١٩٨٧ ز ل١٩ .

٥١- هتمان سرضاوةى ثيَشو .

٥٢- البيرونى : الاثار الباقية عن القرون الخالية ل ٢٢٣ .

٥٣- د. حسن ابراهيم حسن : تاريخ الدولة الفاطمية ، القاهرة ، ٩٥٩ م . ل٦٥٩ - ٦٦٠ .د. محمد جمال الدين سرود : تاريخ الحضارة الاسلامية في الشرق ، الطـبعة

الثانية ١٣٩٣ هجري / ١٩٧٢ م.ل١٩١ز حلمي علي شريف : ملحمة نوروز ل ١٣.

٥٤- گۆڤاری كاروان ژماره (٥٤) ی ١٩٨٧ز ل ١٩ - ٢٠ . احمد زەردەشت كاوەو نەورۆز ل١٩٩- ٢٠٠.

٥٥- الصولي : ابوبكر محمد بن يحيى الصولي (ت ٣٣٥هجري ، ٩٤٦ الميلادى ) اخبار الراضي و المتقي من الكتاب الاوراق و عني بنشره ، هيورت من دار المسيره بيروت ، الطبعة الثالثه ١٩٣٥ م ، ١٩٧٩ ل١٣٢ -١٤٠ ز

٥٦- بجكم (P) وكنيته ابو الحسين (ب) ولم تذكر كتب التاريخ التى بين ايد ينا أسم ابيه و ألى ماكان الديلمى (ه) .

ا/ بجكم: مسكويه : ابو علي احمد بن محمد بن يعقوب (ت ٤٢١هجري /١٠٣٠ م) : كتاب تجارب الامم نشرة ف أمدروز مطبعة التمرين الصناعيه مصر ١٣٣٢ هجري / ١٩١٤ - ١٩١٥ م . ج١. ل٣٧٥ و ياقوت الحموي : معجم البلدان ، باءعتناء و ستنغلد لابيزج ١٨٨٦ - ١٨٧٠ م ، ج٣ ول٢١٣

والذهبي : شمس الدين ابو عبدالرحمن محمد بن احمد بن عثمان بن قايماز (ت٧٤٨ هجري / ٣٤٠٧ م) الخبرفي خير من غير تحقيق فؤاد السيد مطبعه الكويت ، الكويت ١٩٦١ م ، ج٢ حاشيه ل٢٠٢ .

ب/ الصولي : اخبار الراضي ل١٨٦ طبعه سنة ١٩٣٥ م.

حسن الباشا : الالقاب الاسلامية في التاريخ والوثائق والاثار مكتبه النهضه الحرية : القاهرة ١٩٥٧ م ، ل٢٠٨ - ٣٠٦ .

ج/ الصولي : اخبار الراضي ، طبعة سنة ١٩٣٥ ل٤١ - ١١٤ مسكويه تجارب الامم ج١ . ٣٧٥ .

ابن كثير : عماد الدين ابو الفداء اسماعيل بن الكثير القريشي البصري ثم الدمشقي (ت ٧٧٤ هجري / ١٣٧٣م) : البداية والنهاية ، مطبعة السعادة ، القاهرة ، ١٣٤٨ -

١٣٥٨ هجري /١٩٢٩ – ١٠٣٩ م ج١١/ ١٨٣.

ء/ مسكوية : تجارب الامم ج٢ /٤ وياقوت الحموي : معجم البلدان ج١/ ٥٣٢.

ه/فيصل السامر : الدولة الحمدانية في الموصل وحلب مطبعة الايمان و بغداد ١٩٧٠ م ،ج١/٢٢٤ . احمد عطيه الله : القاموس الاسلامي . مكتبة النهضة المصرية القاهرة ١٩٦٣ م .ج١ ، ل٢٧٤ .

٥٧- المقريزي ، تقي الدين احمد بن علي ( ت٨٤٥ هجري /١٤٤١م )المواعظ والاعتبار بذكر الخطط والاثار ، جزاءن طبعة ، بولاق ، ١٢٧٠ هجري ج١ / ٤٩٣٠ .

٥٨- المعاليك : المملوك وجمعه معاليك اسهم مفعول مشتق من الفعل العربي ملك وتخذ هذا اللفظ معنى اصطلاحي خاص في التاريخ الاسلامي فاصبح يقصد بالمماليك جموع الدقيق الابيض الذين كانوا يصبحون رقيقا امانتيجة للاسر في الحرب او الشراة من التاجر الذين يجلبونهم الى البلاد الاسلامية حيث يطلبون اثمانا مرتفعه لبضاعتهم ينظر ، د. عادل زيتون تاريخ الممالك مطبعة دار الكتاب المنشورات جامعة دمشق الطبعة الرابعة ١٤٧- ١٤١٢هجري /١٩٩١- ١٩٩٢م ل١.

٥٩- د. عادل زيتون : تاريخ المماليك ل١٥٨- ١٥٩ .

٦٠- یاداشتەکانی محمد مستەفا حەمەبۆر دەستنووس (٢) ل١٣٣.احمد زەردەشت کاوە و نەورۆز ل٢٠٠- ٢٠١

٦١- الشيخ محمد الكاضمي ا لقزويني : البهائيه في الميزان /الطبعة الاولى مطبعة العرفان (صيدا – ١٣٦٦هجري ) ل٧٤ .

٦٢- ستيفن همسلي لونكريك : اربعه قرون من تاريخ العراق مطبعة الحدث بغداد١٩٦٢ ل٧.

٦٣- د. كاوس قفطان : دراسات في تاريخ بابان و سوران و بۆتان مطبعة الحوادث . بغداد ١٩٨٥م ل٤٣ .

٦٤- عن الامارة البابانيه يراجع د. كاوس قفطان : دراسات فى تاريخ بابان و سۆران و بۆتان ل٤٣ وما بعدها : كيو موكريانى : تاريخى حوكم دەرانى بابان . رەواندز ١٩٣١م .

٦٥- یاداشتەکانی محمد مستەفا حەمە بۆر دەست نووس (٢)ل٢٣٣ احمد زەردەشت كاو ە و نەورۆز ل٢٠١ز

٦٦- یاداشتەکانی محمد مستەفا دەست نووس (٢) ل٢٣٣.

٦٧- د. مارف خەزنەدار : لەبابەت مێژوی ئەدەبی کوردیەوە ل١٢٩.

٦٨- دیوانی شێخ احمد جەزیری : چاپی یەکەمین چاپخانەی هەولێر ١٩٦٤ز ل٥٨ .محمد عبدالرحن زەنگەنە

نەورۆزنامە ، چاپخانەی جاحظ بغداد ١٩٨٥ م .

٦٩- دیوانی حاجی قادری کۆیی چاپخانەی هەولێر ١٩٦٩ ز محمد عبدالرحمن و نەورۆزنامە ل٤٣، گۆڤاری هەولێر ژمارە (٦)ل٣٠ .

٧٠- دیوانی سالم چاپی ١٩٣٣ ل٣٢ . احمد زەردەشت کاوە و نەورۆز ل٢٤٤ . حەمدی دەست نووس ل١٠٤ بروانە گۆڤاری هەتاو ژمارە (٤٥) ی ١٩٥٥ل٩ .

٧١- دیوانی گۆران : محمد ملا کریم، کۆری زانیاری کورد ل٤٠٠،نجم الدين ملا: دیوانی محمدی دەست نوس،ل١٠٤،بروانە گۆڤاری هەتاو ژمارە (٤٥)ی ساڵی ١٩٥٥ ز،ل٩.

٧٢- گۆران ، یادگارو دیاری ل٢١٧ هەروەها گۆڤاری هەولێر ژمارە (٤-٥) ی ٩٧١ ی ل٤٣ .

تێبینی /یاداشتەکانی محمد مستەفا دەست نوس سودم لە بەرێز احمد زەردەشت :( کاوە و نەورۆز) وەرگرتوە لە بەر ئەوە نەمتوانی پەیدای بکەم.

# سوودەكانی مێژوو و سیفەتەكانی مێژوونوس

شوان محمدامین طه*

## تەوەری یەكەم

## مێژوو، روانگەكان

## گرنگی و سوودەكانی مێژوو

وشەی مێژوو لە زمانی كوردیدا واپێدەچێ لە رەگی(مێژ)ەوە هاتووە كە بەمانای كۆن(قدم) دێت، وە دیرۆكیش بە هەمان شێوە لە(دێر) هاتووە كە(دێرین)یش هەر بەمانای كۆن دێت و لە هەردوو بواریشدا مانای رابردوو دەگەیەنێ.

لە زمانی عەرەبیشدا وشەی(التاریخ)بە مانای دەست نیشانكردنی كات دێت، واتە لە (أرخ —یؤرخ) كە لە بنچینەدا لە وشەی(اروخ - ورخ)دێت، كە لە زمانی كۆنی عەرەبی سامیدا بە مانای ناسراو و بەناوبانگ دێت، وەخودای مانگیش لە خوارووی دوورگەی عەرەبی بە ناوی(ورخ)ناسراوە.[1]

كە ئەوەش بەڵگەیە بۆ كۆنی و لە مێژینەیی ئەو خودایە لە زێدی باو باپیرانی عەرەبدا.

زۆربەی مێژوونوسان مانای مێژوو كورت دەكەنەوە، لە رستەیەكدا بەوەی: بریتییە لە گەڕان و لێكۆڵینەوە لە رووداوەكانی رابردوودا، لەسەر ئەو

بنەمایەی کە لە وشەی(Historia) ی یۆنانی کۆن وەرگیراوە بەو مانایە دێت کە هەموو شتێك پەیوەندی بە مرۆڤەوە هەبێت هەر لە دروست بوونیەوە کە شوێنەواری لە سەر زەوی جێهێشتووە.[٢]

بەڕای هنری جۆنسۆن وشەی Historie یان Historia ، لە ئەنجامی ئەو گەشتانەی هیرۆدۆت، بە ناوچەکانی جیهاندا، وە کۆکردنەوەی زانیاری و خستنەڕووی، کاریگەریەکی گەورەی خستە سەر یۆنانیەکان تەنانەت ئەو وشەیە بە شێوازی نوسینی هیرۆدۆت دەگوترا، لە پاشاندا ئەو وشەیە گوازرایەوە بۆ زمانی لاتینی و زمانە نوێیەکانی ئەوروپا و ئەمریکا.[٣]
ئەوانە سەبارەت بە چەمك و زاراوەکانی مێژوو بوو، کە کۆمەڵێك گوزارشت و پێناسەو رای جیاواز دەگرنە خۆ، سەبارەت بە هەندێ بیروبۆچونیش ئیبن خەڵدون**وا دەڕونێتە مێژوو، کە تەنها گێڕانەوەیەکی ساکاری رووداوەکان نیە، بەڵکو وەسف کردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە، وە زنجیرەیەك زانیاری جۆرایەتییە و بابەتگەلی دیاردەکانی کۆمەڵایەتی دەگرێتەوە، وە لە هەناویدا بینین و لێکۆڵینەوە هەیە.[٤]

وە لە فەلسەفەی مێژوویدا یاسا گەلێکی دانا وەك: دەوڵەت وەکو مرۆڤ وایە، لە دایك دەبێ و گەشەدەکاو گەورە دەبێ و پیردەبێ و لە دواییدا دەمرێ، یا دەربارەی شارستانیەت یاسای بەدوایەکداهاتنی قۆناغەکان: کۆچەری،شارستانی،لەناوچون.[٥]

لە دوای چەند سەدەیەك هیگڵ(١٧٧٠-١٨٣١)تیۆرە ئایدیالیزمیەکەی خۆی لە فەلسەفەی مێژوو خستە روو، کە وای دەبینی مێژوو مێژووی هزرە، پێویستە ئەوە بە هەند وەربگرین کە سەرکردەکان چۆن بیریان دەکردەوە کە

بە کارەکانیان هەڵدەستان، نەك کارەکان، وەهێزی پاڵنەری مێژووش هێزی ئاوەزە، بەوەش مێژوو بە ویستی مرۆڤ دەڕواو ئازادی بریتییە لە هۆش و بیری مرۆڤ.[٦]

لە ژێر کاریگەری ئەو بیروباوەڕەو هەڵ و مەرجی ئەو چەرخەدا، لە دوای ئەو مارکس(١٨١٨-١٨٨٣ز)لە روانگەی ماتریالیزمیەوە، قۆناغە مێژوییەکانی پەرەسەندنی مرۆڤایەتی خستەروو، وە بەگوێرەی تیۆری مەتریالی مێژوو بریتییە لە مێژووی ململانێی چینی پرۆلیتاریا و چینی بۆرژوازی، وە مێژوو وابەستەبوونێکی دیالیکتیکیە لە نێوان مرۆڤ و سروشت.[٧]

دواتر ئارنولد توینبی(١٨٨٩-١٩٧٥ز)لەو باوەڕەدابوو کە شارستانیەکان بەیاسای مەیدانخوازی(التحدی والاستجابە)دروست بوون، بەو مانایەی سروشت و ژینگەی سەخت وادەکات مرۆڤ ئارەزوی کارو داهێنانی هەبێ، وە جەختی لەسەر نموونە گەرایی کۆمەڵگە دەکردەوە لەسەر پەیوەندی نێوان بوونەوەرەکانی مرۆڤایەتی، وەگرنگی بەکردەی تاکە داهێنەرەکان و راستی تاکگەرایی دەدا.[٨]

ئەوانەی کە باسمان کرد، هەندێ روانگەی جودابوو لەلایەن تیوریست و بیریاران سەبارەت بە مێژوو، کە دەرفەت نیە لە باسێکی بچووك راڤەیان بکەین.

بە هەرحاڵ مێژوو تۆمارکردنی کاروانی مرۆڤایەتیە.[٩]

وە سەرچاوەیەکی هەرە بنەڕەتی ناسینی دیاردە هەنوکەیەکانە.[١٠]

چونکە رەگ و ریشەیەکی مێژوویی هەیە، فاکتەری نەشونماکردنی هەر نیاردەیەکی کۆمەڵایەتی،ئابووری،پۆلەتیکی،رۆشنبیری،هزری،وەیا ئاینی لە گەڕانەوە بۆ رابردوودا بایەخی مێژوو بەدەر دەخات.

قوستەنتین زریق لەو بارەیەوە دەڵێ: ئەو واقیعەی کە ئێمە تێیکەوتوین، ئەو شلەژانەی ئەورۆ کە هەیە، دەرهاوێشتەی گۆڕانی هەڵ و مەرجی ئابووری و کۆمەڵایەتییە، کە تێیدا مۆرال و ترادسیۆن و بیروباوەڕیش گۆڕاوە و پرسیار گەلێك دروست دەکات، ئەو پرسیارانەش وابەستەی مێژوومان دەکات، وە پێویستیمان بە تێگەیشتنێکی دروست هەیە بۆ رووبەڕوبوونەوە.(١١)

ابو الفتوح رضوان لە پێشەکی کتێبەکەی هنری جونسوندا دەڵێ: مێژوو لە رابردوودا رێگەی گەڕانەوە بۆ دواوەو پاشەکشەکردن و بەرەنگاربوونەوەی پێشکەوتن بوو، بۆیە هەندێ فەیلەسوف وای بۆ دەچوون کە میللەتی بەختەوەر میللەتێکی بێ مێژووەو، وابەستەنین بۆ رابوردو کۆت و بەندەکانی، بەڵام دوای ئەوەی میللەتان لە پێداویستی پێشکەوتن گەیشتن و بڕوایان پێهینا، مێژوو بووە زانستی توێژینەوەی جولەی زەمەن و سێرەی(رصد) ئاراستەکانی پێشکەوتن و پێداویستی کۆمەڵگاکان لە جەنگی بەرەو پێشچووندا.(١٢)

بەڕای ویل دورانت* خوێندنەوەی مێژوو تێگەیشتن و دەرککردنە بۆ ناسینی مرۆڤ کە مرۆڤ چۆن بووە؟ دەڵێ دیدگایەکی فەلسەفی لە رێگەی توێژینەوەکانەوە دەستەبەر دەکەی، کە لە هیچ بارێك لە زانستەکانی دیکەدا نەمبینیەوە.(١٣)

احمد شلبی لە ئنسکلۆپیدیاکەیدا، بایەخی مێژوو لە رستەیەکدا دەخاتە روو دەڵێ (مێژوو تیشکی رابوردووە کە ئێستا و ئایندە رۆشن دەکاتەوە).[١٤]

گرنگی و سودەکانی مێژوو لە ژێر رۆشنایی ئەو بیروبۆچونانەی باسمان کرد دەردەکەوێ، کەلکی هەیە بۆ تێگەیشتن لە رابوردوو، وە هەوڵدانە بۆ تێگەیشتنی ئێستا، بە هەڵسەنگاندنی روداوو پەرەسەندنەکانی رابوردوو، مێژوو بەرهەم و دەست کەوتەکانی مرۆڤە لە رابوردوودا، کە پەیوەندی نێوان تاك و رووداوەکان و کات و شوێن نیشان دەدا.[١٥]

گرنگی دیکەی مێژوو لەوەدایە کە هەموو زانستەکان، وابەستەی مێژوون وەك:

پەروەردە، دەروونزانی، جوگرافیا،گەردوون، زیندەوەرناسی، وە زانستەکانی بوونەوەر، کە هەموو ئەو زانستانە گەشەیان کردووە، بە تێپەرینی کات و مێژووی دۆزینەوەو پەرەسەندنیان هەیە، بۆیە بەکارهێنانی مێژوو وەرەهەندەکانی فراوانترەو پەل و پۆ بۆداپۆشینی زانستەکانی دیکەش دەبات.[١٦]

تەنانەت بایەخی مێژوو لە کتێبە ئاسمانیەکانیشدا هەیە کە وەکو سەرچاوەیەکی تەشریعی، جێگای کراوەتەوە لە تەورات و ئینجیل و قورئاندا. بۆ نموونە بەشێکی زۆر لە قورئاندا تەرخان کراوە بۆ چیرۆك و بەسەرهاتەکان، کاتێك ئامارە بە چیرۆکی پێغەمبەران و مێژووی(بنی اسرائیل)دەکات.[١٧]

تەنانەت لە سورەتی یوسف لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە((لقد كان في قصصهم عبرة لاولى الاباب)).[١٨]

لێرەدا وادەردەکەوێ کە مێژوو فێریووردبینی و فراوانبینی و تێگەیشتنمان دەکات، وەمێژوو پێشانگاو شانۆی ئەزموونی مرۆڤەکانە لە رابوردوودا، لەم رووەوە سیاستمەداری ئەڵمانی بسمارك دەڵێ(زیرەك ئەو کەسەیە کە بە ئەزمون و ئارۆینی خۆی شت فێردەبێ، بەڵام لەو زیرەکتر لە ئەزمونی کەسانی دیکە فێری شت دەبێ).[19]

لە کۆتایی ئەو تەوەرەیەدا ئەگەر بیروڕایەکان چڕ بکەینەوە، دەکرێ سودو گرنگی و خوێندنەوەی مێژوو بەم شێوەیە کورت بکەینەوە، خوێندنەوەی مێژوو وا دەکا باشتر لە خۆمان بگەین و رەگ و ریشەی دیاردەکانی ئێستا بزانین و تارادەیەك پێشبینی ئایندەش بکەین.[20]

سود لە پەندو ئامۆژگاری و وانەکانی مێژوو وەربگرین، بە جۆرێك خەوشی و نەنگی و هەڵەکانی رابردوو دووبارەنەکەینەوە، چاکەو سەروەریەکانیش هانمان بدات کاری بەبرەوو هەڵوێستی جوامێرانەی مرۆڤایەتی و گۆڕانێکی رادیکاڵی بۆ پێشکەوتن ئامانجمان بێت.

مێژوو نمونەی بەرزی مۆراڵی سیاسی،نیشتمانی و قارەمانێتی کەڵەمێردانە لە رابوردوو پێشکەشیان کردوین.

مێژوو ئاشنای داب و نەریت و شێوازی ژیانی کۆمەڵگەکانی رابوردوو و کۆششەکانی مرۆڤ لە رابوردوومان دەکات، وەهەلو مەرجی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابووریمان لە رابوردوو بۆ وێنا دەکات.

لەم رووەوە حسن عثمان دەڵێت:(مێژوو ئەو ئاوێنەیەیە کە تێیدا هەمەڕەنگی رووداوەکان،هونەرکاری هزرەکان و پۆلێك کردەوە و کارو شوێنەواری تێدادەبینین).[21]

**تەوەری دووەم**

خەسڵەت ئادگارەکانی توێژەری مێژوویی(خۆشەویستی بۆ کارەکەیی و خۆراگری و ئارامگری،گومان و رەخنە،بابەتگەرایی و ئەمانەتی زانستی و ئەبستراکت بوون،خاکی بوون و خۆشەویستی بۆ راستی)

لە سەر توێژەری مێژوویی و مێژوونوس پێویستە، کە بزانێ ژمارەیەك لە خەسڵەت و ئەدگار و تایبەتمەندی هەن، کە وەکو مەرجی بنەڕەتی و سەرەکی دادەنرێ بۆ نوسینەوەی مێژوو، هەندێ لە گرنگترین خەسڵەت و شارەزایی بوون و ئامادەباشی دەخەینەڕوو، لە بواری میتۆلۆژیای مێژووییداو لە بواری نوسینەوەی مێژوودا پێویستە لە کەسایەتی و دەروون و روخساری توێژەر خۆی بەرجەستەبکات، لە گرنگترین سیفاتەکان ئەمانەن:

- خۆشەویستی بۆ کارەکەی و خۆراگری و ئارامگری

یەکێك لەو سیفەتانەی کە گرنگە، لە مێژوونوسدا هەبێ ئەوەیە، کارەکەی خۆش بوێ، وەخۆڕاگر و ئارام بێت، بەو مانایەی سەختی لێکۆڵینەوەکەی و ئاستەنگەکانی رێگەی کارکردن نەبێتە بەربەست، وەلێڵی و نادیاری رووداو و راستیە مێژووییەکان و پەرت و بڵاوی و تێکەڵیان، وانەکا لە کارەکەی سڵ بکاتەوە، وە پەلە نەکات لە پێناو بەدەست هێنانی دەستکەوتێك بە خێرایی، چونکە پەلەکردن لەسەر حسابی زانست و راستی مێژوویی دەبێ.[٢٢]

وەدەبێ بۆ دەرکردنی حوکمەکان(احکام) ئارامی هەبێ و کاتی تەواو تەرخان بکا بۆ تاوتوێکردن و بەراوردکاری و شیکردنەوەو لێکدانەوە، واتە مەرج نیە باسی هەموو ئەو راستیانە بکات کە پەیوەندیان بە بابەتی لێکۆڵینەوە هەیە، بەڵکو ئەو باس دەکا کە پێی گەیشتووە و دەستنیشانی

ئەو خاڵانە بکات کە چارەسەری نەکردووە و نەیتوانیوە روونی بکاتەوە، بۆ ئەوەی بۆ توێژەرێکی دیکەی بەجێبهێڵێت.[٢٣]

سەبارەت بە مەسەلەی ئارامگرتن و خۆڕاگری، قوستەنتین زەریق بیروبۆچونێکی هەیەو دەڵێ: ئەوانە هەڵەن، کە وادادەنێن تاکە فاکتەری بەرهەم هێنانی زانستی، تەنها زیرەکیە، چونکە بەرهەمی هزری لە دایکبووی ئەو کۆشش و خۆڕاگریەیە، کە ئاوەزو دەروون(العقل والنفس)ی پێوە ماندوو بووە بۆ گەیشتن بە راستیەکان.[٢٤]

چونکە مەسەلەی ماندووبوونی توێژەر، لە هەموو بوارێکدا و لە هەموو رووێکەوە، کارێکی سروشتییە و دەبێ پتەوی ئیرادەو ئارامگری و خۆڕاگری وابکا، لە کۆتاییدا بەسەر هەموو ئاستەنگەکان زاڵ بێت.[٢٥]

بەهەر حاڵ، لێکۆڵینەوە و گەڕان پێویستیان بە ئارامی هەیە، چونکە شەونخونی و ماندووبوون و هیلاکی دەوێ.[٢٦]

## - گومان و رەخنە

مەبەستمان لە گومان و رەخنە، گومانی زانستی و بوونی هەستێکی رەخنەگرانەی هۆشیاریانەیە.

ئەو گومانەی کە رێنمایمان دەکات بۆ چەسپاندنی راستیەکان، کە توێژەر لەم رووەوە گریمان دادەنێ، دوای ئەوەی بەڵگەو راستیەکان کۆدەکاتەوە، ئەگەر متمانەی لا دروست کرد و بابەتەکەی پشت راست کردەوە، وەیا گومانەکەی لە جێی خۆی نەبوو،بینوسێ، گرنگ ئەوەیە چارەسەری بابەتە مێژووییەکە بکات.[٢٧]

بە جۆرێك بە ووردبینی مامەڵەی تێکست و بابەتەکە بکات، وە هەموو توانا زەینی(ژهینی) یەکانی خۆی بخاتە گەڕ، بۆ دەرخستنی راستی زانیاریەکە ی ا بەڵگەنامەکەو بەدەست هێنانی چارەسەری و ئەنجام.[٢٨]

واتە هەر لەسەرەتادا نابێ، هەر کتێب و بەڵگەیەك بخوێنیتەوە، لەسەری رازی بێت، یاباوەڕ بە قسەی هەموو شایەتمانێك بکات، چونکە خێرا باوەڕ هێنان یەکێکە لە سیماکانی کاڵفامی و لاوازی کەسایەتی و سەربەخۆنەبوون لە بیروڕادا، وە بۆ ئەوەی توێژەر نەکەوێتە تەڵەی خۆشباوەڕیەوە، پێویستە خۆی چەکداربکات بە گومانی بونیاتنەر.[٢٩]

ئەو گومانەی کە لە نێو عەرەبەکان ئیبن خەلدون باسی کردووە، وە لە نێو رۆژئاواییەکانیش، لە سەدەی حەڤدەهەمدا (رینیە دیکارت) لە نوسینەکەی بە ناوی (گوتار لە رێبازدا) بلاوی کردەوە و رێبازێکی نوێی بۆ لێکۆڵینەوەکانی زانستی دۆزیەوەو دانا، کە لەمەشدا پشتی بە تاقیکردنەوەبەست.[٣٠]

کەتێیدا سەروەری ئاوەزی وەکو کۆلەکەیەکی سەرەکی دانا، بۆ راڤەکردنی دەقەکان و کارکردن لە بواری میتودلۆجیادا، بۆ ئەوەی زانست بە شکۆداری بنوسرێتەوە.

بەم شێوەیە دەبێ گومان رەخنە بونیات بنێ، وەتوانای ڕەخنەگرتن، لە سەرووی ئادگارەکانی مێژوونوس بێت، چونکە کاری مێژوونوس کۆکردنەوەو کۆپیکردنی هەواڵ نیە، بەڵکو رەخنەگرتن و لە بیژینگ دانیەتی[٣١] ئەو خەسڵەت و تایبەتمەندییەی، رەخنە ئەگەر نەبێ، ئەوا سیفەتی توێژەر، وادەماڵرێ، تەنها دەبێت قسەکەرێکی گێڕەرەوە، ئەوەی دەیزانێ دەیگێڕێتەوە کە پێی گوترا.[٣٢]

کە لێرەدا سیفەتی کاسیێتێکی ریکۆردەر دەبینیٚ!، بەو کارەش مێژوو ناخوێندریٚ و نانوسرێتەوە.

وە لە هەمان کاتدا هەست کردن بە رەخنەی وشیارانە، پێویستی بە وریایەکی زۆر هەیە، بۆ دوورکەوتنەوە لە خلیسکان، کە شانبەشانی ئەو وریاییە دەبیٚ هاوسەنگ بێت، لە نێوان رەخنەو بریندارکردندا، وە ووردبین بێت وەدەستپاك بێت لە گواستنەوەدا، وە ووردبینی لە بیرکردنەوەو دەربڕیندا.[٣٣]

## - بابەتگەرایی و ئەمانەتی زانستی، ئەبستراکت بوون( التجرد ).

پێویستە لەسەر توێژەری مێژوویی، هەر لە دەستپێکیەوە تا ئەو پەڕی توانا، خۆی لەسەر دادوەری و بابەتگەرایی(الموضوعیة) رابهێنیٚ، واز لە تۆمەتبارکردنی کەسایەتیەکانی مێژوو بهێنیٚ، بەتۆمەتی وشك و هەرزانی لابەلا، وەواز لە هێرش بردن بێنیٚ.[٣٤]

چونکە مەسەلەی بابەتگەری، بەمانای بوونی دادوەری دێت، لە خودی توێژەرو خۆ داتاشین لە لایەنگیری، بەوەش بابەتگەرایی Objectivitty،دژی خودگەراییە Subjectivity کەپشت بەستنە بە سۆزو ئارەزووی کەسێتی و ترادسیون و بەرژەوەندخوازی، کە پێویستە توێژەر خۆی لیٚ بەدووربگریٚ.[٣٥]

پێویستە توێژەر خۆی رزگاربکا، تاپێی دەکریٚ، لە ئارەزوو سەرسوڕمان بوون، لێرەدا توێژەر وەکو دادوەر وایە، کەدەبیٚ حوکم بدات لە ڕوانگەی دادپەروەریەوە دوور لە لایەنگیری و هەوەس.[٣٦]

چونکە ترسناکترین پەتا، کە نووسینی مێژوو تووشی پەککەوتن دەکا، ئەوەیە کە نووسەر بارگەکراوبێت بە هەوەسی ساوایانە و سۆزو ئارەزووی زێدەڕ ۆیی، دەرکردنی حوکمی پێشینە لە سەر کەسایەتیەکان و ڕووداوەکان دەربکات.[٢٧] بۆیە لە سیفەتە سەرەکیەکانی توێژەر، بابەتگەرایی یە، کە بەجۆرێك کاریگەر نەبێ بە فاکتەرە خودیەکان و بیروباوەڕی ئاینی و ئاراستە سیاسیەکەی، کە ڕاستییەکان بگۆڕێ و پێداگیری بکا لەسەر خزمەتکردنی بیروڕواو ئامانجەکانی، بەڵکو مێژوونوس دەبێ، هزرو ڕۆشنبیری و ئارەزووەکەی لە خزمەتی میتۆدی زانستی و ڕاستیەکانی مێژوویی بەکاربهێنێ، چونکە زیان بەدەست پاکی زانستی و ڕاستگۆیی و بابەتگەرایی دەگەیەنێ.[٢٨]

بەهەر حاڵ ئەمانەتی زانستی و گیانی زانستی، ئەدگارێکی خوازراوی توێژەرە، چ لە کاتی کۆکردنەوەی سەرچاوەکان یا لە کاتی دانان و داڕشتنەوەیدا وەیا لەکاتی ڕاڤەکردنیدا، دەبێ پەیڕەوبکرێ تەنانەت ئەگەر زیان بە بەرژەوەندیەکانیشت بگەیەنێ، چونکە ئامانجی بنچینەیی توێژینەوە لە ڕابوردوو بە لایەنی باش و خراپەکانی، ناسینی ئێستایە[٢٩]

لەم ڕووەوە توێژەری مێژوویی، دەبێ ئازاو بوێر بێت، بەرامبەر درکاندنی ڕاستیە مێژووییەکان و نەیانشارێتەوە، بەتایبەت لە هەندێ بواردا وارێکدەکەوێ زانیاری و ڕاستی دەستدەکەوێ، کە خۆی دەیزانێ و ئەوانی دیکە نایزانن، کە نابێ کە ئەوە ڕەچاوبکا کە یەکێك پێی ڕازی نیە، یا لایەنێك وەیا نەتەوەکەی لەگەڵی نین، بەڵکو مێژوونوس دەبێ ویژدانی ڕابەرایەتی بکات و خۆی بەرامبەر بەرپرسیارێتی سەرشانی ئاسودەبکات، وەخەوش و

هەڵەکانی رابوردو و ئاشکراکردنیان سودمەندە بۆ دوورکەوتنەوە لە فاکتەری هەڵەکردن لە ئێستادا.[٤٠]

بە مانایەکی کورتتر، ئازادیی لە دەربڕینی راداو ئازایی لە دەرخستنی راستیدا، دەبێ تەنها ئامانجی خزمەتکردنی راستییە مێژووییەکان بێت[٤١]، لەگەڵ رەچاوکردنی دەستپاکی لە گواستنەوەی زانیارییە وەرگیراوەکان، چونکە تێکستی وەرگیراو لە زانستی مێژوودا پیرۆزی خۆی هەیە، نابێ دەستکاری تێدابکرێ و دەست درێژی بکەیتە سەر هەوڵ و کۆششی خەڵکانی دیکە.[٤٢]

ئەگەر ئەو تێکستانە لە دیدگای جیاواز و دژە ئایدۆلۆژیای توش بێت، دەبێ بەڵگەی راست و دروستت لاهەبێ و وەلامێکی یەکلاکەرەوەت هەبێ، تا گۆشە نیگای خۆت بخەیتەڕوو، بەپشت بەستن بە بەڵگەو راستییە مێژووییەکان، بەبێ توندڕەوی کوێرانە و هەڵکوتانە سەر بیروبۆچونەکانی خەڵکی دیکە.[٤٣]

مەسەلەیەکی دیکەی گرنگ کە پەیوەستە بە توێژەر، خۆداتاشینە یا ئەبستراکت بوونە، لە هەرچی ئایدۆلۆژیای ئاینی و نەتەوەیی وسیاسیی کە هەیە لەخۆتی دابماڵی، کەچەندو چونی لەسەرە، چونکە مرۆڤ لەدایك بوونی رابوردووەو هەڵگری گیانی ئەو سەردەمەیە کەتێیدا دەژی و بوونەوەرێکی بچووکی ئەو ژینگەیە.

لە ئەوروپادا رابەری ئەو قوتابخانە زانستیە نوێیەی مێژوو(لیوبولدڤۆن رانکە)*یە، کە لەسەدەی نۆزدەهەم بنەماکانی ئەبستراکت بوونی خودی دانا، وە لەهەرە داخوازییەکارانی ئەو خەسڵەتە دەژمێردرێ، کە هیواخوازبوو هەموو ئارەزوەکانی بکوژێنێتەوە، تەنانەت خودی خۆشی، بۆ ئەوەی وەکو ئاوێنەیەك وێنەی رووداوەکان لەناویدا رەنگ بداتەوە، کە شوێنکەوتوانی ئەو قوتابخانەیە

لەسەرووی داواكانیاندا، بابەتگەرایی رەهاو ئەبستراكت بوونی تەواوبوو، لە نوسین و تەكنیكی مێژوودا.[٤٤]

لێرەدا مەسەلەی پابەندبوونی مۆراڵی دێتەكایەوە، جگە لەوەی كە وەكو ئەوەی احمد شلبی دەڵێت: مێژوو گێڕانەوەی رابوردوو نیە، گەڕانەوە بۆ دواوەش نیە، بەڵكو كارێكە بۆ خزمەتكردنی ئێستا و ئاینده، مێژوونوسانیش بە ئێستا كاریگەرن و رابوردوو دەنوسنەوە.[٤٥]

وەدەردەكەوێ مەسەلەی خۆداتاشین دوولایەنی هەیە لایەنێك كە مرۆڤ ناتوانێ دەستبەرداری هەموو هەست و نەست و ئایدۆلۆژیاو بیروباوەڕكانی بێت، بەكردەوە، لایەنەكەی دیكەش مەسەلەی پابەند بوونی مرۆڤە بەو ژینگەیەی لە نێویدا دەژی.

(قسطنتین زەریق)لەمبارەیەوە مانایەكی پۆزەتیف بۆ ئەبستراكت بوون دادەنێ، پێی وایە كە ئەبستراكت بوون لە مێژوودا، ئەو مانایە دەگەیەنێ كە مێژوونوس هەرچی لە توانایدا هەیە لە ووردی هەست و نەستی و یەكبینی تا رووبچێتە قوڵایی و ناخی تاكەكان و گرۆپەكان لە رابوردوودا هەست بەهەستەكانیان بكات، وە بتوانێ مەیل و ئارەزویان تاقیبكاتەوە و ئاشنای هیواو ئاواتەكانیان بێت و شارەزای هەڵ و مەرجی دەوروبەریان بێت، بە شێوەیەكی وا كەببێتە یەكێك لەوان و بەزمانی ئەوان بدوێت.[٤٦]

واتە هاوچەرخ بوونی خودی توێژەر، بۆ رووداوەكان و بۆ ناخی مرۆڤەكان، ئەركێكی دیكەی توێژەرە بۆ خستنەرووی راستیەمێژووییەكان، زیاتر لەوەی كە خۆت رووت بكەیەوە لە ئایدیبولۆژیاو، كاریگەری ئەو ژینگەیەت لەسەر نەبێ كەتێیدا دەژی كە لەو بوارەشدا هەوڵ وْ كۆششی دەوێت.

احمد شلبی مانایەکی دیکەی پابەندبوونی مۆرالی دەخاتەڕوو، کە بەئەرکی مێژوونوسی ئەزانی بۆ بەدەنگەوە هاتنی کێشەکانی نەتەوەکەی، تایبەت بە ئاین،نیشتمان و مرۆڤایەتی وەپێی وایە نابێ رۆشنبیر نوقمی ئەبستراکت بوونی بێت، لە کاتێکدا نیشتمانی داگیرکرابێ و لەژێر دەستی زۆردار بێت، بەلآم لەگەڵ ئەوەش پیرۆزی مێژوو دوپات دەکاتەوە، کە نابێ و خیانەتە بەهەوەس گەمەی پێکردبێ.[٤٧]

- **خاکی بوون( التواضع ) و خۆشەویستی راستی**

یەك لە مەرجەکانی توێژەر دەبێ کەسایەتییەکی ساکارو خاکی بێت.[٤٨] بەو مانایەی، بەو زانستەی کەپێی گەیشتووە، خۆی لە کۆمەڵگەی بەرزتر نەزانێ و لە خۆبایی نەبێ، چونکە زانست و زانیاری ئەگەر بۆ خەڵك نەبێت، وەکو گەنجینەیەکی شاراوە وایە، لە سینگی بارهەڵگرەکەیدا، تەنها زەحمەتی قورسایی و بارهەڵگرتنەکە دەکێشێ.[٤٩]

کەواتە زانست و زانیاری دەبێ سوودی بۆ خەڵك ببێ، لێرەدا ئەو بابەتە لەگەڵ خەسڵەتێکی دیکە یەکدەگرێتەوە، خۆبەدوورگرتنی توێژەرە لە ناو ناوبانگ، چونکە توێژەر دەبێ خۆی بۆ کاری زانستی تەرخان بکات، بەو مانایەی کۆششەکانی دابەش نەکات لێرەو لەوێ، کاری دیکە نەکات، ئەگەر دەستکەوت و سامانیشی تێدابێ، ئەوانەی دەست بەتاڵن تەنها بۆ توێژینەوەکان و لێکۆڵینەوەکانی زانستی، ئەوانە پێشکەوتنی مرۆڤایەتی و پەرەسەندنی شارستانیان لەسەر شانە.[٥٠]

وەنابێ توێژەر لەپشت کارەکەیدا، ئامانجی دیکەی هەبێ، جگە لە ئامانجی ئەکادیمی، وە مەبەستی نزیك بوونەوە لەدەسەلآت، یا دەست گیرۆیی بوونی پلەو پایەی هەبێ، وەیا مێژوو لە خزمەت سیاسەت دابنێ و بنوسێ.[٥١]

تەنانەت لەڕووی خزمەتکردنی ئامانجی نەتەوایەتیشەوە، دەبێ ئامانجی سەرەکی، ئاشکراکردن و دۆزینەوەی راستیەکان بێت، و مێژوونوس بێ ترس و سڵەمینەوە رابوردوو وا بخوێنێتەوە کە رووی داوە، چونکە هەموو قۆستنەوەیەك کاریگەری نیگەتیڤی دەبێ، چ لەسەر قۆزەرەوە یا لەسەر قۆزراوەوە ، بەڵکو رەوایە لە خولی دروست بوونی نەتەوەدا سوود لە مێژوو وەربگرین، بەلآم لە کۆتاییدا هەر خزمەت و ئامانجی سەرەکی دەبێ راستی بێت.[٥٢]

وەدەبێ توێژەر زانیاری باشی هەبێ لەسەر مێژووی میللەتەکەی، وە رۆچوبێتە نێو سەردەمە جیاجیاکانی، ژیاری،ئەدەبی،فیکری،سەربازی،چونکە بەهۆی پسپۆریەکەی، ئەمانەتی داکۆکیکردن لە مێژووی میللەتەکەی لەسەر شانە، تاکە ساتە رەوشەن و داهێنانەکانی بەجێنەهێڵێ بۆ ئەوانی دیکە، بەهەڵەو درۆ پڕی بکەنەوە.[٥٣]

وە پێویستە مێژوونوس وێنەیەکی گشتی لە مێژوو بزانێ و کتێبە گرنگەکانی مێژوویی دیاری خوێندبێتەوە.[٥٤]

وەدەبێ روانینێکی مرۆڤانەی هەبێ، تا لە هەست و نەستی مرۆڤەکانی رابوردوو بگات.[٥٥]

وەدەبێ خاوەن هەست و سەلیقەو لێبوردەیی، وەسینگ فراوان بێت بەرامبەر رای بەرامبەر، وە عەقڵێکی کراوەو وشیاری هەبێ و زەینێکی رێك و

پێکی هەبێ، بۆ ئەوەی بتوانێ ڕووداوەکان و هەماهەنگی نێوان ڕاستیەکان ڕێك بخا، سود لە زانیاریەکان ببینێ لە جێگەی گونجاو بەکاریان بهێنێ و لەبەستنەوەی ڕووداوەکان وریا بێت.(٥٦)

ئەوانەی باسمان کرد، گرنگترین ئەو خەسڵەتانەن کە ئەرکی سەرشانی توێژەری مێژووین، پێویستە مێژوونوس بەپێی توانا هەوڵ بدات و بزانی لە ئەستۆی ئەودان، هەوڵەکانی بخاتەگەڕ بۆ ئەوەی، ئەو سیفاتانە لە نوسینەکانی ڕەنگ بداتەوەو خۆی رابهێنێ، بە تایبەتی توێژەری تازەپێگەیشتو، کە ئەرکی زانستی ئایندەی میللەتەکەمانی لەسەر شانە.

## ئەنجام

لە ئەنجامی ئەو باسەدا دەردەکەوێ کە مێژوو تەنها چیرۆك و بەسەرهات و گێڕانەوەیەکی ڕووکەشی ڕووداوەکان نیە، بەڵکو لە هەناویدا، کۆمەڵێك فاکتەری یەکانگیرو پەرت و بڵاو لابەلا هەن، لەودیوی مێژووەوە پێویستیان بە خوێندنەوە هەیە لە پشت ڕووداوەکاندا.

تەنانەت خودی مرۆڤ بوونەوەرێکی مێژووییە، وابەستەی ڕابوردووە، بە یادەوەرییەکانیەوە، بۆیە مێژوو مێژووی مرۆڤە و بایەخی مێژووش بەردەوامی هەیە و بەکۆتایی نایێت.

مێژوو فێری فراوانبینی و سەلیقەمان دەکات، لە زیندوکردنەوەیدا پەندو ئەزموونی تێدایە، ئەوەی کاری مێژوونوسی بکات دەبێت هەڵگری خەسڵەتەکانی مێژوونوس بێت، مێژوو جوانە، بەجوانی و ناشیرینەکانی،

جوانیەکانی مێژووی نەتەوەکەمان، بە شانازیکردن جوانتر دەبێت، ناشرینی و نەنگی و خەوشەکانی هەڵەکانی رابوردوو، بەدوورکەوتنەوە لە هۆکاری ئەو هەلأنە لە ئێستادا، برینە کۆنەکانیش سارێژدەبن، بە دووبارەکردنەوەشیان، حوکمی مێژوو کەمتەرخەمیمان پێناکات و لە نێربەرداشەکانی دەمانهاڕێ.

پەراوێز و سەرچاوەکان

(١) طه باقر و عبدالعزيز حميد، طرق البحث العلمي في التاريخ والاثار، ط١، بغداد١٩٨٠،ص٧.

(٢) حسن عثمان، منهج البحث التاريخي، ط٣، قاهرة١٩٧٣، ص١٢.

(٣) هنري جونسون، تدريس التاريخ، ترجمة و تقديم: ابو الفتوح رضوان، قاهرة١٩٦٥، ص١٤.

(٤) عبدالرحمن بن خلدون، المقدمة، تحقيق:علي عبدالواحد، ج١، مصر١٩٧٥، ص٢٠٩ " البان.ج.ديد جيرى، المذاهب الكبرى في التاريخ - من كونفوشيوس الى توينبى، ط١، بيروت١٩٧٢، ص١٣٥ " احمد علبي، الاسلام والمنهج التاريخي، ط١، بيروت١٩٧٥، ص١٣٥.

(٥) عادل حسن غنيم وجمال محمود حجر، في منهج البحث التاريخي، ط١، اسكندرية١٩٩٦، ص٢٦.

* هیرۆدۆت(٤٨٠-٤٢٥ث.ن)ژیاوە، بە باوکی مێژوو دەناسرێ.

** عبدالرحمن بن خلدون(١٣٣٢-١٤٠٦ن)ژیاوە، لە لای عەرەب بە دامەزرێنەری زانستی مێژوو دەناسرێ.

(٦) عادل حسن عنيم وجمال محمود حجر، م.س، ص٢٨.

(٧) الياس فرح، تطور الفكر الماركسي، ط٣، دار الطليعة، بيروت١٩٧٤، ص٣٨،٢٦.

(٨) البان:ج.ديد جيري، م.س، ص٣٣٢.

(٩) عادل حسن عنيم وجمال محمود حجر، م.س، ص٢١.

(١٠) عماد عبدالسلام رؤوف، تاريخ المؤرخين العراقين في العهد العثماني، بغداد١٩٩١، ص٥.

(١١) قسطنطين زريق، نحن والتاريخ، ط٣، دار العلم للملايين، بيروت١٩٧٤، ص١٨.

(١٢) هنري جونسون، م.س، ص(ي).

* ديل دورانت(١٨٨٥-١٩٨١) ژیاوە، لە ئەمریکا لە دایك بووە، خاوەن چەندین بەرهەمی فەلسەفی و مێژووییە، بە ناوبنگترینیان چیرۆکی شارستانییەتەکانە.

(١٣) ويل ديورانت، ابطال من التاريخ ـ مختصر قصة الحضارة، ترجمة: سامي الكعكي و سمير كرم، بيروت٢٠٠١، ص١٠.

(١٤) احمد شلبي، موسوعة التاريخ الاسلامي، ج١،ط١، قاهرة١٩٨١، ص٣٥.

(١٥) احمد بدر، اصول البحث العلمي ومناهجه، ط٣، كويت١٩٧٥، ص٢٣٤.

(١٦) حلمي فوده وعبدالرحمن صالح عبدالله، المرشد في كتابة الابحاث، ط٤، دار الشرق، جده١٩٨٣، ص١٩.

(١٧) محمد زيان عمر، البحث العلمي مناهجه وتقنياته، سعودية، دار الشروق١٩٨١، ص١٣٨.

(١٨) سورة يوسف، الاية١١١.

(١٩) احمد بدر، س.م، ص٢٣٦.

(٢٠) هنري جونسون، م.س، ص١٩.

* دەربارەی کاروچالاکیەکانی بسمارك بڕوانە: علی حيدر سليمان، تاريخ الحضارة الاوربية الحديثة، ط١، بغداد، ١٩٩٠، ص٢٤٣-٢٤٥.

(٢١) حسن عثمان، م.س، ص١٣.

(٢٢) حسن عثمان، م.س، ص١٨.

(٢٣) عادل حسن عنيم وجمال محمود حجر، م.س، ص٧٣.

(٢٤) قسطنطين زريق، م.س، ص٨.

(٢٥) محمد عبدالكريم الوافي، منهج البحث في التاريخ والتدوين التاريخي عندالعرب، ط١، قاريونس، جامعة بنغازي١٩٩٠، ص٥٢.

(٢٦) يوسف محمد القاضي، مناهج البحوث وكتابتها، دار المرريخ، سعودية، رياض١٩٥٩، ٣٧.

(٢٧) فوزي غرابية واخرون، اساليب البحث العلمي في العلوم الاجتماعية والانسانية، ط١، اردن١٩٧٧، ص٩-١٠.

(٢٨) عادل حسن عنيم وجمال محمود حجر، م.س، ص٣٣.

(٢٩) محمد عبدالكريم الوافي، م.س، ص٥٦.

(٣٠) عەلی جوکل، ڕێبازی لێکۆڵینەوە، چ١، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر١٩٩٩، ل٥.

(٣١) طه باقر و عبدالعزيز حميد، م.س، ص١١٦.

(٣٢) حسن عثمان، م.س، ص١٩.

(٣٣) قسطنطين زريق، م.س، ص٩٦.

(٣٤) محمد عبدالكريم الوافي، م.س، ص٥٥.

(٣٥) فوزي غرابية واخرون، م.س، ص١٠.

(٣٦) حسن عثمان، م.س، ص١٩.

(٣٧) محمد عبدالكريم الوافي، م.س، ص٥٥.

(٣٨) عادل حسن عنيم وجمال محمود حجر، م.س، ص٣٣-٣٤.

(٣٩) طه باقر و عبدالعزيز حميد، م.س، ص١١٦.

(٤٠) حسن عثمان، م.س، ص١٨.

(٤١) عادل حسن عنيم وجمال محمود حجر، م.س، ص٣٢.

(٤٢) محمد عبدالكريم الوافي، م.س، ص٥٨.

(٤٣) حلمي فوده وعبدالرحمن صالح عبدالله، م.س، ص١٩-٢٠.

(٤٤) قسطنطين زريق، م.س، ص٩٨.

(٤٥)احمد شلبى، م.س، ص٤٦.

* لیوپۆلد ڤون رانك(١٧٩٥–١٨٨٦)ژیاوە، مێژوونوسێکی ئەڵمانییە، وانەی کلاسیکی و لاهوتی لە هال و برلین خوێندوە، بە چەندین لێکۆڵینەوە هەڵساوە لە ئیتالیا، لە لایەنگرانی مونەرنیخ بووە بۆیە ئازادیخوازەکان رقیان لێی بووە، لە داندراوەکانی(مێژووی شانشینەکانی عوسمانی و ئیسپانی، شۆرشی سرب و پاپایەتی رۆمانی) وە بە پێشەنگی مێژوونوسان دەژمێردرێت بە مانای زانستی نوێ، وە بە مامۆستاو راهێنەری قوتابیان دادەنرێ لە بواری لێکۆڵینەوەی زانستی.

(٤٦) قسطنطين زريق، م.س، ص٩٩.

(٤٧) احمد شلبي، م.س، ص٤٥–٤٦.

(٤٨) فوزي غرابية واخرون، م.س، ص٩.

(٤٩) يوسف محمد القاضي، م.س، ص٣٨.

(٥٠) حسن عثمان، م.س، ص١٩.

(٥١) عادل حسن عنيم وجمال محمود حجر، م.س، ص٣٥.

(٥٢) قسطنطين زريق، م.س، ص١٠٤.

(٥٣) محمد عبدالكريم الوافي، م.س، ص٤٩.

(٥٤) حسن عثمان، م.س، ص٣٢.

(٥٥) عادل حسن عنيم وجمال محمود حجر، م.س، ص٣٥.

(٥٦) حسن عثمان، م.س، ص١٩–٢٠.

## لیستی سەرچاوەکان

عەرەبیەکان

١- احمد شلبى، موسوعه التاريخ الاسلامى، جزء١،طبعة١، قاهره١٩٨١.

٢- احمد بدر، اصول البحث العلمى ومناهجه، گ٣، كويت١٩٧٥.

٣- احمد علبى، الاسلام والمنهج التاريخى، ط١، بيروت١٩٧٥.

٤- البان.ج.ديد جيري، المذاهب الكبرى في التاريخ ـ من كونفوشيوس الى توينبى، ط١، بيروت١٩٧٢.

٥- الياس فرح، تطور الفكر الماركسي، ط٣، بيروت١٩٧٤.

٦- حسن عثمان، منهج البحث التاريخي، ط٣، قاهرة١٩٧٣.

٧- حلمي فوده وعبدالرحمن صالح عبدالله، المرشد في كتابة الابحاث، ط٤، جده١٩٨٣.

٨- طه باقر و عبدالعزيز حميد، طرق البحث العلمي في التاريخ والاثار، ط١، بغداد١٩٨٠.

٩- عادل حسن عنيم وجمال محمود حجر، في منهج البحث التاريخي، ط١، اسكندرية١٩٩٦.

١٠- عبدالرحمن بن خلدون، المقدمة، تحقيق:علي عبدالواحد، ج١، مصر١٩٥٧.

١١- علي حيدر سليمان، تاريخ الحضارة الاوربية الحديثة، ط١، بغداد، ١٩٩٠.

١٢- عماد عبدالسلام رؤوف، تاريخ المؤرخين العراقين في العهد العثماني، بغداد١٩٩١.

١٣- فوزي غرابية واخرون، اساليب البحث العلمي في العلوم الاجتماعية والانسانية، ط١، اردن١٩٧٧.

١٤- قسطنطين زريق، نحن والتاريخ، ط٣، بيروت١٩٧٤.

١٥- محمد زيان عمر، البحث العلمي مناهجه وتقنياته، سعودية، دار الشروق١٩٨١.

١٦- محمد عبدالكريم الوافي، منهج البحث في التاريخ والتدوين التاريخي عندالعرب، ط١، قاريونس، جامعة بنغازي١٩٩٠.

١٧- هنري جونسون، تدريس التاريخ، ترجمة و تقديم: ابو الفتوح رضوان، قتهرة١٩٦٥.

١٨- ويل ديورانت، ابطال من التاريخ ـ مختصر قصة الحضارة، ترجمة: سامي الكعكي و سمير كرم، بيروت٢٠٠١.

١٩- يوسف محمد القاضي، مناهج البحوث وكتابتها، سعودية، رياض١٩٥٩.

کوردی

٢٠- عەلی جوکل، ڕێبازی لێکۆڵینەوە، چ١، هەولێر١٩٩٩.

قوتابی ماستەر لە بەشی مێژوو

# ڕۆڵی کورد لە چاڵدێران

✍خانزاد صباح بەرزنجی

## پێشەکی:

ئەو لێکۆڵینەوە لەسەر ڕۆڵی کوردە لە یەکێك لە ڕووداوە گرینگەکانی سەدەی شانزە کە ئەویش شەڕی چاڵدێرانی ساڵی ١٥١٤یە کە لە نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی سوننی وسەفەوی شیعەدابەرپا بوو ،زیاتریش جەخت لەسەر ڕۆڵی کورد دەکات لە هەل ومەرجی سیاسی بەرپابوونی ئەو شەڕە وکاردانەوەی بەسەر کوردستان وناوچەکەبەبێ تیشك خستنەسەر لایەنی ئابوری و کۆمەڵایەتی ئەوسای کوردستان تەنها ئەوەندەی پەیوەندی بە وورووژاندنی لایەنی سیاسیەوەنەبێت ٠

ئەوەی جێگای سەرنجە کە لەو لێکۆڵینەوە تەنها باس لە شەڕی چاڵدێران ١٥١٤ کراوە بە هۆکارو ئەنجامەکانیەوە وباس لە ڕووداو وشەڕەکانی دوای ئەو ناکات کەبە مەبەستی بنەبڕکردنی دەسەڵاتی سەفەوی لەکوردستانی سنوری عوسمانی ئەنجامدراون چونکە وەك ڕوونە سەرکەوتنی عوسمانیەکان لەو شەڕە نەبووە هۆی لەناوبردنی دەسەڵاتی سەفەوییەکان و ڕووبەڕووبوونەوەو پێکدادانی تریش لە نێوان ئەو دوو زلهێزە لە دوای

چالدێران ١٥١٤ ڕووی داوە،هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی زیاتر گرنگیم داوە بەو سەردەمەی کەبە سەردەمی میرنشین وپێشەوایەتیە خۆجێ یەکان ناودەبرێ بەهۆی ئەوپەیماننامەی لە نێوان سوڵتان سەلیمی یەکەم (١٥١٢–١٥٢٠) لەلایەك ومیرو پێشەوا کوردەکانیش لەلایەکی تر بەسترا بەنێوەندایەتی کردنی مەلا ئیدریسی بەتلیسی کە وای کرد ئەو میرنشینانە زیاتر فراوانتر ببن وتەشەنە بکەن لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە مۆرکێکی ڕەسمیان وەرگرت لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی سەرکەوتوولەو شەڕەدا بێ گومان ئەوەش زیاترئەومیرنشینانەی بەرەوپێشکەوتن وبووژانەوە برد.

ئەوە جگە لەوەی هەل و مەرجی ئەو شەڕە وای لە دەوڵەتی عوسمانی کرد سیاسەتێکی میانڕەو یان دیبلوماسی پەیڕەو بکات لەگەڵ کوردو هەوڵی ڕازی کردنی کوردبدات بەسوود وەرگرتن لەوسیاسەتەجەوروستەمەی سەفەوییەکان پەیڕەوییان دەکرد لەدژی کورد و کاتێك بە زۆر دەسەڵاتی خۆی بەسەر ناوچە کوردییەکان دەسەپاند کە دەتوانرێ بە گرینگترین هۆکاری لایەنگیری کردنی کوردەکان بۆ عوسمانیەکان لەو شەڕەو شەڕەکانی دوای ئەویش دابنرێ کە بێگومان کورد توانی سوود لە هەل و مەرجی سیاسی و ناکۆکی وململانێ ی نێوان ئەودوو دەوڵەتە وەرگرن دەسەڵاتێکی خۆجێی سەربەخۆ بچەسپێنن لە کوردستان بەپێ ی بەندەکان ئەو پەیماننامەی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی مۆریان کردبوو،کە ڕۆڵی کەسایەتی ئیدریسی ناکرێ فەرامۆش بکرێ.

ئەگەر باسی تێوە گلانی کوردیش لە ململانێ ی نێوان ئەو دوو زلهێزەو بەشدار بوونی لەشانۆی سیاسی و گۆڕەپانی شەڕگەکانیان بکرێ

تێبینی ئەوە دەکرێ کە کوردستان بە هۆی پێگەی ستراتیجی جوگرافی ودەوڵەمەندی ناوچەکەی بە گرینگترین هۆکاری ناکۆکی و ململانێ ی نێوان ئەو دوو هێزە دابنرێ هەر لە بەر ئەوەشە کوردستان دەبێتە گۆرەپانی شەڕی نێوانیان وکوردیش دەبێتە هێزی پارسەنگی ڕووداوەکانی نێوانیان و،لەبەر ئەوەی ئەو شەڕە مۆرکێکی ئایینی مەزهەبیشی وەرگرتبوو کوردەکان بەرmو دەوڵەتی عوسمانی سوننی هەڵکشان کەبەخاوەنی سوننیەکان دەردەکەوت ٠

هەروەها گرینگی ئەو لێکۆڵینەوە هەر لە بەشدار بوونی کورد لە هەل ومەرجی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو دوو هێزەدانابینرێت بەڵکو لە کاردانەوەوکاریگەری ئەو شەڕە بەسەر کوردستان زیاتر بەدی دەکرێ کە خۆی لە دابەش بوونی کوردستان بۆ یەکەم جاربەکردارلە نێوان دوو دەسەڵاتی بە هێزی ناوچەکە دەگرتەوە٠ ئەوەی جێگای باسە لێرەدا کە ڕووداوەکانی ئەو شەڕە زۆر بەکەمی لە سەرچاوەکان ئامـاژەی پێکراوە کە ئەمە یەکێك بوو لەگرینگترین ئاستەنگەکانی هاتنە رێم لە ئەنجام دانی ئەو لیکۆڵینەوە وئەمە جگە لەوەی زۆر لەسەرچاوەی فارسی و تورکی وئینگلیزین بۆیە نەمتوانی بەکاریان بێنم لەو لێکۆڵینەوەدا هەربۆیەش زیاترپەنام بردە بەر ئەو سەرچاوانەی کە بەزمانی کوردین یان وەرگێڕاوون بۆی لەپاڵ سەرچاوە عەرەبیەکان وئەوانەی وەرگێڕاوون بۆی٠

بەگشتیش لێکۆڵینەوەکە لە سێ بەش پێکهاتووە،بەشی یەکەم کەباسی بارودۆخی کوردستان دەکات لە پێش شەڕی چاڵدێران و ئەویش خۆی لەسێ تەوەرەدا چڕ دەکاتەوە،تەوەرەی یەکەم بەکورتی باسی ئەومیرنشینانە دەکات کە لە پێش ئەو شەڕەدا هەبوون لەکوردستان،تەوەرەی دووەمیش

باس لە فراوانخوازییەکانی سەفەوییەکان دەکات لەکوردستان و هەڵکشانیان بەرەو سنووری ڕۆژهەلاتی دەوڵەتی عوسمانی وپیادە کردنی سیاسەتی توندو تیژی بەسەر ئەو ناوچانەی دەسەلاتیان بەزۆری دەسەپاند بەسەریدا،لە تەوەرەی سێیەمیشدا باس لەوەرگێرانی بەرەی شەڕگەکانی عوسمانی بەرەو ڕۆژهەلات وگرتنە بەری ڕێگای ووت وویژ لەگەڵ کوردەکان ئەویش بە سوود وەرگرتن لەپێگەی ئایینی کەسایەتیەکی کوردکە مەلا ئیدریسی بەتلیسی یە کەجگە لەوە شارەزایەکی چۆنیەتی مامەڵە کردن بووە لەگەڵ فەرمانڕەواکان وچەندین پۆستی کارگێڕی وەرگرتبوو هەر لە سەردەمی ئاق قۆینلوەکان ولەدوای ئەوانیش سەفەوییەکان وعوسمانیەکان.

لەبەشی دووەمیشدا کە بەسەر دووتەوەرەدا دابەش دەبێت ،لە تەوەرەی یەکەمداباس لە تێوە گلانی کورد دەکات لەململانێ وناکۆکی نێوان سەفەوی وعوسمانیداوسیاسەتی هەریەکێکیان لە کوردستاندا ،تەوەرەی دووەمیش باسی هۆکارەسەرەکیەکانی ڕووبەڕووبوونەوەلەچاڵدێران دەکات.

بەشی سێیەمیش کە لە سێ تەوەرەدا چڕ کراوەتەوە،تەوەرەی یەکەم باس لە هەڵکەوتەی جوگرافی چالدێران و زۆربەکورتیش باس لە ڕووداوەکانی شەڕەکە و ئەو سیاسەتانەی کە تیادا ئەنجام دراوە،تەوەرەی دووەمیش باس لەڕۆڵی کورد دەکات لەو شەڕەدا چ وەك پارسەنگێکی هێز لەناوچەکەیان بەشداربوونی لەشەڕەگەکان هەڵکشانی سوپای عوسمانی بەخاکی کوردستان بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەچاڵدێران ،تەوەرەی سێیەمیش کە باس لە کاردانەوەو ئەنجامەکانی ئەو شەڕە دەکات بەسەر ناوچەکە بەگشتی و بەسەر کوردستان

بەتایبەتی وباس لەو ڕێکەوتنەی نێوان میرە کوردییەکان وسوڵتان سەلیمی یەکەم (١٥١٢-١٥٢٠)دەکات٠

ئەوە کورتەی بەشەکانی لێکۆڵینەوەکەم بوو هەرچەندە دڵنیام لەوەی کەم و کوڕی زۆری تێدا بەدی دەکرێت بەڵام نەبوونی کات بۆ ئەوەی بەتەواوی بۆلێکۆڵینەوەکەدەست بەتاڵ بم ئەمە جگە لەوەی شارەزانەبوونم لەزمانی سەرچاوە ڕەسەنەکانیش هۆکارێکی تری کەم وکوڕیەکانیئەو لێکۆلینەوەن ،پیلانی لێکۆڵینەوەکەش وای لێکردم ئەوەندە باس لەو ڕووداوە بکەم چونکە بابەتێکی وا گرنگ تەنها بەو چەند لاپەڕەیە بەتێروتەسەلی باسی لێوە ناکرێ وتیشك ناخرێتە سەرهەموو لایەنەکانی بۆ نمونە ڕۆڵی مەلا ئیدریسی بەتلیسی بەتەنها جێگای تاووتوێکردنن لەپەیوەندی بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە لایەك و،پەیوەندیشی بە میرنشینە کوردییەکانیش لەلایەکی تردا،کە منیش پێم خۆش بوو تەوەرەیەك لە لێکۆڵینەکەم تەرخان بکەم بۆ ڕۆڵ و هەڵسەنگاندنی کارەکانی ئەو کەسایەتییە بەڵام توێژینەوەکە هەر ئەوەندەی هەڵدەگرت٠ جاهیوادارم توانیبێتم تیشکێك بخەمە سەر ئەو ڕووداوەوکارێکی چاك بووبێت و بە گەورەیی خۆتانیش چاو لە هەڵەکان بپۆشن ٠

## بەشی یەکەم :تەوەرەی یەکەم :کوردەکان لە سەردەمی پێش چاڵدێران :

هەر لەسەرەتاکانی سەدەی پانزە(١)و شانزدەهەمدا کوردستان با لا دەستی وفەرمانڕەوایەتی چەندین میرنشینی کوردی بە خۆوە دیت کە جیاوازیان هەبوە لەلایەنی فراوانی میرنشینەکەو جۆری دەسەڵاتیان کە هەندێکیان دەسەڵاتیان سنوردار بووەو ناوچەیەکی دیاریکراوی گرتۆتەوە وەکو میرنشینی بانە کە شاری بانە ودەوروبەری گرتۆتەوە(٢) لەکاتێکدا میرنشینی ئەردەڵان سنووری باڵا دەستی گەیشتۆتە ناوچەکانی شارەزوور وناوچەکانی ناوەراستی کوردستانی ڕۆژهەلات(٣) .
سەبارەت بە رۆلی ئەو میرنشینانەو بەهێزیان جیاوازیەکی زۆر بەدی دەکرێت بە پێ ی سنوری ئەو ناوچانەی لە ژێر دەستیان بووەولە هەمان کاتدا سە ربەخۆیی ئەو میرنشیناش جۆراو جۆر بووە بۆ نمونە میرنشینی چمشکزك کە دەکەوتە باکوری ڕۆژئاوای کوردستان خاوەن سەربە خۆییەکی تەواو بووە(٤) تیاشیان دا هەبووە کە سەر بە و دەوڵەتانە بوون کە لە کوردستان دا باڵادەست بوونە نمونەی ئەو میرنشینانەش میرنشینی ساسون کە لە رۆژئاوای بەتلیس بووە سەر بە دەوڵەتی ئاق قۆینلوەکانبووە (٥)هەرچەندە لەلایەن میروفەرمانڕەوا خۆجێیەکان حوکم کراوە(٦).
بەپێ ی ئەو شێوازەی میرنشینەکان لە فەرمانڕەواییدائەو هەموجیاوازییەی کە تیایدا بەدی دەکرێت دیارە لێکۆڵینەوەو باسکردنی بارودۆخی سیاسی

کوردستان لە هەل ومەرجی ئەو کاتی سەدەی شانزەهەمدا دیارە کۆمەڵێك کۆسپ و تەگەرەوئاستەنگ دەخەنە ڕێ بە هۆی ئەو نا سەقامگیریە سیاسیەی لە ناوچەکەشدا هەبووە جا چ بەهۆی شەڕو ناکۆکیٚ نێوان خودی میرنشیننەکان خۆیان بێت یان بە هۆی رووبەڕووبوونەوەوپێکدادان بێت لەگەڵ دەولەتی ئاق قۆینلوەکان.

سەرباری ئەو کۆسپ وتەگەرانەی دەبنە هۆی ئاڵۆزی هەل و مەرج و بارودۆخی سیاسی کوردستان لە سەدەی‌شانزەهەمدا نەبونی یا دەگمەن بوونی سەرچاوەش دەبنە ئاستەنگ لە بەردەم دەوڵە مەند کردنی لێکۆلینەوە لەو سەردەمەدا،جگە لە شەرەفنامە کە ناتوانرێ ڕۆلی لە بەخشینی زانیاری لە سەر ئەو سەردەمە فەرامۆش بکرێ لە گەڵ هەندێ سەرچاوەی نوێ کە لە ڕووداوە مێژووییەکانی ئەو سەردەمە دەکۆلنەوە.

دەربارەی ئەو میرنشینە کوردیانەی کە لە سەدەی شانزەدا هەبوون لە گۆرەپانی سیاسیداچەند نمونەیەك دەخەینە ڕوو بەپێ ی دابەش بوون وهەڵکەوتەی جوگرافیان:

ا-میرنشینەکانی باکوری کوردستان:

١-میرنشینی پازوکی:ئەومیرنشینە لە باکوری‌دەریاچەی (وان) بووەوپایتەختەکەشی شاری (ملازگرد) بووە.(٧)

٢-میرنشینی سیڤدیا:ئەو میرنشینەش لە ڕۆژئاوای شاری (موش) بووە(٨)

٣-میرنشینی چمشکزك:ئەو میرنشینە لەباکوری شاری(ملاگیە) ومەڵبەندی میرنشینەکەش(چمشکزك)بووە.(٩)

٤–میرنشینی بەتلیس:ئـەو میرنـشینەلەباشوری ڕۆژئـاوا (وان)بـووە وبـەتلیس وناوچەکانی دەوروبەری دەگرتەوە(١٠)

٥–میرنـشینی ساسـون:ئـەو میرنـشینە لـەڕۆژئاوای بـەتلیس بـووەو شـاری (ساسون) مەڵبەندی میرنشینەکە بووە(١١).

٦–میرنشینی خیزان:ئەو میرنشینەلە باشـوری ڕۆژ ئـاوای (وان) بووەوشـاری خیزان ودەوروبەری دەگرتەوە(١٢).

٧–میرنشینی هەکاری:ئەو میرنشینەلە باشوری ڕۆژهەلاتی میرنشینی شیروان بـووە لـە هــە رێمــی هەکاریـدا و سنورەکەشــی هــەموو هــەرێمی هــەکاری وشــەمدینان وجولــە مێرگــی دەگرتــە خۆیــو (جۆلــەمێرگ) مەڵبەنــدی میرنشینەکە بووە.(١٣)

٨–میرنــشینی بۆتــان:ئــەو میرنــشینەش لەباشــوری دەریاچــەی وان(١٤) و ڕۆژئاوای‌میرنـشینی هـەکاری بووەوشـاری جـەزیرەش(جزیـرە ابـن عمـر) یـش مەڵبە ندی میرنشینەکە بووە (١٥) ٠

## ب-میرنشینەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان:

٩–میرنشینی لورستان: ناوچەکانی لورستانی گچکەی لـەژێربالا دەسـتی ئـەو میرنشینەدا بووە وشاری (خورەم ئاباد) مەڵبەندی میرنشینەکە بووە.(١٦)

١٠–میرنــشینی موکریــان:لــە کوردســتانی ڕۆژهەلاتــدا حــوکمرانی ناوچــەی (موکری) دەکرد.(١٧)

١١– میرنــشینی بانــە:لــە باشــوری میرنــشینی موکریــان بــووە و شــاری بانەودەوروبەریشی گرتۆتەوە.(١٨)

١٢–میرنشینی دنبلی:ئەو میرنشینە دەکەوتەبلکوری رۆژ ئاوای دەریاچەی ورمێ و شاری(خوی) مەڵبەندی میرنشینەکە بووە.(١٩)

١٣ –میرنشینی برادوست:لە رۆژئاوای دەریاچەی ورمێ بووە وفەرمانرەوایی شاری (ورمی) یان کردووە.(٢٠) ١٤ -میرنشینی کەلهور:لە باکوری لورستان بووە وگرنگترین قەلاَکانیشی لەژێر دەستی دا بوە ولەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەری(٢١)

## ج-میرنشینەکانی باشوری کوردستان

١٥–میرنشینی بەهدینان:لە باشوری میرنشینی هەکاری بووە وشارەکانی عەقرەو دهوك وناوچەکانی تری گرتۆتەوە ومەڵبەندی میرنشینەکش قەلاَی ئامێدی بووە.(٢٢)

١٦–میرنشینی سۆران:لەباشوری میرنشینی بادینانە ولە ناوچەکانی شەقلاَوەو (حریر)و رەواندز بالاَ دەست بوونە ومەڵبەندی میرنشینەکەش(حریر) بووە.(٢٣)

١٧–میرنشینی بابان:لە رۆژهەلاَتی میرنشینی سۆران ولە سەدەی شانزەداسنوری دیاری نەکراوە بەلاَم لەشەرەفنامەدا هاتووەناوچەی لارجان (لاهیجان) لە ژێر دەستدا بووە .(٢٤)

١٨–میرنشینی ئەردەلاَن:ئەو میرنشینە لەو سەردەمەدا دە سەلاَتی دەگەیشتە ناوچەکانی شارەزوور ومەڵبەندی میرنشینەکەش قەلاَی (زەڵم) بووە وناوچەیەکی فراوانی لە ژێر دەستدا بووە(٢٥)٠

١٩-میرنشینی داسنی:هەرچەندە ناوی ئەو میرنشینە لە شەرەفنامە دا هاتووە بەڵام هیچ زانیارییەکی ئەوتۆی لە سەر باس نەکردووە بەڵام (محمد امین زکی) بەگوێرەی زانیارییەکانی (انسیقلو پەدیای اسلام) واتە (دائرە المعارف الاسلامیە) دەڵێ(ئەو میرنشینەلە ناوچەکانی دهوك دا ژیاون و شاری دهوکیشی لە ژێر دەستدا بووە بەڵام بەهۆی ناکۆکی و کێشە لەگەڵ میرنشینی بادینان ئەو ناوچەیەی لە کیس چووە لە سەرەتاکانی سەدەی شانزەهەمدا واتە میرنشینێکی بچوکی ئیزید بیەکان بووە لە پاڵ میرنشینی باد ینان.(٢٦)

ئەوەی جێگای باسە وتێبینی دەکرێ بوونی ئەو میرنشینانەبەڵگەی ئەوەن کە کوردستان دەسەڵاتی سیاسی رێ پێدراوی لەو ماوەیەدا هەبووە کە بەڵگەن بۆ سووربونی کوردلەسەر سەربەخۆیی و مل کەچ نە بوونیان بە ئاسانی بۆ هێرشکەران و پەلامارداراني(فاتحین).(٢٧)

**بەشی یەکەم:تەوەرەی دووەم:فراوا نخوازی سەفەوی لەکوردستان:**

کوردستانی رۆژهەڵات لە کۆتاییەکانی سەدەی پانزەوە دامەزراندنی دەوڵەتێکی تیادا دەرکەوت بەناوی دەوڵەتی سەفەوی کە لە بنەماڵەی سەفەوییەکان پێکهاتبوو (٢٨)ئەو دەوڵەتەش کەوتە ململانێ و ناکۆکی لەگەڵ دەوڵەتی تورکمانی ئاق قۆینلوەکان(٢٩)کە لە ئەنجامدا بووە هۆی رووخانی دەوڵەتی ئاق قۆینلوەکان لە ساڵی ١٥٠٨ و توانیان شوێنان بگرنەوەوبالاّ دەستی خۆیان لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیان رابگەیەنن ولە ساڵی ١٤٩٩ ناوچەی (شێروان) کەوتبووە ژێر رکێفی سە فەویەکان (٣٠)

وهۆکاری ئەو هێرشکاریەش دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێك هۆکاری سیاسی وئابوری و ئایینی(٣١) ٠سەبارەت بە کوردستانیش کە لێرەدا مەبەستی ئێمەیە پێگەکەی دەکەوێتە سەر ڕێگای شوێنێکی ستراتیجی بۆ سەفەوییەکان کە مەبەستیان گەیشتن بوو بە دەریای ناوەڕاست کە ڕێگای بازرگانی ئێران بووەو ناوچەکانی کوردستانیش مەڵبەندی گرنگی ئە و ڕێگایە (٣٢)کە ڕێگای سەرەکی بووە بۆ ناردنە دەرەوەی ئاوریشم بەرەو ئەوروپا(٣٣)وفروانخوازیـشااسماعیل ناوچەکانی ئازەربێجانیشی گرتەوەو توانی دەستی بە سەردابگریۆلەساڵی ١٥٠١ گەڕایەوە تەورێزو شایەتی خۆی ڕاگەیاند ،بەو شێوەش سەفەویەکان بالآ دەست بوون لە زۆربەی ناوچەکانی ئێران (٣٤) وناوچەکانی تریش والآ بوو لە بەردەم فراوانخوازی شا اسماعیل وسەفەوییەکان٠

لە هەمان کاتدا نە بوونی هێزێکی یەکگرتووی کوردی وپەرتەوازەیی هێزی میرنشینەکان هۆکارێکی ترە بۆ ئەوەی هەرچەندە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان سەر بە دەوڵەتی ئاق قۆینلوەکان بوو بەلآم مەیدانێکی چالاکی جم وجۆڵی شا اسماعیل و فراوانخوازییەکانی بووەو(٣٥)شا اسماعیل لەساڵی ١٥٠٦ هێزێکی زۆری نارد ۆتە سەر ناوچەی موکریکە هەرچەندە ئەو هێزە دووجارلەبەردەم هێزی خەڵکەکەی سەرنەکەوتووە(٣٦) بەلآم دواتر توانی چەندین سەرکەوتن لەکوردستان وە دەست بێنێ بەتایبەتیش کاتێك لە ساڵی ١٥٠٧ خۆی سەرکردایەتی ئەو هێزەی کرد کە بەرەو ئەرزنجان ودیاربکر و لەوێوەش بەرەو موسڵ وبەغدا ڕۆیشت وکە لەساڵی١٥٠٨ بەغدای داگیر کردو لەڕێگای لورستان گەیشتەتەورێز ی پایتەختی دەوڵەتەکەی(٣٧) پێشتریش

میرشێکی بۆ ئەرمینیا کردبوو.(٣٨)بەو شێوەیە توانی لاگیری وملکەچی میرنشینە کورد یەکان بەدەست بێنێت جا ئەگەر لە ترسان بوو بێتن یا بە ڕەزامەندی خۆیان بێت لەو انیش میرنشینی هەکاری(٣٩)،میرنشینی چمشکزك(٤٠)،میرنشینی ئەگیل کەبە زۆری دەستی بەسەر داگرت وفەرمانڕەوایی ئەو میرنشینەشی بە قزلباشێك سپارد(٤١) بەهەمان شێوەش میرنشینی پلنگان(٤٢) ،میرنشینی پازوکی(٤٣) هەروەها دەستی بەسەر هەردوو شاریوان (٤٤) ود یاربکری گرت ودوایش بە (میر بك موصلو)یسپارد کە جێ ی بڕوای سەفەوییەکان بووە (٤٥)،بەلاّم ئەوە مانای ئەوە نیە کە ڕوبەڕووی هیچ بەرنگارییەکی میرنشینە کوردیەکان نەبووبێتەوەو بەرپەرچ نەدرابێتەوەبۆ نمونە میرنشینی بۆتان لە هەموو شەڕەکانی دا لە دژی سەفەوییەکان سەرکەوتووەو توانیویەتی نزیکەی ٧٠ کەس لەسوپای سەفەوییەکان بکوژێت.(٤٦) کاتێکیش گەیشتە لورستان لە ساڵی ١٥٠٨ توانی متمانە و لاگیری شای لورەکان بەناوی (روستم شا)وەربگرێ پاش ئەوەی بەناچاری خۆی بە دەستەوە بدات پاش ئابلوقەدانی لە لایەن سوپای سەفەوی(٤٧) ئەمە جگە لەوەرگرتنی لاگیری میرنشینی بەتلیس(٤٨)هەر بەوەش نەوەستا بەڵکو هەوڵی دا ناوچەکانی تری کوردستانیش بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی بۆ ئەو مەبەستەش سێ هێزی ئاراستەی ناوچەی میرنشینی بوتان کرد کە چارەنووسی هەر هەموویان دۆڕان بووەو نەیتوانی ئامانجی خۆی لەو ناوچانە بەدەست بێنێ(٤٩) جگە لەوەش ئەوەی لەکەسایەتی شا اسماعیل تێبینی دەکرێ ئەوەیە کە جیاوازی لە نێوان دۆست و دوژمن نەکردووە بە بەڵگەی ئەوەی کاتێك یانزە میری کوردی میوانی ئەو دەبن

لەشاری (خوی) داوە بۆ بەخشینی لاگیری وڕاگەیاندنی مل کەچی خۆیان بۆدەسەلاتی سەفەوی هەر هەموویان دەکوژێت کە لە نێو ئەو میرانەش میری بۆتان بووە کەپێشتر مل کەچی دەسەلاتی نەبوون ومیری بەتلیسیش کە ناوچەکان لە ژێر ڕکێفی ئەودا بوە(٥٠)بەو شێوەیە سەفەوییەکان لە سەردەمی شا اسماعیل دا لە گشت ناوچەکانی ئێران وعیراق وکوردستان بالاّ دەست بوون چونکە توانیان مل کەچی و لاگیری گشت میرنشینەکان وەرگرن ئەگەر بە ناویش بێت(٥١)٠

## بەشی یەکەم:تەوەرەی سێیەم :لایەنگیری عوسمانی لەکوردستان:

کاتێک سولتان سەلیمی یەکەم دەسەلاتی وەرگرت (١٥١٢–١٥٢٠) دەوڵەتی عوسمانی خەریکی هێرشکارییەکانی بوو لە ئەوروپا و دەوڵەتی سەفەویش خەریکی داگیرکارییەکانی بوو لە کوردستان وئاسیای نزیک بەلاّم لەگەل ئەوەی خەریکی رۆژئاوا بوو لە دوورەوەش چاوەدێری سنوری ڕۆژهەلاتیشی دەکرد بەتایبەتیش کاتێک مە ترسی لەسەر ئەو ئاراستەیە پەیدابوو ئیتر دەولەتی عوسمانی نەیتوانی بەرامبەر ئەو دەست درێژیو هێرشکارییانە دەستەو ئەژنۆ و بێ دەنگ بێت(٥٢) بۆیە ئاراستەی شەرەکانی بەرەو ڕۆژهەلات گۆری (٥٣)

کوردەکانیش کە هێزێکی لاسەنگی ناوچەکە بوون وگرنگیان هەبووە بۆ پاراستنی هاوسەنگی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە بەتایبەتیش لە هەلو مەرجی ئەوسا کە لەسەرو بەندی ڕووبەڕووبوونەوە بوون لەچالدێراندا بۆیە سولتان

سەلیم ویستی سۆزی کوردەکان بۆ خۆی ڕابکێشێت بۆ گەیشتن بەو ئامانجەشی هەوڵی دا سوود لەڕێزو پێگەی ئایینی کەسایەتی (مەلا ادریسی بەتلیسی) وەربگرێت بۆ ئەوەی لەڕێگەی دیبلوماسیدا لایەنگیری کوردەکان بۆ خۆی ڕابکێشێت چونکە ئەو کەسایەتیە کاریگەرییەکی زۆری لە سەر میرە کوردەکان هەبووەو خاوەن کەساییەتیەکی بەهێز بووەو شارەزاییەکی زۆریشی لە فەرمانڕەواییدا هەبووە بۆیە توانیویەتی پشتگیری و لاگیری کوردەکان بۆ دەوڵەتی عوسمانی مسۆگەر بکات لە بەرامبەر دابین کردنی حکومەتێکی خۆجێ ی سەربەخۆ لە کوردستان ئەگەر بۆ ماوەیەکی کاتیش بێت٠(٥٤)

مەلا ادریس بەهۆی ئەوەی چەندین پلەوپایەی پێشتر وەرگرتبوو هە لە سەردەمی ئاق قوینلوەکان ولەدوای ئەوانیش جێگای متمانەی شا اسماعیل دەبێت بەو ڕادەیەی دەبێتە مۆرهەڵگری شا وپاش ئەوەی تای تەرازووی هێز بە لای عوسمانیەکان دەبێت لایەنگیری عوسمانیەکان دەگرێت٠(٥٥) جگەلەو شارەزاییەو ڵارامەییەی بە هۆی نزیکی لە دەسەڵات وەریگرتبوو خاوەنی پێگەی ئاینیش بووە لەناو کوردا ئەمەش کارەکانی بۆ ساناتر کردووەو(٥٦) زۆر بیرو ڕا دەربارەی ئەوکەساییەتیە نوسراوە لەوانەش گردلیڤسکی بە(پیاوی دەوڵەت) وەسفی دەکات (٥٧) ،ئەو پەیوەندییانەی مەلا ادریس بە میرە کوردییەکانی کردووە پاش وەرگرتنی ڕەزامەندی خودی سولتان سەلیم و بە سوود وەرگرتن لەو مۆرانەی لە بەردەستی دا بوون ئەو میرانەی لە فەرمانڕەوایی کردنی میرنشینەکانیان لادرابوون و قزلباشیان لە جێگا داندرابون دایمەزراندنەوەبەو جۆرە بە ڕەسمی ناساندنی میرنشینە

كوردییەكان لەلایەن عوسمانیەكانەوەوپێكهێنانی كۆمەڵی سەربازی سوارەی حازرو ئامادە لەناو هەرمیرنشینێكدا بۆ بەرگری كردن لە دەوڵەتی عوسمانی ئاسایش و دەسەلاتێكی بە میرەكان بەخشی كە پێشتر نەیانبوو (٥٨)٠

پەیرەو كردنی ئەو سیستەمە لە حوكمدا بووە هۆی دروست بونی نزیكەی شانزە (حكومەت) یا میرنشین لەماوەی چەند ساڵێكدا مەلا ادریس لەلایەن خۆی یان جێگرەكەی ووت وێژییان لەگەل كاربەدەستانی دەكرد دەربارەی كاروباری ناوخۆییان وبەو شێویە ناوچەكانی قەڵەم ڕەوی عوسمانی نزیكەی ٣٠٪ خاكی كوردستانی دەگرتەوە (٥٩)،هەندێ ڕاش پێ ی وایە ئەو ڕێكەوتنە بە نیازی ژیاندنەوەی میرنشینە لەناو چووەكان بووەنەك بۆ گۆڕینی حوكمی سەفەوی بە عوسمانی(٦٠)٠

## بەشی دووەم :تەوەرەی یەكەم :كوردستان لەنێوان ململانێ ی سیاسەتی عوسمانی و سەفەوییدا :

هەر لە سەرەتای سەدەی پانزەوە ئیدی دەوڵەتۆكە كوردیەكان لاواز بوون وبەهاندانی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی سیستەمێكی دەرەبەگی هاتە كایەوە ئەم سیستەمەش بوو بە هۆی دامەزراندنی میرنشینی گچكە گچكە و پەرت وبڵاو لە وولاتی كورد دا كە سەر خێڵەكان فەرمانڕەواییان دەكرد(٦١) بەلام ئەو میرنشینانە یا بنەماڵەی پادشاكان یان دەرەبەگەكان هەرچەندە چەشنە سەربەخۆییەكیان هەبووە بەلام زۆر جار لە نێو خۆیاندا یەك نەبوون وهەمیشە پێكەوە شەڕو كێشەیان بووە تەنانەت بۆ

ئەو مەبەستەش داوای یارمەتی و كۆمەكیان لە هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی كردووە (٦٢)٠

دەربارەی سیاسەتی سەفەوییەكان لەكوردستان بەشێك لە لێكۆڵەرەوە پێ یان وایە كە سیاسەتی حكومەتی ئێرانی لە سەرەتادا دەست نەخستنە نێو كاروباری نێوخۆیی بووە بۆ هۆزو خێڵە كوردییەكان(٦٣) لەوانەشە ئەو رایەی تارادەیەك لە ڕاستی نزیك بێت كاتێك تێ بینی هەنگاوەكانی شا اسماعیل دەكرێ لە كوردستان دەبینرێ میری هەكاری كاتێك لاگیری وەل كەچی خۆی بۆ دەسەلاتەكەی ڕادە گەیەنێ شا اسماعیلیش دان بەدەسەلاتەكەی دەنێت وفەرمانڕەوایی كردنەپشتاوپشتیەكەی بۆ دەگێرێتەوە (٦٤)بەلام ئەوە مانای ئەوە نیە ئەوە سیاسەتی گشتگیری سەفەوییەكان بووە بەڵكو لەهەمان كاتدا میری چمشكزك هەرچەندە مل كەچی خۆی ڕادەگەیەنێ وهەموو قەلاكانیشی بەرەزامەندی خۆی پێ دەدا بەلام شا اسماعیل نەك هەرلە فەرمانڕەوایی كردنی میرنشینەكە لا دەدات و میرنشینەكەش بە بڕوا پێكراوێكی خۆی دە سپێرێ بەڵكو لەناوچەكەشی ناهێڵێت و لە ناوچەیەكی سەر بە ویلایەتی عیراق دایدەمەزرێنێ(٦٥)،لەگەڵ ئەوەشدا ئەو سیاسەتە بەردەوام نەبووبە گشتی بۆ زیاتر روونكردنەوەو د یاریكردنی سیاسەتی سەفەوییەكان لەكوردستان دەتوانین پوختەی ئەو سیاسەتە لەچەند خاڵێكدا كۆبكەینەوە كە بریتین لە:

١-پشت بەستن بە توركمانەكان لەجیاتی كورد لە فەرمانڕەوایی كردنی میرنشینە كوردییەكان ئەوەش كاتێك میرێكی كوردی لادەداو قزلباشێكی لە جێگای ئەودا دادەنا٠(٦٦)

٢-ناچار کردنی کورد لەناوچە داگیرکراوەکانی ژێر دەسەلآتیان لە کوردستان بە گۆڕینی مەزهەبی سوننی بەشیعەوئەوسیاسەتەش گشت ناوچەکانی ژێر دەسەلآتیانی دەگرتەوە(٦٧).

٣-بەکارهێنانی گەورەترین هێز بۆ تۆقاندنی خەلك و لە ناوبردن وقڕکردنی گشت بزووتنەوەکانی مل کەچ نەبوون وهەلگەرانەوەلەدژیدا(٦٨).

شایانی باسە زۆربەی ئەوانەی باس لەو بابەتە دەکەن ئەو سیاسەتەی سەفەوییەکان بەرامبەر بە کورد دەگێڕنەوە سەر ئەوەی کورد سوننە مەزهەب بووەو شاسماعیلیش توند ڕەوێکی شیعە بووە(٦٩)

دەوڵەتی عوسمانیش هەوڵی داوە لە کوردستان دا خۆی لە رووبەڕووبونەوە بپارێزێت وڕێگای دبلوماسی گرتە بەر بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ کوردەکان دەربارەی هەڵبژاردنی ئەو ڕێگایەش زۆر بیرو ڕا هەیە لەوانە هەندێ پێ ی وایە (بۆ دەوڵەتی عوسمانی مەحاڵ بووە بتوانێت کوردستان بخاتە ژێر ڕکێفی دەسەلآتی خۆی و داواکانی کورد رەت بکاتەوە(٧٠) ،رای تریش هەیە پێ ی وایە (سوڵتان سەلیم لەهەل و مەرجی ئەوکاتدا بەرژەوەندیەکانی وای خواستووە کە ئەو ڕێگایە بگرێتە بەر لەگەڵ کوردەکان چونکە نیازی رووبەروو بونەوەی لەگەڵ سەفەوییەکان هەبووە)(٧١)،رای تریش هەیە پێ یوایە (دەوڵەتی عوسمانی بەوەی زانیوە کە شەڕ لەگەڵ کوردەکان پارەو شەرکەرێکی زۆری پێویستە بۆیە رێگای دبلوماسی هەڵبژاردووە یان (سیاسەتی هەڵخەڵە تێنەر) وەکو هەندێك وەسفی دەکەن)(٧٢)،بەشێکیش پێ یان وایە( پەیڕەو کردنی ئەو سیاسەتە لەسەر پێشنیاری مەلا ادریس بووە کە وەکو ڕاوێژکاری سولتان بۆ کاروباری کوردی کاری کردووەو پلانێکی رێك

وپێکی دارشتووە بۆ مسۆگەر کردنی لاگیریو مل کەچی میرە کوردییەکان بۆ دەوڵەتی عوسمانی)(٧٣)، ئەمە جگە لەوەی لەوانەیە هەڵویستی خودی میرە کوردیەکان هانی سولتان سەلیمی دابێت بۆ پەیرو کردنی ئەو جۆرە سیاسەتە ئـەوەش کاتێـك کـە تالآنکـاری وزەوت کردنـی مـاڵ وموڵکیـان لەلایـەن سەفەوییەکان بێزارو هەراسانیان دەکات بۆ یە ئـەوانیش هانا بۆ دەوڵـەتی عوسمانی و سولتان سەلیم دەبەن و لاگیری خۆیان بۆیان دووپات دەکەنـەوە ئەوەش لە رێگای مەلا ادریس بووە وەکو نوێنەری سولتان (٧٤) ٠

ئـەوەی جێگـای سـەرنجە لێـرەدا ئەوەیـە کەئـەوەی دەوڵـەتی عوسمـانی و کوردەکان کۆدەکاتـەوە بـەپێ ی زۆربـەی سەرچاوەکان ئەوەیەکـە سـوننەن وکوردیش سۆزی ئایینی و مەزهەبی بەرەو عوسمانیـەکانی بـردووە(٧٥) هـەر ئەمـەش وای لـە کـورد کـردووە کـە لـە سـەفەوییەکان وئـەو سیاسـەتەی پـەیرەوییان کـردووە دوورە پـەرێز بوەسـتێ چـونکە هـەوڵی داوە مەزهـەبی شیعەیان بەسەر بسەپێنێ و ئەو مەزهەبە بەهێز بکات(٧٦)ئەمە لەلایەك و لـە لایەکی تریش مەلا ادریس هەموو شێوازێکی گرتە بەر بـۆ ئـەوەی مـیرە کـورد ییـەکان رازی بکـات بـەوەی کـە پـشتگیری لـە دەوڵـەتی عوسمـانی بکـەن بەرامبەر ئەو کارەشیان ئەگەر قازانج نەکەن ئەوا زەرەرمەنـدیش نـابن و هـەر بەناو سەر بە دەوڵەتی عوسمانی دەبن(٧٧)٠

بەوشـێوەیە سیاسـەتی هەریـەك لـە دەوڵـەتی عوسمـانی و سـەفەوی جـۆرە سەربەخۆ ییەکی بە میرنشینە کورد ییـەکان بەخـشی لـە هەلومـەرجی ئـەوێ رۆژێدا کـەبتوانن لەگـەڵ هـەردوو دەوڵەتـە مەزنەکـەی ناوچـەکە لەیـەك کاتـدا مامەڵە بکەن و(٧٨)بۆنمونە میرنـشینی بابـان بـەهۆی هەڵکەوتـەی جـوگرافی

میرنشینە کە ناچاربوون لە ئێران نزیك ببنەوەو لەسەر دوو پەت یاری بکەن(٧٩) واتە بووە هۆی ئەوەی کورد ڕۆڵێکی دیاری هەبێت لە سیاسەتی هەرێمایەتی(٨٠) لە نێوان ئاگری شەڕی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە کە چوار سەد ساڵی خایاندووە(٨١)٠

## بەشی دووەم :تەوەرەی دووەم :هۆکارە سەرەکییەکانی رووبەرووبونەوە لە چاڵدێران:

هەرچەندە دەربارەی هۆکاری ململانێ ی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە بووترێ هۆکارێکی هەرە گرنگ لە نێوانیاندا سەرنج ڕادەکێشێ ئەویش ستراتیجیەتی ناوچە کوردییەکان کە دەکەوێتە نێوان هەردوو دەوڵەت هۆکارێکی سەرەکیە بۆ خولانەوەی ململانێ یەکە بەدەوریدا(٨٢)کە هەریەك لەو دوودەوڵەتە بیخاتە ژێر دەستی خۆی بەهۆی گرنگی ئابوری ناوچەکە و دەوڵەمەندی بە بەروبومە کشتوکاڵیەکان (٨٣) ئەمە لەگەڵ ئەو گرنگییە بازرگانیەی کەدەکەوێتە سەر ڕێگای بازرگانی ئێرا ن بۆ دەریای ناوەڕاست و دەریای رەش(٨٤)جگە لەگرنگی سەربازی بەسوود وەرگرتن لە پێگەکەی بۆ قەلا سەربازییەکان وهێزی مرۆیی(٨٥)لەگەڵ بونی ئەو هۆکارە ئابوورییانە هەندێك لە مێژوونوسان جیاوازی مەزهەبی بە هۆکاری سەرەکی شەرەکە دادەنێن وبە تایبەتیش ئەو توند ڕەوییەی سەفەوییەکان پەیڕەوییان دەکرد بۆ سەپاندنی مەزهەبەکەیان تەنانەت کار گەیشتە ئەو ڕادەیەی سەفەوییەکان لەبەغدا قەسابخانەیەکیان بۆ زانا سوننەکان ئەنجامدا لەساڵی ١٥١٠(٨٦) کەبووە هۆی وورووژاندنی هەستی گەورە زانایانی ئیسلامی سوننە ی کوردو

عـەرەب بەڕادەیـەك کـەداوا لـە دەوڵـەتی عوسمـانی بکـەن بجـەنگێن لـەدژی سەفەوییەکان ئەمەش بەپاساو بە دەست سولتان سلیم بۆ ئـەوەی مـۆرکێکی ئایینی ببەخشێ بەشەرەکە(٨٧)بەو شێوەیەسولتان سەلیم نەی تـوانی کـاری رووبەرووبونەوەی لەگەڵ سەفەوییەکان فەرامۆش بکات بەتایبەتیش کە شـای ئێـران ناوچـەکانی کـوردی و هـۆزە تورکیـەکانی توروسـی بـچوك وکەمینـە مەسیحیەکانی لە ئەرمینیا هەبون خستە سـەر قەڵـەمرەوی خـۆی و ئەوەشـی ڕاگەیانـد بۆیـە کاربەدەسـتانی ئیـستانبول ئـەوەیان ڕاگەیانـد کـە ئێـران سنورەکانی بەزاندووە کاتێك عیراق وکوردستان و ئەرمینیا بە ناوچەکانی ژێـر دەستی دادەنێ(٨٨)هەندێسەرچاوەش دالّدەدانی شا ئیسماعیل بۆ ئەو میرە عوسمانیانەی دەیانویست دەسەلأت لە سولتان سەلیم وەربگـرن بـەهۆکارێکی بەرپا بوونی شەڕەکە دادەنێن(٨٩)

لەلایەکی تریش سـولتان سـەلیم بـواری بـۆ ڕەخـسا بـۆ ئـەوەی سیاسـەتێکی پـەیوەندی ئاشتی دیبلوماسی لەگەڵ ئـەوروپا پـەیرەو بکـات ئـەوەش دڵنیـای کردەوە لەگۆڕینی ئاراستەی شەرەکانی لە رۆژئاواوە بۆ ڕۆژ هەلأت وهەولّدانی بۆ یەکلا کردنەوەی کێشەکان لە گەڵ دەولّتی سەفەوی و شا اسماعیلدا (٩٠)

بـەو جـۆرە سـولتان سـلیم لـە دژی شـا اسماعیـل و سـەفەوییەکان شـەڕی ڕاگەیاند بەپێ ی فەتوایەکی(شیخ الاسلام) کە تیایدا شـا اسماعیـل بـە کـافرو هەڵگەڕاوە دادەنێ(٩١)بەمەش مـۆرکێکی ئـایینی بـە شـەرەکە بەخـشی و بـۆ پاراستنی پشتی سـوپاکەی ژمارەیـەکی زۆری شـیعەی لـە ئـەنازول دانـا(٩٢) لەدوایشدا فەرمانی کوشتنی ژمارەیەکی زۆری شیعەی دا پاش ئابلّوقە دانیـان لەهەر ناوچەیەك بن لە نێو سنوری عوسمانی کە بـەپێ ی هەنـدێ سەرچـاوە

ژمارەیــان دەگاتــە چــل هــەزار كــەس(٩٣) شــایانی باســە كوردەكــانیش بەشدارییان لەو كوشتارییەی شیعە كردووە تەنانـەت خـودی مەلا ادریس بــە تایبەتی لەناوچەی ماردین(٩٤)٠

## بەشی سێیەم :تەوەرەی یەكەم :شەڕی چاڵدێران:

دەشتی چاڵدێران (٦٤ فەرسەخ واتە ٣٨٤كـم)(٩٥) لـە تـەورێزەوە دوورەو دەكەوێتە باكوریڕۆژئاوای (خوی) ودەكەوێتە نێوان دوو زنجیرە چـیا دەشتەكە بەلا ی ڕۆژهەلآت و ڕۆژئـاوا درێـژ بۆتـەوە لـە هەنـدێك شـوێن دا لـە هەندێ شوێن ئەو دوو زنجیرە چیایە بەجۆرێك لەیـەك دووردەكەونـەوە تـا لـە بەرچـاو وون دەبـن كەچـی لـە هەنـدێ شـوێندا لەیـەك نزیـك دەبنـەوە ،لـەو شوێنانەشدا دەشتی چاڵ ێران وەك دۆڵێكی پان و ەدەردەكەوێ ولـە هەنـدێ شوێنیشی پچر پچریشی تێ دەكەوێلـەو شـوێنانە دەتـوانرێ بـەرەو بـاكورو باشــور بــڕۆی(٩٦) واتــە دەكەوێتــە بــاكوری ڕۆژهــەلآتی (دەریاچــەی وان) هێزەكـانی ســەفەوی لــەكێوەكانی بـاكوری دەشـتەكە جـێگیر ببـوون تـا لـە پەلاماری شەوانە و كت وپڕی دوژمن بیانپارێزێ چونكە ناوچەكە دەكەوتە ناو چیاكانی دەوروبەرەوە (٩٧)سوپای عوسمانیش لە پالێ كێوی تەكللوی نێو ان گوندی سەعدل وگول ئوشاقەجێگیر ببون(٩٨)٠

سولتان سەلیمی یەكەم لە (٢ی رەجەبی ٩٢٠ ك،٢٤ی نیسان ١٥١٤)فـەرمانی پێشرەوی كردنی سوپای دا بەرەو ڕۆژهەلآت هە تا گەیـشتە ئـەرزنجان و لـەو ڕێگەیەشدا لەشكری عوسمانی زەحمەتێكی زۆری كێشا بوو لـەو كـۆچ كردنـی بۆ ئەو ناوچانە بەهۆی كەمی ئازوقە وخۆراك بەتایبەتیش كـاتێ سـەفەویەكان

پلانـی (خـاکی سـوتاویان)پـەیرەو کـرد(٩٩) ئەمـەش کاتێـك(محمـد خـان ئوستاجلو)والی دیار بەکر پاشەکشەی کرد(١٠٠)و(نو ر علی خلیفە روملـو) ش والی ئەرزنجان پاشە کشەی کـرد وهـەردووکیان بڕیاریـان دا لـە دژی سـوپای عوسمانی لە پاڵ سەفەوییەکان بجەنگێن ولەپاش خۆشیان هـەموو شـتێکیان سوتاند کە بە کەڵك دوژمن بێت(١٠١)،ئـەو کارەشـیان بـۆ دابەزانـدنی وورەی ئینکشارییەکان بوو لەگەڵ ئەو هەراسان بوونەی لەشکری ئینکشاری سـولتان سـەلیم بـەردەوام بـوو لـە پێـشرەوی هێرشـکاری بـۆ نـاو خـاکی ئێـران و شـا ئیـسماعیلیش پلانـی وابـوو کـە سـوپای عوسمـانی بـۆ قـوولایی ناوچـە چیاییەکانی خـاکی ئێـران رابکێـشێت لەوێـدا پـەلاماری بـدات و سـەربکەوێ بەسـەرییدا لەبەرامبەریـشدا سـوڵتان سـەلیم نامـەی وورووژێنـەری بـۆ شـا ئیسماعیل دەناردبۆ ئەوەی تورەی بکات و بڕیاری رووبەرووبونەوە بدات(١٠٢) بەو شێوەیە هەردوو سوپا لە دەشتی چاڵدێران بەیەك گەیشتن لـە ٢٣ی ئـابی ساڵی ١٥١٤ و(١٠٣) شائیـسماعیل دەسـتی بـە هێرشـەکە کـردو بنکەکەشـی کـەوتبووەنێوان کێوەکـانی بـاکورو رۆژ هـەلاتی چـاڵدێران وسوپاکەشـی پـەلاماری سـوپای عوسمـانی دا سـوپای عوسمـانیش توانیـان سـەفەوییەکان بخەنە نێومەودای تۆپخانەکانیان کە سوپای سەفەوی ئەو هێزەی نەبووە وبۆ ئەوەی بتوانن زاڵ بـن بەسـەر مەیـدانی شـەر چـونکە لـە سـەرەتای شـەرەکە سـوپای عوسمـانی چـەند سـەرکەوتنێکی سـەفەوییەکانی لەبـەرەکانی چـەپ بەدی کردبێت(١٠٤)٠

بەو جۆرە ئەو شەڕەی هەردوو دەوڵـەتی مـەزنی ناوچـەکە ئامادەکارییـان بـۆ دەکردئـەنجام درا وبەشـکانی سـەفەوییەکان و سـەرکەوتنی عوسمـانی

یەکلاکرایەوە لە رێ ی رووبەرووبونەوەیان لە چالدێران بە یارمەتی هێزی تۆپچیەکان و شا ئیسماعیلیش دوای ئەوەی بەبرینداری لە مەیدانی شەڕ دەرچوو پاشەکشەیان بەسوپاکانیان کردو سولتانیش هەتا کەنارەکانی دەریای (الرس)بەدوای شا ئیسماعیل دا چوو(١٠٥)کە چووبووە هەمەدان(١٠٦) سوپای عوسمانیش لە هەردوو بەرەی باکورو باشور بەرەو خاکی ئێران چوون (١٠٧)دوای گەیشتنیشیان بۆ ئەو ناوچانە سوپای ئینکشاری(١٠٨) نەیتوانی تیایدا بمێنێتەوە هەڵگەراونەتەوە لەسولتان سەلیمی یەکەم وناچارییان کردووە بگەرێتەوە پێگەکانی خۆیان لە ئەنازۆل(١٠٩)کە هەندێ کەسی وەك توینبی پێ ی وایەهۆکارەکەی دەگەرێتەوە بۆئەوەی لەشکری عوسمانی بەدڵ وگیان ئەورووپی بووەونەیتوانیوە نیشتەجێ ی خاکی ئاسیا بێت(١١٠) کەچی هەندێ سەرچاوە هۆکارەکەی دەگەرێننەوە بۆ هیلاکی لەشکرەکەو لە دەست دانی سەرکردەکانیان بووە(١١١)ڕای تریش هەن پێ یان وایەکێشانەوەی لەشکرەکە دەگەرێتەوە بۆ هێندێ حیسابی دارایی و عەسکەری(١١٢)٠

## بەشی سێیەم :تەوەرەی دووەم :رۆڵی کورد لە چالدێران:

ئەگەر ئاماژە بەرۆلی کورد بکرێت لە هەنگاوەکان و رووداوەکانی لەو شەرە دا هەولدانی هەردوولا بەدی دەکەین بۆ راکێشانی سۆزی کورد بەلای خۆیداو چوونە نێو سەربازگەی لەشەرەکەدا سەبارەت بەسەفەوییەکان سەرکەوتنێکی ئەوتۆیان بە دەست نەهێنا چونکە جگە لە چەند میرێکی کوردی کەلەپاڵ لەشکری ئەوان چووە شەرەکەلەوانیش (حاجی

روستم بەگ )میری چمشكزك(١١٣) بێگومان ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سیاسەتە ستەمكارییەی پەیڕەوییان دەكرد بەرامبەر بە كوردەكان (١١٤)بەڵام عوسمانیەكان هەوڵیان دا سوود لەو پەیوەندییە دەرەبەگایەتیەی بڵاو بوو لە كوردستان و هەوڵیان دا سۆزی میرە كوردییە بۆ خۆیان ڕاكێشن و بۆ ئەو مەبەستەش گفتی زۆریان پێ دان (١١٥) ئەمە لەلایەك و لەلایەكی تریش هەوڵەكانی مەلا ادریس بۆپەیرەو كردنی سیاسەتی دبلوماسی بۆ جێ بە جێ كردنی ئەوشێوازەو هەنگاوەكانی پێگەی ئایینی خۆی بەكار هێنا و وای لە میرە كوردییەكان كرد كە بەرەو سەربازگەی عوسمانی وبەگژ حكومەتی ئێراندا بچن (١١٦)هەندێكیش لەو میرە كوردییانە بەهۆی دڵنیا نەبوونیان لە سەركەوتنی عوسمانیەكان بێ لایەنی خۆیان نیشان دا(١١٧) ، بۆیە دەتوانین ڕۆڵی كورد ناتوانرێ فەرامۆش بكرێ بۆ ئەوەی پارسەنگی هێز بە لای عوسمانیەكان بچێت چونكە شانزە میری كوردی چووبوونە پاڵ ئەوسوپایە لەو شەڕەدا (١١٨) بە تایبەتیش كە پارسەنگی هێزبوون لەدروست بوونی ڕووداوەكان(١١٩)لەوانیش بۆ نمونە میر شەرەف بەگ میری بەتلیس كەچووە پاڵ سولتان سەلیم بۆ گێرانەوەی میرنشینەكەی لەدەست سەفەوییەكان(١٢٠) بەڵگەش بۆ ئەو راستیەئەو نامەیە (ئیستمالت نامە) ی سولتانەلەپاش شەرەكەبۆ خەڵكی تەوریزی ناردووە وتیایدا نازناوی میری میران(فخرالامراو) ی كە ناوی (زاهد بەگ)ی میری هەكاری دەكات ،هەروەها لە نوسینەكانی (فتح نامە) بەتایبەت لە(امراو مشرق وقبائل الكورد) كە تیایدا مژدەدات بە سەركەوتنی بە سەر شاساماعیل (١٢١)كەئەویش هەوڵی دابوو

هاوپەیمانیەك لەگەڵ پورتغالەکان و مەمالیکەکان ببەستێت بۆ ڕاگرتنی پارسەنگی هێز لە شەڕدا(١٢٢)

ئەمە جگە لەوەی سولتان مەلا ادریس بە نوێنەری(نائب) خۆی داناوە بۆ ئەوەی هەموو کوردستانی گەورەی بۆ ساغ بکاتەوە و دیاری و خەڵات بەگشت سالارەکانی کورد بدات مەلا ادریسیش دڵسۆزانە لە رووەوە کاری کردووەو کوردەکانیش بەدڵ وبەگیان قسەی ئەویان بەجێ هێناوە لە ڕێ ی فەرمانەکانیشی ئامادە بوون خۆیان بەخت بکەن (١٢٣) بەو جۆرە کوردەکان ڕۆڵێکی گرنگ دەبینین لەو شەرەی بەرپا بوو لەنێوان عوسمانیەکان وسەفەوییەکان(١٢٤) ئەوەش لەوەدا دەردەکەوێ کاتێك سوڵتان سەلیم بەلەشکرێکی دووسەد هەزار کەسیەوە لەژێر سەرکردایەتی خودی سوڵتان بەرەو فارس هەڵکشاوە ولەو هێرشەشدابە زۆری میرو سەرۆکە کوردەکان بە هێزی چەکداری خۆیان بەشداریان کردووەو(١٢٥) لە ٢٣ی ئابی ١٥١٤ بەناو خاکی کوردستانەوە چووە بۆ دەشتی چاڵدێران ولەوێدا رووبەرووی شا ئیسماعیل دەبێتەوەو سەرکەوتن بەدەست دێنێ وهەرچی زێرِوزەبەر هەبوو بە تالآنکراوی گەیاندرا ئەستەمول(١٢٦) وەك لە هەندێ سەرچاوەدا هاتووە کوردستان دیوارێکی خوێن وگۆشت بووە بۆ پاراستنی سنووری دەوڵەتی عوسمانی لەبەرامبەر هێرشکارییەکانی سەفەوی و لەلایەکی تریش کوردستان هەمیشە جێگەی بەیەك گەیاندنی سوپای عوسمانی بووە ئەوە لەلایەك لەلایەکی تریش ئەو شەرە بوو بەخاڵێکی گۆرینی نوێ لە مێژووی نەتەوەیی کورد(١٢٧)٠

**بەشی سێیەم :تەوەرەی سێیەم :ئە نجامەکانی شەڕی چالدێران :**

روون کردنەوەی زیاتری ئەنجامەکانی شەڕو کاردانەوەی ئەو رووداوە گرنگەی کە شوێنەواری بۆسەرد؛می دواتر لە ناوچەکە چونکە ئەو شەڕە بووە هۆی گۆرینی نەخشەی سیاسی ودابەش بوونی دەسەلاتی ئەو دوو هێزە مەزنەی ناوچەکەکە جابۆ ئەوەی کاریگەری ناوچەگیری و کوردستانی لێك جیا بکەینەوە ئەوا بەو شێوەی خوارەوە ئەنجام و کاردانەوەو کاریگەرییەکان دەخەینە روو:

**١-ئە نجام و کاردانەوە ناوچەگیرییەکان ( بە گشتی ) :**

پاش ئەو سەرکەوتنەی عوسمانیەکان رێگای تەورێز والآ بوو لە بەردەم سولتانی عوسمانی کە ئەم شارە گرنگی تایبەتی خۆی هەبووە چونکە پایتەختی سەفەوییەکان بووە و پاش چۆلکردنی لەلایەن دەسەلآتدارانی سەفەوی سولتان سەلیمی یەکەم ئیدریسی بەتلیسی (ئەودەم قازی لەشکری عوسمانی بووە)(١٢٨) ناردە ئەو شارە بۆ ئەوەی رێو رەسمی پێشوازی کردنی لە سولتان ئامادە بکات (١٢٩) بەلأم ئەو رێورەسمە جێ بەجێ نەکرا بەهۆی بارودۆخی ئەو کات (یەکێك لەو ئاستەنگانەهەلگەرانەوەی ئینکیشارییەکان بوو بە هۆی کەمی ئازوقەو پێداویستیە کانی خۆراك) کە لەشکری عوسمانی ناچار کرد لە تەورێز بکشێتەوە (١٣٠).

ئەو شەڕە وای لە دەولەتی عوسمانی کرد کە بە شێکی زۆری ناوچە ستراتیجیەکان بخاتە ژێر رکێفی خۆی لە ئەنازۆل وقفقاس وسوریاو ئێران (١٣١) واتە دەولەتی توانی سەربکەویَ بەسەر گەورەترین هێزی مەترسیدارو

لە ڕۆژهەلاَت و کێشەو تەگەرەکان لەو شـەڕەدا یـەکلا بکاتـەوە و ناوچـەیەکی زۆریش لەژێر دەسەلاَتیان دەربهێنێت بە کوردستانیشەوە ٠

ئەمـە گرینگترین ئـەنجامی ناوچـەگیری ئـەو شـەڕەیە کـە سـوڵتان سـەلیمی یەکەم هەموو شێوازەکانی دبلوماسی و تاکتیکی سـەربازی تیادابـەکار هێنـا و بـوو بـە خـاڵێکی گـوڕان وسـەرکەوتن بـۆ دەوڵـەتی عوسمـانی لـە ڕۆژهـەلاَتی ناوەڕاست،ئەگەر چی هەنـدێ ڕا هەیـەدەربارەی هەڵوێستی هـەردوو دەوڵـەت لـەدوای شـەڕ کـە هـیچ کامێکیـان بـە داروخـاو دانـانێ شـوێنەواری داڕمانیـان نابینێ چونکە دەڵێ هەرچەندە هەرچەندە عوسمانیەکان چوونە تەورێز بەلاَم نـەیان تـوانی تیایـدا بمێننـەوەو کۆتـایش بـەحوکمی فارسـی بێـنن واتـە عوسمانیەکان نەچونەتە قولاَیی خاکی ئێران(١٣٢)٠

## ٢-ئەنجام و کاردانەوەی شەڕەکە لەسەر کوردستان :

سـەرکەوتنی عوسمانیـەکان بـە سـەرەتای مێـژووی هاوچـەرخی تـیرە کوردییـە کـان دادەنرێـت (١٣٣)و کاردانـەوەو کاریگـەری ئـەو شـەرە بەسەرکوردستان و ئەنجامەکەی ڕاستەوخۆ دیارە چونکە بـووە هـۆی دابـەش بـوونی کوردسـتان بـە کـرداو کـە زۆرینەشـی کەوتـە ژێـر ڕکێفـی دەوڵـەتی عوسمانی و هەندێ ناوچەش هەر لـە ژێـر دەسـەلاَتی سـەفەوی مایـەوە(١٣٤) ئەوەش وای لە هەندێ مێژوونوس کردووە کە ساڵی ١٥١٤ بەساڵێکی شوم بـۆ کـورد دابنـێن (١٣٥) بـەلاَم مێژوونوسـی تـریش هەیـە دەڵـی (سـەرکەوتنی عوسمانیەکان لەچاڵدێران بووە هۆی ڕزگاربوونی کورد لە سیاسەتی قڕکردنـی سـەفەوییەکان(١٣٦) ، هەریـەك لـەو دووڕایـە لـە دووسـۆنگەی جیـاواز لـە

مەسەلەکە دەدوێن کە یەکەمیان لە بینینی بۆ دوارۆژەو ،دووەمیشیان بەچاوی هەلومەرجی ئەوکات وداهاتووی سەیرکردووە · ئەگەر توێژەر باس لەسیاسەتی سەفەویەو ستەمکاری بەرامبەر بە کورد بکات وبەهەل ومەرجی رازی بوونی کورد بۆ چوونەپاڵ لەشکری عوسمانی زانی وهەڵوەستەیەکیشی لەسەر ڕووداوەکانی کوردستانی پاش چاڵدێران کرد ئەوا ڕای دووەم پەسند دەکات ،لە کوردستان ڕاپەڕینێکی جەماوەری سەری هەڵدا دژ بە هێزە سەفەوییەکانی لە کوردستان مابوونەوە لە هەموو شوێنێکدا بۆ ئەوەی ناچارییان بکەن بەهێز وەدەریان نێن (١٣٧)کوردیش قوربانیەکی زۆری لەشەڕەکانی عوسمانی داوە نەك هەر لەگەڵ سەفەوییەکان بەڵکولە شەڕگەفراوانخوازەکانی لەئەوروپا وباکوری ئەفریقیا وقەفقاس(١٣٨) ئەوەی جێگای سەرنجیشەمیرە کوردییەکان چوونە پاڵ لەشکری عوسمانی بەپێ ی ئەو ڕێکەوتنەی کە هەندێ لەبەرژەوەندییەکانی کوردی لە خۆ گرتبوو هەرچەندە زۆربەی سەرچاوەکان باس لەڕێکەوتن یاپەیماننامە یابەڵێنامەیەکی یەکلایەنەیە یان پڕوتۆکۆلێکی سیاسیەبۆمیرەکوردەکان لەلایەن بەتلیسیەوە ڕێکخراوەو(١٣٩) محمدامین زکی ئاماژەبەخاڵەکانی ئەورێکەوتنە دەکات بەبێ ئاماژە کردن بەسەرچاوەی ڕەسەنی کە ئەو زانیارییانەی لێ وەرگرتوون (١٤٠) وەسەرچاوەکانی تریش ئاماژە بە سەرچاوەی ڕەسەن ناکەن دەربارەی ئەو خالانە یان بەندەکان وبەووردیش باسیان لێوەناکەن(١٤١) بەلام دەتوانین گەواهی بوونی رێکەوتنێك لە نێوان پێشەوا کوردەکان لەلایەك ولەلایەن ئیدریسی بەتلیسی بە نوێنەرایەتی سولتان وەك شەرەف خان لەسەرزمان ئیدریسی بە تلیسی دەڵێ (میرە کانی کوردستان داوا لە سوڵتانی مەزن وپایە

بــەرز دەکــەن کــە فەرمانڕەوایەتیــە میراتگەرییەکــەیان پــێ ببەخــشێ ........هتد)(١٤٢)کە لە مـەش دەردەکـەوێ مـیرە کوردییـەکان گێرانـەوەی ئـەو فەرمانڕەوایەتیـەی بـە میراتگری بۆیـان دەمایـەوە بـە مـەرج دانـاوە بـۆ ڕێکەوتن لەگەڵ سـولتان و چـوونە ژێـر ڕکێفـی دەوڵـەتی عوسمـانی ،ئـەوەش بەتەواوی لە ووتەکانی گەرید ەی عوسمانی ئەولیا چەلەبی دەردەکەوێ کاتێك بـاس لـە حکومـەتی ئاگیـل دەکـات ە دەڵـێ (بێگەکـەی عوسمـانی نیـە بۆیـە نـاتوانرێ لابـدرێ ولــە کــاتی مردنیــشی کوڕەکــەی یــان یــەکێکی تــر لەمیراتگرەکانی فـەرمانڕەوایی وەردەگرن چـونکە حکومـەتێکی سـەربەخۆیە وەکاتێکیش حکومەتـە سـەربەخۆکانی ویلایـەتی دیـار بکـر دەژمێرێـت دەڵـێ (لەگەڵ ئەوەی نازناوی میری مـیران(امـیر الامـراو) یـان پێـدراوە بـەڵام دەبـێ بەشداری بکەن لەگەڵ وەزیر(والی دیار بکر)لە شەڕەکاندا) (١٤٣).

بـۆ ئـەوەی هەنـدێك لـە بەنـدە ڕاسـتەکانی ئـەو ڕێکەوتنامەیەبـەگوێرەی سەرچاوەکانی پێشوو دەتوانین چەند خـاڵێکی گرینگیـان لـێ بخەینـە ڕووکـە ئەوانیش بریتین لە:

١-پاراستنی ئازادیو سەربەخۆیی میرنشینە کوردیەکان(١٤٤) .

٢- دان پیانانی دەوڵەتی عوسمانی بە مافی میراتگەری بۆ میرە کوردییـەکان لـە فـەرمانڕەوایی کردنـی میرنـشینەکانیان وە هـەر کاتێـك میرێکـی نـوێ دادەمەزرا دەبـوا فـەرمانێکی سـوڵتانی بـۆ دەرچـێ بـۆ پـشتگیری کـردن لـەو دامەزرانەودان پیانانە بە حوکمەکەی(١٤٥).

٣-لەسەر میرە کوردییەکان پێویستە کۆمەکی دەوڵـەتی عوسمـانی بکـات لـە کاتی شەڕدا و(١٤٦) بۆ دەوڵەتی عوسمانیش هەیە ئەو میرە ی دوابکەوێ لە

کومەك و یارمەتی دان لابدات (١٤٧)٠

٤-لەبەرئەوەی کوردستان کەوتە ژێر ڕکێفی دەوڵەتی عوسمانی بۆیە ئاسایی بوو کە ئەو دەوڵەتە ئەو میرنشینانە بپارێزێت لە مەترسی دەرەکی (١٤٨)٠

٥- هەر لەبەر ئەوەی سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بوون دەبوایە پابەند بەگشت ئەو باج وسەرانەی بەسەریانی دەسەپاند (١٤٩)٠

ئەو پەیماننامەیە لە ڕێکەوتنێکی سەر زارەکی دەرچووە چونکە بۆ ماوەیەکی زۆر کاری پێ کراوە وکە گەواهی بوونی جۆرە ڕێکەوتنێکی لەوجۆرەن ئەوە جگە لەوەی کە سوڵتان فرمانی بە نوسینی ئەو جۆرە ڕێکەوتنانە دەدا لەبەر ئەوە دەبێ بەتلیسی کاتێ لە گەڵ میرە کوردییەکان ڕێکەوتووە بەندەکانی ئەو ڕێکەوتنامەی تۆمار کردووەو بۆ سولتانی ناردووە بە هەر شێوەیەك و جۆریك بێت بەڵگە نامەکان جێ بەجێ کردنی ڕێکەوتنێك لە ساڵی١٥١٤دەردەخەن(١٥٠)بەپێ ی ئەو فرمانەش کوردستان بۆ چەند یەکەیەکی کارگێڕی وسیاسی ڕێکخرا وسوڵتان سەلیم لەدوای شەڕەکە کوردستانی خستبووە ژێر دەستی (١٥١)بۆنمونە ناوچەی دیاربکر لەبەرگرنگی دیار بکر کرا بە مەڵبەندی ئیالەیەکی عوسمانی و نۆزدە سەنجەقی پێوە بەند بووە ویانزەش لەو سەنجەقانە فەرمانڕەوایی ڕاستەوخۆیان بەسەر سەپێنراوە(١٥٢) ٠ئەوەی لەو ڕیکەوتنە بەدی دەکرێت ئەوەیە کە بەتلیسی ئەو میرنشینە کوردییانەی هەر بەناو بە (باب العالی) ببەستێتەوە وئەمەشی بەخاڵێك لە ڕێکەوتنامەکە چەسپاندووە (١٥٣) ئەمە لەلایەك و لەلایەکی تریش بەتلیسی هەوڵی داوە ئەو کوردانەی نیشتەجێ ی ناوچە سنورییەکانن ببەخشێ لەگشت باج وسەرانەیەك بە مەرجێ لەشکرێکی

هەمیشەیی پێك بێنن لەکاتی پێویست یارمەتی دەوڵەتی عوسمانی بدەن (١٥٤) ٠کاتێك بەتلیسی هیواخوازی پادشایی کردنی ئێران (١٥٥) لەڕێکخستنی کوردستان لەپاش چالدێران بەخۆی نیشانەی پابەند بوونی ئەو میرنشینانە بە دەوڵەتی عوسمانی بەسەریان دابەش کرد کە بریتی بوو لە دۆڵ و ئالاّ (١٥٦) ئەو ڕێکەوتنەش هەلێك بووە لەو هەلە باشە کەمانەی بۆ کورد هەڵکەوتوە کەئەگەر سوودی لێ وەرگیرابا دامەزراندنی حکومەتێکی یەکگرتووی کوردی لە کیس نەدەچوو(١٥٧) ٠

## پوختەی لێکۆڵینەوەکە :

سەرەتاکانی سەدەی شانزە باڵادەستی وفەرمانڕەوایی چەندین میرنشینی کوردی بەخۆوە دیوە کە جیاوازی لەنێوان ئەو میرنشینانە لە لاگیری کردنیان وسنوری دەسەلاتیان وجۆری فەرمانڕەوایی کردنیان هەیە هەروەکوجیاوازی لەکاریگەری وڕۆڵی ئەو میرنشینانەلەدروست بوونی ڕووداوەکان بەدی دەکرێت کە دەبێتە هۆی ئاڵۆزی هەل و مەرج وبارودۆخی سیاسی ئەو سەردەمەی کوردستان٠

لە پاڵ ئەو ئاڵۆزییەی بارودۆخی کوردستان فراوانخوانزییەکانی سەفەوی لە لایەك و، وەرگێرانی بەرەی شەڕەکانی عوسمانیش لەلایەکی تر، دەبێتە هۆی ئەوەی کوردستان ببێ بەگۆڕەپانی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو دوولایەنە،تەنانەت

کوردیش ببێتە پارسەنگی هێز لە شەڕگەکانیان ئەوەش خۆی لەخۆیدا هۆیەکە بۆ تێوە گلانی کوردلە کێشەوناکۆکیەکانی نێوان ئەو دوو هێزەوئەمەش وای لەکورد کردکە هەندێك ناچار بێت لەسەر دووپەت یاری بکات بۆ ئەوەی بتوانێت پارێزگاری لەو دەسەلأتە سەربەخۆیە خۆجێ یەی خۆی بکات وبتوانێت بەجیا مامەڵە لەگەڵ سیاسەتی هەریەك لەودوو زلهێزە بکات ٠

لەسەرو بەندی ئەوبارودۆخەدا ڕووداوێکی گرنگ لە مێژووی کوردو ناوچەکەڕوودەدات کە ئەویش شەڕی چاڵدێرانیساڵی ١٥١٤ یە کەمۆرکێکی ئایینی مەزهەبی وەرگرت و لەو شەڕەشدا هەڵکشانی کوردبەلای عوسمانیەکان دەبێتە هۆی سەرکەوتنیان کە بێ گومان ئەو هەڵکشانە بەهۆی هاومەزهەبی هەردوولایەنەو ڕەنگدانەوەو هەڵوێستێکی کوردیشە بەرامبەر ئەو سیاسەتە توندو تیژییەیپەیڕەو دەکرا لە لایەن سەفەوییەکان٠

جگە لەو هاومەزهەبیەی کوردو عوسمانیەکانی کۆدە کردەوە لە هەمان کاتیشدا کورد توانی سوود لەهەل و مەرجی سیاسی ئەوێ ڕۆژێدا وەربگرن وپەیماننامەیەك بێننە ئاراوە کە ڕۆڵی کەسایەتی ئایینی مەلا ئیدریسی بەتلیسی لەو پەیماننامەیە جێگای سەرنجە چونکە ئەو کەسیەتیە توانی میرو پێشەوا کوردییەکان ڕازی بکات بۆ چوونە پاڵ لەشکری عوسمانی تەنانەت ڕۆڵی کاریگەریشیان هەبێت لەو شەڕەو شەڕکانی تر کە بەدوای دێن بۆ بنەبڕکردن و لەناوبردنی سەفەوییەکان ولابردنی مەترسیان لەسەر سنوریڕۆژهەلأتی دەولەتی عوسمانی ئەمەش لەبەرامبەر چەند جیاووکیك کە خۆی لەسەربەخۆیی بوونی خۆجێ یی ئەومیرنشینانەیفەرمانڕەوایی

کوردستانیان دەکردچـڕدەکاتەوە ئەمـە جگـە لـەوەی کـەدان پیانـانێکی ڕەسمیش بوولە لەلایەن دەولەتی عوسمانی سەرکەوتوو بەسەر سەفەوییەکان کە هەتا ماوەیەکی دوور کاریگەری ئەو پەیماننامەیە دەمێنێت.

گرنگـی ئـەو شـەڕە تـەنها لـەوەدا نیـە کـە ڕووبەڕووبوونەوەیـەکی عوسمـانی وسـەفەوییە وعوسمانیـەکان سـەرکەون بەسـەر سـەفەوییەکان کەدەیانویـست ئەوناوچانەی کوردستانی عوسمانی داگیربکـەن لـە پێنـاو گەیـشتن بـەدەریای ناوەڕاست کە بەرژەوەندی ئابوورییان تیایدا هەبووە بەڵکو لە دابـەش بـوونی کوردستان بۆ یەکەم جار بەسەر ئەودوو زلهێزەی ئەو سەردەم کـە کاریگـەری و شوێنەواری هەتا ئەوڕۆش بەکوردستانەوە دیارە.

## پەراوێز و سەرچاوەکان

(١)محمود الدرة:القضية الكرديه، بيروت ١٩٦٦ ،ص ٧٤

(٢)صالح قەفتان:مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تاکو ئیمرۆ،بەغدا ١٩٦٩،ل٢٦٧

(٣)محمد امين زكی:خلاصەيەکی تاريخی کوردو کوردستان، بەغدا ١٩٣٧، جلد ٢،ل٣٢٨

(٤)امير شرف خان البدليسي:الشرفنامە(ترجمة:ملا جميل بندی رۆژبيانی)، بغداد ١٩٥٣،ص ١٨٤

(٥)ئاق قۆينلوەکان/دامەزرێنەری دەوڵەتەکەيان پياوێکە بەناوی(قرە عثمان) کە تيمور لنك کردبووييە فەرمانرەوای ئەرمينيا وعيراق،لەدوای لەناوچوونی تيمورلنك دەست بەسەر دياربكر دادەگرێ ولەدوای ئەويش (ئوزون حسن) ی نەوەی درێژە بە حوکمی دەدات و هەندێ سەرچاوەش ئوزون بەدامەزرێنەری راستەقينەی دەوڵەتەکە دادەنێن)، محمد وصفی أبو مغلی:ايران دراسە عامە،من منشورات مركز دراسات الخليج العربی بجامعە البصرە،١٩٨٥،ص ٢٤٢

(٥)البدليسي،الشرفنامە،ص ٢٠٨-٢٠٩

(٦)محمد امين زكی:خلاصەيەکی تاريخی کورد،ل١٦٢

(٧)صالح قەفتان:مێژووی گەلی کورد،ل ٢٦٦

(٨) البدليسي :الشرفنامە: ص٢٦٠

(٩)صالح قەفتان:مێژووی گەلی کورد ل ٢٦٦

(١٠) البدليسي :الشرفنامە:ص ٤٢٥

(١١) البدليسي :الشرفنامە:ص ٢٠٨-٢٠٩

(١٢)هەمان سەرچاوە:ص ٢٣٣

(١٣)محمد امين زكى:خلاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان:ل٣٧٥

(١٤)صلاح هروری:امارە بوتان فی عهد الامیر بدرخان(١٨٢١-١٨٤٧)دراسە تاریخیە سیاسیە،اربیل ٢٠٠٠ ،ص ١١

(١٥ ) البدلیسی :الشرفنامە:ص ١٠

(١٦)صالح قەفتان:مێژووی گەلی کورد،ل ٢٦٥

(١٧)محمد امين زكى:خلاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان،ل٣٨٤-٣٨٥

(١٨)البدلیسی :الشرفنامە:ص ٣٤٣

(١٩)صالح قەفتان:مێژووی گەلی کورد،ل٢٦٧

(٢٠) البدلیسی : الشرفنامە:ص ٣٠٧

(٢١) البدلیسی :الشرفنامە:ص ٣٣٩,٣٤٢

(٢٢)هـ.س:ل ١٣٩-١٤٠،کاوە فریق احمدشاوەلی ئامیدی:امارە بادینان (١٧٠٠-١٨٤٢) دراسة سیاسیة اجتماعیة ثقافیة ، ٢٠٠٠ ،ص ٢٤

(٢٣)حسین حزنی موکریانی:موجز تاریخ امراو سوران(ت.محمد الملا عبدالكريم)،بغداد ،ص ٦

(٢٤) البدلیسی :الشرفنامە:ص ٢٨٩-٢٩٠

(٢٥) ماهشەرەف خانم مەستورەی کوردستانی:مێژووی ئەردەلان (و.د.حسن جاف و شکر مصطفى) بەغدا،١٩٨٩،ل٢٥-٢٦،مەستورەی کوردستانی:مێژووی ئەردەلان،هەژاری موکریانی لەگەڵ سەرچاوە گەلێکی تردا لە بەریەکی گرتوونوکردوونی بە کوردی،هەولێر ٢٠٠٢ ،ل٢٨

(٢٦)محمد امین زکی:خلاصەیەکی تاریخی کورد،ل ٣٩٢ ،انور مایی:الاكراد فی بهدينان (بحث تاريخي اجتماعی عن منشأ الأكراد وعقائدهم،وعاداتهم وطبائعهم وادابهم)،دهوك ١٩٩٩ ،ص ٤٤

(٢٧)سعدی عثمان حسین:(كوردستان والامبراطورية العثمانية دراسه فی تطورهاالسياسي ١٥١٤-١٨٥١م)، اطروحة قدم الى جامعه صلاح الدين-اربيل لنيل درجه ماجستير فی التاريخ الحديپ ،اربيل ١٩٩٥ ،ص١٩

(٢٨)دەربارەی دەرکەوتنی ئەو بنەماڵەیە بڕوانە: عمر عبالعزيز عمر:دراسات فی تاريخ العرب الحديث،بيروت ،١٩٧٨،ج١،ص٦٤-٦٥:هاشم حيجازی فەر،لێکۆڵینەوە یەك بەناوی (شا ئیسماعیلی یەکەم وجەنگی چاڵدێران)،(وەرگێرانی:د.کەمال رشید شریف)، سلێمانی ٢٠٠٢،ل٥٣-٨٣ :رەسول هاوار:کوردو باکوری کوردستان لە سەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دوهەمی جیهان،بەرگی یەکەم هەتا کۆتایی شەڕییەکەم، ٢٠٠٠ ،ل١٥١ : محمد وصفی أبو مغلی:ايران دراسه عامه،ص ٢٤٤:علی حسون:تأريخ الدولە العثمانية ط٤،المكتب الٳسلامی،٢٠٠٢،ص٥٦ :حوسێنی مەدەنی:کوردستان و ئیستراتیژی دەوڵەتان،هەولێر٢٠٠٠ ،ل٨٣

(٢٩)ستيفن همسلی لونگريك:اربعه قرون من تاريخ العراق الحديث ،ترجمة:جعفر الخياط،١٩٨٧،ص ٢١

(٣٠) لونگريك:اربعه قرون من تاريخ العراق الحديث،ل٣١ :هاشم حیجازی فەر،شا ئیسماعیلی یەکەم وجەنگی چاڵدێران ،ص ٦١

(٣١) سعدی عثمان حسين:كوردستان والامبراطورية العثمانية،ص ٢٠

(٣٢) عبدالعزيز سليمان نوار:تاريخ الشعوب الاسلاميه فی العصر الحديث،قاهرة،،١٩٦٨ ج١،ص ٢٨-٢٩

(٣٣)عبدالله عەلیاوەیی:کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا جەنگی جیهانی یەکەم لێکۆلینەوەیەکە لەبواری مێژووی سیاسیدا ،سلێمانی ٢٠٠٤ ،ل٢١ :حوسێنی مەدەنی:کوردستان و ئیستراتێژی دەوڵەتان،ل٨١

(٣٤) مجموعة من المؤرخين:العراق فى التاريخ،بغداد ١٩٨٣،ص ٥٦٣

(٣٥) جلال الطالبانى:كردستان والحركه القومية الكورديه،بيروت١٩٧١ ،ص ٦٧ ،محمود ملا عزت:د يپلوماسێتی بزوتنەوەی کوردایەتی،سلێمانی ١٩٧٣،ل ٠٦

(٣٦)صالح محمد امین:کوردو عەجەم (مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران) ، ١٩٩٢،ل٢٤

(٣٧) البدليسى:الشرفنامة،ص ٢٩٩،محمد جمیل رۆژبەیانی:فەرمانڕەوایی موکریان،بەغدا ١٩٩٢،ل٤٢

(٣٨)سيار كوكب الجميل:استراتيجيه العراق واثرها فى نشوْ الصراع العثماني الايرانى،مجلة(افاق عربيه)،عدد(١٠)،سنه(١٩٨١)،ص ١٥

(٣٩) البدليسى:الشرفنامة،ص ١٣٠

(٤٠) هـ·س، ص ٢٠٠

(٤١)هـ·س، ص ٣٣٩–٣٤٠

(٤٢)هـ·س، ص ٣٥٨

(٤٣)هـ·س، ص ٣١٥

(٤٤)هـ·س، ص ٤٢٦

(٤٥)هـ·س، ص ١٥٤

(٤٦)محمد امین زکی:خلاصەیەکی کوردو کوردستان ،ل٣١٧

(٤٧)البدليسى:الشرفنامه،ص ٤٢٦

(٤٨)البدلیسی:الشرفنامە،ص ٤١٢

(٤٩)ھ٠س،ص١٥٤

(٥٠)ھ٠س،ص٤٢٨

(٥١)لونگریك:اربعە قرون من تاریخ العراق الحدیث،ص ٣٢

(٥٢) عماد الجواھری:صراع القوی السیاسیە فی المشرق العربی،الموصل ١٩٩٠،ص ٦٥

(٥٣)صالح محمدامین:کوردو عەجەم،ل٢٥

(٥٤)محمد امین زکی :خلاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان،ل١٦٠-١٦١

(٥٥)البدلیسی،الشرفنامە،ص ٣٧٢

(٥٦)د ڤیڤید مەکداول:مێژووی ھاوچەرخی کورد،وەرگێڕانی لە فارسیەوە(ابوبکر خۆشناو) ،ل٥٦

(٥٧)کمال مەزھەر:چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد،بەشی یەکەم،بەغدا ١٩٨٥،ل٣٣

(٥٨)دیڤید مەکداول:میژووی ھاوچەرخی کورد،ل٥٦

(٥٩) دیڤید مەکداول:میژووی ھاوچەرخی کورد،ل٥٦

(٦٠) سەعد بەشیر ئەسکەندەر:سەرھەڵدان وڕوخانی سیستەمی میرنشینی کوردستان،جەوھەر کرمانج کردوویە بە کوردی، سلێمانی ٢٠٠٤ ،ل٧٧-٧٨

(٦١)شاکر خەسباك:کوردو مەسەلەی کورد، وەرگێڕانی:ئەمجەد شاکەلی ، ٢٠٠٥،ل٢٨

(٦٢)عبدالرحمن قاسملو:کوردستان و کورد ،وەرگێڕانی :عبدالله حسن زادە ، ١٩٧٣ ز،ل٧٢-٧٣

(٦٣)خەسباك:کوردو مەسەلەی کورد ،ل٢٨

(٦٤)البدليسی:الشرفنامه،ص١٣٤

(٦٥)البدليسی:الشرفنامه،ص١٨٦

(٦٦)محمد امين زكی :خلاصەیەكی تاریخی كوردو كوردستان،ل١٦٠ : رەسول هاوار:كوردو باكوری كوردستان لە سەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دوهەمی جيهان،ل١٥٤-١٥٥

(٦٧) قاسملو:كوردستان و كورد ،ل ٤١:سيار كوكب الجميل:دراسات في السيگره العثمانية على الموصل و الجزيره سنه ١٥١٦ وبدايات الصراع العپمانی-الايرانی(الصفوی) فی عهد السلطان سليم الاول،سنه ١٩٨٠ الموصل،ص ١٩٦ : رەسول هاوار:كوردو باكوری كوردستان لە سەرەتای مێژووەوە ،ل١٥٤

(٦٨) صالح محمد امين:كوردو عەجەم،ل٢٤

(٦٩)محمد امين زكی:خلاصە یەكی كوردو كوردستان،ل١٦٠

(٧٠) صد يق الد ملوچی:اماره بهدينان او(امارة العمادية) ، اربيل ١٩٩٩،ص ١٤

(٧١) ديڤيد مەكداول:مێژووی هاوچەرخی كورد ،ل٥٥

(٧٢) الگالبانی :كردستان والحركة القومية الكردية،ص ٣٧

(٧٣) خەسباك:كوردو مەسەلەی كورد،ل٢٩

(٧٤)البدليسی:الشرفنامه،ص ٤٣١

(٧٥)الطالبانی :كردستان والحركه القوميه الكرديه،ص ٦٩

(٧٦)قاسملو :كوردستان وكورد،ل٤١

(٧٧)خەسباك:كوردو مەسەلەی كورد،ل٢٩-٣٠

(٧٨)لونگريك:اربعه قرون من تاريخ العراق ،ص ٣٤:كريس كۆچيرا:مێژووی كورد لە سەدەی ١٩-٢٠ ،(وەرگێڕانی:محمد ريانی)، بەهاری ١٣٦٩-تاران،ل٣٦

٧٩) کاوس قەفتان:چەند لێکۆڵینەوەیەك لە مێژووی بابان سۆران بۆتـان، کـەمال مەزهەر پێشەکی بۆ نوسیوە، بەغدا ١٩٨٥ ،ل٢٧

(٨٠) سـەعد بەشـیر ئەسـکەندەر:سـەرهەڵدان ورِوخـانی سیـستەمی میرنـشینی کوردستان،ل٧٩

(٨١) حوسێنی مەدەنی:کوردستان و ئیستراتیژی دەوڵەتان،ل٨٨

(٨٢)ابـراهیم خلیـل احمـد:تـاریخ الـوطن العربـی فـی العهـد العثمـانی ١٥١٦-١٩١٦،جامعةالموصل ١٩٨٦،ص ٢٤

(٨٣) ابراهیم خلیل احمد:تاریخ الوطن العربی فی العهد العثمـانی ١٥١٦-١٩١٦،ص ٢٣

(٨٤) سعدی عبمان حسین:کوردستان والامبراگوریه العپمانیه،ص ٢٥

(٨٥) ابراهیم محمود:صوره الاکراد عربیا بعد حرب الخلیج،گ١، ١٩٩٢،ص ٢٤

(٨٦) عبدالعزیز سلیمان نوار: تاریخ العـراق الحـدیث،قـاهره،١٩٦٧،ص ٦: محمـود الـدره:القـضیة الکوردیـه،ص٤٨ : حوسـێنی مـەدەنی:کوردسـتان و ئیـستراتیژی دەوڵەتان،ل٨٢

(٨٧) صالح محمد امین:کوردو عەجەم،ل٢٥

(٨٨)لونگریك:اربعه قرون من تأریخ العراق الحدیپ،ص ٣٣

(٨٩) محمد فرید بك المحامی:تاریخ الدوله العلیه العپمانیه،بیروت ،١٩٧٧،ص ٧٣ :عمر عبدالعزیز عمر:دراسات فی تأریخ العرب الحدیث،ص ٦٧

(٩٠) سیار کوکب الجمیل: دراسـات فی الـسیطرة العثمانیـة علـی الموصـل و الجزیـرة سنه ١٥١٦ وبـدایات الـصراع العثمـانی-الایرانـی(الـصفوی) فی عهـد الـسلطان سـلیم الاول،ص ١٩٤: عماد عبدالسلام:الصراع العراقی الفارسی ،بغداد ١٩٨٣ ،ص٢٠٩

(٩١) لونگریك: اربعه قرون من تأریخ العراق الحدیث،ص ٣٣

(٩٢) ) سعدی عثمان حسين:كوردستان والامبراطورية العثمانية،ص ٢٦

(٩٣)لونگريك: اربعه قرون من تأريخ العراق الحديث،ص ٣٢:محمد فريد بك المحامي:تاريخ الدولة العلية العثمانية،ص ٧٤: عمر عبدالعزيز عمر:دراسات فی تأريخ العرب الحديث،ص ٦٨:رەسول هاوار:کورد، باکوری کوردستان لە سەرەتای مێژووە هەتا شەڕی دووهەمی جیهان،ل١٥٦:محمود الدره:القچيه الكورديه،ص ٤٩

(٩٤) کەمال مەزهەر :چەند لاپە ڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد،ل٥٣

(٩٥)ياقوت/معجم البلدان،بيروت،بدون تأريخ،جزو١،ص٣٦

(٩٦)هاشم حیجازی فەر :شا ئیساعیلی یەکەم وجەنگی چاڵدێران،ل١١٨

(٩٧) سيار كوكب الجميل: دراسات فی السيطرة العثمانية على الموصل و الجزيرة سنه ١٥١٦ ،ص ١٩٩

(٩٨) هاشم حیجازی فەر :شا ئیساعیلی یەکەم وجەنگی چاڵدێران،ل١٢٢

(٩٩) هاشم حیجازی فەر :شا ئیساعیلی یەکەم وجەنگی چاڵدێران، ل١٢٣

(١٠٠)البدليسی:الشرفنامه،ص٤٣١

(١٠١)صالح محمد امين: کوردو عەجەم ،ل٢٥

(١٠٢) محمد فريد بك المحامی:تاريخ الدوله العليه العيمانيه،ص ٧٤

(١٠٣) سعدی عثمان حسين:كوردستان والامبراطورية العثمانية،ص ٢٨

(١٠٤)هاشم حیجازی فەر:شا ئیسماعیلی یەکەم و جەنگی چاڵدێران،ل١٤٢ –١٤٣

(١٠٥) محمد فريد بك المحامی:تاريخ الدولة العلية العثمانية،ص ٧٤

(١٠٦) محمد وصفی أبو مغلی:ايران دراسة عامة،ص ٢٤٧

(١٠٧) هاشم حیجازی فەر:شا ئیسماعیلی یەکەم و جەنگی چاڵدێران ،ص ١٦٢

(١٠٨)( ئینکشاریەکان/ئەو سوپایە لەسەردەمی سوڵتان ئورخان دامەزراو ئەندامانی ئەو سوپایە بریتی بوون لە ڕۆڵەی وولاتە ئەوروپیە ئازادکراوەکان کە

خرابوونە نێو سەربازگەی تایبەتی ولەسەر هونەرەکانی جەنگ ڕاهێنرا بوون و ڕۆڵێکی باشیان هەبوو لەو شەڕانەی عوسمانیەکان ئەنجامیان دەدا) علی حسون: تأريخ الدولة العثمانية،ص١٠٦

(١٠٩) عمر عبدالعزيز عمر:دراسات فى تأريخ العرب الحديث،ص ٦٨ –٦٩

(١١٠) ارنولد توينبى نقلا عن عمر عبدالعزيز عمر:دراسات فى تأريخ العرب الحديث،ص ٦٩

(١١١) سيار كوكب الجميل: دراسات فى السيطرة العثمانية على الموصل و الجزيرة سنه ١٥١٦ ،ص ٢٠٠

(١١٢) سەعد بەشیر ئەسکەندەر:سەرهەڵدان وڕوخانی سیستەمی میرنشینی کوردستان،ل٧٨

(١١٣) البدليسى: الشرفنامه:ص ١٨٦

(١١٤) محمد امين زكى: خلاصه،ل١٦٤

(١١٥) الطالبانى:كردستان والحركة القومية الكردية،ص ٣٧

(١١٦)صالح قەفتان:مێژووی گەلی کورد،ل٣٤١

(١١٧)محفوظ العباسي:اماره بهدينان العباسيه،الموصل،١٩٦٩،ص ٥٢ :انورالمايي:الاكراد فى بهدينان،ص ١٢١

(١١٨) محمد امين زكى: خلاصه،ل١٦٦

(١١٩)الجميل:استراتيجية العراق،ص ١٧

(١٢٠)البدليسى:الشرفنامه،ص٤٣١

(١٢١)صالح محمد امين:کوردو عەجەم ،ل٦٨

(١٢٢) عماد عبدالسلام:الصراع العراقى الفارسى ،ص٢١٠

(١٢٣)صالح قەفتان:مێژووی گەلی کورد،ل٣٤١

(١٢٤) سی٠جی٠ادمونز:کوردو ترك وعرب سیاسة ورحلات وبحوث عن الشمال الشرقی من العراق ١٩١٩-١٩٢٥،ترجمه:جرجیس فتح الله،اربیل ١٩٩٩،ص ١٢

(١٢٥) نەجاتی عەبدوللاّ:کوردستان و کێشەی سنوری عوسمانی -فارسی ١٦٣٩-١٨٤٧، هەولێر٢٠٠١ ،ل٣٠

(١٢٦) نەجاتی عەبدوللاّ:کوردستان و کێشەی سنوری عوسمانی -فارسی ١٦٣٩-١٨٤٧،ل٣٠ : رەسول هاوار:کوردو باکوری کوردستان لە سەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دوهەمی جیهان،ل١٩٣

(١٢٧) عبدالرحمن قاسملو: چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی،١٩٨٨،ل١٨

(١٢٨) انور المایي:الاکراد فی بهدینان، ص١٢١

(١٢٩)محمد امین زکی:مشاهیر الکردوالکردستان،(اعداد:رفیق صالح)،السلیمانیه ٢٠٠٥ ، ج٢،ص ١١١

(١٣٠) محمد فرید بك المحامی:تاریخ الدوله العلیة العثمانیة،ص ٧٤

(١٣١) احمد عبدالرحیم مصطفی:فی اصول التاریخ العثمانی گ١،بیروت،١٩٨٢ ، ص٨

(١٣٢) سیار کوکب الجمیل: دراسات فی السیطرة العثمانیة علی الموصل و الجزیرة سنة ١٥١٦ ،ص٢٠١:عمر عبدالعزیز عمر:دراسات فی تأریخ العرب الحدیث،ص ٦٩ :علی حسون:تأریخ الدوله العثمانیة ،المکتب الأسلامي،٢٠٠٢ ،ص٥٧

(١٣٣)ئارشاك سافراستیان:کوردو کوردستان،(وەرگێرانی :ئەمین شوان)،هەولێر ٢٠٠٥ ،ل٥٦

(١٣٤) م٠س٠ لازاریف: کێشەی کورد ١٨٩٦-١٩١٧(وەرگێرانی:د٠کاوس قەفتان)،بەغدا ١٩٨٩،ل٤٣ : قاسملو: چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی،ل١٨

(١٣٥)قاسملو:کوردستان وکورد،ل٤٢

(١٣٦)صالح قەفتان:مێژووی گەلی کورد،ل٣٤٠

(١٣٧)کمال مظهر:دراسات فی تاریخ ایران الحدیث والمعاصر،بغداد ١٩٨٥،ص ٢٣٠

(١٣٨)باسیل نیکتین:الاکراد ،بیروت،ص ١٦٩

(١٣٩)محمد امین زکی:خلاصە،ل٧

(١٤٠) خلاصە،ل١٧١

(١٤١) شاکر خەسباك: کوردو مەسەلەی کورد،ل٢٩

(١٤٢)البدلیسی:الشرفنامە:ص ٤٣

(١٤٣)ئـەولیا چـەلەبی :کـورد لەمێـژووی دراوسـێکانیدا–سـیاحەتنامەی ئـەولیا چەلەبی،(وەرگێرانی:ناکام)،بەغدا ١٩٨٧،ل٢٨–٣٦

(١٤٤) ئەولیا چەلەبی :کورد لەمێژووی دراوسێکانیدا–سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی،لەلاپەرەکانی ٢٨، ٣٥–٣٦، ٩٥ ، ١٠٥، ٣١٦:خەسباك:کوردو مەسەلەی کورد،ل٣٠

(١٤٥)هـ٠س:ل٢٨–٣٥

(١٤٦) هـ٠س٠،ل٣٦، ٢١١

(١٤٧) بلـەچ شـێرکۆ:کێـشەی مێژینەوئێـستای کـورد : (وەرگێرانـی :محمـد حەمـە باقی)، ١٩٩١،ل٣١

(١٤٨) قاسملو: چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی،ل١٨

(١٤٩)خەسباك: کوردو کێشەی کورد،ل٢٩

(١٥٠)محمد امین زکی: خلاصە،ل١٧١

(١٥١)مینورسـکی:کـورد،د٠مـارف خەزنەدارلـە روسـیەوە کردوویيـەتی بەعـەرەبی وحمەسعید کریم کردوویەتی بەکوردی،هەولێر ١٩٨٤ ،ل٥٠

(١٥٢) ئـەولیا چـەلەبی :کـورد لەمێـژووی دراوسـێکانیدا–سـیاحەتنامەی ئـەولیا چەلەبی،ل٣٥

(١٥٣)علاءالـدین سـجادی:شۆڕشـەکانی کـورد(وە کـوردو کۆمـاری عـیراق)،بەغـدا ١٩٥٩،ل٢٧ : جیاووك الکردی(م٠ع٠١):القضیة الکردیة،بغداد ١٩٢٥،ص ١٤

(١٥٤)قاسملو:کوردستان و کورد،ل٤٢

(١٥٥)ئارشاك سافراستیان:کوردو کوردستان،ل٥٦

(١٥٦)محمد امین زکی:خلاصە ،ل١٧٦

(١٥٧) م٠رەسول هاوار:کوردو باکوری کوردستان لە سەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دوهەمی جیهان،ل١٥٨

**سەرچاوەکان:**

**١-سەرچاوە کوردییەکان و وەرگێڕاو بۆ ی:**

- ئەولیا چەلەبی :

١-کوردلەمێـــــــــژووی دراوســـــــــێکانیدا-ســــــــــیاحەتنامەی ئەولیاچەلەبی،(وەرگێرانی:ناکام)چاپی دووەم،بەغدا ١٩٨٧.

-ئارشاك سافراستیان:

٢-مێـژووی هاوچـەرخی کـورد،چـاپی دووەم،وەرگێڕانـی لـە فارسـیەوە (ابـو بكـر خۆشناو )،لەبلاوکراوەکانی کتێبفرۆشی سۆران ٢٠٠٥ .

- بلەچ شێرکۆ:

٣-کێشەی مێژینەوئێستای کورد : (وەرگێرانی :محمد حەمە باقی)چ٣،کوردسـتانی عێراق ١٩٩١ .

-دیڤیدمەکداول:

٤- کوردو کوردستان،(وەرگێرانی:ئەمین شـوان)،لـەبلاوکراوەکانی دەزگـای ئـاراس ٢٠٠٥ .

- حوسێنی مەدەنی:

٥-کوردستان و ئیستراتیژی دەوڵەتان،بەرگی یەکەم،هەولێر٢٠٠٠ .

- رەسول هاوار:

٦-کوردو باکوری کوردستان لە سەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دوهەمی جیهان،بەرگی یەکەم هەتا کۆتایی شەڕییەکەم،لەبلاوکراوەکانی ناوەندی چاپەمەنی و راگەیاندنی خاك ٢٠٠٠ .

-سەعد بەشیر ئەسکەندەر:

٧-سەرهەڵدان وڕوخانی سیستەمی میرنشینی کوردستان،جەوهەر کرمانج کردوویە بە کوردی،چاپی یەکەم -سلێمانی ٢٠٠٤ .

- شاکر خەسباك:

٨-کوردو مەسەلەی کورد، وەرگێڕانی:ئەمجەد شاکەلی ،لە بلاوکراوەکانی دەزگای ئاراس ٢٠٠٥ .

- عبدالرحمن قاسملو:

٩-کوردستان و کورد ،وەرگێڕانی :عبداللە حسن زادە ،لە بلاوکراوەکانی بنکەی پێشەوا ١٩٧٣ز .

١٠- چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی ،چاپی دووهەم،١٩٨٨،بەبێ شوێنی چاپ .

- صالح محمد امین:

١١-کوردو عەجەم (مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران)،ج١، ١٩٩٢ .

- صالح قەفتان:

١٢- مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تاکو ئیمڕۆ،بەغدا ١٩٦٩.

- علاءالدين سجادی:

١٣-شۆڕشەکانی کورد(وە کوردو کۆماری عیراق)،بەغدا ١٩٥٩ .

-عبدالله محمد علی:

١٤-کورد لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا جەنگی یەکەمی جیهانی (لێکۆڵینەوەیەکە لەبواری مێژووی سیاسیدا)،سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان،سلێمانی ٢٠٠٤ .

- کاوس قەفتان:

١٥-چەند لێکۆڵینەوەیەك لە مێژووی بابان سۆران بۆتان،د.کەمال مەزهەر پێشەکی بۆ نوسیوە،چاپخانەی الحوادث- بەغدا ١٩٨٥ .

-کمال مەزهەر:

١٦-چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد،بەشی یەکەم،بەغدا ،١٩٨٥ .

- کریس کۆچیرا:

١٧-مێژووی کورد لە سەدەی ١٩-٢٠ ،(وەرگێڕانی:محمد ریانی)،چاپخانەی کارون ،بەهاری ١٣٦٩-تاران .

- م.س. لازاریف:

١٨- کێشەی کورد ١٨٩٦-١٩١٧(وەرگێرانی:د.کاوس قەفتان)،بەغدا ١٩٨٩ .

- مەستورەی کوردستانی:

١٩-مێژووی ئەردەلان (و.د.حسن جاف و شکر مصطفی) بەغدا،١٩٨٩ .

٢٠-مێژووی ئەردەلان،هەژاری موکریانی لەگەڵ سەرچاوە گەلێکی تردا لە بەریەکی گرتوون وکردوونی بەکوردی،لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ئاراس،هەولێر ٢٠٠٢ .

- محمد امین زکی:

٢١-خلاصەیەكی تاریخی كوردو كوردستان،جلد ٢،بەغدا١٩٣٧ ٠

٢٢- خلاصەیەكی تاریخی كوردو كوردستان،جلد١،چاپی ١٩٣١ ٠

-محمد جمیل ڕۆژبەیانی:

٢٣-فەرمانڕەوایی موكریان،بەغدا،١٩٩٢ ٠

-محمود ملا عزت:

٢٤-د یپلوماسیێتی بزوتنەوەی كوردایەتی،سلێمانی ١٩٧٣ ٠

- مینورسكی:

٢٥-كورد،د٠مارف خەزنەدارلە روسیەوە كردوویەتیبەعەرەبی وحمەسعید كریم كردوویەتی بەكوردی،چاپخانەی زانكۆی سەلاحەدین ١٩٨٤ ٠

-نەجاتی عەبدوڵلا:

٢٦-كوردستان وكێشەی سنوری عوسمانی-فارسی ١٦٣٩-١٨٤٧،لە بلاوكراوەكانی دەزگای چاپ و بلاوكردنەوەی موكریانی ،هەولێر ٢٠٠١ ٠

-هاشم حیجازی فەر:

٢٧-لێكۆلینەوەیەك بەناوی (شا ئیسماعیلی یەكەم وجەنگی چاڵدیران)،وەرگێرانی:د.كەمال رشید شریف،لە بلاوكراوەكانی:بەڕێوەبەرایەتی خانەی تیشك ،چاپی یەكەم ٢٠٠٢،سلێمانی ٠

**ب-سەرچاوە عەرەبیەكان و وەرگێڕاو بۆی:**

- امير شرف خان البدليسى:

٢٨-الشرفنامه(ترجمة:ملا جميل بندى رۆژبيانى )،مطبعة النجاح بغداد ١٩٥٣ .

- ابراهيم خليل احمد:

٢٩-تاريخ الوطن العربى فى العهد العثمانى ١٥١٦-١٩١٦،جامعةالموصل ١٩٨٦ .

-ابراهيم محمود:

٣٠- صورة الاكراد عربيا بعد حرب الخليج،ط١، ١٩٩٢ .

-احمد عبدالرحيم مصطفى:

٣١- في اصول تاريخ العثماني ،ط١،دار الشرق بيروت،١٩٨٢ .

- انور مايي:

٣٢- الاكراد في بهدينان (بحث تاريخي اجتماعي عن منشأ الأكراد وعقائدهم،وعاداتهم وطبائعهم وادابهم)،الطبعة الثانية ،دهوك ١٩٩٩ .

-باسيل نيكتن:

٣٣- الاكراد،دارالروائع ،بيروت،١٩٦٧ .

٣٤- الكرد دراسة سوسيولوجيةوتاريخية ،تقديم:لويس ماسينيون،نقله من الفرنسيةوعلق عليها(د. نورى طاَلبانى)،من منشورات ئاراس سنة٢٠٠٤ .

- جلال الطالبانى:

٣٥- كردستان والحركة القومية الكوردية،الطبعة الثانية،بيروت١٩٧١ .

- جياووك الكردي(م.ع.١):

٣٦- القضية الكردية،مطبعة الاستقلال،بغداد ١٩٢٥ .

– حسين حزني موكرياني:

٣٧– موجز تاريخ امراء سوران(ت.محمد الملا عبدالكريم)،بغداد،بدون سنة طبع ٠

– ستيفن همسلي لونطريك:

٣٨– اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث ،ترجمة:جعفر الخياط ،الطبعة السادسة ،بغداد ١٩٨٥ ٠

–سى٠جى٠ ادمونز:

٣٩– كوردوترك و عرب (سياسة ورحلات وبحوث عن الشمال الشرقى من العراق ١٩١٩ –١٩٢٥ ٠ ،ط٢،ترجمة:جرجيس فتح الله،من مطبوعات دار ئاراس للطباعة والنشر،اربيل ١٩٩٩ ٠–عمر عبدالعزيزعمر:

٤٠– دراسات في تاريخ العرب الحديث،ج١،بيروت،١٩٧٨ ٠

–علي حسون:

٤١–تأريخ الدولة العثمانية ط٤،المكتب الأسلامي ٢٠٠٢ ٠

– صد يق الد ملوضى:

٤٢– امارة بهدينان او(امارة العمادية) ، من منشورات دار ئاراس للطباعة والنشر، ١٩٩٩ ٠

– صلاح هروري

٤٣– امارة بوتان في عهد الامير بدرخان(١٨٢١–١٨٤٧) دراسة تاريخية سياسية،من منشورات مؤسسةموكرياني للطباعة والنشر،الطبعة الاولى ،لسنة ٢٠٠٠ ٠

– عماد عبدالسلام:

٤٤-الصراع العراقي الفارسي ،بغداد ١٩٨٣ .

-عماد الجواهري:

٤٥- صراع القوى السياسية في المشرق العربي،الموصل ١٩٩٠ .

- عبدالعزيز سليمان نوار:

٤٦- تاريخ العراق الحديث،قاهرة،١٩٦٧ .

٤٧- تاريخ الشعوب الاسلامية في العصر الحديث،ج١ ،قاهرة، ١٩٦٨ .

- محمد امين زكي:

٤٨- الكردوالكردستان،(اعداد:رفيق صالح) ج٢،السليمانية(بنكەی ژین) ٢٠٠٥ .

٤٩-خلاصة تاريخ الكورد و الكردستان(ت:محمد علي عوني) ط٢،بغداد١٩٦١ .

-محمد فريد بك المحامي:

٥٠- تاريخ الدولة العلية العثمانية،بيروت،١٩٧٧ .

-محفوظ العباسي:

٥١- امارة بهدينان العباسية،الموصل ١٩٦٩ .

-محمود الدرة:

٥٢-القضية الكردية،منشورات دارالطليعة -بيروت ١٩٦٦ .

- مجموعة من المؤرخين:

٥٣- العراق في التاريخ،بغداد ١٩٨٣ .

-محمد وصفي ابومغلي

٥٤-ايـران دراسـة عامـة ،مـن منـشورات مركـز دراسـات الخلـيج العربـي بجامعـة البصرة،١٩٨٥ .

- كمال مظهر:

٥٥- دراسات فى تاريخ ايران الحديث والمعاصر،بغداد ١٩٨٥ .

- كاوة فريق احمدشاوةلي ئاميدى:

٥٦-امارة بادينان (١٧٠٠-١٨٤٢) دراسة سياسية اجتماعيـة ثقافيـة ،مـن منـشورات مؤسسة موكريانى للطباعة والنشر ،الطبعة الاولى ٢٠٠٠ .

- ياقوت الحموي:شهاب الدين أبوعبدالله (ت ٦٢٦ه / ١٢٢٨م)

٥٧-معجم البلدان،دارصادر،بيروت،بدون تأريخ .

ج- خولاوەكان

-سيار كوكب الجميل:

٥٨- دراسات في السيطرة العثمانية على الموصل واقليم الجزيرة سنة١٥١٦ وبـدايات الـصراع العثمـاني الايرانـي في عهـد الـسلطان سـليم الاول،في مجلـة(بـين النهرين)،عدد(٣٠)،سنة١٩٨٠ .

٥٩- اسـتراتيجية العـراق واثرهـا في نشوالـصراع العثمـاني الايرانـي،مجلـة(افـاق عربية)،عدد(١٠)،سنة ١٩٨١ .

د-ماستە رنامە كان

- سعدى عثمان حسين:

٦٠-(كوردستان والامبراطورية العثمانية دراسة في تطورهاالسياسي ١٥١٤-١٨٥١م)، اطروحة قدم الى جامعة صلاح الدين-اربيل لنيل درجة ماجستير في التاريخ الحديث (باشراف د٠احمد عثمان ابوبكر)،١٩٩٥م ٠

# بزوتنەوەی چاکسازی عوسمانی لە سەردەمی سوڵتان مەحمودی دووەم(١٨٠٨ - ١٨٣٩ز)

د.حکیم احمد مام بکر
م.عەدنان ئەمین محمد

## کورتەیەك لەسەر مێژووی چاکسازییەکان لە دەوڵەتی عوسمانی

### دەروازە

دەوڵەتی عوسمانی(١٢٩٩-١٩٢٤)یەکێکە لە دەوڵەتە هەر بەهێزو ناودارەکانی مێژوو، کە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ و لە رووبەرێکی فراوانی زەوی لە هەر سێ کیشوەری ئاسیا و ئەوروپا و ئەفریقا فەرمانڕەوایەتی کردووە، ئەم دەسەڵاتە کە لەسەرەتادا میرنشینێکی بچوك بووە لە باکووری رۆژئاوای ئەنادۆڵ، پەیتا پەیتا بەرەو فراوان بوون و پەلهاوێشتن رۆیشتووە تا بووەتە ئیمپراتۆرییەتێکی مەزن و پان و پۆڕ لە سەردەمی سوڵتان سولەیمانی یەکەم(قانونی)(١٥٢٠-١٥٦٦)، مێژوونوسان سەردەمی فەرمانڕەوایەتی ئەم سوڵتانە، بە سەردەمی زێڕینی دەوڵەتی عوسمانی دادەنێن، کە دەوڵەتەکە گەیشتە لوتکەی هێزو توانا لە زۆربەی بوارە جیاجیاکانەوە.[١]

پاش مردنی سوڵتان سولەیمانی یەکەم، دەوڵەتی عوسمانی پەیتا پەیتا، دیاردەی لاوازی رووی لێکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانیبووی پارێزگاری لە

هێزو دەستکەوت و سەروەرییەکانی بکات بۆ نزیکەی سەدەیەکی تریش، شوێنەوارەکانی ئەم لاوازیەش بە شێوەیەکی روون دەرنەکەوت تا ساڵی ١٦٨٣ لە کاتی دووەم گەمارۆدانی شاری(ڤیەنا)، کە سوپای عوسمانی سەرنەکەوت لە گرتنی ئەو شارەدا و پاشەکشەی کرد، کە زۆر لە مێژوونوسان ئەو ساڵە بە سەرەتای دەست پێکردنی سەردەمی لێك هەڵوەشانی دەوڵەتی عوسمانی دادەنێن.[٢]

لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا گرفتەکانی دەوڵەتی عوسمانی زیادی کردو دیاردەکانی لاوازی بەسەریدا زاڵ دەبوو، هۆکارەکانی لاوازبوونیشی جۆراو جۆرو فرەلایەنەبوو، لە نێوان کێشەی ناوخۆیی و دەرەکی، و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و نەتەوایەتی و تەنانەت ئاینیش خۆی دەبینیەوە، کە هەریەك لەو گرفتانە لەلای خۆیەوە کاری دەکرد و هەموویان پێکەوە ئەو دواکەوتنەیان بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا سەپاندبوو[٣] باس کردن و ژماردنی هەموو ئەو هۆکارانە لێرەدا کارێکی ئاسان نیە و لێکۆڵینەوەی سەربەخۆی دەوێت[٤] بەڵام نیشانەکانی ئەم لاوازی و لێك هەڵوەشانە زیاتر لە هەرەس هێنانی رژێمی ئابووری و گەندەڵی بەڕێوەبردنی دامەزراوەکانی دەوڵەت، و دەست تێوەردانی ئافرەتانی کۆشك لە بەڕێوەبردنی کاروباری حکومەت و بوونی راپەڕین و جوڵانەوەکانی دژ بە دەوڵەت لە هەرێمە جیا جیاکانی وڵات، و لاوازی سوپاو شکستەکانی لەبەرامبەر هێزی دەوڵەتە ئەوروپیەکان، خۆی دەبینیەوە.[٥]

ئەو گرفتانە وای لە چەندین کەسایەتی سیاسی عوسمانی و هەندێ لە سوڵتانەکانیش کرد کە بیر لەچارەسەرکردنی ئەو بارودۆخە ناهەموارە

بکەنەوە دەربارەی سەرەتاییەکی تەواو بۆ مێژووی چاکسازییەکانی لە دەوڵەتی عوسمانی بیرو رای جیاواز هەیە، هەندێك نووسەر ئەو سەرەتاییە دەگەڕێننەوە بۆ سەدەی شانزەهەم و ئیشارەت بەدەوری چەند کەسایەتیەك دەکەن لەم بوارەدا، لەوانە (لوتفی پاشا) کە یەکێك بووە لە وەزیرەکانی سوڵتان سولیمانی قانونی(١٥٢٠-١٥٦٦)، کە نامەیەکی نووسیوە لە ژێر ناونیشانی (ئاصف نامە) و تیایدا ئیشارەتی بە هندێ لایەنی لاوازی دەوڵەت کردووە[٦] هەندێ نووسەری تر پێیان وایە چاکسازییەکان وەك بزووتنەوەیەکی فراوان دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم و دەبیەسنەوە بەهەوڵی سوڵتانەکانی ئەو ماوەیە، بەتایبەتی سوڵتان مستەفای سێیەم(١٧٥٧-١٧٧٤)گەشەیان کرد، کە هەوڵی چاکسازیکردنی سوپاو لایەنی دارایی داوە. [٧]

رای تەواو لە نێوان ئەو دوو را زۆر لێك جیاوازەدا، ئەوەیە چاکسازیکردن وەك(بیرۆکە) لەدەوڵەتی عوسمانیدا مێژوویەکی کۆنی هەیە، بەلاَم بە شێوەیەکی دیار دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەهەم، ئەگەر بە شێوەیەکی زۆر سادەش بە دیار کەوتبێت، چونکە سەرەتای دەرکەوتنی لاوازی لە دەوڵەتی عوسمانی پاش ئەو مێژووە دەست پێدەکات، بۆیە لەو کاتە بەدواوە هەندێ لە سوڵتانەکانی داوا لە بیرمەندەکانی عوسمانی دەکەن بیرو بۆچوونی خۆیان لەسەر چۆنیەتی چارەسەرکردنی کێشەکانی دەوڵەت دەربڕن، لە پێشەنگی ئەو کەسانە(قۆچی بەگ)ە، کە ئەفسەرێکی عوسمانی بوو لە کۆشکی سوڵتان مورادی چوارەم(١٦٢٣-١٦٤٠)، لە نامەیەکیدا بۆ سوڵتان باسی هۆکارەکانی لاوازبوونی دەوڵەت و ڕێگا چارەسەرەکانیشی

دەکات، بە بۆچوونی ئەم چاکسازیخوازە (جێ بەجێ کردنی یاساکانی ئیسلام بە چاکی، هۆکاری سەرەکییە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی دەوڵەت) [٨]، سوڵتانیش لەلای خۆیەوە چەند هەنگاوێکی نا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی دەوڵەت و بەهێزکردنی سوپا و پتەو کردنی دام و دەزگاکانی دەوڵەت، لەڕێگای سەر لە نوێ بوژانەوەی دامەزراوەکانی کۆنەکان.[٩] لە کەسایەتیە چاکسازیخوازەکانی دیکە(حاجی خەلیفە)یە کە لە ساڵی ١٦٥٣ نامەیەك دەنێرێت بۆ سوڵتان محەمەدی چوارەم(١٦٤٨-١٦٨٧ز)لەژێر ناونیشانی (دستور العمل لاصلاح الخلل) واتە (پەیڕەوی کارکردن بۆ چارەسەرکردنی کەموکورییەکان)، کە تیایدا باسی هۆکارەکانی گەندەڵ بوونی بارودۆخی دارایی و سەربازی و کارگێڕی دەوڵەتی عوسمانی دەکات.[١٠]

ئەوەی لە هەوڵە چاکسازییەکان و بیروبۆچونی خاوەنەکانیان و جێ بەجێ کردنی لەلایەن سوڵتانەکانی ئەو ماوە مێژوویيە - بە درێژایی سەدەی حەڤدەهەم - تێبینی دەکرێت، ئەوەیە:

بیرو بۆ چونەکانی چاکسازی کردن زیاتر لەسەر بنچینەی گەرانەوە بۆ یاساکانی ئیسلام و داب و نەریتە باوەکانی عوسمانی دامەزرابوو، هەروەها جێ بەجێ کردنیشی لەلایەن دەوڵەتەوە لە سنورێکی فراواندابووە و هەنگاوەکانیش کاتی بوون و بەرنامەیەکی دیارو تۆکمەشی نەبووە.

لە سەرەتای سەدەی هەژدەهەمەوە، چاکسازییەکان شێوازێکی نوێی بەخۆیەوە دەبینی، ئەوەش لە ئەنجامی زیاتر باڵادەست بوونی شارستانی رۆژئاوا لە بوارە جیاجیاکاندا و رۆژ بە رۆژ دواکەوتنی بارودۆخی جیهانی ئیسلامی بەگشتی و دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەتی، لێرە بەدواوە کەسانێك لە

دەوڵەتی عوسمانی دەردەکەون کە داوادەکەن زیاتر سوود لە پێشکەوتنی ڕۆژئاوا ببینرێت و (وەرگرتنی شێوازە ئەورووپیەکان) بە پێویست دەزانن، هەر ئەو بۆچونەش بوو کە لە پاشەڕۆژدا دوفاقەیی لە دەوڵەتی عوسمانی دروست کرد، واتە لەو مێژووەوە کۆمەڵی دووەم بەرەوکەوتن لە مێژووی چاکسازی عوسمانی بەرامبەر بە بۆچوونی کۆمەڵی یەکەم کەپێی لەسەر شێوازە کلاسیکییەکەی چاکسازیدا دەگرت، هەروەك لە پێشەوە باسمان کرد، ئەوەشی کە لە پاشەڕۆژدا تای تەرازووەکەی بەلای کۆمەڵی دووەم داهێنا و پاشانیش دەوڵەتی عوسمانی ناچار کرد بۆچوونی دووەم پەیڕەو بکات، پێشکەوتن و سەرکەوتنی وڵاتە ئەورووپیەکان بوو لە بوارە جیاوازەکاندا بە تایبەتی بواری سەربازی[11]، لەم رووەوە(داماد ئیبراهیم باشا)کە پلەی سەرۆك وەزیران (صدر الاعظم)ی وەرگرت لە سەردەمی سوڵتان ئەحمەدی سێیەم(١٧٠٣-١٧٣٠)،بەیەکەم بەرپەرسی عوسمانی دادەنرێت، کە زۆر گرنگی بە شارەزابوونی بارودۆخی ئەورووپا داوە، بۆیە دەوڵەتی عوسمانی دەستی کردووە بە ناردنی نێردراو(سەفیر)بۆ پایتەختی وڵاتە ئەورووپیەکان بۆ ئەو مەبەستە، لە دیارترین سەفیرەکانی ئەو سەردەمە: (محمەد چەلەبی)بوو، کە بەسەفارەتی دەوڵەتی عوسمانی چووە فەرەنسا لە ساڵی ١٧٢٠.[12]

چاکسازییەکانی عوسمانی لە سەدەی هەژدەهەمدا زیاتر لە بواری سەربازی و رێکخستنی سوپادابووە، ئەویش بە هۆی ئەو شکستە زۆرانەی سوپای عوسمانی تووشی هاتبوو لەو ماویەدا، ئەم چاکسازییانەش زیاتر لەسەردەمی سوڵتان مستەفای سێیەم(١٧٥٧-١٧٧٤) کەهەستا بەرێکخستنی تۆبخانەو هێزی دەریایی لەسەر شێوازی ئەورووپی بەسوود وەرگرتن لە پسپۆرانی

ئەورووپی بەتایبەتی شارەزایەکی فەرەنسی کە ناوی(دی توت)بوو.[١٣]
لەگەڵ هاتنی سوڵتان سەلیمی سێیەم بۆ سەر دەسەڵات لە ساڵی ١٧٨٩ز چاکسازیەکانی عوسمانی زیاتر بوژایەوە، بەوەی کەتەنها بواری سەربازی نەگرتەوە، کە تەوەری سەرەکی گرنگی پێدانی سوڵتانەکانی پێش خۆی بوو، بەڵکو زۆربەی لایەنەکانی تریشی گرتەوە.[١٤] بەرپابوونی شۆرشی فەرەنسی لە ساڵی ١٧٨٩و بڵاوبوونەوەی بنەماکانی(ئازادی،برایەتی،یەکسانی) زیاتر پێویستی چاکسازیکردنی لە دەوڵەتی عوسمانی بەدیار خست، بەتابەتی پاش داگیرکردنی میسر لەلایەن فەرەنسا لە ساڵی ١٧٩٨، کە ویلایەتێکی عوسمانی بوو، هەروەها پێویستە کاریگەری چینی بۆرجوازی تازەپێگەیشتووشمان لە یاد نەچێت لە(ئەستەنبول)، ئەگەر چی لاوازیش بووبێت لەو کاتەدا، کە پشتگیری چاکسازییەکانی دەوڵەتی دەکرد بۆ رزگاربوون لەو بارودۆخە دەرەبەگایەتییە دواکەوتووەی لە دەوڵەتی عوسمانی بڵاوبوو.[١٥]
سوڵتان سەلیمی سێیەم هەستا بەبانگهێشت کردنی کۆمەڵێك بیرمەند و سیاسەتمەداری دەوڵەتی عوسمانی بۆ زانینی راو بۆچوونیان لە سەر چۆنیەتی چارەسەرکردنی هۆکارەکانی لاوازی دەوڵەت، هەموویان هاتنە سەر ئەو رایەی کە پێویستە چاکسازی لە سوپادا بکرێت پێش هەموو بوارەکانی تر و لە ساڵی ١٧٩٢زنجیرەیەك یاساو رێنمایی تازە دەرکرا بەناوی (قانون نامە) کە کۆمەڵێك چاکسازی لە خۆ گرتبوو، هەروەها چەند قوتابخانەیەکی سەربازی دامەزرێنرا بە یارمەتی راهێنەرو پسپۆرە ئەورووپیەکان کە زۆربەیان فەرەنسی بوون، سوڵتان سەلیمی سێیەم لەم کارەیدا دەیویست(سوپایەکی

نوێ) دابمەزرێنێ کە بە تێپەڕبوونی کات شوێنی سوپای یەنیچەری * بگرێتەوە، کە ماوەیەکی زۆربوو تووشی لاوازی و گەندەڵی ببوو.(١٦)

هەنگاوەکانی سوڵتان وای کرد دوژمنانی چاکسازی کە خۆی لە سوپای یەنیچەری و هەندێ لە زانایانی ئاینی دەبینیەوە، بکەونە خۆیان و ئەو چاکسازیانەی سوڵتان- کە بەپشت بەستن بە ئەزموونی ئەورووپی ئەنجام دەدرێ - بە گومرایی (بدعە) و لەدین دەرچوون لە قەڵەم بدەن، ئەوەبوو یەنیچەرییەکان لە ساڵی ١٨٠٧یاخی بوونی خۆیان لە سوڵتان راگەیاند و گەمارۆی کۆشکی سوڵتانیان داو لەسەر تەخت لایاندا، بەلابردنی سوڵتان سەلیمی سێیەم و کوشتنی لەهەمان ساڵدا، چاکسازیەکانی عوسمانی راوەستاو نەکەوتەوە کار تاهاتنی سوڵتان مەحمودی دووەم بۆ سەر تەختی عوسمانی لە ساڵی١٨٠٨.(١٧)

یەکەم :

## سوڵتان مەحمودی دووەم و تەختی دەسەڵات

سوڵتان مەحمودی دووەم(١٧٨٤-١٨٣٩ز)کوری سوڵتان عەبدول حەمیدی یەکەمە، لە مانگی رەمەزانی ساڵی ١١٩٩کۆچی بەرامبەر ساڵی ١٧٨٤زاینی لەدایك بووە، پاش لابردنی سوڵتان مستەفای چوارەمی برای لەسەر تەخت، بووە بە سوڵتان و بەسێیەمین سوڵتان دادەنرێت لە رێزبەندی سوڵتانەکانی عوسمانی(١٨)، دایکی سوڵتان مەحمود ئافرەتێکی فەرەنسی بوو بە ناوی (ئێمێ*) کە ئافرەتێکی زۆر جوان و بە توانا بووە و دواتر دەورێکی گەورەو

و كاریگەری بینی لە پەروەردەكرن و دامەزراندنی كەسایەتی مەحمودی كوڕیدا.[19]

بارودۆخی سەڵتەنەت لە ساتە وەختی هاتنی سوڵتان مەحمود بۆ سەر دەسەڵات، بەكات و ساتێكی زۆر ئاڵۆزدا تێدەپەڕی، ئەوەبوو سوپای یەنیچەری بە هاوكاری موفتی(شێخ الاسلام)ی دەوڵەت توانیبویان سوڵتان سەلیمی سێیەم لەسەر تەخت لابەرن لە ساڵی ١٨٠٧و زۆرێك لە وەزیرو كاربەدەستانی تری دەوڵەت بكوژن و هەموو قوتابخانە و دامەزراوەكانی پەیوەست بەچاكسازی كردن هەڵبوەشێننەوە زۆربەی ئەفسەرە چاكسازی خوازەكانیش بكوژن[20]، پاشان یەنیچەریەكان (مستەفای چوارەم)یان لە شوێنی سوڵتان سەلیم دانا، لەهەمان ساڵدا، كە وەك ئامێرێك وابوو بە دەستیانەوە.[21]

لابردنی سوڵتان سەلیمی سێیەم لەسەرتەخت و كارە ئاژاوە گێڕییەكانی یەنیچەریەكان، وای كرد لایەنگرانی چاكسازكردن و دۆستانی سوڵتان سەلیم بەو كارە رازی نەبن، و هەوڵبدەن بۆ گێڕانەوەی سوڵتان سەلیمی دەركراو، ئەوەبوو(مستەفا پاشای بەیرەقدار) كە یەكێك بوو لە كەسە نزیكەكانی سوڵتان سەلیم، كە فەرمانڕەوای ویلایەتی(رۆستۆك)بوو لە بولگاریا، لەساڵی ١٨٠٨ بەخۆی و هێزێكەوە بەرەو (ئەستانە)ی پایتەخت كەوتە رێ و توانی دەست بەسەر بارودۆخی شاردا بگرێت، پاشان دەستی كرد بە كوشتنی ئەو كەسانەی دەستیان هەبوو لە لادانی سوڵتان سەلیم، دوای ئەوە بەرەو شوێنی زیندانیكردنی سەلیمی سێیەم رۆیشت لە پێناو ئازادكردنی و گێڕانەوەی بۆ سەر تەختی سەڵتەنەت، هەر لەو كاتەشدا سوڵتان مستەفای چوارەم فەرمانی

دەرکرد بەکوشتنی سەلیم و مەحمودی برای –لە باوکە، دایکیان جیابوو– بۆ ئەوەی (مستەفا پاشای بەیرەقدار) و لایەنگرانی واز لە راپەڕین بهێنن و لە مەبەستەکەیان پەشیمان ببنەوە، چونکە بەپێی بیرکردنەوەی سوڵتان مستەفا ئەگەر ئەو دوو کەسایەتییە لە ناوببرێن ئەوا لە بنەماڵەی عوسمانی کەسێکی وا دەست ناکەوێت بیکەن بە سوڵتان، ئەو کاتەش راپەڕیوان ناچار دەبن سوڵتان مستەفا لە شوێنی خۆی بهێڵنەوە، ئەوەبوو سەربازەکانی سوڵتان،سەلیمی سێیەمیان کوشت و زۆریسی نەمابوو مەحمودیش بکوژرێت و ببێتە قوربانی ئەو ململانێیە، ئەگەر زوو خۆی نەشاردباوە لە سەربانی ئەو کۆشکەی کە ئەو و سوڵتان سەلیمی ئامۆزای تێدا دەست بەسەرکرابوون[22].

ئەو پیلانەی سوڵتان مستەفا نەبووە مایەی ساردبوونەوەی راپەڕیوان، و مستەفا پاشای بەیرەقدار وازی نەهێنا تا سوڵتان مستەفای لەسەر تەخت لابرد و مەحمودی برای بە سوڵتانی نوێی عوسمانی لەسەر تەخت دانا لە ساڵی ١٨٠٨ز.[23]

بەڕای زۆر لە مێژوونوسە موسڵمان و بیانییەکان، سوڵتان مەحمود یەکێکە لە سوڵتانە هەرە بەهێزو بە تواناکانی بنەماڵەی عوسمانی و هەندێ سەرچاوە رایان وایە، پاش سوڵتان سلێمانی گەورە–یەکەم– سەوڵتان مەحمود بەهێزترین سوڵتانەکانی عوسمانی بووە[24]، و سوڵتان مەحمود بەژن رێك و قۆزو دەم و چاو شیرین و خاوەن دەنگێکی نێرانە بووە[25]، و پەرۆی فەرەنسییەکانی بواری جەنگی خوێندووەتەوەو جل و بەرگی سەربازانەی لەبەرکردووە و بەسواری ئەسپ یەکەکانی سوپای عوسمانی بەسەرکردۆتەوە.[26]

دووەم:

## بارودۆخی گشتی دەوڵەتی عوسمانی لە سەردەمی سوڵتان مەحموودی دووەم

سوڵتان مەحمود کاتێك دەسەلاتی وەرگرت لە ساڵی ١٨٠٨ تەمەنی بیست و چوار ساڵ بوو، بارودۆخی گشتی دەوڵەت تەواو ئاڵۆز بوو بوو،کێشەو گرفت لە هەموو لایەکەوە بەرەو رووی دەوڵەت بووبویەوە، ئەو گرفتانە زۆر و جۆراو جۆر بوون، ناوخۆیی و دەرەکی بوون، زۆرێك لەو کێشانە درێژ خایەن و کۆن بوون و دەگەڕانەوە بۆ دەیان ساڵ بەر لەهاتنی سوڵتان مەحمود بۆ سەر تەختی سەڵتەنەت.

خستنە رووی بارودۆخی گشتی دەوڵەتی عوسمانی لە سەردەمی سوڵتان مەحمود و شارەزابوون لە سروشت و پێکهاتەی دام و دەزگاکانی دەوڵەت لەو سەردەمەدا کارێکی پێویستە بۆ تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی هەوڵە چاکسازییەکانی سوڵتان مەحمود، هەروەها رووداوەکانی ئەو ماوەیە کاریگەریەکی تەواوی هەیە لەسەر رەوت و ئەنجامی چاکسازیەکانی سوڵتان، بۆیە هەوڵ دەدەین بە کورتی تیشك بخەینە سەر ئەو بارودۆخە:

دەوڵەتی عوسمانی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا تووشی چەندەها کێشەی ناوخۆیی ئاڵۆز ببوو، ئەمەش لە زۆربەی بوارەکاندا رەنگی دابوویەوە، ئەوەبوو لەڕووی کارگێڕییەوە، تووشی لێك هەڵوەشان ببوو میر و (والی) یەکان بەپێی بەرژەوەندی خۆیان فەرمانرەواییان دەکرد، بێ ئەوەی گوێ بدەنە بەرژەوەندیەکانی ولات فەرمانڕەوایی ئەو والیانە زۆر جار تەنها ناوەندی شارە سەرەکییەکانی دەگرتەوە و ناوچە دوورەکانیش لە دەست

كەسایەتی و سەرۆك هۆزی ناوچەكەدا بوو، والی یەكان، زۆرجار بۆ مانەوەیان لە شوێنی خۆیان دەبوایە بە دیاری و خەلات دەمی سەرۆك وەزیران(صدر الاعظم)یان چەور بكردایە، لەولاشەوە ئەو والی یە، پلە جۆر بەجۆرەكانی ویلایەتەكەی خۆی بەبەرتیل وەرگرتن دەبەخشی بە فەرمانبەرەكانی[٢٧]، هەروەها ((.... گەندەڵی یاسا و زوڵم و زۆری كار بەدەستان تەواو بلاوببوویەوە، هەریەك لەو كاربەدەستانە بەهۆشێكی تەسك و بەرژەوەندییەكی فراوانەوە فەرمانڕەوایی دەكرد، كە هیچ مافێكیان بۆ ژێر دەستەكانیان دانەدەنا و خۆیان بەهیچ یاسایەكەوە نەدەبەستەوە و تەنها مەبەستیان ناوو نازناوی گەورەبوو....)).[٢٨]

ئەو گەندەڵییە كارگێڕی و كێشە زۆرانەی دەوڵەتی عوسمانی تێكەوتبوو، وای كردبوو بارودۆخێكی كۆمەلأیەتی ناهەموار لە سەر شانی خەڵكە رەش و رووتەكە بە تایبەتی لادێ نشینەكان دروست دەبێت و بێبەش بن لە زۆربەی خزمەتگوزارییە فێركاری و تەندروستیەكان، كە دەوڵەتی عوسمانی پشت گوێی خستبوو، ئەوەش كە نیشانەیەكی دیاری حوكمی عوسمانی بوو. هەروەها بلأوبونەوەی نەخۆشی و هەژاریش بە ئاشكرا هەستی پێدەكرا.[٢٩]

لاوازی دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەتی لە رووی سەربازییەوە، هۆكارێك بوو بۆ ئەوەی هەندێك لەبنەماڵە و نەتەوە جیاوازەكانی دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەتی جێگا دوورەكان ئەو بارودۆخە بقۆزنەوەو هەوڵی دەسەلأتی خۆیەتی لە ناوچەكانی خۆیان و شێوە سەربەخۆیەك بەدەست بهێنن، لە گرنگترین ئەو دەسەلأتانەش، كە لەكاتی هاتنە سەركاری سوڵتان مەحمودی دووەمدا دەسەلأتیان لە دەستدابوو ئەمانە بوون:

مەمالیکەکانی بەغدا(١٧٥٠-١٨٣١)، بنەماڵەی جەلیلیەکان لە موصڵ(١٧٢٦-٨٤٣)، بنەماڵەی قەرانلی لە تەرابلوس(١٧١١-١٧٥٣)، بنەماڵەی حسەینی لە تونس(١٧٠٥-١٨٨١)، زەیدییەکان لە یەمەن، و هۆزە عەرەبیەکان لە عیراق و شام و(بزوتنەوەی وەهابیەکان)* لە نیمچە دوورگەی عەرەبی، هەروەها میرنشینە کوردییەکان لە کوردستان، وەك میرنشینەکانی بابان، سۆران، بۆتان،....هتد.[٣٠]

لەپاش هاتنە سەر کاری سوڵتانیش چەندین کە سایەتی و میری دیکەش بەدەرکەوتن و کەوتنە ململانێ لەگەڵ دەسەلآتی ناوەندیی دەوڵەت هەوڵی سەربەخۆییان دەدا، لە گرنگترینیان(محەمەد عەلی پاشا)ی والی میسر و (عەلی پاشا) کە سەربەخۆیی خۆی راگەیاند لە ناوچەکانی(ئەلبانیا) (٣١)، هەروەها هەندێ لەنەتەوەکانی ژێر دەسەلآتی دەوڵەتیش لە بەشی ئەوروپا کە زۆرینەیان(گاور) بوون و کەمتر سۆزیان هەبوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی، بە هاندانی دەوڵەتانی ئەوروبی، کەوتنە شۆرش کردن بۆ وەدەست هێنانی سەربەخۆیی خۆیان، بەتایبەتی(یۆنانیەکان) کە کێشەیەکی گەورەیان بۆ دەوڵەتی عوسمانی دروست کردو لە ساڵی ١٨٠٤ەوە دەستیان کردبوو بەشۆرش کردن.[٣٢]

وەنەبێت هزرو رۆشنبیری فێرکردنیش لە دەوڵەتی عوسمانیدا لە ئاستێکی باشدا بووبێت، چەند سەدەیەك بوو جیهانی ئیسلامی تووشی دواکەوتن ببوو، لە کاتێکدا ئەوروپا بە سەردەمی بوژانەوەدا رۆیشتبوو، موسڵمانان لە کاروانی زانست بەجێ مابوون، و خوێندەواری زیاتر لەسەر شێوازێکی کۆن دەرۆیشت لە قوتابخانە ئاینیەکاندا، کە زیاتر خۆی لە وتنەوەی هەندێ کتێبی شەرع و

زمانەوانیدا دەبینیەوە، لەولاشەوە بوارە زانستییەکان پشت گوێ خرابوو، بواری لێکۆڵینەوەش (اجتهاد) لە باسەکانی ئیسلام دەرگای لەسەر داخرابوو، بیروباوەری موسڵمانانیش بەشێوەیەکی گشتی خۆی لەهەندێ پەرستشی رواڵەتی بێ ناوەڕۆکدا دەبینیەوە، و ئەفسانەو نەخوێندەواریش تەواو بلاّببوویەوە.(٣٣)

ئابووری عوسمانیش هەر لەکۆنەوە تووشی دارمان ببوو، هۆکارەکانیشی جگە لەو بارودۆخە خراپەی کە لە پێشەوە باسمان کرد چەندین هۆکاری تری هەبوو، وەك شەڕو شوری بەردەوام و بە فیڕۆدانی پارەی زۆر لە کۆشکی سوڵتان و دابەزینی بەرهەم هێنان بەهۆی ئەو باج و سەرانە زۆرەی بەسەر پیشەگەر و جوتیاراندا سەپێنرابوو(٣٤) هەروەها پەیڕەو کردنی رژیمی دەرەبەگایەتی و قۆستنەوەی یاسای (ئیلتزام)* بۆ بەرژەوەندی تاکەکەسی و گەنەڵ بوونی سوپای یەنیچەری کە پارەیەکی زۆریان بۆ سەرف دەکرا بێ ئەوەی خزمەتی پێویستی دەوڵەت بکەن(٣٥)، هەروەها لاوازبوونی بازرگانی بەهۆی نەبوونی رێگاوبانی پێویست و نەبوونی هێمنی و ئاسایش لە زۆربەی ناوچەکانی وڵات و دانانی باجی زۆر بەسەر کەل و پەل و بازار، و لاوازبوونی پیشەسازی عوسمانی هاتنە ناوەوەی سەرمایەو کەلوپەلی بیانی بۆ ناو ویلایەتەکانی عوسمانی، وای کردبوو کەلوپەلی ناوخۆ و بەرهەم هێنانی عوسمانی نەتوانێ بەرامبەر بەرهەم هێنانی ئەورووپی بوەستێ و شکست بهێنێت.(٣٦)

سوپای عوسمانیش کەبۆ ماوەیەکی زۆر مایەی شانازی و فراوانبوونی دەوڵەت بوو، هەر لەسەرەتای سەدەی هەژدەهەمەوە، تووشی لاوازی ببوو، هێزی

یەنیچەری کە هێزی سەرەکی وبڕبڕەی پشتی سوپای عوسمانی بوو**، ئەمونەری شەرو چەکی پێشکەوتوو بێ بەش بوو، هەروەها لە مەبەستە سەرەکییەکەی کە تێکۆشان(الجهاد)کردن بوو، دوورکەوتبۆوە و خەریکی کاری ئاژاوەگێڕی بوو، کەوتبووە ململانێ لەگەڵ سوڵتان و دەسەڵاتی ناوەندی حکومەت و دژایەتی کردنی چاکسازییەکانی دەوڵەت و زۆرجار دەگەیشتە رادەی لادانی سوڵتانەکانیش، هەروەك لەلادانی سوڵتان ئەحمەدی سێیەم(١٧٠٣-١٧٣٠)و سوڵتان سەلیمی سێیەم(١٧٨٩-١٨٠٧)بە ئاشکرا دەردەکەوێت.(٣٧)

سوپای یەنیچەری گرفتێکی دارایی قورسیشی بۆ دەوڵەتی عوسمانی دروست کردبوو، ئەویش بەهۆی خەرجیە زۆرەکانیانەوە، یەنیچەرییەکان کەم بەشداری کاری سەربازیان دەکرد و زۆرێکیان لەکاتی موچە وەرگرتندا نەبێت سەردانی سەربازگەکانی خۆیان نەدەکرد، موچەکەشیان بەپێی پسولەیەك وەردەگرت، زۆر لە یەنیچەرییەکان پسولەکانی خۆیان دەفرۆشت و کاسپیان پێوە دەکرد، ژمارەی ئەو پسولانەش لە سەردەمی سوڵتان مەحمودی دووەمدا گەیشتبووە(١٣٥٠٠٠)پسولە، و تەنها لە(٥٪)ی هەڵگرانی ئەم پسولەیە بەچاکی بەشداریان لە ژیانی سەربازی یەنیچەریدا دەکرد ، لەبەر ئەم هۆیەش بوو یەنیچەریەکان بەرهەڵستکاری هەموو پرۆژەیەکی چاکسازی کردنی سوپایان دەکرد.(٣٨)

ئەو بارودۆخە خراپە ناوخۆییەی دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەتی لاوازی و گەندەڵی سوپا، تەواو رەنگی دابوویەوە لەسەر شکستەکانی دەوڵەت و ناوبانگییەکەی لەدەرەوە، تا وای لێهات وڵاتان چاو ببڕنە سەروەت و سامان

و زەوی و زارە فراوانەکەی و ناوی لێبنێن (پیاوە نەخۆشەکەی ئەوروپا) لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهـ .ا.

دەوڵەتی عوسمانی لەسا ەمی سوڵتان مەحمود(١٨٠٨-١٨٣٩)تووشی چەندەها شەڕو شوڕو کێ ی دەرەکی بوویەوە کە دەتوانین لەم چەند دێرەدا کورتی بکەینە

هێرشی بەریتانیا بۆ سەر میسر کە ویلایەتێکی عوسمانی بوو لەساڵی ١٨٠٧، ئەو کێشەیە مابوویەوە تا رێکەوتنی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و بەریتانیا لە ساڵی ١٨٠٩، و شەرەکانی ناپلیۆن کە دەوڵەتی عوسمانی خزاندبووە ناو ململانێی نێو دەوڵەتی، هەروەها شەڕەکانی روسیا لە نێوان ساڵانی ١٨٠٩-١٨١٢، کە دەوڵەتی عوسمانی لە ئەنجامیدا هەندێ ناوچەی گرنگی لەدەستدا لەبەشی ئەوروپا و پاشانیش پاڵەپەستۆی روسیا بۆ دەوڵەتی عوسمانی، کە وەك شەڕێکی بەردەوام وابوو، تا ساڵی ١٨٢٩ کە پەیماننامەیەکی سەرشۆڕکەرانەی بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا سەپاند، هەروەها کێشەی هاندانی وڵاتانی ئەوروپی بۆ هەندێ لە میللەتانی لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی بۆ شۆرش کردن دژی دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەتی یۆنانییەکان. لەکیشوەری ئەفریقاش داگیرکردنی وڵاتی جەزائیر لەلایەن فەرەنساوە لە ساڵی ١٨٣٠کێشەیەکی دیکە بوو کە دەوڵەتی عوسمانی تووشی هات، لە رۆژهەڵاتیشەوە شای ئێران چاوی بڕیبووە خاکی عیراق و لە ساڵی ١٨٢١ شەڕ لە نێوانیاندا روویدا کە پاشتر کۆتایی پێهات بە رێکەوتنی ئەرزەڕوومی یەکەم.[٣٩]

جگە لەو کێشە دەرەکییانە، دەوڵەتی عوسمانی لە ناوخۆشدا- لەپێشەوەش ئاماژەمان پێکرد- تووشی چەندەها شەڕ بوو، بەتایبەتی شەڕەکانی محمد علی پاشای والی میسر، کە دەوڵەتی عوسمانی بەهۆی هەندێ کێشەی نێوانیان کەوتە شەڕ لەگەڵیداو تووش چەندەها دۆڕاندنی ئابڕۆبەرانەبوویەوە لەبەرامبەریدا، بەتایبەتی لەشەڕی( سیبین) لە١٨٣٩/٦/٢٤، کە پاش ئەو شەڕە بە شەش رۆژ واتە لە٣٠/٦/ ١٨٢ز ، سولڵتان مەحمود کۆچی دوایی کرد، پێش ئەوەی هەواڵی ئەو ڕەساتەی پێبگات.[٤٠]

ئەو ماوەتەو بڵێین دەوڵەتی عوسمانی لەو کاتانەدا، زیاتر بە هۆی هەلومەرجە نێودەوڵەتیەکان مابووەوە نەك بەهۆی هێزو توانای دەوڵەتی خۆی، وەئەگەر بەهۆی دروست بوونی هەندێ کێشەی نوێ و تێکنەچوونی هاوسەنگی نێو دەوڵەتی و چۆنیەتی دابەش کردنی دەوڵەتی عوسمانی نەبوایە، دەمێك بوو لەت و پەت بووبوو.[٤١]

سێیەم:

## هەلو مەرجەکانی چاکسازیکردن لە بەردەم سولڵتان مەحمودی دووەم

ئەو کێشە زۆرانەی تووشی دەوڵەتی عوسمانی ببوو، وە ببووە مایەی مژین و بە فیڕۆچوونی زۆر لە تواناکانی، نەبووە هۆی بەچۆك دادانی بە سولڵتان مەحمود و بێ ئومێدکردنی، بەڵکو بەردەوام لەبیر کردنەوەو هەوڵداندا بوو بۆ راستکردنەوەی ئەو بارە نالەبارەی کە دەوڵەتەکەی تێی کەوتبوو.

سولڵتان مەحمود سوودی زۆری لە تێبینیەکانی سەلیمی سێیەم بینی سەبارەت بەچۆنیەتی جێبەجێکردنی چاکسازیکردن، کاتێ کەپێکەوە دەست

بەسەر کرابوون لە سەردەمی سوڵتان مستەفای چوارەم(١٨٠٧–١٨٠٨)(٤٢)، بەڵام دەبووایە زۆر هۆشیارانە کاری بکردایە، بۆ ئەوەی نەکەوێتە هەمان ئەو هەولانەی کە سەلیمی ئامۆزای تێ کەوتبوو، بەتایبەتی کە هێزی یەنیچەرییەکان ئەو کاتە بەهێزتربوون ،ەی کە سوڵتان مەحمود بتوانێ زاڵ بێت بەسەریاندا.(٤٣)

سوڵتان مەحمود راستەوخۆ ، بوونی بە سوڵتان، (مستەفا پاشای بەیرەقدار)ی کرد بەسەرۆك وەزیران، و رێکخستنی کاروباری یەنیچەرییەکانی پێسپارد، ئەویش زۆربەی کاربەدەستانی دەوڵەت و هەندێ لە وەزیرە پێشووەکانی کۆکردەوە و وتارێکی بۆ خوێندنەوە و تیایدا باسی گەندەڵی سوپای یەنیچەری بۆ کردن و پێویستی بەجێهێنانی چاکسازیکردنی دیاردە دزێوەکانی ناو ئەم سوپایەی بۆ روونکردنەوە، و ئامادەبوانیش هەموویان ئەم داوایەیان پەسندکرد، لەمەش زیاتر توانی(فتوی)ی پێویست بوونی جێبەجێکردنی یاسا بنەڕەتیەکانی یەنیچەریش بەدەست بهێنێت، ئەم کارەش یەنیچەریەکانی تورەکردو کەوتنە پیلان گێران دژی سەرۆك وەزیران.(٤٤)، لەراستیدا بەیرەقدار کەوتبووە هەڵەیەکی ئاشکراوە کاتێ دەیویست بەو ئاسانیە بەسەر یەنیچەریەکاندا زاڵ بێت، بەتایبەتیش کاتێ کەتەنها چوار هەزار سەربازی لە کۆی ئەو شازدە هەزار سەربازەی لەگەڵ خۆیدا هێشتبووەوە، کەلەژێر دەستی دابوون.(٤٥)

یەنیچەریەکان دەستیان کرد بە ئاژاوە نانەوە، ویستیان مستەفای چوارەم بگێڕنەوە بۆ سەر تەختی سەڵتەنەت، کە ئەو کاتە دەست بەسەردا کرابوو، ئەوەبوو لەشەوی ١٣/ لەسەر ١٨٠٨/١١/١٤توانیان گەمارۆی کۆشکی سەرۆك

وەزیران بدەن، و شەڕێکی سەخت دەستی پێکرد، بەیرەقدار کە زانی یەنیچەریەکان گەمارۆی ئەو دەوروبەرەیانداوە نزیکە بەسەریدا زاڵ بن و دەیانەوێت سولتان مەحمود لەسەر تەخت لابەرن، فەرمانی دەرکرد بەکوشتنی مستەفای چوارەم و فرێدانی تەرمەکەی بەناویاندا، بەو هیوایەی پاشگەزببنەوە لە مەبەستەکەیان، بەڵام ئەم کارە یەنیچەریەکانی زیاتر هارو هاج کرد و ئاگریان بەردایە ئەو کۆشکەی بەیرەقداری تێدابوو، پاش بەرگرییەکی زۆر بەیرەقدار و پاسەوانەکانی لە ناو کۆشکەکەدا سوتان، بەڵام کە ڕۆژ بوویەوە، لایەنگرانی بەیرەقدار بەتایبەتی هێزی تۆپخانە، و بەڕەزامەندی سولتان مەحمود بەرەو ڕووی یەنیچەریەکان بوونەوە و زۆری نەمابوو هەموویان تەفرو تونا بکەن بۆ ڕۆژی دواتر یەنیچەریەکان زانیان کە کار وابڕوات رزگاربوونیان نیە ئاگریان بەردایە زۆربەی گەڕەکەکانی شار، بۆیە سولتان مەحمود لە پێناوی رزگارکردنی شارەکە، ناچاربوو وازیان لێبهێنێت و رازی ببێت بەداواکارییەکانیان.(٤٦)

پاش ئەو ڕووداوە یەنیچەریەکان دەستیان بەسەر ئەو بارودۆخەدا گرتەوەو سولتانیش ناچار بوو مل بۆ داواکاریەکانیان کەچ بکات، وفەرمانێك ئیمزا بکات، کەبەپێی ئەوە، تێکرای چاکسازییەکانی سەلیمی سێیەم پوچەڵ دەبوویەوە، پاشان یەنیچەریەکانیش دەستیان کردەوە بەزێدەڕۆیی و کارەخراپەکانیان و سولتانی چاکسازی کاریش جگە لە چاوەڕێبوون بۆ بەدەست هێنانی دەرفەتێکی لەبار بۆ تێك و پێك شکاندنی ئەم دوژمنە مەترسیدارانەی خۆی و بنەماڵەکەی، چی دیکەی لەدەست نەدەهات.(٤٧)

لەو رووداوە بەدواوە سولتان مەحمود ئەم چەند خاڵەی بەتەواوی لاڕوون بووبوویەوە:

١- پرۆژەی چاکسازیکردن پێویستە گشتگیرو هەمەلایەنە بێت، بە جۆرێك کە هەموو یاساکانی عوسمانی کۆمەڵگای عوسمانی بگرێتەوە، نەك تەنها چەند لایەنێکی بواری سەربازی بگرێتەوە.

٢- پێویستە رژێمی ... هەڵبوەشێنرێتەوە، بۆ ئەوەی نەبێتە رێگر لەبەردەم پرۆژەی چاکسازیکردن.

٣- وریایی و بە ئاگابوونی تەواو لە کاتی جێبەجێکردنی چاکسازییەکان، و دەستەبەرکردنی رێوشوێنی پێویست بۆ سەرخستنیان پێش هەستان بەو کارە.[48]

سولتان مەحمود خەمی یەکەم و گەورەی مەسەلەی چاکسازییەکان بوو، چونکە لای روون بوو، بێ ئەنجام دانی چاکسازی، دەوڵەت ناتوانێت لەسەر پێی خۆی راوەستێ و پێشبکەوێت، بۆ ئەم مەبەستەش هەندێ هەنگاوی نا، ئەوبوو لایەنگرانی چاکسازیکردنی لەدەوری خۆی کۆکردەوەو پلەو پایە گرنگەکانی دەوڵەتی پێبەخشین[49]، لە ئاستی دەرەوەش هەوڵیدا دەوڵەتی عوسمانی دووربخاتەوە لە شەڕوشۆڕ و هەتا بتوانێ کێشە دەرەکیەکانی بە ئاشتی چارەسەربکات لە گەڵ وڵاتاندا، بۆ نموونە، ئەوەبوو لە ساڵی ١٨٠٩ لەگەڵ بەریتانیا رێکەوتنی ئیمزا کرد، و لەهەمان کاتیشدا، لەگەڵ روسیا دەستی بەوتووێژ کرد، ئەگەر چی نەشگەیشتنە هیچ رێکەوتنێك.[50]

ماوەتەوە بڵێین، هەلومەرجەکانی چاکسازیکردن لەبەردەم سولتان مەحموددا زۆر ناسك و ئاڵۆزبووە و سولتانیش پێویست بوو لەسەری، زۆر بەئاگایی و

لەسەرخۆیی بەرەو رووی ئەو کێشانە ببووایەوە و کاتێکیش بەشێك بووە لە چارەسەرکردنی گرفتەکانی، هەروەك لە دوایی دەبینین، کە زۆربەی چاکسازییەکانی سوڵتان کەوتە پاش هەژدە ساڵ لە هاتنی بۆ سەرتەختی سەڵتەنەت.

بەشی دووەم

## بوارەکانی چاکسازیکردنی سوڵتان مەحمودی دووەم

چاکسازییەکانی سوڵتان مەحمود زۆرن و جۆراو جۆرن، و لەگەڵ یەکدا تێکهەڵکێشن جیاکردنەوەشیان بۆ روونکردنەوەی بابەتەکەیە، و دەتوانین گرنگترین چاکسازییەکانی سوڵتانیش لەم چوار بوارەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە:

یەکەم : چاکسازییە سەربازییەکان

دووەم : چاکسازییە کارگێرییەکان

سێیەم : چاکسازییە ئابوورییەکان

چوارەم : چاکسازییە رۆشنبیری و کۆمەلآیەتییەکان

شتێکی ئاشکراشە کە چاکسازییەکانی سوڵتان مەحمود لە بواری سەربازییەوە دەست پێدەکات بەهۆی سروشتی دەسەلآتداریێتی عوسمانی، کە سروشتێکی سەربازییانەی هەبوو، هەروەها سوپای عوسمانیش کە زیاتر لە هێزی یەنیچەریدا خۆی دەبینیەوە، تووشی گەندەڵی هاتبوو، تەنانەت چاکسازی بوارەکانی تریش پەیوەست بوو بەم بوارەوە، چونکە دەزانین کە

رێگری یەکەم لەبەردەم چاکسازییەکانی سوڵتان محمود دا نارەزایی سوپای یەنیچەری بوو بە پلەی یەکەم ، هەروەك لەپێشەوە باسمان کرد.

یەکەم

## چاکسازییە سەربازییە[illegible]

هەروەك لەبەشی یەکەمدا [illegible]مان کرد سوڵتان محمود هەر لەکاتی بوونی بەسوڵتان لە ساڵی [illegible]۰۸ [illegible] وە دڵنیا بوو کە پێویستە چاکسازی فراوان ئەنجام بدرێت لەم بوارەدا، ئەمەش بێ لەناوبردنی یەنیچەرییەکان مەحاڵ بوو، بەڵام ئاواتەکانی سوڵتان و چاکسازیکردن لەم بوارەدا ساڵانێکی زۆر دواکەوت، ئەویش بەهۆی ئەو کێشە زۆرانەی بەرەو رووی بووبوونەوە.

یەکەم کار کە سوڵتان لەم بوارەدا ئەنجامیدا، ئەوبوو هەستا بە بوژاندنەوەی ئەو قوتابخانە سەربازییانەی کە سەلیمی سێیەم دایمەزراند بوو، بۆ ئەوەی بتوانێت سوپایەکی تازەیان لێ پێك بهێنێت[٥١]، لە چوار چێوەی ئەو کارەشدا سوڵتان مەحمود یەك لەدڵسۆزانی خۆی بەناوی حسەین پاشا کەبە(حسینە رەش)ناسرابوو، وە ئەندامێکی کۆنی یەنیچەرەکان بوو، هەڵیبژارد بۆ سەرپەرشتیکردنی ئەو هێزەی کە لە بەشە ئاسیاییەکەی ئەو بەر بسفۆربوو، ئەم کەسایەتییە ئامادەبوو بۆ جێبەجێکردنی هەر فرمانێکی سوڵتان.[٥٢]

سوڵتان مەحمود بۆ ئەوەی شەرعیەت بدات بە کارە چاکسازییەکانی لە بواری سەربازی، هەوڵیدا [illegible]رای گشتی زانایانی ئایینی بەدەست بهێنێت و لەم مەبەستەشیدا سەرکەوتووبوو ئەوەبوو (موفتی)ی دەوڵەت فتوای دا کە ئەو چاکسازییانەی سوڵتان دەیەوێت ئەنجامی بدات لەم بوارەدا لەگەڵ شەریعەتی

پیرۆزی ئیسلام دەگونجێت و پێویستە لەسەر هەموو کەسێك پشتگیری لێبکات.[٥٣]

سوڵتان مەحمود لە سەرەتای ساڵی ١٨٢٦، بە ئامادەبوونی سەرۆك وەزیران و زۆربەی کاربەدەستە باڵاکانی دەوڵەت و زانایانی ئاینی، ژمارەیەك لە ئەفسەرانی یەنیچەری بانگهێشت کرد ئەنجومەنێکی لێ دروست کردن، و پرۆژەی چاکسازیکردنی سوپای خستە بەردەمیان، پرۆژەکەش ئەوەبوو سێ یەکی یەنیچەرییەکان هەڵبژێرن بۆ ئەوەی بە درێژایی سنوورەکانی رۆژئاوای دەوڵەت مەشقیان پێبکرێت لە سەر شێوازی تازە و هەروەها جل و بەرگی تایبەتیشیان لەبەر بکرێت، پرۆژەکەش پێی دادەگرت لەسەر نەهێشتنی دیاردەکانی بەرتیلکاری لەسوپادا، ئەنجومەنەکەش بەتەواوی ئەم پرۆژەی قەبوڵ کرد، ئەوەبوو دەستکرا بە پێکهێنانی ئەو هێزە تازەیە بە پاڵپشتی سوپای ئەنادۆڵ کە لەکەناری رۆژهەڵاتی بسفۆر دابوو، ئەم هێزەش ناوی لێنرابوو(موعەللەم ئەشکینجی)واتە(پاسەوانی مەشقپێکراو) سوڵتان مەحمود لە مەشق پێکردنی ئەم سوپا نوێیەدا بەو راهێنەرانە بەستبوو کە (محەمەد عەلی) پاشای والی میسر بۆی ناردبوو.[٥٤]

یەنیچەرییەکان کە لە دوارۆژی خۆیان دەترسان کەوتنەخۆو لە رۆژی ١٨٢٦/٦/١٥ لە گۆڕپانی(ئات مەیدان)* کۆبوونەو و دەستیان کرد بە ئاژاوە نانەوە دژی چاکسازییە تازەکان و قاپی خواردنەکانیان سەرەو نخون کرد ئەوەش مانای ئەوەبوو کە ئامادەنین خواردنی سوڵتان بخۆن، نیشانەی تورەیی و هەڵگەڕانەوەیان بوو، و دەستیان کرد بە تاڵان کردنی ماڵەکانی دەوروبەریان، سەرەتا سوڵتان پێی راگەیاندن ئەگەر بڵاوە بکەن لێیان خۆش

دەبێت، بەلاّم یەنیچەرەکان گوێیان نەدا بەداواکەی سولّتان و ویستیان هێرش بکەنە سەر بارەگای(بابا عالی)، بۆیە سولّتان خۆی ئامادەکرد بۆ لە ناوبردنیان، ئەوەبوو بۆ رۆژی دواتر سولّتان بەخۆی و هێزێکەوە و زۆرێك لە زانایانی ئاینی و قوتابیانی قوتابخانەکان و خەلّکێکی زۆر بەرەو شوێنی یاخی بووان رۆیشتن و فەرمانیشی به (حسینە رەش) بەخۆی و هێزەکەیەوە لە بسفۆر بپەڕنەوە بۆ ئەسته ، ئەویش زۆر بەتوندی بەپالّپشتی تۆبخانە هێرشی کردە سەریان ... ز گەلەکانیانی بەسەردا روخاند و لەماوەی چەند کاتژمێرێکدا تەفرو توناکران، و بەم شێوەیە دەولّەت رزگاری بوو لەم کۆسپە ناوخۆییە[٥٥] ئەم رووداوەش لە مێژووی دەولّەتی عوسمنیدا ناوی لێنراوه(رووداوی پیرۆز)[٥٦]، هەندێ لە سەرچاوەکان ژمارەی یەنیچەرییە کوژراوەکان لەم رۆژەدا بەبیست هەزار کەس دەخەملّێنن[٥٧]، بەلاّم لەراستیدا ئەم ژمارەیە زیادەڕۆیی تیاداکراوە، هەروەك لە راپۆرتی سەفیری ئەو کاتەی بەریتانیا لە ئەستانەدا هاتووە، کە ژمارەی ئەو کوژراوانە شەش هەزار کەس بووە.[٥٨]

بۆ رۆژی دواتر فەرمانی رەسمی سولّتان دەرچوو بۆ هەلّوەشانەوەی سوپای یەنیچەری، و ئالاّکانیان داگیرانە خوارەوەو جل و بەرگە تایبتی یەکانیان قەدەغەکراو قاوەخانەکانیان کەلێی کۆدەبوونەوە روخێنران و فەرمانەکەش بەهەموو ویلایەتەکانی عوسمانی بلاّوکرایەوە و داواکرا لە هەرکوێیەك یەنیچەری لێبێت لەسێدارە بدرێت یان دووربخرێتەوە لە ولاّت، بەم شێوەیە یەنیچەرییەکان چەند هەزار کەسێکی تریشیان لێ کوژرا لە شوێنە جیاجیاکاندا[٥٩]، هەروەها سولّتان فەرمانی دەرکرد بە هەلّوەشاندنەوەی

هەردوو تەریقەتی سۆفیگەرێتی بەکتاشی و مەولەوی، و داخستنی تەکییەکانیان و سێ کەسیش لە گەورەکانیان لە سێدارەدرا، ئەویش بەهۆی پەیوەندی پتەوی ئەم دوو تەریقەتە بە سوپای یەنیچەرییەوە[٦٠]، هەر لە نرێژەی ئەو هەنگاوانەشدا سولتان فەرمانی هەلوەشاندنەوەی تیپەکانی کوڵبەران و ئاگر کوژێنەوەکانیدا کە پەیوەست بوون بەسوپای یەنیچەرییەوە[٦١]، و هەموو یەکە سەربازییە دەرەبەگییەکانی دەرکرد.[٦٢]

سولتان راستەوخۆ پاش لە ناوبردنی یەنیچەرییەکان دەستیکرد بە رێکخستنەوەی سوپا، بۆ ئەم مەبەستەش لێژنەیەکی بۆ رێکخستنی کاروباری سوپا پێك هێنا، وە بەسەرپەرشتی ئەو لێژنەیەش سوپایەکی نوێ لەسەر شێوازی سوپای ئەوروپییەکان پێکهێناو ناویان نا(عەساکیری مەنسوری محەمەدی)واتە(سوپای محەمەدی سەرکەوتوو)، و حسینەرەشی هەلبژارد بە (سەر عەسکەر) واتە سەرکردەی ئەو سوپا نوێیە[٦٣]، لە ماوەیەکی کەمدا ژمارەی ئەم سوپا نوێیە زیادی کردو گەیشتە (٢٧٠٠٠) سەرباز[٦٤]، (١٢٠٠)ی لە پایتەخت و ئەوی کەشی لە ویلایەتەکانی تر[٦٥]، تەنانەت هەندێ سەرچاوە دەلێن ژمارەی ئەو سوپایە لە سالەکانی کۆتایی فەرمانرەوایی سولتان مەحمود گەشتووەتە(٧٠٠٠٠)سەرباز.[٦٦]

سولتان مەحمود پاش ئەوەی کە داواکارییەکەی لە لایەن محەمەد علی پاشا والی میسر رەت کرایەوە، کە راهێنەری بۆ بنێرێت بۆ مەشق کردنی ئەم سوپایە، رووی کردە ولاتانی ئەوروپی بۆ پەیداکردنی راهێنەری سەربازی، ئەوەبوو بروسیا چەند ئەفسەرێکی شارەزای بۆ نارد، لەوانە(ڤۆن مۆلتکە)* کە رۆلی بەرچاوی هەبوو لە رێکخستنی سوپای عوسمانی، ڤۆن مولتکە و

هاوڕێکانی خزمەتی باشیان کرد بە سوپای عوسمانی بەتایبەتی لە رووی نەخشەکێشان و قایم کردنی سەربازگە و قەڵاکان و تازەکردنەوەی کارگەکان و مەشق پێکردنی ئەفسەرانی عوسمانی بە چەکی تازە، و چەندین کاری تریش.[٦٧]

لە درێژەی کارەکانیدا سوڵتان مەحمود هەستا بە دامەزراندنی چەند قوتابخانەیەکی سەربازی، لەوانە قوتابخانەی ئەندازیاری سەربازی و قوتابخانەی ئەندازیاری دەریایی لە ساڵی ١٨٢٨، لە سەرەتای سییەکانیشد قوتابخانەی مۆسیقای سەربازی(موزیکی هومایون)ی دامەزراند[٦٨]، هەروەها چەند قوتابخانەیەکی لە سەر شێوازی ئەو قوتابخانانەی کە ناپلیۆنی یەکەم لە فەرەنسا دایمەزراندبوو، بەسەر پەرشتی پسپۆرە فەرەنسیەکان دامەزراند. لەگەڵ قوتابخانەیەکی پزیشکی سەربازی، دەرچووی هەندێ لەو قوتابخانانەی نارد بۆ پایتەختە ئەوروپییەکان بۆ فێربوون و وەرگرتنی زانستی سەربازی نوێ.[٦٩]

سوڵتان مەحمود لەسەر پێشنیاری(مولتکە)، سەرۆکی پاسەوانان و بەرپرسی تۆپخانەی خستە ژێر چاودێری وەزیری جەنگەوە، کە تائەو کاتە هەریەك لە بەرپرسی ئەو دوو پۆستە هەمان ئاستی وەزیری جەنگیان هەبوو، کە ئەوەش هەندێ جار وای دەکرد هاوکاری کردن لە نێوانیاندا زەحمەت بێت.[٧٠]

چاکسازییەکان بواری کەشتیگەل و هێزی دەریایشی گرتەوە، ریکخستن و بەهێزکردنی کەشتیگەلی عوسمانی لەلایەن وەستای کەشتی دروستکەری ئەمریکی و پسپۆرە دەریاییە بەریتانیاییەکان ئەنجام درا.[٧١]

دەوڵەتی عوسمانی بەهۆی سوپای نوێوە، توانی ناوچە و ویلایەتەکانی ببەستێتەوە بەیەکتر، بە شێوەیەك کە دەوڵەت دابەش کرابوو بۆ حەوت بنکەی سەربازی و هەریەك لەم بنکانە سوپایەکی تایبەتی بۆ دانرابوو، کەلەلایەن سەرکردەی گشتی سوپاوە چاودێری دەکرا.(٧٢)

دووەم

## چاکسازییە کارگێڕییەکان

چاکسازییەکانی ئەم بوارە، بە پلەی دووەم دێت لە ریزی پرۆژە چاکسازییەکەی سوڵتان مەحمود لە دەوڵەتی عوسمانیدا، بە لەناو بردنی سوپای یەنیچەری، کە هۆکارێکی سەرەکی گەندەڵ بوونی دام و دەزگاکانی دەوڵەت بوو، ریگا والأبوو بۆ سوڵتان کە هەڵستێت بە رێکخستنەوەی کاروباری دەوڵەتەکەی.

سوڵتان مەحمود هەوڵیدا دام و دەزگاکانی دەوڵەت بەهێز بکات، لەم رووەوە دەستی کرد بە هەڵوەشاندنەوەی ژمارەیەکی زۆر لەو پلەو پۆستە حکومییانەی کە تەنها بۆ ناو شۆرەت بوو ، وە ئەرك و ئیشی کاربەدەستانی دەوروبەری خۆی رێکخست و ئەو نازناوەشی لابرد کە خاوەنەکەی کارو فرمانی دیاریکراوی نەبوو، سوڵتانیش خۆی بەچاکی ئامادەی دانیشتنەکانی دیوانی دەوڵەت دەبوو، بەم کارەش ئەو نەرێتە عوسمانییەی زیندوو کردەوە کە لە پاش سوڵتان سلێمانی قانونییەوە پشتگوێ خرابوو.(٧٣)

بەبڕیاری سوڵتان مەحمود لە ساڵی ١٨٣١ یەکەم سەرژمێری گشتی دانیشتوان ئەنجام دراو پێوانەی رووبەری زەوییەکانی دەوڵەت کرا،

بەمەبەستی رێکخستنی کاروباری سەربازی و دیاریکردنی باجەکان، سیستەمێکی پشکنینی تەندروستیش هێنرایە کایەوە تا بتوانێ بەرەنگاری نەخۆشییەکان بێتەوە، بەتایبەتی نەخۆشی تاعون کە لەساڵی ١٨١٢ ژمارەیەکی زۆری لە دانیشتوانی ئەستانەی لە ناوبرد.[٧٤]

سوڵتان مەحمود کاروباری ئەوقافی خستە ژێر چاودێری خۆی، کە پێشتر لە ژێر چاودێری موفتی وڵات و زانایانی ئایینی بوو، بۆ رێکخستنی کاروباری ئاینیش بەڕێوەبەرایەتیەك (لە دواییدا بوو بە وەزارەت) ی دامەزراند بۆ ئەوقاف، و دەسکەوت و دەرامەتی ئەوقافیش کەوتە ژێر چاودێری دەوڵەت، لە راستیدا ئەو هەنگاوەش لێدانێکی توندبوو لە زانایانی ئاینی درا، بەشێوەیەك نەتوانن رکابەرایەتی دەسەلاتی دەوڵەت بکەن.[٧٥]

سوڵتان مەحمود ئەنجومەنی وەزیرانی لەسەر شێوازی ئەنجومەنی وەزیرانی ئەوروپی دامەزراند و چەند وەزارەتێکی تازەش هاتەکایەوە، وەك وەزارەتی دارایی و وەزارەتی جەنگ[٧٦]، پۆستە حکومییەکانیش لە ساڵانی دواتر گۆڕانکارییان بەسەرداهات، ئەوەبوو لە ساڵی ١٨٣٧ نازناوی(صدر الاعظم) لابراو و دەسەلاتەکەشی درابەو کەسەی کە پێیان دەوت(باش وەکیل) واتە وەزیری یەکەم، کە هاوتای(سەرۆك وەزیران) بوو، لە هەمان کاتدا ئەو کەسە وەزارەتی ناوخۆشی لە دەستدابوو.[٧٧]

لە ساڵی ١٨٣٤ دەوڵەتی عوسمانی سەفارەتەکانی خۆی کردەوە لە پایتەختە ئەوروپیەکان، کە پاش لابردنی سوڵتان سەلیمی سێیەم داخرابوون، لەو سەفارەتانەشدا کەسانێك پەروەردەبوون کە لەدوارۆژدا رۆڵی زۆریان لە

بزووتنەوەی چاکسازی عوسمانیدا بینی [٧٨]، هەر لەو سەردەمەشدا ئیشو کاری پۆستەخانە رێکخرا.[٧٩]

لە بواری دادگەریشدا سوڵتان مەحمود جێ پەنجەی دیارە، ئەوە بوو لەساڵی ١٨٣٨(ئەنجومەنی باڵای دادگەری)دامەزرا کە پێی دەوترا(مەجلیس عالی ئەحکام عەدلیە)کە بەر پرس بوو لە لێکۆڵینەوەو دانانی بەرنامە بۆ بابەتە سەرەکیەکانی بواری دادگەریی[٨٠] ئەوەشمان بیر نەچێت کە سوڵتان هەڵدەستا بەگەڕان بە ویلایەتەکاندا بۆ لێکۆڵینەوە لە ژیان و گوزەرانی خەڵك، بە تایبەتیش بۆ ئاگاداربوون لە چۆنیەتی شێوازی مامەڵەکردنی کاربەدەستان لەگەڵ مەسیحییەکان، و زۆریش جەختی لەسەر جێبەجێکردنی دادپەروەری دەکردەوە لەگەڵ دانیشتوان بەتایبەتی کەمایەتیە ئاینیەکان.[٨١]

سوڵتان مەحمود زۆر بەوردی چاودێری ئیش و کاری فەرمانبەرەکانی دەوڵەتی دەکرد و هەوڵی زۆریشی دەدا بۆ نەهێشتنی بەرتیل کاری و کۆنەکردنەوەی باجی زیادە لە خەڵك، و لەساڵی ١٨٣٨موچەی دیاریکراویشی بۆ کاربەدەستانی دەوڵەت بڕییەوە، کەپێش ئەو مێژووە بەشی خۆیان هەندێ جار لە خەڵك و هەندێ جاریش لە کاربەدەستانی سەرووی خۆیان وەردەگرت[٨٢] هەروەها سوڵتان فەرمانی دەرکرد بۆ کارمەندانی دەوڵەت کە شەرواڵی ئەورووپیانە(پانتۆڵ)و چاکەتی درێژی رەشی سەرانسەر قۆپچەدار کە بە(ئەستەمبوڵی)بە نێوبانگ بوو لەبەر بکەن، پێڵاوی رەش لە پێبکەن و (تەربوش)یش، کە لەساڵی ١٨٢٧لە رێگای ئەفسەری دەریاوان (قوبتان)خەسرەو محەمەد پاشا هێنرابوویە دەوڵەتی عوسمانی – لەجیاتی مێزەر لەسەر بکەن، سوڵتان خۆیشی ئەو فرمانەی دەری کردبوو،

جێبەجێكرد، و پاشانیش وەزیرو كارمەند و زۆر لە ئەفسەرەكانیش لاسایی سوڵتانیان كردەوە، تا لە ساڵی ١٨٢٩ كە بەپێی بڕیارێكی رەسمی دەبوایە سەربازو كارمەنە مەدەنییەكان لە جیاتی مێزەرو جل و بەرگی میللی، تەربوش و جل و بەرگی ئەوروپی بپۆشن، ئەم بڕیارە تەنها پیاوە ئاینی و كارمەندانی بواری ئاینە جیاوازەكانی نەدەگرتەوە[٨٣]، هەروەها وێنەی سوڵتان محمود كێشراو بڵاو كرایەوەو لە بنكەو فەرمانگەكانی دەوڵەتدا هەڵواسرا، لەم كاتە بەدواوە هەڵواسینی وێنەی سوڵتانەكانی عوسمانی لە فەرمانگەكانی دەوڵەتدا بوو بەنەریتێكی باو.[٨٤]

لەدیارترین و گرنگترین چاكسازییەكانی سوڵتان مەحمود لە بواری كارگێڕیدا، گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی ناوەندی دەوڵەت بوو، بۆ ویلایەتەكان، لە بەشی یەكەمی باسەكەماندا باسی بارودۆخی ناوخۆی دەوڵەتی عوسمانیمان كرد، كە چۆن دەسەڵاتی ناوەندی دەوڵەت لاواز ببوو، تا ئەوڕادەیەی لەزۆر جێگادا تەنها بە رواڵەت هەستی پێدەكرا، بۆیە سوڵتان بڕیاریدا بە لەناوبردنی دەسەڵاتە خۆجێیەكان و گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی ناوەندی دەوڵەتی بۆ ئەو ناوچانە و لەم پێناوەشدا زۆر رێگای گرتە بەر و توندو تیژیشی بەرامبەر ئەو كەسانە بەكارهێنا كە دژی پرۆژەكە بوون.

سوڵتان مەحمود هەر لەسەرەتاوە بە نیازبوو دەسەڵاتی دەوڵەت بگەڕێنێتەوە بۆ ناوچە دابراوەكان بەڵام بەهۆی ئاژاوەو گرفتی یەنیچەریەكان، لە سنوورێكی تەسكدا نەبێت نەیتوانی ئەم مەبەستە بەئەنجام بگەیەنێت، لە ساڵی ١٨٢٢ دەوڵەتی عوسمانی توانی دەست بەسەر ناوچەكانی سەرووی ئەلبانیادا بگرێتەوە كە لەژێر دەستی عەلی پاشادا بوو[٨٥]، سەركوت كردنی

-دەسەلأتی وەهابیەکان و میرەکانی سعودیش لە نیمچەدوورگەی عەرەبی لە ڕێگای محەمەد عەلی پاشای والی میسر، لەساڵی ١٨١٨دیسانەوە دەچێتە ڕیزی هەوڵەکانی سوڵتان مەحمود، لەپێناو سەپاندنی دەسەلأتی ناوەندی دەوڵەت بەسەر ناوچە دابڕاوەکاندا.

- پاش لەناوبردنی سوپای یەنیچەری لە ساڵی ١٨٢٦، سوڵتان مەحمود بە گروتینێکی زیاترەوە دەستی کرد بەلەناوبردنی دەسەلأتە خۆجێییە سەربەخۆکان، سەرەتاش لە عیراقەوە دەستی پێکرد، بەم شێوەیە دەسەلأتی(مەمالیکەکان)لە بەغدا لە ساڵی ١٨٣١، دەسەلأتی بنەماڵەی جەلیلی یەکان لە موصلّ لە ساڵی ١٨٣٤، پاشانیش لە ناوبردنی میرنشینە کوردییەکان، دیارترینیشیان میرنشینی سۆران بوو لە ساڵی ١٨٣٦، سوڵتان ئەم پەیڕەوەی لە ناوچە دوورەکانیش پەیڕەو کرد، ئەوەبوو توانی لە ساڵی ١٨٣٥ فەرمانڕەوایی بنەماڵەی قەرامنلی لە تەرابلوسی ڕۆژئاوا کۆتایی پێبهێنێت.(٨٦)

لە بەرامبەر ئەو هەوڵە سەرکەوتوانەدا سوڵتان مەحمود لە سەپاندنی دەسەلأتی ناوەندی بەسەر هەندی ناوچەدا، شکستی هێنا، بەتایبەتی لە گێڕانەوەی میسر بۆ ژێر دەسەلأتی ڕاستەوخۆی دەوڵەت، سوڵتان نەك تەنها سەرکەوتوو نەبوو لەو مەبەستەدا، بەڵکو تووشی چەندین شکستی ئابڕوبەرانش بووەوە لەبەرامبەر محەمەد پاشای والی میسر، هەروەها (یۆنانیەکانیش) پاش شەڕو شۆڕێکی زۆر، لە ساڵی ١٨٢٩ لە دەوڵەتی عوسمانی جیابوونەوەو سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیاند.

لە درێژەی رێکخستنی کاروباری ویلایەتەکان، سوڵتان مەحمود هەستا بەکەم کردنەوەی دەسەلاتی والیەکان و دەسەلاتی جێبەجێکردنی لە سێدارەدانی لەسەر سنوردارکردن، کە بێ رەزامەندی سوڵتان و بەپێی برگەیەکی یاسایی نەبێت بۆیان نییە ئەو کارە ئەنجام بدەن[٨٧]، هەروەها لەدرێژەی کارەکانی راهێنان و ئامادەکردنی فەرمانبەرانی بە توانا بوو، بە تایبەتی لە گەنجان، کە فێری زمانە ئەوروپییەکان و شێوازی نوێی بەڕێوەبردن دەکران. سوڵتان(ئەنجومەنی ویلایەتەکان)یشی دامەزراند، ئەو ئەنجومەنانە موسڵمان و مەسیحی لە خۆ دەگرت، و ئەرکەکانیش ووتوێژکردن بوو لەسەر بابەتە مەدەنی و دارایی و دادگەرییەکان، پێویست بوو لەسەر والیش رەزامەندی ئەم ئەنجومەنە بەدەست بهێنێت بۆ کاروکردەوەکانی، ئەمەش هەوڵدانێکی سوڵتان مەحمود بوو بۆ بەستنەوەی ویلایەتەکان بەدەسەلاتی ناوەندی و زیاتر چاودێریکردنی کاربەدەستان[٨٨]، لەساڵی ١٨٣٧یشدا لیژنەیەکی هەمیشەیی دامەزراند، ئەرکی لیژنەکەش دانانی نەخشەو پلانە گشتییەکانی چاکسازیکردن بوو.[٨٩]

سێ یەم

## چاکسازییە ئابوورییەکان

سەرەتای کارەکانی سوڵتان لەم بوارەدا ئەوەبوو، هەستا بەنەهێشتنی دادگا - نووسینگەی دەست بەسەرداگرتن* و لە جیاتی ئەوەش بڕیارێکی نوێی دەرکرد، کە تیایدا هاتبوو( لە ئەمڕۆ بەدواوە نابێت دەوڵەت ببێت بە ب. لەسەر شانی خەڵك و لەمەو پاش دەوڵەت دەست وەرنادات لە ماڵ و سامانی

خەڵك و دەست بەسەر سامانی هیچ کەسێکدا ناگرێت[٩٠]، هەرچەندە هەڵوەشاندنەوەی نووسینگەی دەست بەسەرداگرتن بووە هۆی کەمکردنەوەی دەرامەتی گشتی، بەڵام ئەو بڕیارە دڵنیایی زیاتری بەخشی بە کارمەندان لەسەر ماڵ و سامانیان، وبەڕێوەبردنی ئیش و کارە گشتییەکانی ئاسانتر کرد.[٩١]

سوڵتان دەرامەتی (ئەوقافی) خستە ژێر چاودێری دەوڵەت، کە پێشتر دەرامەتەکە بۆ هەندێ مەبەستی لاوەکی بەکاردەهێنرا، و زۆر لەو موڵك و زەوی و زارانەی دەرەبەگ و خاوەن دەسەڵاتەکان دەستیان بەسەرداگرتبوو، گەڕاندییەوە بۆ موڵکدارێتی گشتی، بەو هەنگاوانە تا رادەیەکی باش دەرامەتی دەوڵەت زیادی کرد، لە ساڵی ١٨٣٤یشدا بەپێی بڕیاری رەسمی دەوڵەت هەموو ئەو باجانە هەڵوەشێنرایەوە کە کاربەدەستان لەکاتی تێپەڕ بوونیان بە ویلایەتەکاندا لە دانیشتوانیان وەردەگرت، و وەرگرتنی باجەکانیشی پێش هاتنی کاتی خۆی قەدەغە کرد، و ئەو شێوازەشی لە کۆکردنەوەی(جزیە)دا پەیڕەو دەکرا لابراو کۆکردنەوەشی درایە دەست لیژنەیەکی تایبەت کە لەقازی و کاربەدەستە موسڵمانەکان و سەرانی ئاینە ئاسمانیەکانی تر(أهل الکتاب)(أهل الذمة) پێك دەهات[٩٢]، هەروەها سوڵتان پارەی تازەی دەرکرد[٩٣]، و هەوڵی زۆریدا بۆ نەهێشتنی بەرتیل کاری، و موچەی فەرمانبەرانی رێکخست و زیادیشی کرد.[٩٤]

سوڵتان مەحمود گرنگی زۆریدا بەدروست کردنی رێگاو بان، و زۆر رێگای تازەی کردەوەو لە سەردەمی ئەودا چەندین پردیش دروست کرا، بەتایبەتی بۆ بەستنەوەی گەڕەکەکانی ئەستەنبوڵ بەیەکترەوە، و ژمارەیەکی زۆر

کەشتیش کەنزیکەی سەد دانە دەبوو دروست کران، و رووباری (دانوب) یشی بۆ کەشتیوانی و کاری بازرگانی کردەوە[٩٥]، لە ئەوروپاش چەند جۆرێك کەل و پەل و شمەکی پێویست هێنراو چەند کارگەیەکیش دامەزرا، وەك کارگەی رستن و چنین کە جل و بەرگی سەربازانی ئامادەدەکرد.[٩٦]

چوارەم

## چاکسازییەکانی بواری رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی

وەك لە بەشی یەکەمدا باسمان کرد، دەوڵەتی عوسمانی لە بواری زانست و رۆشنبیریدا لە ئاستێکی نزمدا بوو، بەرنامەو پرۆگرامەکانی خوێندن دواکەوتووبوو، لە ئاستێکدا نەبوو بگونجێت لەگەڵ پێداویستییەکانی سەردەمدا، خوێندن لە قوتابخانەکاندا لەسەر شێوازێکی کۆن دەرۆیشت، و بوارە زانستیەکانی تێدا پشت گوێ خرابوو، ئەمە لەکاتێکدا کە ئەوروپا رۆژ بە رۆژ لە پێشکەوتن دابوو، بۆیە پێویستی دەکرد، چاکسازییەکانی سوڵتان ئەم لایەنەش بە چاکی بگرێتەوە.

سوڵتان مەحمود گرنگییەکی تەواوی بە بواری خوێندندا، گرنگی دانیشتنی بەم بوارە لەسەر شێوازی هەرەمەکی سەرەو نخون دابوو، واتە گرنگی دان بەئاستی سەرەوە پێش خوارەوە ئەمەش بۆ خۆ بە دوورگرتن لەناڕەزایی زانایانی ئایینی، واتە سوڵتان راستەوخۆ لە دەرچووی حوجرەکانەوە دەستی پێ نەکرد، تەنها ئەو قوتابیانەی حوجرەکانی هەڵدەبژارد کە ئارەزووی خوێندنی ئاینیان نەبوو، دوو قوتابخانەی تایبەت بۆ ئەو قوتابیانە دامەزراند، لەم دوو قوتابخانەیەدا بنچینەکانی زمانەوانی و مێژوو و بیرکاری دەوترایەوە

بەوکەسانەی کە ئارەزووی پەیوەندیکردنیان هەبوو بە پەیمانگە هونەرییە سەربازییەکانەوە، ئەو قوتابیانەش کە ئارەزووی پەیوەندیکردنیان بە دامودەزگاکانی حکومەتەوە هەبوو، قوتابخانەی(عەدلیە)و قوتابخانەی (ئەدەبیات)یان بۆ دامەزراندن، کە فێرکردنی زمانی عەرەبی و فەڕەنسی، و جوگرافیا و مێژوو وبیرکاری و زانستە سیاسییەکانی تێدا دەوتراویەوە، هەروەها قوتابخانەی(عیرفانیە)ش لە(باب العالی)کرایەوە بۆ فێرکردنی ئەو کارمەندانەی کە ئارەزوویان هەبوو لەدوارۆژدا پلە بەرزەکارگێڕییەکان بگرنە دەست. لە بەرامبەر ئەم گرنگی دانە زۆرە بە خوێندن لەسەر ئەم شێوازە نوێیە و کردنەوەی ئەو هەمووە قوتابخانە دەوڵەتییانە کە کاریگەریی ڕۆژئاوای پێوە دیاربوو، کەچی دامەزراوە ئایینیەکان دوور لە چاکسازیکردن مانەوە.[٩٧]

سوڵتان مەحمود چەندین قوتابخانەی سەرەتایی و ئامادەیی تازەی دامەزراند، خوێندنی لە قوتابخانە سەرەتاییەکان کردە زۆرە ملێ[٩٨] بە مەبەستی گەشەپێدان و فراوانکردنی پەیمانگا هونەرییە باڵاکان، زیاد لەسەد قوتابی نارد بۆ وڵاتە ئەوروپییەکان بۆ خوێندن، بۆ ئەوەی لە دوارۆژدا مامۆستای بەتوانایان لێ دەربچێت و لە قوتابخانەکانی دەوڵەتدا وانە بڵێنەوە، بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی سەربازیش چەند قوتابخانەیەکی سەربازی دامەزراند، هەروەك لە بابەتی چاکسازییە سەربازییەکاندا باسمان کرد، و لەسەردەمی سوڵتان مەحمودیشدا یەکەم ڕۆژنامەی ڕەسمی حکومەت دەرچوو لەساڵی ١٨٣١ بەناوی (تقویم وقائع).[٩٩]

سوڵتان مەحمود گرنگییەكی زۆری دەدا بەفێربوونی زمانە ئەوروپییەكان و هانی كاربەدەستانی دەوڵەتیشی دەدا لەم رووەوە، هەتا سەردەمی سوڵتان دەوڵەتی عوسمانی لە پەیوەنییە دەرەكییەكانی لەگەڵ وڵاتە ئەوروپییەكان پشتی بەسەفارەتە بیانیەكان دەبەست كە لەئەستانە بوو، ووتوێژ و پەیوەندییەكانیش لە رێگەی وەرگێڕە مەسیحییەكان دەبەست كە لەسەفارەتەكان و(باب العالی)دابوون، ئەو كەسانەش زیاتر یۆنانییە رۆشنبیرەكان بوون كە لە(باب العالی)كاریان دەكرد، بەڵام پاش هەڵگیرسانی شۆڕشی یۆنان لەساڵی ١٨٢١، بەباش زانرا كە موسڵمان لە جیاتیاندا دابنرێت.[١٠٠]

لە ساڵی ١٨٣٤سوڵتان مەحمود(تەرجەمە ئودەسی)واتە(نووسینگەی وەرگێڕان)ی دامەزراند، كە لەپاشدا بوو بە وەزارەتی دەرەوە، لەم نووسینگەیەدا ژمارەیەكی زۆر لە ناودارانی دەوڵەتی عوسمانی دەرچوون، وەك عالی پاشا و فواد پاشا و نامیق كەمال بەگ و چەندانی تریش، كە لە پاشەڕۆژدا دەوری زۆریان بینی لە پرۆژەی چاكسازیكردنی عوسمانیدا.[١٠١]

سوڵتان مەحمود بەمەبەستی زیادكردنی هۆشیاری دانیشتوان لە رووی تەندروستییەوە، فرمانی دا بەبڵاوكردنەوەی رێنمایی بەسەر خەڵكدا، كە باسی نەخۆشییە باوەكان و چۆنیەتی خۆپاراستن لێیانی تێدا روون كرابوویەوە.[١٠٢]

چاكسازییەكانی سوڵتان مەحمود لەبوارە جیاجیاكاندا، گۆڕانكاری كۆمەڵایەتی لە كۆمەڵگای عوسمانیدا هێناكایەوە، لەناوبردنی یەنیچەرییەكان و نەهێشتنی زۆرێك لە دیاردەكانی گەندەڵی كارگێڕی و هەنگاوەكانی دیكە.

تارادەیەك ژیان و گوزەرانی خەڵکی باشتر کرد، هەروەها کرداری وەرگرتن لە ڕۆژئاوا، کۆمەڵگای عوسمانی بەرەو کرانەوە و ژیانی هاوچەرخانە برد، کاریگەری شارستانییەتی ڕۆژئاوا لەسەر خودی سوڵتان مەحمود بەئاشکرا ڕەنگی دابووەوە، سوڵتان ریشی کورت دەکردەوە و شەرواڵی ئەوروپیانە(پانتۆڵ)ی لە بەر دەکرد و تەربوشی لەسەر دەکرد، لاسایی کردنەوەی سوڵتان لە جل و بەرگدا وەزیر و کارمەندو زۆرێك لە ئەفسەرەکانیشی گرتەوە[١٠٣]، دانیشتوانی ئەستانەش بەرێژەیەکی زۆر وازیان لە جل و بەرگی نیشتمانی هێناو جل و بەرگی تازە مۆدیلیان پۆشی.[١٠٤]

یەکەم

## دەرەنجام و کاریگەری چاکسازییەکانی سوڵتان مەحمود

کاریگەری چاکسازییەکانی سوڵتان مەحمود بەهەمان ریز بەندی باس کردنی چاکسازییەکان، باس دەکەین، کە لەبەشی دووەمدا ئاماژەمان پێکرد. بە شێوەیەکی گشتی چاکسازییەکانی سوڵتان مەحمود ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو لە بەهێزکردنی دەوڵەتی عوسمانی و توانایەکی زیاتری پێبەخشی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی لە ناوبردنی سوپای یەنیچەری قازانج و سوودی زۆری لێبینرا، دانیشتوان لەستەم و زۆری ئەم تاقمە رزگاریان بوو، یەنیچەرییەکان دەستیشیان زۆر لە کاروباری وڵات وەردەداو سوڵتان و سەرۆك وەزیران و کاربەدەستی باڵای دەوڵەتیان لادەدا، تەنانەت زۆرێك لەوانەش بوونە قوربانی ئارەزووەکانی ئەو تاقمە، بەلەناوبردنیان ئەو

مەترسیانە نەما، هەروەها بە لەناوبردنیشیان تا رادەیەك باری ئابووری دەوڵەت بەرەو باشتر رۆیشت، چونکە هەروەك لە پێشەوە باسمان کرد یەنیچەرییەکان سەروەت و سامانێکی زۆری دەوڵەتیان بەفیڕۆدەدا، سوپای نوێش کە سوڵتان پاش لەناوبردنی یەنیچەرییەکان دایمەزراند بەشێوەیەکی ئەکادیمی رێکخرا، ئەگەر کێشە زۆرە جۆر بە جۆرەکانیش نەبوایە ئەو هێزە نوێیە دەیتوانی خزمەتی زیاتری دەوڵەت بکات.

هەوڵەکانی سوڵتان مەحمود بۆ رێکخستنی کاروباری کارگێڕی دەوڵەت تارادەیەکی باش سەرکەوتوو بوو، دام و دەزگاکانی دەوڵەت رێکخران و زۆرێك لە دیاردەکانی گەندەڵی کارگێڕی قەلاچۆکرا، گۆڕانکارییەکانی ئەم بوارەش کە سوڵتان لە پلەو پایە بەرزەکانی دەوڵەت ئەنجامیدا، وەك دامەزراندنی ئەنجومەنی وەزیران لەسەر شێوازی ئەنجومەنی وەزیرانی ئەورووپی، کاریگەرییان هەبوو لەسەر دواڕۆژی دەسەلاتداریتی لە دەوڵەتی عوسمانیدا، لەسەردەمی سوڵتاندا دەسەلاتی(باب العالی)زیادی کرد، بەتێپەڕ بوونی کات ململانێ لە نێوان دەسەلاتی سوڵتان و کارمەندە بالاکانی دەوڵەت، سوڵتان دەیویست دەسەلاتێکی رەهای هەبێت، لەو لاشەوە کارمەندە بالاکان دەیانویست دەسەلاتی سوڵتان سنوردار بکەن بە هەندێ یاسا، ئەو ململانێیەش لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا بەتەواوی دەرکەوت،(١٠٥) هەروەها رێکخستنەکانی سوڵتان لە بواری کاگێڕیدا دیوانسالاری پەرەپێدا، بەتایبەتی لە رووی چەندایەتییەوە، کەساڵ بەساڵ ژمارەی کارمەندانی دیوانی حکومەت زیادی دەکرد.(١٠٦)

مەترسیانە نەما، هەروەها بە لەناوبردنیشیان تا رادەیەك باری ئابووری دەوڵەت بەرەو باشتر رۆیشت، چونکە هەروەك لە پێشەوە باسمان کرد یەنیچەرییەکان سەروەت و سامانێکی زۆری دەوڵەتیان بەفیڕۆدەدا، سوپای نوێش کە سوڵتان پاش لەناوبردنی یەنیچەرییەکان دایمەزراند بەشێوەیەکی ئەکادیمی رێکخرا، ئەگەر کێشە زۆرە جۆر بە جۆرەکانیش نەبوایە ئەو هێزە نوێیە دەیتوانی خزمەتی زیاتری دەوڵەت بکات.

هەوڵەکانی سوڵتان مەحمود بۆ رێکخستنی کاروباری کارگێڕی دەوڵەت تارادەیەکی باش سەرکەوتوو بوو، دام و دەزگاکانی دەوڵەت رێکخران و زۆرێك لە دیاردەکانی گەندەڵی کارگێڕی قەلاچۆکرا، گۆڕانکارییەکانی ئەم بوارەش کە سوڵتان لە پلەو پایە بەرزەکانی دەوڵەت ئەنجامیدا، وەك دامەزراندنی ئەنجومەنی وەزیران لەسەر شێوازی ئەنجومەنی وەزیرانی ئەورووپی. کاریگەرییان هەبوو لەسەر دواڕۆژی دەسەلاتداریتی لە دەوڵەتی عوسمانیدا. لەسەردەمی سوڵتاندا دەسەلاتی(باب العالی)زیادی کرد، بەتێپەڕ بوونی کات ململانێ لە نێوان دەسەلاتی سوڵتان و کارمەندە بالاکانی دەوڵەت، سوڵتان دەیویست دەسەلاتێکی رەهای هەبێت، لەو لاشەوە کارمەندە بالاکان دەیانویست دەسەلاتی سوڵتان سنوردار بکەن بە هەندێ یاسا، ئەو ململانێیەش لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا بەتەواوی دەرکەوت،[١٠٥] هەروەها رێکخستنەکانی سوڵتان لە بواری کاگێڕیدا دیوانسالاری پەرەپێدا، بەتایبەتی لە رووی چەندایەتییەوە، کەساڵ بەساڵ ژمارەی کارمەندانی دیوانی حکومەت زیادی دەکرد.[١٠٦]

سوڵتان مەحمود هەستا بەکەم کردنەوەی رۆڵی دامەزراوەی ئاینی، کە لە کۆندا رۆڵی کاریگەریان هەبوو لە بریارەکانی دەوڵەتدا، سوڵتانەکانی عوسمانی تا رەزامەندی موفتی و زانایانی ئایینیان بەدەست نەهێنابایە زۆرێك لە ئیش و کارەکانیان ئەنجام نەدەدا، سوڵتان مەحمود هەوڵیدا سەربەخۆیی ئەم دامەزراوەیە لەناو بەرێت و بیکات بەبەشێکی تەواو لە دامەزراوەی دەوڵەت، بەم پێیەش زانا ئایینیەکانی کرد بە موچەخۆری دەوڵەت، بۆ ئەم مەبەستەش سوڵتان بەرێوەبەرایەتیەکی بۆ ئەوقاف دامەزراند، بەو شێوەیە دەوڵەت توانی دەست بگرێت بەسەر گرنگترین سەرچاوەی داهاتیان و سەربەخۆیی مادی لەنێوبردن.[١٠٧]

لە دیارترین چاکسازییەکانی سوڵتان مەحمود لە بواری کارگێریدا، گێرانەوەی دەسەلاتی ناوەندی دەوڵەت بوو بۆ ویلایەتە نیمچە سەربەخۆکان، لەم کارەشدا تا رادەیەکی باش توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت. ئەم هەوڵە گەرچی بۆ دەسەلاتدارانی دەوڵەتی عوسمانی بە چاکسازییەکی گەورە دابنرێت ئەوا هەر ئەو هەولانە شوێنەواری خراپی بەجێهێشت بەسەر زۆر لە ناوچە گەراوەکان، چونکە ئەو کارە توندوتیژی لێکەوتەوەو دەوڵەت و دەسەلاتدارنی ئەو ناوچانەی خستە نێو ململانێ و کوشتارو وێرانکاری بەدوای خۆیدا هێنا، بۆ نمونە لە گەراندنەوەی ویلایەتی بەغدا بۆ ژێر دەسەلاتی ناوەندی دەوڵەت، مەمالیکەکانی توشی کوشتاری و قرکردن بوون، هەروەك(لونگرێك) دەڵێت((چاکسازییەکانی سوڵتان مەحمود بۆ مەمالیکەکانی بەغدا بەلاو لەناوچون بوو))[١٠٨]، چونکە هەوڵەکەی سوڵتان بۆ گێرانەوەی بەغدا بۆ ژێر سایەی دەوڵەت کۆتایی نەهات، ئەوەبوو هەر لەساڵی گێرانەوەی

بەغدا لە ساڵی ١٨٢١مەمالیکەکان تووشی کوشتارێکی بەکۆمەڵ بوون کە ناودەبرێت بە(کوشتاری گەورەی مەمالیکەکان).[١٠٩] هەروەها لە شوێنەواریەکانی تری ئەو چاکسازییانە سەپاندنی هەندێ یاساو بڕیاری زۆرە ملێ بوو بەسەر دانیشتوانی ناوچە گەڕاوەکان، وەك سەپاندنی یاسای بەزۆر سەربازی کردن، کە بەسەر شانی خەڵکی ناوچەکانەوە قورس بوو، هەروەك لە موصل پەیڕەو کرا لە ساڵی ١٨٣٤.[١١٠]

چاکسازییە کارگێڕییەکانی سوڵتان مەحمود بەشێوەیەکی گشتی ڕەنگدانەوەی خراپی لە سەر کوردستانیش هەبوو، بەتایبەتی لە رووی سیاسیەوە چونکە سەرەتای لە ناوچوونی میرنشین و دەسەلآتە ناوخۆییە کوردییەکان بوو، لە کوردستان تا سەردەمی سوڵتان مەحمود چەندین میرنشینی کوردی فەرمانڕەوایەتی دەکرد، وەك سۆران و بابان و بۆتان و هەکاری و بادینان، کە هەر لە کۆنەوە بەپێی ڕێکەوتنی کوردی –عوسمانی ساڵی ١٥١٤ تا ڕادەیەك سەربەخۆییان وەرگرتبوو، سوڵتان مەحمود لە درێژەی سەپاندنی دەسەلآتی ناوەندی دەوڵەت بڕیاری لە ناوبردنی ئەو دەسەلآتە کودییانەی دەرکرد، ئەو کارەی سوڵتان ئەگەر بۆ دەسەلآتدارێتی عوسمانی سوودمەند بووبێت ئەوە بۆ کورد زەرەروو زیان بووە، بەتایبەتی کە دەسەلآتدارێتی عوسمانی بەرژەوەندی خۆی ویستووە و مەبەستی بەدەست هێنانی چەند ئامانجێك بووە، لەوانە زیادکردنی داهاتی دەوڵەتی عوسمانی لە کوردستانداو بەکارهێنانی کوردەکان لە بواری سەربازیدا[١١١] سوڵتان مەحمود سوپای ڕەوانەی کوردستان کرد بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکەی و توانی دەست بەسەر زۆر ناوچەی کوردستاندا بگرێت، و

دەسەلاتی میرنشینی سۆران لەناوبەرێت لە ساڵی ١٨٣٦ ئەو هەولانەی سولتان مەحمود کوشتارو نەهامەتی زۆری لێکەوتەوە بۆ کورد و بوو بەهێلێکی گشتی کە سولتانەکانی دوای خۆشی لەسەری رۆیشتن، لەبەرامبەر سەپاندنی ئەو دەسەلاتە ناوەندیەدا، پەیڕەوکردنی یەکسانی و ڕێکخستنی یاسای باج و دیاریکردنی ماوەی سەربازیکردن و زۆرێکی تر لەیاسا پەیوەندیدارەکانی بواری کۆمەلایەتی و ئابووری و سەربازی، کاریگەرییان بە چاکی هەستی پێنەکرا، چاکسازییەکانی بواری پەروەردە و فێرکردنیش وەك کردنەوەی قوتابخانەکان زۆر درەنگ گەیشتە کوردستان.[١١٢]

سیاسەتی سەپاندنی دەسەلاتی ناوەندی و شوێنەوارەکانی ناوچەکانی میرنشینە تورکییەکانی ئەنادۆڵ و ئەوروپای رۆژهەلاتیشی گرتەوە، هەروەها میرنشینە عەرەبیەکانی عیراق و ولاتی شامیشی گرتەوە.[١١٣]

کاریگەری چاکسازییە پەیڕەوکراوە نوێیەکان بەتایبەتی لەرووی کارگێڕییەوە لە هەموو ناوچەیەکدا وەك یەك نەبوو، ڕێکخستنی بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەت و دامەزراوەکانی لە ویلایەتەکان –بەتایبەتی دوورەکان– دا وەك پێویست نەبوو، بەڕێوەبردن زۆر گۆرانکاری بەسەردانەهات و پێشکەوتنی بەخۆیەوە نەبینی و ئەو چاکسازییانە درەنگ لە ویلایەتەکاندا جێ بەجێ دەکران.[١١٤]

لە ویلایەتە عەرەب نشینەکاندا چاکسازییەکان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر جیاوازی هەبوو، هەندێ ناوچەی وەك نیمچەدوورگەی عەرەب بە هۆی دووری لە مەڵبەندی فەرمانڕەوایەتییەوە و لاوازی دەوڵەتی عوسمانی لەوێ، بەشێوەیەکی کەم نەبێت کاریگەری چاکسازییەکانی تیا دەرنەکەوت، بەتایبەتی لەبواری خوێندندا کە هەر لەدەستی زانایانی ئایینیدا مایەوە، لە

میسریشدا چاکسازیکردن لەسەر دەستی محەمەد عەلی پاشای والیدا هاتە دی، کە توانی بەچاکسازیکردنی میسر بگەیێنێتە پلەی دەولەتێکی پێشکەوتوو لە ناوچەکەدا، بۆیە چاکسازیکردنی عوسمانی پێویست بەوەرگرتنی نەکرا، لە ناوچەیەکی وەك عیراقیشدا ئەگەر چی هەندێ هەنگاوی هاوشێوەی چاکسازییەکانی سولتان نرا بەتایبەتی لە دروست کردنی سوپای نوێدا، بەلام کاریگەری چاکسازییەکان بەشێوەیەکی فراوان کەوتە سالانی دوای سەردەمی سولتان مەحمود.(115)

لە ویلایەتەکاندا کێشەکان ئەوەندە زۆر بوو، کە لەتوانای والییەکاندا نەبوو چارەسەری بکەن بە تایبەتی کێشەی بەرتیل کاری، کە سولتان زۆر هەولی بۆ نەهێشتنی تەنانەت هەندێ سەرچاوەش باسی زیادبوونی ئەو دیاردەیە دەکەن، نەك کەم بوونەوەی، ئەوەش لە ئەنجامی چەند هۆکارێك لەوانە:

١- ئەو موچەی بەپێی بریاری سولتان براببوویەوە بۆ فەرمانبەران کەم بوو بۆیە ئەوانیش پەنایان دەبردە بەر بەرتیل کاری.

٢- دەزگایەکی چاودێریکردنی پێویست نەبوو، چاودێری ئیش و کاری فەرمانبەران بکات، بەتایبەتی کاربەدەستە بالاکان.(116)

چاکسازییە ئابووریەکانیش لە سەرجەمیاندا کاریگەر و بە سوود بوون، ژیان و گوزەرانی دانیشتوانی باشتر دەکرد، بەتایبەتیش هەلوەشاندنەوەی باج و رەسمە زیادەکان، گرنگیدان بەم بوارە بوو بە بابەتێك کە هەندێ لە سولتانەکانی پاش سولتان مەحمود بەباشی لەبەر چاوی بگرن.

چاکسازییە رۆشنبیری و کۆمەلایەتیەکان، کاریگەری تەواویان لەسەر کۆمەلگای عوسمانی دروست کرد، ئەو چاکسازییانە دەرگای زیاتر والا کرد

وەرگرتنی شارستانییەتی رۆژئاوا، بۆ نمونە دامەزراندنی نووسینگەی وەرگێڕان لە ساڵی ١٨٢٤بوو بنکەیەك بۆ پێگەیاندنی چینێکی سیاسەتمەداری عوسمانی کاریگەر بەرۆژئاوا، کە جیاوازبن لەو کەسانەی کە خاوەن بۆ چوون و داب و نەریتی کلاسیکی رۆژهەلأتییانە بوون[١١٧] ئەوەش کێشەیەکی زۆری دروست کرد لەلای رۆشنبیرو چاکسازیخوازەکانی دەوڵەتی عوسمانی، کە هەر تاقمێکیان بە بۆ چوونی خۆی چارەسەری بۆ کێشەکان دەبینیەوە، لەسەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی یەکەمدا ئەو کێشەیە بەتەواوی دەرکەوت.

گرنگی دانی سوڵتان مەحمود بە بوارە جیاجیاکانی زانست و کردنەوەی قوتابخانەی هاوچەرخ و هێنانی مامۆستاو شارەزای بیانی بۆ وانە وتنەوە، خوێندنی لە شێوازە کۆنەکەی دەکرد، و رۆلی حوجرەکانی کەم کردەوە، ئەو هەنگاوانەی سوڵتان بوون بەبنچینەیەك بۆ بەدنیایی کردنی رێڕەوی خوێندن، کە پاش سوڵتان مەحمود وورده وورده شوێنەوارەکانی دەردەکەوتن، هەر ئەو هەنگاوانەش کاریگەری تەواویان لەسەر پلەو پایەی زانا ئایینیەکانیش کرد، زانا ئایینیەکان کە لەسەدەی هەژدەهەمدا یەکێك لە بەهێزترین و دەوڵەمەندترین تاقمە کۆمەلأیەتییەکانی ناو کۆمەڵگای عوسمانی بوون، بێ هێزو هەژار بوون و بوونەچاو لەدەستی دەوڵەت.(١١٨)

دەتوانین بڵێین چاکسازییەکانی سوڵتان مەحمود لەبواری کۆمەلأیەتیدا، لە روویەکی دیکەوە بووە هۆی لاوازکردنی پەیوەندی نێوان کۆمەڵگای عوسمانی بەیەکترەوە، چونکە جیاوازی سروشتی نێوان چینی فەرمانڕەواو چینی گشتی و ولأت و جیاوازی نێوان گوندنشینەکان و چینی کەمینەی رۆشنبیران

زیاتر کرد(١١٩)، هەروەها دیاردەی ئارەزووکردنی ژیانی خۆشگوزەرانی و شارییانەی لەلای خەڵك پەیداکرد، بە تایبەتی لەلای دەوڵەمەندو کەسایەتییە ناودارەکان لە ئاستانە بێت یان شارە گەورەکان، کە لە گەڕەکە کۆنەکان باریان دەکرد و لەخانوی تازەدا نیشتەجێ بوون.(١٢٠)

لاسایی کردنەوەی ئەورووپا لە هەندێ دیاردەی کۆمەڵایەتی بوو کارێکی باو لەکۆمەڵگای عوسمانی، بەتایبەتی لە جل و بەرگ لەبە رکردندا، سوڵتان مەحمودیش لەپێش هەمووانە کەوتبووە ژێر کاریگەری شارستانییەتی رۆژئاوا، هەروەك لەبەشی دووەمدا باسمان کرد.

دەبێت ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییانە زیاتر لە مەڵبەندی دەسەڵات(ئەستانە)دا بەر چاو دەکەوت، بە تایبەتی لای کارمەندو خاوەن پیشەکان، بەڵام لە ناوچەکانی تری وڵات ئەو گۆڕانکارییانە بەکەمی هەستی پێدەکرا.

دووەم

## هەڵسەنگاندنی چاکسازییەکانی سوڵتان مەحمود

سوڵتان مەحمود، وەك هەموو کەسێك، کوڕی رۆژگارو کۆمەڵگای خۆی بووە. و کاتێك بوو ەسوڵتان، دەوڵەتی عوسمانی گلۆڵەی کەوتبووە لێژی و رۆژ بەرۆژ بەرەو لێك هەڵوەشانەوە دەڕۆشت، وەك(محەمەد قوتب) دەڵێت :((دەوڵەتی عوسمانی لە کۆتاییەکاندا لە تەنگەژەیەکی سیاسی و سەربازی و فیکری و زانستی وا سەختدا دەژیا، کە تا ئێستاش جیهانی ئیسلامی لە دەرهاوێشتەکانی ئەو سەردەمەدا دەژی))[١٢١]، بۆیە بۆ لێکۆڵینەوەو

هەڵسەنگاندنی چاکسازییەکانی سوڵتان، پێویستە رەچاوی ئەو سەردەمە بکەین کە دەوڵەتی عوسمانی تیایدا دەژیا.

بە شێوەیەکی گشتی، چاکسازییەکانی عوسمانی، بەئاشکرا کارگەریگەری ژیاری رۆژئاوای پێوە دیاربوو، ئەوروپا لەو کاتەدا تائێستاش چەقی گۆڕانکارییەکان بوو لە جیهاندا، لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا دواکەوتن لە هەموو روویەکەوە بڵاوبیبوویەوە، و باوەڕ نەبوون بەخۆ سیمایەکی دیاری موسڵمانان بوو، لەسەردەمی سوڵتان مەحموددا، رەوتە کلاسیکییەکەی چاکسازیکردن، کە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان داوای گەڕانەوەی دەکرد بۆ نەریتی باو باپیران، گورەپانەکەی بەجێهیشتبوو بۆ چینە بۆرژوازییە بەگڕوتینەکەی کۆمەڵگای عوسمانی، هەر بۆیە سوڵتان جگە لە ئازایەتی و وریایی خۆی بە ئاسانتر لە سوڵتانەکانی پێش خۆی توانی چاکسازییەکانی ئەنجام بدات.

چاکسازییەکانی سوڵتان مەحمود بە تایبەتی لە بواری کۆمەڵایەتیدا، پاڵنەر بوو بۆ پرۆسەی بە رۆژئاوابوونی کۆمەڵگای عوسمانی، کە لە ساڵانی دوای خۆی نیشانەکانی بە تەواوی بەدیار کەوت، بۆ نموونە ئەو تیپە مۆسیقییانەی لە سەردەمی سوڵتاندا، بە یارمەتی مۆسیقا ژەنە ئەوروپییەکان دامەزرابوو، پاش سوڵتان مەحمود شانی لە شانی قوتابخانە مۆسیقییە ئەوڕوپییەکان دەدا.(١٢٢)

کەم کردنەوەی دەسەڵات و چالاکی دامەزراوەی ئاینی، کاریگەری دیاری هەبوو لە لاوازکردنی جێ بەجێکردنی یاساکانی ئیسلام لە دەوڵەتی عوسمانیدا، نیشانەکانی ئەوەش راستەوخۆ لەسەردەمی (رێکخستنەکان)*ی عوسمانیدا بە ئاشکرا دەرکەوت.

چاکسازییەکانی سوڵتان مەحمود زیاتر کاریگەربوو بەدام و دەزگاو شێوازی فەرەنسی، لە قوتابخانە تازە دامەزراوەکاندا زمانی فەرەنسی لە زمانە ئەوروپیەکانی دیکە زیاتر دەخوێندرا و قوتابخانە سەربازییەکانیش لەسەر شێوازی کۆلێژی(سان سیر)ی فەرەنسی دامەزرابوو، کە ناپلیۆنی یەکەم لە فەرەنسا دایمەزراندبوو، سەرپەرشتیارانی ئەو قوتابخانانەش زیاتر شارەزای فەرەنسیەکان بوون[١٢٣] ئەو دیاردەیەش دەگەڕێتەوە بۆ قوڵی شارستانیەتی فەرەنسی و پەیوەندی کۆنی نێوان فەرەنساو دەوڵەتی عوسمانی، هەروەها سوڵتان مەحمود خۆیشی بەهۆی(ئێمیّ)ی شاژنی دایکییەوە کە ئافرەتێکی فەرەنسی بوو، کەوتبوە ژێر کاریگەری شارستانیەتی فەرەنسییەوە هەتا سەردەمی سوڵتان مەحمود کاریگەری ئەدەب و رۆشنبیری عەرەبی و فارسی لەسەر شارستانیەتی تورکی بە ئاشکرا دیار بوو، بەڵام ئەم کاریگەرییە لەسەردەمی سوڵتاندا، بەهۆی گرنگی دان بە زمانە ئەوروپیەکان بەتایبەتی زمانی فەرەنسی، بەرەو کزی و کەم بوونەوە رۆیشت.[١٢٤]

وەنەبێت سوڵتان مەحمود تەنها سوودی لە فەرەنسا وەربگرێت، بەڵکو سودی زۆریشی لە ئەزمونی وڵاتە ئەوروپیەکانی دیکەش وەرگرتبوو، بەتایبەتی لەشارەزایی ئەفسەرە بروسیەکان چونکە بروسیا لەو سەردەمەدا لە لایەنی سەربازییەوە هێزیکی ئەوروپی زۆر بەتوانا بوو.

سوڵتان مەحمود لە بەئەنجام گەیاندنی چاکسازییەکاندا سوودی لە ئەزمونی والی خۆی(محەمەد عەلی پاشا)ی والی میسر(١٨٠٥-١٨٤٨)بینی، بە تایبەتی پێش ئەوەی پەیوەندی نێوانیان تێك بچێت، چونکە محەمەد عەلی لەپێش سوڵتانەوە دەستی کردبوو بەئەنجامدانی چاکسازییەکانی و سەرکەوتنی

باشیشی بەدەست هێنابوو، هەندێ لەمێژوونوسانی عەرەب جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە زۆربەی چاکسازییەکانی سوڵتان لاسایی کردنەوەی کارەکانی محەمەد عەلی پاشایە، راستە چاکسازییەکانی سوڵتان کاریگەربووە بەهەنگاوەکانی محەمەد عەلی پاشا، بەڵام نەك بەو رادەیەی کە ئەوان باسی دەکەن چونکە هەندێ لەو مێژوونوسە عەرەبانە زیاد لە رادەی خۆی بەشان و باڵی محەمەد عەلی پاشا هەڵدەدەن.

سوڵتان مەحمود لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجەکانیدا زۆر ماندوو نەناس بووە(١٢٥)، بەڵام لەکارەکانیدا وەك هەموو مرۆڤێك لە هەندێکیدا بەئاگاو سەرکەوتوو بووەو لەهەندێکیدا سەرنەکەوتووبووە، سوڵتان زۆر لێزان بوو لە لەناوبردنی یەنیچەرییەکان و دامەزراندنی سوپای نوێدا، گرنگی سوپای نوێ، پێش هەموو شتێك، لەوە دابوو کە گوێرایەڵی سەرکردەی خۆی بوو. لەناوبردنی سوپای یەنیچەری یەکێك بوو لە گرنگترین رووداوەکانی مێژووی عوسمانی چونکە بۆ یەکەم جاربوو، چاکسازیکردن بە لەناوبردنی دامەزراوەیەکی کۆن بێتە بەرهەم، و رێگا خۆش بێت بۆ دامەزراوە نوێیەکان بەئازادانە بکەونەکار(١٢٦)، سەرەرای ئەو لێزانییە، سوڵتان مەحمود کەوتە هەندێ هەڵەی سیاسی و سەربازی زەق، بەتایبەتی لە سیاسەت و هەڵسەنگاندنەکانی بەرامبەر محەمەد عەلی پاشای والی میسر.

کێشە ناوخۆیی دەرەکییەکانی سەردەمی سوڵتان مەحمود ئەوەندە زۆر بوون، سوڵتانی ماندوو کردبوو، کاتێك کە سوڵتان دەیویست پاش لەناوبردنی یەنیچەرییەکان درێژە بە چالاکیەکانی بدات، دەوڵەتی عوسمان تووشی تووشە چەندەها کێشەو شەڕی دەرەکی و ناوخۆیی سەخت بووەوە، ئەوش

بوو بەهۆی خاوکردنەوەی رەوتی چاکسازییەکانی سولتان و بەفیڕۆچوونی زۆر لە تواناکانی.

چاکسازییەکانی سولتان مەحمود، وەك چاکسازییەکانی سولتانەکانی دیکە. ئەگەرچی لەکاتی جێبەجێکردنیدا گڕوتینێکی باشی بە دەولەتی عوسمانی بەخشی، بەلام ئامانجە سەرەکییەکانی بەدەست نەهێنا کە بریتی بوو لە گێڕانەوەی هێز بۆ دەولەتی عوسمانی و رزگارکردنی لە هۆکارەکانی لاوازی و دواکەوتن، هۆکارەکانی سەرنەکەوتنی چاکسازییەکانیش زۆر بوون، لە گرنگترینیان لاوازی ئامێری بەڕێوەبردن و هاوکاری نەکردنی ئەو دام و دەزگایانە بە شێوەیەکی تەواو لە بەئەنجام گەیاندنی چاکسازییەکاندا، چونکە زۆرێك لە فەرمانبەرانی دەولەت وابیریان دەکردەوە سەرکەوتنی ئەو چاکسازییانە دەبێتە هۆی لەناوبردنی بەرژەوەندییەکانیان، هۆیەکی تریش هەماهەنگی نەکردن و ناڕەزایی هەندێك لە چینە خاوەن پلەوپایەکانی ناو کۆمەلگای عوسمانی بوو بۆ چاکسازیکردن، وەك زانا ئاینییەکان، هەروەها کێشەو دەستێوەردانی ولاتە ئەوروپییەکان لە کاروباری دەولەتی عوسمانی[١٢٧] هۆیەکی دیکەش ئەوەبوو کرۆرێك لەو چاکسازییانە روکەشی و چاولێکەری بوو، بەتایبەتی لەرووی جل و بەرگ و هەندێ دیاردەی رواڵەتی تر، بێ ئەوەی هەولی چارەسەرکردنی کێشە بنەڕەتییەکان بدات، ئەم هۆکارانە و چەندین هۆکاری دیکە کە لەناوەڕۆکی لێکۆلینەوەکەدا ئیشارەتی پێکراوە.

لەدوا وتەدا ئەوە ماوەتەوە بلێین، گرنگی سەردەمی سولتان مەحمود و چاکسازییەکانی لەوەدایە، کە بوو بە بنکەیەکی پتەو بۆ(رێکخستنەکانی

عوسمانی، و دەرگای بەتەواوی والآکرد بۆ چاکسازیخوازەکانی پاش خۆی، بۆیە سوڵتان مەحمود بە دامەزرێنەری سەردەمێکی تازە[١٢٨]، و گەورەترین چاکسازیخواز دادەنرێت لە مێژووی تورکیای نوێدا.[١٢٩]

## کۆتایی

لە ژێر تیشکی ئەو زانیارییانەی کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا باس کراوە، دەتوانین بگەینە ئەم تێبینی و راستیانەی خوارەوە:

١- بیرۆکەی چاکسازییەکانی عوسمانی مێژووییەکی کۆنی لە دەوڵەتی عوسمانیدا هەبووە و لەگەڵ سەرهەڵدانی دیاردەکانی لاوازیدا بەدیارکەوتووەو لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتداو و لەگەڵ گرفتەکاندا گەشەی کردووەو بووەتە پێویستیەکی تەواو، پاشان ئەو بیرۆکەیە سەرەرای کۆسپ و تەگەرەکانی بەردەمی، بووەتە بزووتنەوەیەکی بەهێزو و فراوان لە دەوڵەتی عوسمانی.

٢- بارودۆخی دەوڵەتی عوسمانی لەساتەوەختی هاتنە سەرتەختی سوڵتان مەحمود، و بەدرێژایی فەرمانڕەوایەتیشی زۆر ئاڵۆزو نا هەموار بووە و کێشە ناوخۆیی و دەرەکییەکانیش ئەوەندە سەخت بوون، بیبووە هۆی خاوکردنەوەی رەوتی چاکسازی سوڵتان و بە فیڕۆچوونی زۆر لە تواناکانی.

٣- سوڵتان مەحمود یەکێکە لە سوڵتانە هەرە بەهێزەکانی بنەماڵەی عوسمانی و لەگەڵ بوونی بەسوڵتان، سەرەڕای کێشەو گرفتە زۆرەکانی بەردەمی، زۆر لێبڕاوانە هەوڵی بەئەنجام گەیاندنی چاکسازییەکانی داوە، و تاڕادەیەکی باشیش لە کارەکانیدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە.

٤- سەردەمی سوڵتان مەحمود لە رووی چاکسازییەوە بە سەردەمێکی زێرین دادەنرێت لە دەوڵەتی عوسمانیدا بە شێوەیەك کە سوڵتان توانی گرنگترین

بەربەستەکانی بەردەم چاکسازیکردن نەهێڵێت و ڕێگا والآ بکات بۆ چاکسازیخوازەکانی پاش خۆی.

٥- چاکسازییەکانی سوڵتان مەحمود لەکاتێکدا ئەنجام دەدرا کە دەوڵەتی عوسمانی وەك پیاوێکی بەتەمەنی سەر جێگاوابوو، بۆیە ئەو چاکسازییانەی هەر چەندێك بەهێز بووبێت، نەیتوانیوە ببێتە مایەی بەهێزکردنەوەی دەوڵەتی عوسمانی وەك پێویست.

٦- چاکسازییەکانی سوڵتان مەحمود سەرەڕای لایەنی چاکیان، شوێنەواری خراپیشی هەبوو لەسەر دەوڵەت و کۆمەڵگای عوسمانی، بەتایبەتی لە کرداری بەڕۆژئاوایکردنی کۆمەڵگای عوسمانی و کەمکردنەوەی سنوری پەیڕەوکردنی یاساکانی ئیسلام، هەروەها هۆیەکیش بوون بۆ دەست تێوەردانی وڵآتانی ڕۆژئاوا لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتی عوسمانی لە داهاتوودا.

## پەراوێز و سەرچاوەکان

(١) موفتی بنی المرجة، صحوة الرجل المریض او السلطان عبدالحمید الثانی والخلافة الاسلامیة،الکویت، ١٩٨٤،ص٤٢.

(٢) اورخان محمد علی، السلطان عبدالحمید الثانی، حیاتة واحداث عصرة،ط١، الرمادی، ١٩٨٧، ص٢٧.

(٣) حسین لبیب، تاریخ المسألة الشرقیة، القاهرة، ١٩٢١،ص٦.

(٤) بۆ زیاتر ئاگاداربوون لە هۆکارەکانی لاوازی و لێك هەڵوەشانی دەوڵەتی عوسمانی بگەڕێوە بۆ سەرچاوەکانی،وەك: محمود شاکر، التاریخ الاسلامی-العهد العثمانی-الجزء ٨، ط٣، بیروت،١٩٩١،ص١١١-١٢٥، حسین لبیب، المصدر السابق، ص٦-٢٥.

(٥) ابراهیم خلیل احمد، تاریخ الوطن العربی فی العهد العثمانی١٥١٦-١٩١٦، الموصل. د.ت،ص١٧٨.

(٦) کامیران عبدالصمد الدوسکی، کوردستان العثمانیة فی النصف الاول من القرن التاسع عشر دراسة تاریخیة تحلیلیة، ماجستیر، کلیة الاداب، جامعة صلاح الدین، ٢٠٠٠،ص٦٢.

(٧) جمیل موسی النجار، الادارة العثمانیة فی ولایة بغداد من عهد الوالی مدحت باشا الی نهایة الحکم العثمانی ١٨٦٩-١٩١٧،ط٢،بغداد،٢٠٠١،ص٢١.

(٨)محمد حرب، السلطان عبدالحمید الثانی اخر السلاطین العثمانیین الکبار. ط١،دمشق،١٩٩٠،ص١٥.

(٩) احمد عبدالرحیم مصطفی، فی اصول التاریخ العثمانی، ط١، بیروت، ١٩٨٢، ص١٥٢.

(١٠) کامیران عبدالصمد الدوسکی، المصدر السابق،ص٦٢.

(١١) ابراهیم خلیل احمد، المصدر السابق، ص١٧٩.

(١٢) احمد عبدالرحیم مصطفی، المصدر السابق، ص١٥٨-١٦٠، محمد حرب، المصدر السابق، ص١٧.

(١٣) ابراهیم خلیل احمد، المصدر السابق، ص١٨٠.

(١٤) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص١٧٦-١٧٧، جميل موسى النجار، المصدر السابق، ص٢٢.

(١٥) ) ابراهيم خليل احمد، المصدر السابق، ص١٧٩-١٨٠.

* (سوپای یەنیچەری) لە لایەن سوڵتان ئورخانی یەكەمەوە(١٣٢٦-١٣٥٩)دامەزراوە، یەنیچەری: ووشەیەكە لە زمانی توركی مانای سوپای تازە دەگەیەنێ. لە سەرەتادا ئەم سوپایە خزمەتی زۆری بە دەوڵەتی عوسمانی كرد، بەڵام پاشان بەرەو لاوازی رۆیشت، سەیری: ) ابراهيم خليل احمد، المصدر السابق، ص٧٦-٧٩بكە.

(١٦) نفس المصدر، ص١٨١، رؤف بك الجادرى، التاريخ السياسى، بغداد، ١٩٢٤، ص١٨٠.

(١٧) محمد فريد بك المحامى، تاريخ الدولة العلية العثمانية، ط٢، بيروت، ١٩٧٧، ص١٩٤.

(١٨) محمد فريد بك المحامى، المصدر السابق، ص١٩٧" ابراهيم بك حليم، تاريخ الدولة العثمانية العلية المعروف بكتاب التحفة الحليمية فى تاريخ الدولة العلية، بيروت، ٢٠٠٠، ص٢٨٩.

*(ئێمێ) ئامۆزای (ژۆزفین)ی خێزانی ناپلیۆن بۆناپارتی ئیمپراتۆری فەرەنسابوو، یەكێكە لە ئافرەتە ناو بانگەكانی مێژووی فەرەنسا، تەماشای ئەم سەرچاوەیە بكە :نۆبل باربەر، فەرمانرەوایانی قۆچی زێرین لە سوڵتان سلێمانی قانوونییەوە تا ئەتاتورك، و: رێبوار كەریم وەلی، چ١، هەولێر، ٢٠٠١، ل ١٠٤.

(١٩) هەمان سەرچاوە، ل١٠٤-١٠٥.

(٢٠) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص١٨٦.

(٢١) محمد فريد بك المحامى، المصدر السابق، ص١٩٥.

(٢٢) عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ الشعوب الاسلامية،بيروت،١٩٧٣،ص١٧٦.

(٢٣) محمد فريد بك المحامى، المصدر السابق، ص١٩٧، شكرى محمود نديم، احوال العراق فى مرحلة المشروطية العثمانية١٩٠٨-١٩١٨ دراسة تاريخية، دكتوراة، كلية الاداب، جامعة بغداد، ١٩٨٥، ص٢٠.

(٢٤) حسين لبيب، المصدر السابق، ص٦٨، ماری ملزباتريك، سلاطين بنی عثمان الخمسة، ت: حنا غصن و كامل مروة وكامل صموئيل،د.م، ١٩٣٣، ص٣٣، شكری محمود نديم، المصدر السابق،ص٢٠.

(٢٥) نۆیل باربەر، سەرچاوەی پێشوو،ل١١٢–١١٤.

(٢٦) حسين لبيب، المصدر السابق، ص٦٨.

(٢٧) كاميران عبدالصمد الدوسكی، كوردستان العثمانية فی النصف الاول من القرن التاسع عشر، ص٥٧–٥٨.

(٢٨) احمد امين، زعماء الاصلاح فی العصر الحديث، القاهرة،١٩٤٨، ص٢٧.

(٢٩) ابراهيم خليل احمد، تاريخ الوطن العربی الحديث والمعاصر، بغداد، ١٩٨٧، ص٢٢.

* بزووتنەوەی وەهابی: بزوتنەوەیەكی چاكسازی ئایینی بوو، لە بیروباوەڕەكانی (محەمەدی كوڕی عەبدول وەهاب)(١٧٠٣–١٧٩١)سەرچاوەی گرتبوو، ئەم بزووتنەوەیە لە نیمچە دوورگەی عەرەبی سەری هەڵدا، داوای پاككردنەوەی ئاینی ئسلامی دەكرد لە گومڕایی و زیادەكاری، پاشان ئەم بیروباوەڕە لەلایەن بنەماڵەی سعود وەرگیراو توانیان لەو ڕێگایەوە دەسەلأتیان بەسەر زۆربەی نیمچەدورگەی عەربیدا بسەپێنن، دەوڵەتی عوسمانی نەیتوانی سەركتیان بكات بە هاوكاری محەمەد عەلی پاشای میسر نەبێت لە ساڵی ١٨١٨.

(٣٠) ابراهيم خليل احمد،تاريخ الوطن العربی الحديث والمعاصر، ص٢٢، محمد عصفور سليمان، العراق فی عهد مدحت باشا١٨٦٩–١٨٧٢، ماجستير، كلية الاداب، جامعة بغداد. ١٩٨٩، ص١٣.

(٣١) حسين لبيب، المصدر السابق،ص٦٥.

(٣٢) كارل بروكلمان، تاريخ الشعوب الاسلامية، ت: تبة فارس ومنير البعلبكی، ط٩. بيروت، ١٩٨١، ص٥٣٩.

(٣٣) احمد امين، المصدر السابق، ص٧–٨، محمود شاكر، التاريخ الاسلامی –العهد العثمانی، الجزء ٨، ص١٣–١٨.

(٣٤) كاميران عبدالصمد الدوسكي، المصدر السابق، ص٦٠.

* رژێمی(ئیلتزام): شێوازێك بوو بۆ باج كۆكردنەوە، ئەویش ئەوەبوو كە دەوڵەت كرداری باج كۆكردنەوەی باجێكی دیاری كراوی دەدا بە كەسێك كە پێی دەوترا (ملتزم)، بەرامبەر ئەوەی ئەو كەسە بڕێكی دیاریكراو پارەی دەدا بەدەوڵەت، ئەم رژێمە لایەنی خراپی زۆر بوو، چونكە زۆربەی ئەو باج كۆكەرەوانە هەوڵیان دەدا زیاترین دەست كەوێ لەو بڕەی كە دیاریكرابوو لە سەر شانی باج دەران بۆ بەرژەوەندی خۆی، ئەم رژێمەش لە چوار چێوەی هەوڵە چاكسازییەكانی دەوڵەت لە سەدەی نۆزدەهەمدا هەڵوەشایەوە.

(٣٥) موفق بنى المرجة، صحوة الرجل المريض او السلطان عبدالحميد الثانى والخلافة الاسلامية، ص٤٤.

(٣٦) ابراهيم خليل احمد، تاريخ الوطن العربى فى عهد العثمانى ١٥١٦-١٩١٦، ص٨٢-٨٨.

** دامەزراوەی سەربازیی عوسمانی لە دوو جۆری سەرەكی پێكدەهات: هێزی سوارەی دەرەبەگی كە لەسەرەتای دەوڵەتی عوسمانی دامەزرابوو، و هێزی یەنیچەری كە لەسەردەمی ئورخان(١٣٢٦-١٣٥٩)دامەزرابوو، سەرچاوەی ئەم هێزەش بۆ ماوەیەكی زۆر، زیاتر ئەو منداڵە مەسیحی یان بوون كە لەشەڕدا دەست دەكەوتن و پاشان پەروەردەیەكی ئیسلامیانە دەكران و دەهێنرانە ریزی ئەم سوپایە، هێزی یەنیچەری پەیوەندییەكی پتەوی لەگەڵ تەریقەتی بەكتاشی هەبوو، كەرێچكەیەكی سۆفیگەرانەبوو، كە لەناو هۆزەكانی(ئەنادۆل) دا باوبوو. سەیری ئەم سەرچاوەیە بكە: ابراهيم خليل احمد، تاريخ الوطن العربى فى عهد العثمانى ١٥١٦-١٩١٦، ص٧٥-٧٩.

(٣٧) ابراهيم خليل احمد، تاريخ الوطن العربى الحديث والمعاصر، ص٢١.

(٣٨) محمد كمال الدسوقى، الدولة العثمانية والمسألة الشرقية، القاهرة، ١٩٧٦،ص١١٢.

(٣٩) دەربارەی بارودۆخی دەرەوەی دەوڵەتی عوسمانی سەیری ئەم سەرچاوانە بكە: محمد فريد بك، المصدر السابق،ص١٩٩ ومابعدها، احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص١٨٨" كارل بروكلمان، المصدر السابق، ص٥٣٩.

(٤٠) محمد فريد بك، المصدر السابق،ص٢٣٦–٢٣٧“ محمد كمال الدسوقى، المصدر السابق، ص١٨٠.

(٤١) حسين لبيب، المصدر السابق، ص٦٤، على حيدر سليمان، تاريخ الحضارة الاوربية الحديثة، ط١، د.م، ١٩٩٠، ص٣١٢.

(٤٢) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص١٨٧.

(٤٣) محمد كمال الدسوقى، المصدر السابق، ص١١١.

(٤٤) محمد فريد بك، المصدر السابق، ص١٩٧–١٩٨“ رؤوف بك الجادرجى، التاريخ السياسى، ٢٨٠.

(٤٥) ابراهيم بك حليم، المصدر السابق، ص٢٨٩“ محمد فريد بك، المصدر السابق، ص١٩٨.

(٤٦) محمد فريد بك، المصدر السابق، ص١٩٨–١٩٩.

(٤٧) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص١٨٧“ نۆيل باريتر، سەرضاوەى ثيَشوو، ل١١٤.

(٤٨) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص١٨٩.

(٤٩) محمد كمال الدسوقى، المصدر السابق، ص١١١.

(٥٠) محمد فريد بك، المصدر السابق، ص١٩٩.

(٥١) ابراهيم خليل احمد، تاريخ الوطن العربى فى العهد العثمانى١٥١٦–١٩١٦، ص١٨٣.

(٥٢) محمد كمال الدسوقى، المصدر السابق، ص١١١.

محمدEMINOTAY,TARIH,LISE III,ISTANBUL,1989,S 266

كمال الدسوقى، امصدر السابق، ص١١١

(٥٤) محمد فريد بك، المصدر السابق، ص٢١٩“ كارل بروكلمان، المصدر السابق، ص٥٤٠.

* (ئات مەيدان) واتە گۆڕەپانی ئەسپ و تاودان

(٥٥) محمد فريد بك، المصدر السابق، ص٢٢٠، ابراهيم خليل احمد، تاريخ الوطن العربى فى العهد العثمانى، ص١٨٣.

EMIN OKTAY, TARIH, S266

(٥٧) ابراهيم خليل احمد، تاريخ الوطن العربى فى العهد العثمانى، ص١٨٣.

(٥٨) محمد كمال الدسوقى، المصدر السابق، ص١١٣.

(٥٩) محمد فريد بك، المصدر السابق، ص٢٢٠.

(٦٠) المصدر نفسة، ص٢٣١، ابراهيم بك حليم، المصدر السابق، ص٢٩٠" ابراهيم خليل، تاريخ الوطن العربى فى العهد العثمانى، ص١٩٠.

(٦١) محمد فريد بك، المصدر السابق، ص٢٣١" كارل بروكلمان، المصدر السابق، ص٥٤١.

(٦٢) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص١٩١.

(٦٣) محمد فريد بك، المصدر السابق، ص٢٢٠، ابراهيم بك حليم، المصدر السابق، ص٢٩٠.

(٦٤) ابراهيم بك حليم، المصدر السابق، ص ٢٩٠.

(٦٥) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص ١٩٢.

(٦٦)على حيدر سليمان، المصدر السابق، ٣٧٢.

* ڤۆن مولتکە: سەرکردەیەکی ناوداری ئەڵمانییە لە ساڵی ١٨٠٠ لەدایك بووە، وە بووە بەسەرباز لە سوپای بروسی و لەکاری سەربازیدا زۆر لێهاتوو بووە، رۆڵی بەرچاوی هەبوو لە رێکخستنی سوپای عوسمانی، پاش شەری نیبین لە ساڵی ١٨٣٩ گەراپەوە بۆ بروسیا و کراوە بە سەرۆکی سوپای بروسی و دەوری گەورەی هەبوو لە سەرکەوتنی بروسیا بە سەر فەرەنسا لە ساڵی ١٨٧٠، و لەساڵی ١٨٩١ مردووە. تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە : محمد فريد بك، المصدر السابق، هامش ص٢٣٦.

(٦٧) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص١٩٢" كارل بروكلمان، المصدر السابق، ص٥٥٨.

(٦٨) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص١٩٣"
EMIN OKTAY, TARIH, S268

(٦٩) محمد فريد بك، المصدر السابق، ص٢٣٢" عبدالعزيز سليمان نوار، المصدر السابق، ص١٧٨.

(٧٠) محمد كمال الدسوقى، المصدر السابق، ص١٧٨، كارل بروكلمان، المصدر السابق، ص٥٥٨.

(٧١) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص ١٩٢.

(٧٢) ) ابراهيم خليل احمد، تاريخ الوطن العربى فى العهد العثمانى، ص١٨٣-١٨٤.

(٧٣) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق،ص١٩١.

(٧٤) نۆيل باريەر، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٥.

(٧٥) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق،ص١٩٤.

(٧٦)EMIN OKTAY, TARIH, S268"

ابراهيم خليل احمد، تاريخ الوطن العربى فى العهد العثمانى، ص١٨٩.

(٧٧)EMIN OKTAY, TARIH, S267 "

" محمد كمال الدسوقى، المصدر السابق، ص١٧٨.

(٧٨) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق،ص١٩٣.

(٧٩) ابراهيم بك حليم، المصدر السابق، ص٢٩١.

(٨٠) عبدالعزيز سليمان نوار، المصدر السابق، ص١٧٩، احمد عبدالرحيم مصطفى. المصدر السابق، ص١٩٥.

(٨١)EMIN OKTAY, TARIH, S267 "

(٨٢) كارل بروكلمان، المصدر السابق، ص٥٥٨" الدسوقى، المصدر السابق، ص١٧٨.

(٨٣) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص١٩٥-١٩٦.

(٨٤)EMIN OKTAY, TARIH, S268

(٨٥) محمد كمال الدسوقى، المصدر السابق، ص١١٠.

(٨٦) جميل موسى النجار، المصدر السابق، ص٢٤" ابراهيم خليل احمد، تاريخ الوطن العربى فى العهد العثمانى، ص٨٩-١٠٥.

(٨٧) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص١٩١" عبدالعزيز سليمان نوار، المصدر السابق، ص١٧٩.

(٨٨) عبدالعزيز سليمان نوار، المصدر السابق، ص١٨٠.

(٨٩) جميل موسى النجار، المصدر السابق، ص٢٤.

* یاساو نەریتێكی كۆن بوو، مافی دەدا بە دەوڵەت بەدەست بەسەرداگرتنی سەروەت و سامانی هەر كەسێك بە تایبەتی فەرمانبەران هەر كاتێك بە پێویستی بزانیبایە.

(٩٠)EMIN OKTAY, TARIH, S267

(٩١) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص١٩٤.

(٩٢) المصدر نفسة، ص١٩١.

(٩٣) ابراهيم بك حليم، المصدر السابق، ص٢٩١.

(٩٤) الدسوقي، المصدر للسابق، ص١١٤ " احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص١٩٥.

(٩٥) ابراهيم بك حليم، المصدر السابق، ص٢٩١ " الدسوقي، المصدر السابق، ص١١٤.

(٩٦)EMIN OKTAY, TARIH, S269

(٩٧) ) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص١٩٢.

(٩٨) محمد أنيس، الدولة العثمانية والشرق العربي١٥١٤–١٩١٤، القاهرة،د.ت،ص٢١٣.

(٩٩)؛EMIN OKTAY, TARIH, S268

ابراهيم خليل احمد، تاريخ الوطن العربى فى العهد العثمانى، ص١٨٩.

(١٠٠) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص١٩٣.

(١٠١) ابراهيم خليل احمد، تاريخ الوطن العربى فى العهد العثمانى، ص١٨٩.

(١٠٢) محمد أنيس، المصدر السابق، ص٢١٤.

(١٠٣) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص١٩٦.

(١٠٤)نۆیل باریەر، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٥.

(١٠٥) محمد حرب، العثمانيون في التاريخ والحضارة،ط٢، دمشق،١٩٩٩،ص٤٨" ابراهيم خليل احمد، تاريخ الوطن العربي في العهد العثماني، ص١٨٩.

(١٠٦) نادر ئینتخابی، ئاین و دەوڵەت لە تورکیا لە چاکسازییەوە تا ئێستا، و: ڕێبوار کەریم وەلی، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە(٦)، هەولێر، ١٩٩٨، ل٦٢.

(١٠٧) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص١٩٤.

(١٠٨) ستيڤن هيمسلى لونكريك، اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ت: جعفر الخياط، ط٦، بغداد،١٩٨٥، ص٣١١.

(١٠٩) باقر ياسين، تاريخ العنف الدموي في العراق، ط١، بيروت،١٩٩٩، ص٢٤٣.

(١١٠) عماد عبدالسلام رؤوف، الموصل في العهد العثماني مرة الحكم المحلي١٧٢٦-١٨٣٤، النجف، ١٩٧٥، ص٢٠٩.

(١١١) سعدى عثمان حسين، كوردستان والامبراطورية العثمانية دراسة في تطورها السياسي ١٥١٤-١٨٥١، ماجستير، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين،١٩٩٥، ص١٢٤.

(١١٢) كاميران عبدالصمد احمد الدوسكى، المصدر السابق، ص٥٥.

(١١٣) عثمان على، الاسس الفكرية للحركة القومية الكوردية، مجله ئالآى ئيسلام، العددان٢و٣، ماليزيا،١٩٩٥، ص١٦.

(١١٤) جميل موسى النجار، المصدر السابق، ص٢٤.

(١١٥) ابراهيم خليل احمد، تاريخ الوطن العربي الحديث والمعاصر،ص٢٩-٣٢.

(١١٦) عبدالعزيز سليمان نوار، المصدر السابق، ص١٨١.

(١١٧) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص١٩٤.

(١١٨) نادر ئینتخابی، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٤.

(١١٩) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص١٩٤.

(١٢٠) ابراهيم خليل احمد، تاريخ الوطن العربي في العهد العثماني، ص١٩٧.

(١٢١) محمد قطب، كيف نكتب التارخ الاسلامى، ط١، د.م، ١٩٩٤، ص١٧٦.

(١٢٢) محمد حرب، المصدر السابق، ص٥٠٩.

* سەردەمی ڕێکخستنەکان (تنظيمات): بەو ماوە مێژووییە دەوترێت لە دەوڵەتی عوسمانیدا کە ڕاستەوخۆ لە ساڵی ١٨٣٩، لەگەڵ هاتنە سەر تەختی سوڵتان عەبدول مەجیدی یەکەمی کوڕی سوڵتان مەحمود دەست پێدەکات و تا کۆتایی فەرمانڕەوایی سوڵتان عەبدول عەزیز(١٨٦١-١٨٧٦)درێژەی کێشا، ڕێکخستنەکانی عوسمانی درێژبوونەوەی بزووتنەوەی چاکسازی عوسمانیە، بەڵام بەوە لەیەکتر جیادەکرێنەوە کە بیرۆکەو جێبەجێکردنی ڕێکخستنەکان شێوازێکی دیکەی وەرگرت، بەشێوەیەك کە دەوڵەتی عوسمانی دەستی کرد بە دارستنەوەی زۆرێك لەیاساکانی بە پشت بەستن بەیاسا ئەوروپیەکان، ئەو هەنگاوەش بوو بەهۆی کەمکردنەوەی بواری بەکارهێنانی شەریعەتی ئیسلامی لە دەوڵەتی عوسمانیدا. سەیری ئەم سەرچاوانە بکە:

محمد حرب، المصدر السابق، ص٤٨ " جميل موسى النجار، المصدر السابق، ص٢٠.

(١٢٣) محمد فريد بك، المصدر السابق، ص٢٣٢.

(١٢٤) فيليب حتي، موجز تاريخ الشرق الأدنى، ت: أنيس فريحة، بيروت، د.ت، ص٢٥١.

(١٢٥) لونكريك، المصدر السابق، هامش ص٣١٢.

(١٢٦) احمد عبدالرحيم مصطفى، المصدر السابق، ص١٩٠.

(١٢٧) خليل علي مراد و اباهيم خليل احمد، ايران وتركيا دراسة في التاريخ الحديث والمعاصر، الموصل، ١٩٩٢، ص٢٢٠.

(١٢٨) كارل بروكلمان، المصدر السابق، ص٥٦٠.

(١٢٩) جميل موسى النجار، المصدر السابق، ص

## سەرچاوەکان

یەکەم : کتێب

أ- کتێبە عەرەبی کراوەکان

- ابراهیم بك حليم :

١- تاريخ الدولة العثمانية العلية المعروف بكتاب التحفة الحليمية فى تاريخ الدولة العلية، مؤسسة الكتب الثقافية، بيروت،٢٠٠٠.

- احمد عبدالرحيم مصطفى :

٢- فى اصول التاريخ العثماني، ط١، دار الشروق، بيروت، ١٩٨٢.

- ابراهيم خليل احمد :

٣- تاريخ الوطن العربى فى العهد العثمانى١٥١٦-١٩١٦، دار الكتب للطباعة و النشر، الموصل، د.ت.

٤- تاريخ الوطن العربى الحديث والمعاصر، دار الكتب للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٨٧.

- ابراهيم خليل احمد و خليل على مراد:

٥- ايرا وتركيا دراسة التاريخ الحديث و المعاصر، دار الكتب للطاعة والنشر، الموصل، ١٩٩٢.

-احمد امين:

٦- زعماء الاصلاح فى العصر الحديث، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، ١٩٤٨.

أورخان محمد على:

٧- السلطان عبدالحميد الثانى حياته واحداث عصره ،ط١، مكتبة دار الانبار، الرمادى،١٩٨٧.

- باقر ياسين:

٨- تاريخ العنف الدموى في العراق، ط١، دار الكنوز الأدبية، بيروت، ١٩٩٩.

- جميل موسى النجار:

٩- الادارة العثمانية فى ولاية بغداد من عهد الوالى مدحت باشا الى نهاية الحكم العثماني١٨٦٩-١٩١٧، ط٢، دار الشؤن الثقافية، بغداد، ٢٠٠١.

- حسين لبيب:

١٠- تاريخ المسألة الشرقية، مطبعة الهلال، القاهرة، ١٩٢١.

- رؤوف بك الجادرجي:

١١- التارخ السياسي، المكتبة العربية، بغداد، ١٩٢٤.

- ستيفن هيمسلي لونكريك:

١٢- اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ت: جعفر الخياط، ط٦، مكتبة اليقظة العربية، بغداد، ١٩٨٥.

- عبدالعزيز سليمان نوار:

١٣- تاريخ الشعوب الاسلامية، دار النهضة العربية، بيروت،١٩٧٣.

- على حيدر سليمان:

١٤- تاريخ الحضارة الأوربية الحديثة، ط١، مكتبة النهضة الجديدة، د.م، ١٩٩٠.

- عماد عبدالسلام رؤوف:

١٥- الموصل فى العهد الموصلى فتر الحكم المحلى١٧٢٦-١٨٣٤، مطبعة الاداب، النجف، ١٩٧٥.

- فليب حتي:

١٦- موجز تاريخ الشرق الأدنى، ت: أنيس فريحة، دار الثقافة، بيروت، د.ت.

- كارل بروكلمان:

١٧- تاريخ الشعوب الاسلامية، ت: نبيه أمين فارس ومنير البعلبكي، ط٩، دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٨١.

- ماري ملزباتريك:

١٨- سلاطين بني عثمان الخمسة، ت: حنا غصن وكامل مروه وكامل صموئيل مسيحة، د.م، ١٩٣٣.

- محمد فريد بك المحامي:

١٩- تأريخ الدولة العلية العثمانية، ط٢، دار الجيل، بيروت، ١٩٧٧.

- محمد كمال الدسوقي:

٢٠- الدولة العثمانية والمسألة الشرقية، القاهرة، ١٩٦٧.

- محمد حرب:

٢١- العثمانيون فى التاريخ والحضارة، ط٢، دار القلم، دمشق، ١٩٩٩.

٢٢- السلطان عبدالحميد الثاني آخر السلاطين العثمانيين الكبار، ط١، دار القلم، دمشق، ١٩٩٠.

- محمد انيس:

٢٣- الدولة العثمانية والشرق العربي، دار الجيل، القاهرة، د.ت.

محمد قطب:

٢٤- كيف نكتب التاريخ الاسلامي، ط١، دار الكتاب الاسلامي، د.م، ١٩٩٤.

-محمود شاكر:

٢٥- التاريخ الاسلامي-العهد الاسلامي-، الجزء٨، ط٣، المكتب الاسلامي، بيروت، ١٩٩١.

- موفتي بني المرجة:

٢٦- صحوة الرجل المريض أو السلطان عبدالحميد الثاني والخلافة الاسلامية، مطابع دار الكويت للصحافة، الكويت، ١٩٨٤.

ب- كتێبێكی بەكوردی كراو :

نۆیل باربەر :

فەرمانڕەوایانی قۆچی زێڕین لە سوڵتان سلیمانی قانونییەوە تا ئەتاتورك، و: ڕێبوار كەریم وەلی، چاپی١، دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی موكریانی، هەولێر، ٢٠٠١.

ج- کتێبێکی تورکی:

EMIN OKTAY:
TARIH,LISE III, ATLAS KITABEVI ,ISTANBUL,1989

دووەم: نامە زانکۆییەکان:

١- سعدي عثمان حسين:

كوردستان والامبراطورية العثمانية، دراسة في تطورها السياسي(١٥١٤-١٨٥١) ماجستير، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين،١٩٩٥.

٢- شكري محمد نديم:

احوال العراق في مرحلة المشروطية الثانية١٩٠٨-١٩١٨ دراسة تاريخية، دكتوراه، كلية الاداب، جامعة بغداد، ١٩٨٥.

٣- كاميران عبدالصمد احمد الدوسكي:

كوردستان العثمانية في النصف الاول من القرن التاسع عشر(دراسة تاريخية تحليلية) ماجستير، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين،٢٠٠٠.

٤- محمد عصفور سليمان:

العراق في عهد مدحت باشا١٨٦٩-١٨٧٢، ماجستير، كلية الاداب، جامعة بغداد، ١٩٨٩.

سێ یەم : گۆڤار

أ- بە زمانی کوردی

ب- نادر ئینتخابی:

ئاین و دەوڵەت لە تورکیا لە چاکسازییەوە تا ئێستا، و: ڕێبوار کەریم وەلی، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە٦، هەولێر، ١٩٩٨.

ب- بەزمانی عەرەبی

عثمان علی:

الأسس الفكرية للحركة القومية الكوردية، مجلة ئالأی ئیسلام، العددان٢-٣، السنة التاسعة، الرابطة الاسلامية لطلبة و شباب كردستان، ماليزيا، ١٩٩٥.

# دەستنووسی کوردی لە پەرتووکخانەکانی تاران

✍فوئاد ڕەوەند

گرنگی و بایەخی دەستنووس لەلای گەلانی خاوەن شارستانیەت دیاردەیەکی بەرچاوە ولە زۆربەی وڵاتە پێشکەوتووەکان . ئەم بایەخ دانە بە مەبەستی ناسینی کلتوور . مێژوو . ئەدەب و هونەری ڕابردووە . ساڵانە بودجەیەکی بەرچاو تەرخان دەکرێ و دەیان دەستنووسخانەیان دامەزراندووە . چەندین دەزگای جۆرا و جۆر بۆ پاراستن . لێکۆڵینەوە . توژینەوە . ساخ کردن . لەچاپ دان . پێناسەکردن و تۆمار کردنی زانیاری پێویست. چالاکانە کار دەکەن . بەشی تایبەت بە دەستنووس و زانستی لێکۆڵینەوە لەم بارەوە لەزانکۆکانیان دامەزراوە (١) بۆ پاراستنی ئەم گەنجینە بەنرخانە یاسای تایبەتیان لەم بارەوە داناوە . بۆ کەم کردنی زیانەکان . وێنەگرتن بەکامێرای فلاش دار و روونووس کردنی دەستنووس بە ئامرازی کۆپی ئاسایی قەدەغەیە . ساڵانە دەستنووسەکان لە تاقیگا دەدرێتە بەر پشکنین (٢) هونەرمەندانی پسپۆر ئەرکی چاك کردنەوەی بەشە تێکچووەکان دەگرنە ئەستوو . کامپیوتەر لەخزمەتی دەستنووس بەکار دەبەن . دەزگای پێشکەوتوو بۆ ناسینی جۆری مەرەکەب و تەمەنی کاغەز و جۆری کەرەستەی بەکار هاتوو ، بەکار دەهێنن . گرنگی دان بە دەستنووس وەك ئەرکیکی مرۆڤایەتی و مێژوویی کەوتە ئەستووی رۆژئاوا . بەڵام وانەبی رۆژهەلأت بێ بەش بێت لەم

ئەرکە . هەندی لەرۆشنبیرانی رۆژهەلآت رۆژئاوا تومتبار دەکەن کە گەنجینەی رۆژهەلآتیان تالآن کردووە . و بە مەبەستی کولۆنیزمانە دەستیان داوەتە کۆکردنەوەی دەستنووس (٣) لەوانەیە ئەم رایە تائەندازەێك راست بێت ، بەلام رەشبینی و دەرمارگیری پیوە دیارە . پروفیسور ئەدوارد براون دەڵەمەندێکی بەریتانی یە و لە زانکۆی کمبریج مامۆستای زمان و ئەدەبی فارسی بووە . یەکەمین کەسەکەمێژووی ئەدەبی فارسی نووسیووە و زۆر دەستنووسی ساخ کردووە و دەستنووسە فارسیەکانی پێرست کردووە و ژیان و ماڵی لەخزمەتی ئێرانی بەکار هێناوە (٤) لەساڵی ١٨٢٩

بەرێزان charmoi , fraehn و میرزا جەعفەر توپچی باشیف لەرووسیا ، دەستیان داوەتە پێرست کردنی دەستنووسەکانی پەرتووکخانەی شیخ صەفی صەفەوی کە لە ئەردەبیل بووە و لەباتی باجی شەڕ لەلایەن قاجارەکان دراوەتە رووسیا . لەساڵی ١٨٥٢ بەرێز درن پێرستێکی بە زمانی فەرەنسی بۆ دەستنووسەکانی پەرتووکخانەی شچدرینی شاری لینین گرادی پێرستەکەی لە چاپ داوە (٥)

ئەڵمانیەکان درەنگ تر دەستیان داوەتە پێرستی کردنی زانستی و لە ساڵی ١٨٦٦ لەلایەن بەرێز J-Aumer پێرستی دەستنووسەکانی پەرتووکخانەی شاری مونیخی ئەڵمانیا لە دوو بەرگ و لە ساڵی ١٨٥٧ بەرگی سێیەمی پێرستی دەستنووسەکانی لە چاپ داوە (٦) سەدەی ١٩ی زایینی لە رۆژئاوا وا دەچتە پێش . کەچی لەهەمان کات لە دەوڵەتی عۆسمانی بابزانین چ رووی داوە . لە هێرِ شیکی لەشکری ترك (تورك) بۆ سەر میرنشینی بەدلیس لەسەردەمی میرعەبداڵ خان بەدلیسی لەزمانی ئەولیاچەلەبی ترك کە هاورێ

سوپای عۆسمانیەیە باس لەکارەساتیکی فەرهەنگی دەکا و باس لەتالآن کردنی پەرتووکخانەی بەدلیس دەکاو دەنووسی : ئەم تۆمارانە ئەوەندە بە هەرزان فرۆشران کە پارەکە بایی یەك نوختەیان نەبوو (٧) لەلایکی تر بازرگانێکی زەردەشتی هیندی . کە مرۆڤیکی زانا بووە بە ناوی مانوك جی هاتریا لەنێوان سالآنی ١٨٥٤ تا ١٨٩٠ لە دەوڵەتی قاجار و عۆسمانی ژیاوە و چەندین جار سەردانی کوردستانی کردووە . بە هەزاران دەستنووسی کڕیووە و ڕەوانەی ئەورووپای کردوون . سەرمایە و گیانی خۆی خستووتە مەترسی و ئێمە کوردیش دەبێ سۆپاسی هەوڵ و تەقەلآی بین . راستە بەمەبەستی بازرگانی و گەیاندنی ئەم دەستنووسانە بۆ رۆژئاوا کاری کردووە . بەلآم چوار دەستنووسی فارسی سەبارەت بە کوردی لە لەناو چوون پارستووە کەسێ دانەیان لە دەزگای کاما لەشاری بەمبەیی هیندستان پارێزراوە کە بریتین لە ١- تاریخ کشاف . تاریخ کردستان و تاریخ دنبلیها (٨) دەستنووسی چوارەم بەناوی مراه قاسان لە نووسینی عەبدولرەحیم کوڕی ئبراهیم ضە رابی یە . لەساڵی ١٩٥٦ لەلایەن دکتۆر ئیرەج ئەفشار لە ژیر ناوی (تاریخ کاشان) لە تاران لەچاپ دراوە . زانیاری بەسوود لەبارەی کوردەکانی شاری کاشان لەخۆ دەگری . نووسەریش یەکیکە لەو کوردانە . شایانی باسە بنەماڵەی صەباو ضە رابی کاشان بەشیکن لەکوردەکانیکاشان و رۆلێکی گرنگیان لە گەشانەوەی ئەدەب و هونەری ئێرانیان لە سەردەمی قاجار و پەهلەوی بینیوە (٩).

ئێران وڵاتیکی فرە نەتەوەی فرە ئایینە . هەموو چەشنە نەژاد تیدادەژین وەك ئاری . سامی . مەغول . قەفقازی . دراڤیدی و ڕەش پێست .

پایتەختیش تاکۆ ئێستا نەبوویتە فارسی یەك دەست . دەڤەری تاران تات نێشینە . هۆزی جۆراوجۆر بەشێوەی بارمەتە لەم شارە ژیاون کە ئەم ووتارە شوێنی ئەم باسە نیە وای لە شاری تارانی کردووە کە فرە فەرهەنگ بێت و دەستنووسی عیبری و ماندایی و ئەرمەنیش لە پاڵ فارسی و عەرەبی تیدا دەست بکەوی . وەقف کردنی پەرتووکیش لەم وڵاتە باوە . نمونەی هەرە گرنگیان . وەقف کردنی ١٤٣٨ دەستنووس لەلایەن سەید محەمەد صادق طە باطە بائی بۆ پەرتووکخانەی ئەنجومەنی شورای ئێران لە سەردەمی دواشای پەهلەوییە (١٠) سەیر نیە کە لە پەرتووکخانەکانی ئێران ، دەستنووسی کوردی بەرچاو بکەوی . نمونەی ئەو کوردانەی کە دەستنوسیان وقف کردووە کەم نین وەك بەڕێز ئەبو وەفای مۆعتەمدی کوردستانی ، کە کومەڵە دەستنووسێکی بە پەرتووکخانەی ( کتابخانە استان قدس رضوی ) شاری مەشهەدی پێشکەش کردووە. بۆ نمونە دیوانی مەولەوی و داستانی روڵە بزانی (١١) هەندی کەسایەتی ناکوردیش دەستیان هەبووە لە وەقف کردن و پێشکەش کردنی دەستنووس وەك بەڕێز ناصرئەلدەولەی مەجید فیروز کەلە شوێنی خۆی باسی دەکەین و بەڕێز حاجی محەمەد نەخجەوانی کە دەستنووسی عەقیدەی مەولەوی پێشکەش بە پەرتووکخانەی (کتابخانە ملی تبریز ) ی کردووە (١٢) لەم ووتارە باس لە ٤٤ بەرهەم کە لە ژێر ٣٣ ژمارەلە پێنج پەرتووکخانەی شاری تاران دەکەم . چوار پەرتووکخانە دەوڵەتین و پێنجەمین پەرتووکخانەی تایبەتی یە .

A – پەرتووکخانەی ناوەندی و بنکەی بەڵگە نامەی زانکۆی تاران ((۱))

ئەم پەرتووکخانەیە لە ساڵی١٩٦٤دامەزراوە و لەساڵی١٩٩٠ . خاوەنی پازدە هەزار دەستنووس و ٦٧٩٤ لولە میکرو فیلمی تیدا پارێزراوە (١٣) لەڕووی ژمارەی دەستنووسە کوردیەکان . ئەم پەرتووکخانەیە لە پلەی یەکەم وەستاوە . لەکاتی لێکوڵینەوەم بە هیچ شیوەێك هاوکاریان نەکردم . لەم پەرتووکخانەیە ٢٨ بەرهەم لەژێر ١٧ ناونیشان پارێزراوە .

١– مثنوی پریشان کرد

دیوانی مەلا پەریشانە (١٤) بەژمارە میکروفیلمی ف ٢٣٧٤ . گوایا ئەم میکروفیلمە لەسەر یەکیك لە دوو دەستنووسی پەرتووکخانەی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی وێنە گیراوە . پێرست نووس بێ دەمارگیری دان بە کورد بوونی مەلا پەریشان دەنێ (١٥) هەر چەند لە شوێنی تر و هەر لەباس کردنی مەلا پەریشان چاو دەبەستی و بە هەڵە ڕێنمایمان دەکات (١٦)

٢– دیوان ملا پریشان لر بختیاری (( بلهجه بومی))

دیوانی مەلا پەریشانە . بە ژمارەی ٤٣٣٧ و لە ١٢٤ لاپەڕەی ١٩ دێڕی ئەندازە ٩×١٨ و بەرگی مقەبای ١٣ × ٢١ پارێزراوە . دەستخەتی محەمەد تەقیەیە و دوو بەروار لەم دەستنووسە تۆمار کراوە ١٣٢٢/١١/٢٩ کۆچی و ٨ی شەوالی ١٢٨٩کۆچی . دەستخەتەکە بە شێوازی نەستەعلیقە . دیوانی مەلا پەریشان لەلاپەڕەی ٤ تا ١٢٨ ی ئەم دەستنووسەیە . دەستپێکی دەستنووس

اینه کان بس سیمرغ نوی        دهاب جواد ید طه وجه الله

کۆتایی دەستنووس

پس مغای ابە ز جشن و قیاس       کاظمین الغیظ عافین عن الناس

ڕای فرمی دەسەلآت لەئێران کە لووڕ کورد نین و زمانی کوردیش زاراوەیێکی فارسی یە (١٧) محەمەد تەقی دانش پژوە کە یەکیکە لە پێرست نووسە بە ئازمونەکانە دەبوا ناوی (لر بختیاری ) وەك زمانی دەستنووس دەست نیشان نەکا . بەلآم دەمارگێری سەری لیدەشیوێنی بۆ زانیاری دانی زیاتر بە خوێنەر لە پەراویز نووسیویتی بڕوانە : بەرگی ٩ی لاپەڕە ١٥٨ الذریعة فی اعلام الشیعه . کەلەم پەرتووکەش مەلا پەریشان بە کورد ناسراووە ! بۆ کەم کردن لە نرخی دەستنووسیش نووسیویەتی : بلهجه بومی . وواتە بەزاری خەلکی خیلەکی و خوجێبی واتە نائەدەبی سەیرە لەو هەموو لێك نەچوونە . هەر چەند زاری لووڕی بەختیاری کوردیە و شانازیە کە بەر هەمیکمان بەم زارا وە نووسراو بێت .

٣- دیوان پریشان لك (١٨)

دیوانی مەلا پەریشانە . بەژمارە میکروفیلمی ٦٠٦٢ . لە ٦٦ لاپەڕەی ئەندازە ١٢× ٢٠ نووسراوە کە بریتیە لە ١٠٥٣ بەیت و لە ڕووی دەستنووسی حەمید ئێزەد پەناه ئەم میکروفیلمە گیراوە.((٢)) دەستخەتی کەربەلایی ((٣))محەمەد حەسەن کولی وەندە وبە فەرمانی حەسەن خان فەرەج ئەلآ خانی کولی وەند . لە ڕۆژی هەینی ٢ی شەوالی ١٣٤٩ کۆچی و بە شیوازی نەستە علیق نووسراوە محەمەد تەقی دانش پژوهی پێرست نووس ئەمجارە دەنووسی بەزاراوەی لەکی کەتێکەلآویکە لە زاراوەی لووڕی و کرماشانی و صەحنەیی . ئەم تبینیەیە تائەندازەیك ڕاستە بەلآم بۆ هەر جاریك بە ناویك ئەم دەستنووسە لەڕێ ئەو دێتە ناسین ؟ هەر لەبەر دەمارگیریە وەبەس .

٤ – جنگ هماوند ( شاەنامە ) (١٩)

ـ ستانیکە بە زاراوەی لەکی نووسراوە . بە ژمارەی میکروفیلمی ٦٠٥٢ . ئەم میکروفیلمە لە سەر دەستنووسی حەمید ئیزەد پەنا گیراوە.

٥ – مثنوی های کردی (٢٠)

کومەلە دەستنووسیکە . کە بریتین لە ١– حمزە نامە ٢– مثنوی محمد حنفیە نووسراولە ١١٧٣ھ ٣–حاتم نامە ٤ – محشر نامە ٥ – جلندی نامە ٦ – شیرافکن . ئەم شەش دەستنووسە لەژێر ژمارەی میکروفیلمی ژمارەی ف ٣١٥١ پارێزراوەو لە ١٨٦ لاپەڕە نووسراوە . ئەم میکروفیلمە وێنەی دەستنووسی ژمارە ١٩١ی پەرتووکخانەی (کتابخانە دانش سرای عالی تهران) ە . دەستنووسی (( محمد حنفیە )) ساڵی ١١٧٣ کۆچی لەسەرە کە ئەویش گرنگی ئەم دەستنووسە نیشان دەدا . لە پەرتووکخانەی نیشتمانی پاریس لەژێر ژمارەی ٧٧٧ و لە ٣٥ لاپەڕە پارێزراوە ماموٚستا محەمەد عەلی قەرەداغی باس لە دەستنووسیکی تر لە شاری بەغدا لە ژیر ژمارەی ٢٤٧٩٩ کە لە ٦١ لاپەرەیە دەکا(٢١)

٦– داستان خواجە اشرف و درویش بچە و گل چهرە دختر خجند وزیر (٢٢)

داستانیکە بەزاراوەی گوٚران و بە ژمارە میکروفیلمی ف ٣١٥٢. ئەم میکروفیلمە وێنەی دەستنووسی ژمارە ١٥٩ی پەرتووکخانەی (کتابخانە دانش سرای عالی تهران ) ە لەشاری مەشهەدیش بەرگیکی ئەم دەستنووسە کەلە ٥٧ لاپەڕەیە لەلایەن حاجی سەید عەلی ئەصغەر ئەصغەر زادە نووسراوە (٢٣)

۷- جنگ نامەنادری(۲٤)

یەکێکە لە بەرهەمەکانی سەر هەنگ ئەڵماس خان کنوڵەیی کە بە زاراوەی گۆران نوسراوە . سەرهەنگ ئەلماس خان یەکیکە لەسەر کردەکانی نادرشای ئەفشار و خاوەنی چەندین بەرهەمە وەك : هەفت لەشکر . شیرین و فەرهاد و خورشید و خەرامان (۲٥) ئەم داستانە بە نادر و توپاڵیش ناسراوە . ئەم میکروفیلمە بە ژمارەی ۳۲۸ . کە وێنەی دەستنووسی ژمارەی ۱۳٦ پەرتووکخانەی (کتابخانە مجلس شورای اسلامی ایران ) ە ولەویَ بە جنگ نامە الماس ناسراوە .

۸- دفتر سرانجام و کۆمەڵە هۆنراوەیکی کوردی (۲٦)

لەم میکروفیلمە دوو دەستنووسی کۆکراوەتەوە . یەکەمیان دفترسرانجام بە خامەی کاکایی سەید دەرویش کەریم توت شامی یە ((٤)) پێشەکیکی فارسی هەیە . هونراوەکان بەزاراوەی گۆرانە و باس لە بابەتی ئایینی یارسان دەکا دەستخەتی سەید کازم نیك نەژادە و لە ۸ی شەهریوەری ساڵی ۱۳۳۷ کۆچی هەتاوی (هاوێنی ۱۹٥۸ ) بە شیوازی نەستە علیق نووسراوە.

نامیلکەی دووەم . بریتیە لە کۆمەڵە هۆنراوەیکی ئایینی یارسانە بە خامەی سیَ لە شاعیرانیان . شایانی . شاعیرانیش بریتین لە ۱- میرخسرو ۲- مطهر میر احمد لرستانی ۳- پیربنیامین . ئەم سیَ نەفەرە لە شاعیرانی یارسانن و بە زاراوەی گۆران هۆنراوەیان هونیوە . دەستخەتی نەستەعلیق سەدەی ١٤ی کۆچیە .

هەردوو دەستنووس بە ژمارە میکروفیلمی ف ۳۷٥۲ کە کوپی دستنووسی مۆراد ئەورنگە ((٥))

٩- کەشکوڵ (٢٧)

ئەم کەشکوڵە بە ژمارە ٣٩٩٦ و بەشی ٢و٣و٤ی کوردیە . گشت کەشکوڵە کە بریتیە لە ١٦٤ پەڕی ١٢ دێڕی کاغەزی فەرەنگی ئەندازە ٦× ١٣ . بەرگی تیماجی ڕەشی مەیلەو قاوەیی ئەندازە ١١× ١٨دەستخەتی یەحیایە ولە ١٣٠٤ کۆچی بەشیوازی نەستەعلیق نووسراوە. لە لاپەڕی ٨٨ هۆنراوەێکی یەحیا جوانرویی یە . دەستخەتیکی جوانی هەبووە بە تایبەتی لەنەستەعلیق گوڵستانیکی سەعدی . دیوانی مەولەوی و دیوانی هۆنراوەکانی خۆی لێ بەجی ماوە و هەروەها چەندین کەشکوڵ لە هۆنراوەی کوردی و فارسی شاعێرانی کورد بەرهەمی خامەی ئەوە (٢٨).

بەشی دووەمی کەشکوڵ ( دیوانی غزلهای ملا خضر نالی کرد) هۆنراوەکانی نالیە لە لاپەڕە ١٠٠ تا ١٦٤ . سەرجەم دووهەزار بەیتە و لە لاپەڕە ١٥٤ تا ١٥٧ هۆنراوەێکی نالی لە هەجوی مەستورەی ئەردەلان و وەلامی ئەو تیدا تۆمار کراوە . دەستپێکی دەستنووس

ای جلوه درحسن و جوکیش تماشا

سر رشته دین بی مدد تونیه حاشا

کۆتایی دەستنووس

راستی صیقلیه تیغ زبان نالی

تندونرم اوی گلو گیره قصه بی دیره

بەشی سێیەمی کەشکوڵ ( دیوان از مثنوی و قطعة ورباعی از ملا عبدالرحیم معدوم ) لەلاپەڕەی ١٨١ تا ٣١٩ و بریتیە لە هەزار و هەشت صەد بەیت.

دەستپێکی دەستنووس

اینه کامل ازیز که فرد  فدای امات بون صفاییت اورد

کوتایی دەستنووس

واز اواش وك ریشه مستیم برد  ریشه کوتره جرگم براورد

بەشی چوارەمی کەشکوڵ بریتیە لە هۆنراوەی کوردی .عەرەبی و فارسی شاعێرانی کوردە ، ئەم کەشکوڵە بە نرخە لە تووی ١٦٤ پەڕ وواتە ٣٢٨ لاپەڕە نووسراوە کە بەڕاستی بە نرخە

**١٠. جنگ ( شاه بهرام ، خورشید و خاور ، شیخ صنعان ، لیلی و مجنون ) (٢٩)**

میرزا محەمەد صادق، لە ساڵی ١٢٨٩ کوچی ئەم چوار داستانەی بۆ محەمەد ئاغا کوڕی مەحموود ئاغا کوڕی محەمەد ئاغا کوڕی خواجە صادقی نووسیوە بە ژمارەی ٤١٨١ لە ٣٩٢ لاپەرەی ١٠ دێریە ، کاغەز فەرنگی رەنگاوڕەنگە بە ئەندازەی ٩×١٦ و بەرگی تیماجی قاوەیی ئەندازە ١٢×٢٠ دەستخەتی نەستەعلیقی میرزا محەمەد صادقە . دەستنووسی یەکەم (شاه بهرام)ە و بە زاراوەی گۆرانە و بە (بهرام و گلندام) یش ناسراوە .

دەستپێکی دەستنووس

فلك ، مهره نرو مرشانان امشو  موتم نه دفتر مروانان امشو

کۆتایی دەستنووس

یا فکری بگیرند پرده ظهیر  فردش میزان گر چون پیکان تیر

دەستنووسی دووەم (خورشید و خاور)ە ، یەکێکە لە بەرهەمەکانی دەرویش قۆلی کەرەندی و لە رۆژی پێنج شەممەی ٢ی مانگی رەبیعی دووەمی ساڵی ١٢٩٨ کوچی نووسراوە .

دەستپێکی دەستنووس

دمای حمد ذات جهان افرین　　　یادم به تعریف شای خاور زمین

کۆتایی دەستنووس

مصطفى وسن دنیایی وفسان　　　کار و بازارش بی شرطی وجفان

دەستنووسی سێ یەم (شێخ صنعان)ە

دەستپێکی دەستنووس

بوا چون تعریف صنعان گمراه　　　چه گمراهی دلش چون پرسش براه

کۆتایی دەستنووس

الحمد لله باقی والسلام　　　خاتم الكتاب یاوا انجام

هزاران درود و هزاران سلام　　　زمابر محمد علیه السلام

دەستنووسی چوارەم برێتیە لە ( لیلی و مجنون )

دەستپێکی دەستنووس

بنام دانای جهان پیداگر　　　بلبلان چه عشق شیت و شیداگر

کۆتایی دەستنووس

غریق رحمت یزدان کسی باد　　　که کاتب را با الحمدی کند یاد

لە هەندی شوێن هۆنراوەی ئەحمەد بەگی کوماسی ، سەید عەبدوالحکیم ، ئاغا برا بەگی کوڕی ئاغا مەحموود ، میرزا شفیع و فردی هاتووە دەستنووسێکی لەیلی و مەجنون بە زاراوەی گۆران . بە ژمارەی add.7829 و دەستنوسێکی تر بە ژمارەی add.7828. دەستنووسێکی بهرام و گلندام لە نووسینی ئەمین کە لە ساڵی (١٠٤٧ کوچی ١٧٣٤ز )

لێبویتەوە لە ژێر ژمارەی or.1433 لە موزەخانەی بەریتانیا پارێزراون .
دەکرێ بۆ بەراورد سوودیان لێوەربگێری (٣٠)

**١١. جنگ (٣١)**

کەشکۆلیکە و لە بەشی حەفدەی نووسراوە ( کلام شعر نالی بە کردی ) و لە لاپەرە ٤٣٤ دەست پێدەکا ، ئەم کەشکۆلە بە ژمارەی ٧٥٣٥ و پێرست نووس لەوە زیاتر زانیاری نەداوەتە دەست .

**١٢. داستان جواهر پوش ( رستم ایرانی و افراسیاب تورانی ) (٣٢)**

داستانێکی کوردیە بە زاراوەی گۆران و بە ژمارەی ٢٥٤١ و لە ٢٧٥ لاپەرەی دێڕ جۆراوجۆرە کاغەزی سپی رووسی یە ، بەرگی تیماجی قاوەیی ئەندازە ٢١×١٧ دەستخەتی سەدەی چواردەی کوچی یە و بە شیوازی نەستەعلیق و شکەستە نەستەعلیقە بە خامەی مەلا نور عەلی کوڕی کویخا شیرعەلی خەڵکی (مزرعە جامە شوران) لە رۆژی یەك شەممە مانگی صەفەری ساڵی ١٣٠٦ کوچی لێبوتەوە لە سەر داواکاری مەلا سوهراب خان کوڕی کەربەلایی صەفەربەگ دانێشتوی سەراب کرماشان نووسراوە، لە کۆتایی دەستنووس ساڵی ١٣٣٣ کوچی نووسراوە و ئەم مۆرانە لە سەر لاپەڕەکانی نەخشینراوە : علی اصغر ، محمد علی خان ، میر سید محمود ، یا علی ، سەرەتای دەستنووس سێ لاپەرە و لە کۆتایی چوار لاپەرەی سپی تیدایە.

سەر دێرەکان بە فارسی یە و بریتیە لە ١٠٣ ناونیشان کە بە ( امدن یاقوت پوش و لعل پوش و رزم نمون با سپاه) و( بە گرفتن جهان بین قاموس را و کشتن قاموس ) کۆتایی دێت .

دەستپێکی دەستنووس

بسم الله الرحمن الرحیم		صنایع بی چون رحمن الرحیم

کۆتایی دەستنووس

خروار بخروار گنج کس ندار		یك سرو پیش کس شی با ایران و یار

١٣. کتاب درویش بچە (٣٣)

داستانێکە بە زاراوەی گۆران و بەرهەمی ئیسماعیل کوردە و لە ساڵی ١٢٧٥ کوچی تەواوی کردووە بە ژمارەی ٤٥٤٦ ، لە ٢٠٨ لاپەرەی ١٥ دێری ، کاغەز فەرهەنگی ئەندازە ١٥×٧ ، بەرگی تیماجی سووری ئەندازە ١٩×١٢ ، دەستخەتەکە لە رۆژی دووشەممەی ١٣ی شەوالی ساڵی ١٣٠٦ کوچی نووسراوە . شیوازی نووسین نەستەعلیقە ناوێکی تری ئەم دەستنووسە (فرد هوشنگ شاە)ە کە چیرۆکی هوشەنگ شاو هەر دوو وەزیرەکەی ئاصف و فەرزانەیە .

دەستپێکی دەستنووس

بسملە یکتای لم یزل		کریم کار ساز یکتای لم یزل

کۆتایی دەستنووس

هزاران درود و هزاران سلام		زمابر محمد علیە السلام

١٤. جنگ (٣٤)

کەشکۆلیکە لە لایەن (محمود کردستانی سنی) نووسراوە (٣٥) مەلا محموود مۆفتی کوردستانی (١٩٥٩_١٨٨٦) خوشنوسیکی خوش خامە و زانایێکی ئایینی بەرز و مامۆستا بووە لە زانکۆی تاران ، ویدەچی هەر بە خۆی ئەم کەشکۆلەی پیشکەشی زانکۆی کردبێ لە زۆر شوێن هەندی بەروار بەر چاو

دەکەوی وەك (١٢٧٦_١٢٧٧_١٢٨٢_١٢٨٣). بە ژمارەی ٤٧٨١ و لە ١٦٤ لاپەڕەی کاغەزی سپی ئەندازە ٧×٨ و بەرگی مقەبای ئەندازە ٩×١١ و بەختی نەستەعلیق نووسراوە . ئەم کەشکۆڵە بۆ هونراوەی : کوردی ، فارسی ، عەرەبی و تورکی . شاعێرە کوردبێژەکان بریتین لە :

اخضر ، باقی ، کشفیا ، ابو المعالی کوڕی کشفیا ، و شفیع . بەرانبەر ابن همام نووسراوە شاعر کرد نژاد (شاعێری کورد نەژاد) و هۆنراوەیێکی عەرەبی تۆمار کراوە .

**١٥. جنگ (٣٦)**

لە لایەن میرزا ئەبو حەسن تاج حسێنی کە لە نێوان سەدەی ١١و ١٢ی کۆچی دەژیا کۆکراوەتەوە . بە ژمارەی ٣٠١٥ ، لە سەر کاغەزی ئەصفەهانی ئەندازە ١٩×٧/٥ و لە هەر لاپەڕەیێك ١٨ دێرنووسراوە ، دەستخەتی نەستەعلیق سەدەی یازدەی کۆچی یە. بابەتێکی سەیر لە لاپەرە (٢٠٣) بەرچاو دەکەوی کە برێتیە لە شیوازی مارە برین لە کوردستان (مەبەست سنەی ئەردلانە ) و گوتەی مارەبرین (نکاح) و جیابوونەوە (طلاق) بە زمانی کوردیە .

**١٦. شیرین و فەرهاد (٣٧)**

یەکیکە لە بەرهەمەکانی ئەڵماس خان کنوڵە یی یە . بە ژمارەی ٤٧٧٢ ، لە ٢٢٠ لاپەرەی ١٢ دێریە ، کاغەزی فەرەنگی ئەندازە ٨×١٥ ، بەرگی تیماجی قاوەیی ئەندازە ١٣×١٧ ، نێوەی لاپەرەی یەکەم براوە ، ئەم دەستنووسە بە دەستخەتی هادی کرمانشانی یە و بە شیوازی شکەستە نەستەعلیق ، لە رۆژی هەینی ١٢٩٨ کۆچی نووسراوە . خوشنووس (بە هادی کرمانشاهی کتابدار) یش ناسراوە

دەستپێکی دەستنووس

کریم کار ساز کار بە دەست اسان          شاه رضای شریف رهبر

شناسان

کۆتایی دەستنووس

هزاران درود و هزاران سلام          زمابر محمد علیە السلام

**١٧. ورقە گلشاه (٣٨)**

داستانێکە بە زاراوەی گۆرانە ، چیرۆکێکی ئەفسانەییە کە رووداوەکانی لە یەمەن رودەدەن بە ژمارە میکروفیلمی ١٣٧٨ و لە ١٦٣ لاپەرەیە ، دەستخەتی حاجی ئاغای کەندوڵەیی و بە شیوازی نەستەعلیق نووسراوە و سەرەتا و کۆتایی دەستنووس دیار نیە . ئەم میکروفیلمە وێنە دەستنوسی ژمارە or.oct.1196 پەرتووکخانەی ماربورگ MARBURG ئەڵمانە . ئەم داستانە لە ساڵی ١٩٩٩ لە لایەن دکتور فاتمە مودەریسی (٣٩) : دوای ساخ کردنەوە و لێکدانەوە لە چاپی داوە .

دەست پێکی دەستنووس ( بە پێ ساغ کردنەوەی دکتور فاتمە مودەریسی )

بەنی عەمر نامێ نیشتەبی وە تەخت          هەر دەم مواتش یاری

کەردەن بەخت

کۆتایی دەستنووس

چون مەرگ وەرقە تەمام کەردن فاش          خەلایق یە یەك ئامان

جەلاش

B_ پەرتووکخانەی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی ئێران( (٦))

ئەم پەرتووکخانەیە لە ساڵی ١٩٥٠ دامەزراوە. خاوەنی ١٧٦٩٠ دەستنووسە . و لە دوو باڵاخانە پێك هاتووە و لە ساڵی ١٩٨٩ نێزیك ٢٢٨١٥ پەرتوكی فارسی و عەرەبی و ١٦٩٦٩ پەرتووكی لاتین لەم پەرتوكخانەیە پاریزراوە . (٤٠) رێزدار عەبدولحسێن حائری سەرۆكی ئەم پەرتووكخانەیە بە دڵێكی فراوان پێشوازی لێكردم و ئامادە بوو كە هەر زانیاری و یارمەتیك سەبارەت بە دەستنووسەكان پێشكەشم بكا ، و بە هیمەتی ئەو بوو كە توانیم چەند دەستنووسیك فۆتۆكوپیٚ بكەم . لەم پەرتووكخانەیە ٨ دەستنووسی كوردی پارێزراوە .

١. پریشان نامە (٤١)

دیوانی مەلا پەریشانە ، پێرست نووس بە ( ملا پیشان کرد کرمانشاهی )بە ئێمە دەناسێنی ،بە ژمارەی ٥٧ ژمارە تۆماری كۆن (شمارەی ثبت قدیم) ٤٤٤٢١ ژمارەی نۆی (شمارە جدید) ٥١٨٥ لە ٢٦ لاپەرە كاغەزی فەرنگی سپی ئەندازەی ١٢/٥ × ٢٠/٥، بەرگی تیماجی سوور بە ژمارەی دێری جێواز بە دەستخەتی خان بابا و شێوازی شكەستە نەستەعلیقە و لە سەرتای سەدەی ١٤ ی كۆچی نووسراوە. لە لایەن بەرێز (ناصرالدولە مجید فیروز) پێشكەشی ئەم پەرتووكخانەیە كراوە، ناوبراو یەكیكە لە شازادەكانی قاجار، لە پەراوێزی ئەم دەستنووسە مانای ووشە كوردیەكان نووسراوە . سەرەتای دەستنووس بە فارسی نووسراوە.

دل و بحر ژرف فکر فرو رفتن

تا یك رباعی مطبوعم گفتن

**دەستپێکی دەستنووس:**

من ژ بسم الله من ژ بسم الله

ابتدا مکم من ژ بسم الله

**کۆتایی دەستنووس:**

ف فقر و فامە و فنا و مجل

خیر الکلام دات و قل و دل

**٢- مثنوی در حکمت الهی (پریشان نامە) ٤٢**

دیوانی مەلا پەریشانە، بە ژمارەی ٣٢٦٠ ژمارەی تۆماری کۆن (شمارە ثبت قدیم)

٦٨٤١ ژمارەی نۆی ( شمارەی جدید) ٦٢١٥ چەندین بابەت لە ژیر ئەم ژمارەیە کۆ کراوەتەوە و پەریشان نامە، ژمارە سێزدەیە و لەلاپەڕەی ١٨٧ تا ٢٠٣دایە و سەرجەم ١٧ لاپەڕەی ١٩ دێریە . کاغەزی سپی فەرەنگی ١٨×٢٨ بەرگی تیماجی بێ مقەبایە. بە دەستخەتی معین الرعایا و محەمەد هاشمە و بە شێوازی نەستەعلیقە.

**دەستپێکی دەستنووس:**

من ژ بسم الله من ژ بسم الله

ابتدا مکم من ژ بسم الله

**کۆتایی دەستنووس:**

پس معنای ایە چنین و قیاس

کاظمین الغیظ عافین عن الناس

**٣- بدایع اللغە. ٤٣**

یەکیکە لە بەرهەمەکانی عەلی ئەکبەر وەقایع نگاری کوردستانی ناسراو بە ئەفسەر کە لە ساڵی ۱۹۹۰ لە لایەن مامۆستا رەئووف تەوەکولی ساغ و لە چاپ دراوە. فەرهەنگێکی کوردی فارسی یە. نووسەر لە بنەماڵەی قادری و ئاموزای مەستوورەیە و لە ساڵی ۱۳۱۷ کۆچی مردووە. لەبەر هەمەکانی:

۱- دیوانی هۆنراوەی فارسی ۲- حدیقه ناصری ۳- پاشکۆ لەسەر تاریخ اردلان مەستوورە ٤- تاریخ طوایف بنی اردلان ٥- وبەرهەمی تر (٤٤)

ئەم فەرهەنگە لە ساڵی ۱۲۸٦ کۆچی لە سەرداوای فەرهاد میرزای قاجار (معتمد الدوله) نووسراوە و لە ۲٥/ ربیع الاول/ ۱۲۸۷ کۆچی تەواو بووە. بە ژمارەی ۸٤٤ ژمارە دەفتەری (شماره دفتر ) ۱۳۳۰۸ لە ۲۸۰ لاپەڕەی ۱٤ دێڕی کاغەزی فەرەنگی ئەندازە ۱۷×۲۱/٥ و بەرگی تیماجی بە دەستخەتی نەصرئەلای کوردستانی و لە ساڵی ۱۲۸۷ کۆچی بە شێوازی نەستەعلیق نووسراوە.

**دەستپێکی دەستنووس:**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

حمداً لمن کل لسان الکل فی بیانه و لوجری یجری علی عنوانه. انطق کل طائفة من عباده بلغه تخصه فی تفهیم مراده....

**کۆتایی دەستنووس:**

....انشاء نموده و این بنده درگاه انرا برشته تحریر در اورده. تحریر فی بیست و پنجم ربیع الاول سنه ۱۲۸۷.

٤- زوهرا اللغه: ٤٥

لە نووسینی ئەبونەجیب محەمەد جوانڕوویی یە، کە لە نێوەی دووەمی سەدەی دەیەمی کۆچی نووسراوە. بە ژمارەی ٨٥٧ ژمارەی دەفتەری ( شمارەی دفتر) ١٤٧٦٨، لە ١٢٨ لاپەڕەی دە دێڕیە، کاغەزی سپی فەرەنگی ئەندازە ٣٥×٢٣ بەرگی مقەبا بە دەستخەتی یاسین کوڕی عۆمەر کوڕی محەمەد کوڕی حاجی سلێمان بە شێوازی نەستەعلیق لە شەوی یەك شەممەی ٢٠ ی رەبیعی یەکەمی ساڵی١٢٠١ کۆچی لە روونووس کردنی بوویتەوە فەرهەنگێکە کە ووشە ئاڵوزەکانی گۆڵستان و بوستانی سەعدی و یوسف و زۆلەیخای جامی بە فارسی ، عەرەبی ، کوردی ، تورکی و هێندی لێك داوەتەوە. مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی باس لە شەش دەستنووس بە ژمارەی (١٩٩٨٨/٢٤٧٠١/ ١١٨٤٠/٤٩١٨/٢٥٥٨٢/٤٩٦٩) لە یەکیکە لە پەرتووکخانەکانی شاری بەغدا پارێزراوە.(٤٦)

**دەستپێکی دەستنووس:**

**بسم الله الرحمن الرحیم**

حمدوسپاس بی قیاس مرخدایراست که نگارنده سماست به اختر و زمین به بشر و گلستان و بوستان بشکوفه و زهر و درود تمام

**کۆتایی دەستنووس:**

....علی ید احقر العباد یاسین بن عمرابن محمد ابن حاجی سلیمان . تمت فی لیله الاحد بعد اذان العشاءبعشرین شهر ربیع الاول فی سنه ١٢٠١

**٥- جنگ نامه، الماس ٤٧**

پێرست نووس مەلامحەمەد مۆراد کوڕی نور عەلی زەنگەنە بە نووسەری ئەم دەستنووسە دادەنی کە هەڵەیە و لەڕاستی دا ناوبراو خاوەنی

دەستنووسەکەیە و نووسەر ئەڵماس خان کنۆڵەیی یە، کە بە سەرهەنگ ئەلماس خانیش ناسراوە و لەم دەستنووسە ساڵی نووسینی ئەم داستانە کە بە زاراوەی گۆران نووسراوە ١١٤٧ کۆچی تۆمار کراوە. کە ئەوەش سەیرنیە چونکە لە ساڵی ١١٤٦ شەڕێکی گەورە لە نێوان نادرشای ئەفشار و توپاڵ پاشای عۆسمانی رویداوە و بەتیك شکانی نادر شای ئەفشار کۆتایی هاتووە و ئەڵماس خان بە خۆی بەشداری شەڕی کردووە. ئەم داستانە بە نادر نامەش ناسراوە ، ئوباڵی ئەم شکەستە لە سەردمی خۆی خراوەتە پاڵ سەرهەنگ ئەڵماس خان و تووشی ئەشکەنجە و دوورخستنەوە و ئازار هاتووە.(٤٨)

ئەم دەستنووسە بە ژمارەی ١٣٦ و لە ١٨٠ لاپەڕەی ١٤ و ١٦ دێری کاغەزی سپی ئەندازە ٨×١٥ و بەرگی تیماجی بەڕەنگی کل بە مقەبا تێهەڵکێشراوی ئەندازە ١٢×١٨. بە دەستخەتی مەلافەرەج ئەلاَی کوڕی عەزیز ئەلاَی تۆرکاشوەندە کە لە رۆژی چوارشەممەی ١٨ ی صەفەری ساڵی ١٢٧٧ کۆچی ، بە شێوازی نەستەعلیق نووسراوە.

٦- مثنوی کردی:(٤٩)

ئەم داستانە بە ژمارەی ٥٧٩ لە ٢٧٨ لاپەڕەی ١٤ دێڕی کاغەزی سپی ئەندازە ٧×١٣ بەرگی تیماجی ترياکی ئەندازە ١١×١٦ ، دەستخەتی ئەم دەستنووسە بە شێوازی نەستەعلیقی سەدەی ١٣ ی کۆچی یە، سەردێڕەکان فارسی یە.

١- رفتن ابو المحجن و سعد و قاص به شهر ناهید شاه.

٢- رسیدن خبر ناهید شاه به نزد قطال شاه و سپاه اوردن قطال شاه

٣٠- امدن صلصال شاه به میدان و جنگ مغلوبه شدن.

کۆتایی دەستنووس فەوتاوە.

**دەستپێکی دەستنووس:**

بم اول خالق دانای کردگار

رسولش احمد مصطفی نازدار

**٧- شیرین و فرهاد (٥٠)**

چەندین شیرین و فەرهاد لە ئەدەبی کوردی هەیە، کە یەکیکیان بە خامەی وەلەد خان گۆرانەوە ئەوی تر بە خامەی سەرهەنگ ئەڵماس خان کنوڵەیی یە.

ئەم دەستنووسە بە ژمارەی ٥٨٠ و لە ٢٢٠ لاپەڕەی ١٣ دێڕیە و کاغەزسپی ئەندازە ٨×١٢

بەرگی تیماجی ترياکی ئەندازە ١٤×٢٠ . دەستخەت بە شێوازی نەستەعلیقی سەدەی ١٣ی کوچی یە . سەرەتا و کۆتایی دەستنووس فەوتاوە . سەردێرەکان فارسی یە . یەکەمین سەردێر (خواب دیدن خسرو شیرین را ) دوا سەردێر ( دیوانه شدن سرو و رو به صحرا نهادن ، خود را از کمر به زیر انداختن ) نووسەری ئەم دەستنووسە بۆ من ساغ نەبوویتەوە .

٨. رباعیات بابا طاهر (٥١)

چوارینەکانی بابا تایری هەمەدانی یە کە بە ( بابا طاهر عریان ) یش ناسراوە . بە ژمارەی ٤٩٤٨ و ژمارەی دەفتەری ( شماره دفتر ) ٦٥٠١٩ ئەم نامیلکەیە بە ژمارەی چواردە لەم کۆ دەستنووسە پارێزراوە . لە سەر کاغەزی سپی ئەندازە ١٤×٢١ و بەختی شکەستە نەستەعلیق نووسراوە . لە

لاپەرەی ١١٢ و ١١٦ ، ٤٨ چوارێنە لەخۆ دەگرێ ، بەرگی دەستنووسەکە تیماجی شینی ڕەش باوە .

**C : پەرتووکخانەی میللی مەلەك ((٧))**

ئەم پەرتووکخانەیە لە ساڵی ١٩٣٧ لە لایەن بازرگانێکی تارانی بە ناوی مەلەك دامەزراوە .

لە ساڵی ١٩٨٩ خاوەنی ٦٥٢٧ دەستنووس و ٦١٧٦ لولە میکروفیلمە . بێجگە لە ٢١٠٨٨ پەرتووکی فارسی و عەرەبی و ٣٦٠٠ پەرتووکی لاتینی ( مەبەست بە زمانەکانی ئەورووپی یە ). ئەم پەرتووکخانەیە یەکیکە لە هۆبەکانی پەرتووکخانەی ( کتابخانه استان قدس رضوی ) (٥٢) و ٤ دەستنووسی کوردی لەم پەرتووکخانەیە پارێزراوە .

**١. مثنوی از ملا پریشان کرد (٥٣)**

دیوانی مەلا پەریشانە ، بە ژمارەی ٤٦١١ ، کە لە ٥٠ لاپەرەی ١٢ دێری یە کاغەزی سپی فەرەنگی ئەندازە ١٢/٩ × ٢/٢٠ بەرگی تیماجی مەڕە ، بە ڕەنگی سووری عەنابی یە ئەم دەستنووسە جوانکاری و نیگاری هەیە و بە رەنگی زێرین و سوور نووسینی تیدایە . لە مانگی ذی حەجە ساڵی ١٣٠٠ کۆچی بە شێوازی نەستەعلیق نووسراوە . بریتیە لە هەزار بەیت و ( معراج نامە )لە خۆ دەگری.

**٢. جواهر پوش (٥٤)**

دەستنووسێکی تری ئەم داستانە لە پەرتووکخانەی ناوەندی زانکۆی تارانە . ئەم دەستنووسە بە ژمارەی ٤٦١٦ و لە ٢٩٤ لاپەڕەی ١٣ دێرییە و لە کاغەزی فەرەنگی سپی ئەندازە ١١×١٧/٣ و بەرگی تیماجی ڕەش نووسراوە .

دەستخەتی بەهرام میرزای لەنگی کوری عەباس خوشخوانە و لە ١٢ی ڕەجەبی ساڵی ١٣٠٧ کۆچی بە شێوازی شکەستە نەستەعلیق نووسراوە . سەردێڕەکان بە فارسی یە و بە ڕەنگی سوور نووسراوە لە سەرەتای دەستنووس چەند لاپەڕێك بزر بووە . ئەم داستانە باس لە شەڕی نیوان ئێران و تورانە لە سەردەمی پادشایی کەیخسرو رووی داوە .

٣. رباعیات بابا طاهر همدانی (٥٥)

بە ژمارەی ٢٥٠٤ ، لە نامیلکەی ژمارەی پێنجی ئەم کەشکوڵەیە . لە سەر کاغەزی سپی فەرەنگی ١٠ و ١١ دێری ئەندازە ١٠×١٧ نووسراوە بەرگی تیماجی ڕەش سەردێر بە مەرەکەبی سوور نووسراوە لە یەکەمی مانگی صەفەری ساڵی ١٢٨٨ کۆچی و بە شێوازی شکەستە نەستەعلیق نووسراوە.

٤. رباعیات بابا طاهر همدانی (٥٦)

بە ژمارەی ٣١١٢ . لە نامیلکەی ژمارە شەشی ئەم کەشکوڵەیە . لە سەر کاغەزی ترمەی ١٧ دێری ئەندازە ١٢/٥ ×١٨/٢ و بەرگی تیماجی ڕەش و دەستخەتی شکەستە نەستەعلیق و نەسخەکە لە ساڵی ١٣٠٦ کوچی نووسراوە . سەردێڕەکان بە مەرەکەبی سوور نووسراوە .

چەندین دەستنوسی دیوانی بابا طاهر هەمەدانی لە پەرتووکخانەکانی جیهان پارێزراون ، لە پەرتووکخانەی لینین لە شاری مۆسکو دوو دەستنووس بە ژمارەی ٥٢ و ١٩٢٦ پارێزراوە . و چەندین جار دیوانی لە چاپ دراوە ، چورینەکانی ناوبانگیکی جیهانیان هەیە .

**D : پەرتووکخانەی میللی ئێران ((٨))**

ئەم پەرتووکخانەیە لە چەندین شوێنی شاری تاران هۆبەی هەیە و هەرکامەیان بەشێك بەڕێوەدەبەن . بەشی دەستنووسەکان لە یەکێکە لە کوشکەکانی شای پەهلەوی لە سەر شەقامی نیاوەرانە ، ئەم پەرتووکخانەیە لە ساڵی ١٣٣٧ دامەزراوە . لە ساڵی ١٩٨٩ خاوەنی ١٣٠٠٠ دەستنووس و ٧٠٠ لولە میکروفیلمە . هەروەها ١٥١٢٤١ پەرتووکی فارسی و عەرەبی تیدا پارێزراوە کە چەندین پەرتووکی کوردی چاپی مۆسکو لەوی پارێزراوە. ئەوە بێجگە لە پەرتووکی عەرەبی لە سەر مێژووی کورد (٥٧) لەم پەرتووکخانەیە ٣ دەستنووسی کوردی پارێزراوە .

١. **مجموعە اشعار در تهنیە جشن ولادت ناصرالدین شاه (٥٨)**

کۆمەلە هۆنراوێکە لە ساڵی ١٣٠٥ کۆچی بە بۆنەی رۆژی لە دایك بوونی (ناصرالدین شاه قاجار) گوتراوە . کە لیستی ٣٠ شاعیر لە خۆ دەگری. کە کۆی بەختیاری بە یەك هۆنراوەی فارسی و دوو هۆنراوەی بە زاراوەی کوردی بەختیاری تاقە شاعیری کوردە کە هۆنراوەی کوردی هۆینووە لەم یادە .

ئەم دەستنووسە بە ژمارەی ٣٨٤ رف و لە سەر کاغەزی بووری چواردە دێری ئەندازە ٧/٥×١٥ و بەرگی تیماجی سووری ئەندازە ١٣×٢١ و بەخەتی شکەستە نەستەعلیقە کە لە ساڵی ١٣٠٥ کۆچی نووسراوە سەردێرەکان بە مەرەکەبی سوور نووسراوە .

دەستپێکی دەستنووس

بسملە ، دیوان قصائدیکە در تبریك و تهنیت عید سعید مولود بندگان اعلیحضرت قدر قدرت همیون شاهنشاهی ارواحنا فداه .

و ادباو برشتە نظم کشیدە و بە عرض خاك پای مبارك رساندە....

کۆتایی دەستنووس

..... یا رب بحق شاه ولایت امام عصر

ئەم دەستنووسە خاوەنی ژمارەیێکی ترە کە برێتیە لە ٣٩٦، س / ٤٦٨١

**٢- جنگ اشعار (٥٩)**

لە دوا ساڵە کانی سەدەی ١٢ کۆچی ئەم کەشکوڵە نووسراوە. ئەم کەشکوڵە بە ژمارەی ٢٢٢٢/ف و لەسەر کاغەزی سپی نووسراوە لە لاپەڕەی ٤٣٨ تا ٤٤١ ، چوارینەگانی بابا تاهیر هەمەدانی و تیدا تۆمار کراوە

**٣- رباعیات یا دو بیتی های بابا طاهر عریان (٦٠)**

چوارینەکانی بابا تاهیر هەمەدانی و بە ژمارەی ٩٦٦/ف / ١٢ کە لە لاپەڕەی ٢٥١ تا ٢٧٠- هۆنراوەکانی ئەم شاعێرە کوردە تۆمار کراو

پەرتووکخانەی مامۆستا مۆجتەبا مینوی (١٩٠٢ - ١٩٧٦) (٦١)

لەم پەرتووکخانەیە نێزیك ٢٠٠ دەستنووس و پانزدە هەزار پەرتووك پارێزراوە.

یەك دەستنووس لەم پەرتووکخانەیە تایبەتی یە هەیە، بە ناوی (منظومە بوربیان) داستانی بەور بەیانی کوردیە.

دەستپێکی دەستنووس

یاران گوشبدن و شهد شیرین

داستان ورین کیانان کین

بە دەستخەتی یار حسێن حبی خەڵکی گوندی موینە (مونیە) و لەساڵی ١٣٣١ نووسراوە

ئەم ووتارە مەڵویکە لە خەرمانی دەسنووسی کوردی لە ئێران ، ئومید دەخوازم  کە لە دەرفەتێکی تر دەستنووسە کوردیەکانی پەرتووکخانەکانی ئێران بە خوێنەری کورد بناسینم ، ئالێرە ، سوپاسی خۆم ئاراستەی گشت ئەو سەربازە وونانە دەکەم کە لە خزمەتی دەستنووسی کوردین ئەم ئەرکە نیشتمانی و نەتەوەیە بە ئەستوو دەگرن. بە تایبەتی مامۆستا ئەنوەر سۆلتانی و مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی دەکەم و تەمەن درێژ و تەندروستیان لە یەزدان پاك بۆ دەخوازم.

سەرچاوەکان

١- کتابهای خطی هر برگ، یك سند

(فارسی)

مجله ادبستان  سال ١٣٧١ شماره ٣٥ ص ٥٨ - ٦١

٢- ترمیم و نگهداری اسناد و مواد کاغذی

(فارسی)

ار.سی. گوپتا، رابزکیشور، سی. بی گوپتا ترجمه عباس علی عابدی

استاد ص٦٥

٣- سیر تاریخی وارزیابی اندیشه شرق شناسی

(فارسی)

دکتر محمد دسوقی  ترجمه دکتر محمود رچا افتخار زاده

٤- زندگی طوفانی

(فارسی)

سید حسن تقی زاده ص١١٢

٥- نسخەهای خطی

محمد تقی دانش پژوه - دفتر هشتم ص٩٩

٦- نسخەهای خطی

محمد تقی دانش پژوه - دفتر نهم ص ٣١٩

٧- کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا

(کوردی)

ئەولیا چەلەبی وەرگێڕانی سەعید ناکام

٨- سە اثر در تاریخ کردستان

دکتر مهدی غروی

مجلە راهنمای کتاب سال ١٣٥١ هـ.ش شمارە ٣و٤ ص١٧٩ - ٢٠٠

٩- تاریخ کاشان

(فارسی)

عبدالرحیم ضرابی (سهیل کاشانی) بە کوشش ایرج افشار

١٠- کتابهای خطی هر برگ، یك سند

(فارسی)

مجلە ادبستان سال ١٣٧١ هـ.ش شمارە ٣٥ ص٥٨ - ٦١

١١- فهرست نسخ خطی استان قدس رضوی

(فارسی)

جلد ۹.ص ١٦٢ و ٣٥٤

١٢- فهرست نسخ خطی کتابخانه ملی تبریز

(فارسی)

جلد دوم ص٨٨٩ به کوشش میر ودود سید یونسی

١٣- راهنمای مراکز اسناد و کتابخانەهای

تخصصی، اختصاصی و دانشگاهی

شیرین تعاونی

١٤- مەلا پەرێشان دینەوەری و چەند دەستنووسیك

(فارسی)

فوئاد رەوەند، ئەدەب و هونەری برایەتی ژمارە ١٧٩، هەینی ٢٠٠٠/٦/٢

ل٢

١٥- فهرست میکرو فیلم های کتابخانه مرکزی و مرکز اسناد، دانشگاه تهران

(فارسی)

محمد تقی دانش پژوه جلد دوم ص١٣٢

١٦- فهرست نسخەهای خطی کتابخانه مرکزی و مرکز اسناد دانشگاه تهران

(فارسی)

محمد تقی دانش پژوه جلد ١٣ ص٣٢٩٥

١٧- رده بندی دهدهی دیونی زبانهای فارسی

(فارسی)

کتابخانه ملی ایران

١٨- فهرست میکرو فیلم های کتابخانه مرکزی و مرکز اسناد،
(فارسی)
دانشگاه تهران، محمد تقی دانش پژوه جلد سوم ص١٩٥
١٩- سەرچاوەی پێشوو، ص١٩٤
(فارسی)
٢٠- سەرچاوەی پێشوو، جلد دوم ص٨٥
(فارسی)
٢١- بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە رێگەی
(کوردی)
دەستخەتەکانیانەوە. محمد علی قەرەداغی ، بەرگی یەکەم ل٢٣٠
٢٢- فهرست میکرو فیلم های کتابخانه مرکزی و مرکز اسناد،
(فارسی)
دانشگاه تهران . محمد تقی دانش پژوه ، جلد دوم ص٨٥
٢٣- نسخەهای خطی کتابخانه مرکزی و مرکز اسناد، دانشگاه تهران
(فارسی)
محمد تقی دانش پژوه و ایرج افشار . دفتر پنجم
٢٤- فهرست میکرو فیلم های کتابخانه مرکزی و مرکز اسناد،
(فارسی)
دانشگاه تهران محمد تقی دانش پژوه جلد دوم ص ١٣٢
٢٥- حدیقه سلطانی (فارسی و کوردی)
محمد علی سلطانی . جلد اول ص١٠٠

٢٦- فهرست میکرو فیلم های کتابخانه مرکزی و مرکز اسناد،

(فارسی)

دانشگاه تهران .        محمد تقی دانش پژوه،      جلد دوم  ص٢٤٣

٢٧- فهرست نسخه های خطی کتابخانه مرکزی و مرکز اسناد،

(فارسی)

دانشگاه تهران        محمد تقی دانش پژوه       جلد ١٢   ص٢٩٨٦

٢٨- جغرافیای تاریخی و تاریخ مفصل کرمانشاهان

(فارسی)

محمد علی سلطانی .    جلد ٣  ص٥٢٧

٢٩- فهرست نسخه های خگی کتابخانه مرکزی و مرکز اسناد،

(فارسی)

دانشگاه تهران        محمد تقی دانش پژوه       جلد ١٣  ص٣١٤٨

٣٠- منظومه کردی مهر و وفا                    (فارسی و کوردی)

قادر فتاحی قاچی   ص٥

٣١- فهرست نسخه های خطی، دانشگاه تهران

(فارسی)

محمد تقی دانش پژوه       جلد ١٦   ص٦١٥

٣٢- سەرچاوەی پێشوو، جلد ١٢

(فارسی)

٣٣- سەرچاوەی پێشوو، جلد ١٣

(فارسی)

٣٤– سەرچاوەی پێشوو، جلد ١٤ ص٣٨٢٥

(فارسی)

٣٥– دانشمندان کرد در خدمت علم و دین

(فارسی)

عبدالکریم مدرس ، ترجمه احمد حواری نسب، چمیمه ص٥٨٢

٣٦– فهرست نسخه های خطی، دانشگاه تهران

(فارسی)

محمد تقی دانش پژوه

٣٧– سەرچاوەی پێشوو، جلد ١٤ ص٣٨١٧

(فارسی)

٣٨– فهرست میکرو فیلم های کتابخانه مرکزی و مرکز اسناد،

(فارسی)

دانشگاه تهران

٣٩– وەرقەو گوڵشا

(کوردی)

ئامادە کردن و ساغکردنی دوکتور فاتمە مودەریس ١٣٧٨

٤٠– راهنمای مراکز اسناد و کتابخانە های

(فارسی)

تخصص ، اختصاص و دانشگاهی

شیرین تعاونی ص٢٢٣

٤١– فهرست نسخه های خطی کتابخانه مجلس شورای ملی

(فارسی)

جلد ٢١ ص٢٠١ ، اهدائی ناصر الدوله مجید فیروز

٤٢– سەرچاوەی پێشوو ، جلد ١٠ بخش دوم ص٨٦٢

(فارسی)

عبدالحسین حائری

٤٣– سەرچاوەی پێشوو ، جلد ٢ ص ٧٦

(فارسی)

ابن یوسف شیرازی، ضیاءالدین حدائق ، عبدالحسین حائری

٤٤– تاریخِ مشاهیر کرد

(فارسی)

بابا مردوخ روحانی جلد دوم ص٦٢

٤٥– فهرست نسخ خطی کتابخانه مجلس شورای ملی ایران

(فارسی)

ابن یوسف شیرازی ، ضیاءالدین حدائق ، عبدالحسین حائری ، جلد ٢ ص٨٧

٤٦– بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیەوە.

(کوردی)

محەمەد عەلی قەرەداغی بەرگی سێیەم ل٢٥٧ .

٤٧– فهرست کتابهای خطی کتابخانه مجلس سنا

(فارسی)

محمد تقی دانش پژوه و بهاوالدین علمی انواری جلد اول ص٦٩

٤٨- حدیقه سلطانی (فارسی و کوردی)

محمد علی سلطانی ، جلد اول ص١٠٠

٤٩- فهرست کتابهای خطی کتابخانه مجلس سنا

(فارسی)

محمد تقی دانش پژوه و بهاوالدین علمی جلد اول ص٣٦٦

٥٠- سەرچاوەی پێشوو ، ص٣٦٧

(فارسی)

٥١- راهنمای مراکز اسناد و کتابخانه های تخصصی ،

(فارسی)

اختصاصی و دانشگاهی شیرین تعاونی ص٢

٥٢- فهرست نسخه های خطی کتابخانه ملی ملك

(فارسی)

ایرج افشار و محمد تقی دانش پژوه جلد ٤ ص٧١٨

٥٣- سەرچاوەی پێشوو ، جلد ٢ ص١٩٣

(فارسی)

ایرج افشار ، محمد تقی دانش پژوه ، محمد باقر حجتی ، احمد منزوی

٥٤- سەرچاوەی پێشوو

(فارسی)

٥٥- سەرچاوەی پێشوو

(فارسی)

٥٦- راهنمای مراکز اسناد و کتابخانە های تخصصی ،

(فارسی)

اختصاصی و دانشگاه شیرین تعاونی ص٢١١

٥٧- فهرست نسخ خطی کتابخانە ملی ایران

(فارسی)

سید عبدالله انوار جلد پنجم ص٣٢٦

٥٨- سەرچاوەی پێشوو ، جلد دوم ص ٥١٦

(فارسی)

٥٩- سەرچاوەی پێشوو ، جلد ص

(فارسی)

٦٠- فهرستوارە کتابخانە مینوی

محمد تقی دانش پژوه و ایرج افشار ص٢٣٦

پەراوێزەکان

١- پەرتوکخانەی ناوەندی و بنکەی بەڵگەنامەکانی زانکۆی تاران (کتابخانەی مرکزی و مرکز اسناد دانشگاه تهران)

ناونیشان: استان تهران - تهران

میدان انقلاب خیابان انقلاب دانشگاه تهران کتابخانە مرکزی

٢- حەمید ئێزەد پەنا (حمید ایزد پناه) نووسەرێکی پڕ بەرهەمە و خەڵکی شاری خوڕەم ئاوای لووڕستانە لە بەرهەمەکانی ١- فرهنگ لری ٢- فرهنگ لکی ٣- اثار باستانی و تاریخ لرستان لە سێ بەرگ. بە زاراوەی لووڕی

هۆنراوەی هۆنیوە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مشاهیرلر ایرج کاظمی ص٥٩٩ وص٢٥٦.

٣- کەربەلایی، نازناویکە لە نێوان شیعە ئێرانیەکان باوە و بەو کەسانە دەگوترێ کە سەردانی بارەگای سێ یەمین پێشەوای شیعە لە شاری کەربەلا دەکەن و لە ناو خەڵك ڕێز و پایەێکی بەرزیان هەیە.

٤- توت شامی ، گوندێکە لە ٤٠ کیلومتری باکووری ڕۆژ هەڵاتی شارۆچکەی کەرەند لە کرماشان، سەید حەیدەر کوڕی سەید مەنصور ناسراو بە سەید براکە (١٢١٠ - ١٢٩٠کۆچی) خۆی و ٣٦ قوتابیەکەی خەریکی ڕاڤەکردنی (سرانجام) لەم گوندەنیشتەجی بووینە و خزمەتێکی ئەدەبی ئایینی یارسانیان کردووە بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: دوره هفتوان سرانجام - صدیق صفی زادە .

٥- موراد ئەورەنگ ، کوردێکی ڕۆژهەڵاتی کوردستانە و لە سوپای محەمەد ڕەزا شای پەهلەوی کۆلۆنیل بووە و لەبەرهەمەکانی ١- کردشناسی ٢- فرهنگ کردی لە دوو بەرگ. کۆمەڵە ووتارێك سەبارەت بە کورد لە گۆڤارەکانی ئێرانی لە چاپ داوە.

٦- پەرتووکخانەی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی ئێران

(کتابخانە مجلس شورای اسلامی ایران)

ئەم پەرتووکخانەیە لە دوو شوێنی جودایە و بە ژمارە یەك و ژمارە دوو دەناسرێ ناونیشانی پەرتووکخانەی ژمارە یەك:

تهران - میدان بهارستان

کتابخانە شمارە یك مجلس شورای اسلامی ایران.

ناو نیشانی پەرتووکخانەی ژمارە دوو: تهران – خیابان امام خمینی

خیابان فلسطین کتابخانە شمارە دو مجلس شورای اسلامی ایران

٧- پەرتووکخانەی میللی مەلەك (کتابخانە ملی ملك)

ناونیشان:استان تهران – تهران

بازار بزرگ،بازار بین الحرمین،موزە و کتابخانە ملی ملك

٨- پەرتووکخانەی میللی ئێران (کتابخانە ملی ایران)

ناونیشان

ناونیشان:استان تهران – تهران،خیابان ٢٠ تیر کتابخانە ملی ایران

# بارودۆخی سیاسی و ئابوری وکۆمـــەلایـــەتی کـــــورد لــەدەوڵـــەتــی ئومـــەویـــی
## ( ٤١- ١٣٢ك )

✍ نەهرۆ اسماعیل زەندی

## پێشـــــەکی :

زۆرێك لەنەتەوەکانی کورد و فارس و عەجەم لەژێرسایەی خەلافەتی ئومەویدا دەژیان، ئەوانە هەریەکە بەپێی تایبەتمەندی خۆی هەندێ مافیان هەبووە، بەگشتی ئەوانە مەواليان پێدەلێن، ناساندنی مەواليش بەپێی قۆناغەکانی مێژوویی ئیسلام و سەردەمی خەلیفەکان جیاوازە، بۆیە مەوالی لەســـەردەمی پێغەمبـــەر (د .خ ) ســـەرەتای ئیـــسلام بەکەســـێك دەووترا(کەدەست بخاتە ناو دەستی یەکێکی ترەوە وپەیمانی لەگەڵدا دەبەست دەیگوت خوێنم خوێنتە میراتم میراتت دەبێت ....) [1].

بۆیە هیچ جیاوازی نەدەکرا لەرووی ماف و ئەرکیان، بەڵام لەسەردەمی خەلیفەکانی راشیدی مەوالی شێوازێکی تر وەرگرت، مەوالی بەکاردەهێنرا بۆ خەڵکی ئەو وولاتانەی کەلەلایەن سوپای ئیسلام فەتح دەکران دەبوونە موسلمان، لەسەرموسلمانە نوێیەکان پێویست بوو پەیوەندی بکەن[2].

چەمکی مەوالیش لە لە قورئان ئامـاژەی پێدراوە کە خـوای گـەورە دەفـەرموویت ( فَإن لَمْ تَعْلمُوا آبَاءهُمْ فَإخْوَانُكُمْ فِي الدِّين وَمَوَالِيكُمْ) [٢]، لێـرەدا ووشـەی مـەوالی بەمەبەسـتی ئـەوەی (بـرا)یـن نـەك جیـاوازی کـردن بێـت، جیـاوازی کـردن لـەنێوان نەتـەوە جیاوازەکـان. پێغەمبـەریش (د.خ) دەفەرموویت (لافرق بین عربی و اعجمی الابـالتقوی )، بـەڵام ئـەم شـێوازەی تێ گەیشتن بۆ مەوالی وەکو خۆی نەمایەوە .

بارودۆخی مـەوالییش لـەدوای کۆچـی پێغەمبـەر(د.خ) دەسـتپێدەکات، چـونکە فـراوان بـوونی دەسـەڵاتی ئیـسلام لەسـەردەمی پێغەمبـەر( د.خ) لەسنوری نیمـچە دوورگـەی عـەرەب تێپـەری نـەدەکرد، بـەڵام لەسـەردەمی خەلیفەکانی راشیدی بەتایبەتی لەسـەردەمی عومـەری کـوری خـەتاب( ر.خ) فراوانیەکـەی چـووە دەرەوەی نیمـچەدوورگەی عـەرەب، بۆیـە لەئـەنجامی فتوحات ژمارەیەکی زۆر لە ناوچەکانی غـەیرە عـەرەب ( فـارس، کـورد، رۆم ..) کەوتنەژێر دەسەڵاتی خەلافەتەوە، لێرەوە دەتوانین بلێین پێناسەیەکی مێژوویانەی تەواو بـۆ مـەوالی بکـەین، چـونکە عومـەری کـوری خـەتاب(ر.خ) یەکێك بووە لەوخەلیفانە زۆر لەگەڵ غـەیرە عەرەبـەکان دادپەروەرویەکسان بووە، لەوانە ( ابن عبد ربـە دەڵێـت( مـەوالی بریتیـە لـەو موسـلمانانەی کـە عـــەرەب نـــین لەدەولـــەتی ئیـــسلامدا دەژیـــان ..) [٤]، فلـــهاوزن دەڵێ ((ئەوفارسـانەی لەشـەردا بـەدیل دەگـیران لەلایـەن عەرەبەکانـەوە بـاج و خەراجیان لێ ناسەنرێ و لەدیوانی سـەربازی ناویـان تۆمارنـاکرێ ..)[٥]، ابـن الاثیر دەڵێت (مەوالی بەوکەسانە دەووترێت کە عەرەب نەبن، (ئەوەش کوردو رۆم فارس دەگرێتەوە..) [٦].

سەبارەت بەهەلوێستی عومەریش (ر.خ) لەگەڵ مەوالی ئەوا ئەرك و فەرمانی دادپەروەری پەیڕەو کردوە لەکاتی دابەشکردنی دەسکەوت، لەم بارەیەوە بلازری دەڵێ : عومەر لەکاتی دابەشکردنی دەسکەوت پشکی موسلمانی عەرەب و موسلمانی مەوالی وەکو یەکی بۆ دادەنان، هەروەها لەڕیزی سوپاشدا عومەر (ر.خ)رازی بووە کەس و کەتیبەی مەوالی بێتە ناو سوپای ئیسلامەوە، وە رازی بووە بەمەرجەکانیان هاوپشك بن لەدەسکەوت.

بەشێوەکی گشتی مەوالی لەسەردەمی عومەری کوری خەتاب(ر.خ) هەموو مافێکیان هەبووە، بێ جیاوازی، وە لەبارودۆخێکی باشدا بوونە، بەڵام دوای عومەری کوڕی خەتاب(ر.خ)، عوسمانی کوری عەففان(ر.خ) هات ئەویش درێژکردنەوی سیاسەتی عومەر(ر.خ)بووە، بەڵام لەهەندێ ڕووەوە عوسمان کوری عەففان(ر.خ) هەستا بەدابەشکردنی پلەو پایە بەسەرخزمە نزیکەکانی خۆی بەمەش جیاوازی کەوتە نێوان موسلمانەکان[8]، وبنەماڵەی ئومەوییەکان زیاتر لەدەسەڵات نزیك بوونەوە، دوای هاتنی عەلی کوری ابو تالیب ( ر.خ ) مەوالیەکان زیاتر بەشداری دەکەن لەکێشەکانی دەوڵەتی ئیسلامی، وە بەشداریان لەکێشەی عەلی کوری ئەبوتالب معاویە کوری ابوسفیان دەکەن .

لەسەردەمی خەلافەتی ئومەوییەکانیش دەتوانین بڵێین شێوازێکی تر بۆناساندنی مەوالی بکەین، چونکە چەمك و مانای مەوالی گۆرا، لەم بارەیەوە فلیپ حتی دەالێت ( مەوالی مەبەست لێی ئەو عەجەمانەن کەهاتونەتە ناو

ئیسلام دلسۆزیان بۆ یەکێك لە هۆزەکانی هەبووە، پایەی کۆمەڵایەتیان لەموسلمانی عەرەب کەمتربووە )[8].

بەشێوەکی گشتی دەتوانین بڵێن، مەوالی هەموو ئەونەتەوە جیاوازانە دەگرێتەوە لەدەوڵەتی ئیسلامی دەژیان.

* * *

## ئەو هەرێم و ناوچانەی کورد تێیدا نیشتەجێ بوون لەسەردەمی دەولەتی ئومەویی دا :

### ١- موسل :

دەکەوێتە کەناری خۆرئاوایی رووباری دیجلە لەبەرامبەری دا کەناری خۆرهەلاتی شاری نەینەوایە چەندین قەلاو شووراو تێدایە [9]، بەپێگەی یەکەمی جزیرە دادەنرێت [10]، شاری موسل چەندین گوند پەیوەندیان پێوە بوو وەك تیرهان ، السن ،حدیسە، باجلی ،باهزران ، حبتون (هەفتوون )،حەززە [11]. وەکورد لەم هەرێمە هەر لە کۆنەوە نیشتە جێ بوونە [12]، هەرچی عەرەبە دوایی فتوحات تەعریبیان کردووە لە دەڤەری موسل نیشتەجێ بوونە [13] ،کەواتە ئەم شارە شارێکی کوردیە گەرەکی تایبەت بە خۆیان هەبووە چەندین هۆز کوردی تێدا نیشتە جێ بوون [14] .

## ٢- شـــــارەزوور:

شارەزوور یەکێکەلەهەرێمە کوردییەکان [١٥]، مێژوویی نیشتەجێ بوونی کورد لەم هەێمە دەگەرێتەوە بۆ ساڵێ (٢٨٠٠-٢٧٠٠پ.ز)[١٦]، ئەم هەرێمە دەکەوێتە نێوان اربل همدان[١٧]، لەسەرەتای فتوحاتی ئیسلامی سەر بەموصل بوو[١٨]، شارەزوور ناوچەیەکی چڕو سەخت ودژوارە بوو هیچ میر وخەلیفەیەك حوکمی شارەزووریان نەکردووە [١٩]، ئەم هەرێمە شەش شاری کە ئەمانە( نیم ئەز، تیران شاه،دیلمستان، دزدان، بیر، مسینا ) [٢٠].لەخۆدەگرێت.

سەبارەت بەدەستنیشانکردنی سنوری ئەم هەرێمە لە باشور دەکەوێتە نێوان حلوان خانقین کرخ وجلدان[٢١]، لە لای باکوری سنوری ئەربل هەیە، چیای (السلف) لەلای رۆژهەلاتیەتی داقوق و باجەرمێ لەلای رۆژئاوایەتی [٢٢].

## ٢-هەرێمی جزیرە :

ئەم هەرێمەش کەوتۆتە باکوری رۆژئاوایی کوردستانەوە[٢٣]، بۆیە پێی دەووترێت جەزیرە چونکە دەکەوێتە نێوان دیجلەو فورات لەسەرووی تکریتەوە تاسەرچاوەکانی هەردوو رووبار دەگرێتەوە[٢٤]، لەهەرێمی جزیرە کورد لە ناوچەکانی سەروو نیشتە جی بوونە بەتایبەتی لەبەشەکانی خۆرهەڵات و باکوری خۆرهەلات [٢٥]، هەندێ هۆزی عەرەبیش لەم شوێنەدا نیشتەجێ بوونە پێش هاتنی ئیسلام [٢٦]، ئەم هەرێمەش شوراو قەڵای زۆری

تێدایە[٢٧]، وەچەند شار لەخۆ دەگرێت لەوانە(نوسیبین ، دارا ، حسین کیف ،ماردین ،ئورفە ، ئاماد( یاربکر)، ئەرزن)[٢٨] .

سەبارەت بەدەستنیشانکردنی سنوری ئەم هەرێمەش لە رۆژئاواو رۆژهەڵاتەوە هەرێمی چیاو ئەرمینیا هەیە، لە لای باشوری عێراق و لای باکوریشەوە وولاتی رۆمە[٢٩]، هەرێمی جزیرە هەرێمێکی تایبەتە لەڕووی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کەوا دانیشتوانەکەی لە کورد و عەرەب و ئەرمەن و رۆم و فارس پێکهاتووە بۆیە ئاسایە بارودۆخێکی شەلژاو و بەربەرەکانی دروست بکات بەجۆرێك زەمینە خۆش بکات بۆ بزووتنەوەکانی دژ بە ئەمەویی یان هەربانگەوازێك بۆ هەڵگەرانەوە بکرێت دژی رژێمی هەرحوکمێك کە فەرمانڕەوایەتی دەکات[٣٠] ، ئەم بارودۆخە شەلژاوەش وای کرد چەندین بزووتنەوەی ڕوو بکەنە ئەم هەرێمەکورد بەشداری تێدا بکات دژ بە ئومەویی.

### ٣-هەرێمی چیـــــا :

ئەم هەرێمەش بۆیە بەم ناوە ناونراوەچونکە چیا و شاخی زۆرە[٣١]، یاقوتی حەمەوی ئاماژە بەوە دەکات سەردەمێ بەم هەرێمە ووتراوە : عێراقی عەجەمی بۆ ئەوەی جیا بکرێتەوە لەعێراقی عەرەبی[٣٢]، دەووبەری ئەم هەرێمەش بەچەند هەرێمی تر دەوردراوە لەخۆر هەڵاتی هەریەك لە خوراسان و وولاتی فارسە، لە خۆرئاواوە بەشێك لە ئازەربیجان وە جزیرەو پێ دەشتەکانی عێراقە، لەباکور دەریای خەزەر و وولاتی دەیلەم و قەزوینە لەباشوری دا عێراق و خوستانە[٣٣].

کورد زۆرینەی زۆری دانیشتوانی چیا پێك دەهێنێت، بەتایبەتی لای ناوەراستی رۆژئاوایی ئەم هەرێمەدا،(دار الاکراد)ی پـێ دەگووترێت[٣٤]، ابـن حوقل ئاماژە بەبوونی کوردێکی زۆر دەکات لەهەرێمی چیا[٣٥]، ئەو شارانەی کوردی تێدا نیشتەجێ بوونە، کەدەکەونە چوارچێوەی ئەم هەرێمەوە بریتین لـە( هەمـەدان ، دینـوەر ، نهاوەنـد ، قرماسـین( کرماشـان) ، ماسـبزان ، مەندەلی ..)[٣٦]، مسعودی ئاماژە بـەوە دەکـات لەسـەردەمی ئومەوییەکانـدا کـورد لـەم هـەرێمی هـەبووە لەناوچـەی سـهرود چـالاکیان دژ بەخەلافـەت ئەنجامداوە، وە بزووتنەوەکەی موختاری کوری عبیدسەقەفیش لەم هەرێمـە دژ بە ئومەوییەکان چالاکی ئەنجام داوە[٣٧].

### ٤-هەرێمی ئازەربیجان :

ئەم هەرێمەش هەرێمێکی فراوانە، کەوتۆتە نێوان هەرێمی چیاو وولاتی ئارانـەوە[٣٨]، زۆربـەی رووبەرەکـەی شـاخاویە[٣٩]، ژمارەیـەکی زۆر قـەلاو شورایی تێدایە[٤٠]، ئەم هەرێمەش ژمارەیەك لە هۆزی کورد تێیـدا نیـشتەجێ بوونە[٤١]، ناتوانرێت سنورێکی تەواوی بۆ دەست نیشان بکرێت، تەنیا لەسـەردەمی عەبباسـیەکان نـەبێت، [٤٢]( ئەمـەش ناکەوێتـە چوارچـیوەی توێژینەوەکـەمان)، هەنـدێ ئـاران و ئـەرمینیاو ئازربیجـان بەیـەك هـەرێم دادەنێـنن[٤٣]، شـارە کوردنـشینەکانـــی ئـەم هەرێمـــەش( ئـەردەبیل ، تەورێز، ورمی، باجـروان، سلماس..) [٤٤].

## بارودۆخی کورد لەسەر دەمی فتنە ( ٣٥ك-٤١ك )

دوایی شەهید کردنی عوسمانی کوری عەففان لەساڵی (٣٥ك) ئەوا ئاژاوەو فیتنە خەلافەتی ئیسلامی گرتەوە، هەرچەندە هەندێ لە مێژوونوسان باس لەوەدەکەن عوسمانی کوری عەففان(ر.خ) گرینگی زیاتر بە خزمەکانی خۆی داوە هەروەکو سیدعبدالعزیز دەڵێ( خەڵکی لێی تورەبوون کاتێك هەڵساوە لەکار لابردنی والی و کاربەدەستەکۆنەکان کە لەلایەن خەلیفە عومەرکوڕی خەتاب (ر.خ) دانرابووە، لەجێگایی ئەوان هەندێکی تری داناوە لە خزمی نزیکی خۆی بوون[٤٥]، ئەو بوو کۆمەلێك دەرچوون لەدژی ئەم کارانە لەناوچەکانی میسرو کوفەو بەسرا....[٤٦] [٤٧]

بۆیە معاویەی کوری سوفیان هەستی بەو مەترسیە کرد، داوایـــی لە عوسمانی کوری عەففان(ر.خ) کرد بێت بۆ شام بەڵام خەلیفە بەمە رازی نەبوو[٤٨]، ئەوەبوو ئەو کۆمەڵەی دەرچوو بوون کۆمەلێك ئاژاوەیان نایەوە بووە هۆی شەهیدکردنی عوسمانی کوری عەففان(ر.خ) لەساڵی( ٣٥ك).*

سەبارەت بە بارودۆخی کوردیش لە ماوەی خەلافەتی عوسمانی کوری عەففان(ر.خ) ئەوا هیچ ئامارژەیەك نیە یان دەقێکی مێژوویی وامان لەبەر دەستدا نیە باس لە کورد یان ناوچەیەکی کوردی بکات دەوریان هەبێت لەو ئاژاوەیە ئەوەش لەبەر ئەوەی ناوچە کوردیەکان دوور بوون لە خەلافەت بۆیە ئاگاداری ئەو گۆران کاریانەنەبوونە، بەسەر خەلافەتدا هاتووە.

دوایی شەهیدکردنی خەلیفە عوسمانی کوری عەففان(ر.خ) لەسەر موسلمانەکان پێویست بوو خەلیفەیەك دیاری بکەن، تاوەکو کاروباریان بەرێوەبەرێت، ئەوەبوو مهاجیرەکان و ئەنصارەکان داوایان لەعەلی کوری ئەبوتالب(ر.خ) کرد، تاوەکو خەلافەت قبول بکات، کاروباری موسلمانەکان بەرێوەبەبات، سەرەتا ڕەتی کردەوە، بەڵام دوایی قبوڵی کرد [٤٩]، وە زۆربەی موسلمانەکان، تەلحەکوری عبدللە، زوبێری کوری عەوام چەندانی تر لەهاولانی پێغەمبەر(د.خ) بەیعەتیان پێدا [٥٠][٥١]، بەڵام بە کوژرانی عوسمان(ر.خ) ئەوا عایشەی خێزانی پێغەمبەر(د.خ) بەیعەتی پێ نەدا، داوایی تۆلە سەندنەوەی خوێنی عوسمانی کوری عەففانی (ر.خ) کرد، بەمەش کەوتنە کێشە لەگەڵ عەلی کوری ئەبوتالب(ر.خ) ئەمەش بووە هۆی ڕوودانی هەردووشەری( جەمەل و سەفین)**[٥٢] .

سەبارەت بە بارودۆخی کوردیش لەو ماوەی ئەو کێشەو ئاژەوەیەدا ئەوا تەنیا چەند بزووتنەوەیەکی خەواریجی پەیدابوونە هاتوونەتە ناوچە کوردیەکان و نیشتە جێ بوونە، ئەو بزووتنەوەیەش بەسەر کردایەتی ئەشرسی کوری عوفی شیبانی دەرچوون بۆ (دسکرە) لەگەڵ دووسەد کەس لە لایەنگرانی، دوایی ئەوەش بزووتنەوەیەکی تر بەسەر کردایەتی (عقلە بن هیلال ) پەیدا بوو دەرچوون بۆ ماسبزان، کە نزیکەی دووسەد کەسی لەگەڵ دابوو، بەڵام ئەم بزووتنەوەیە زۆری نەخایەند عەلی کوری ئەبوتالب(ر.خ) سوپایەکی بۆ نارد بەسەر کردایەتی (معقەل کوری قیس ئەل رجاحی) توانی ئەم کۆمەڵەیە لە ناوبەرێت[٥٣]، پێناچێ کورد بەشداری لەم بزووتنەوانە

کردبێت لەبەر ئەوەی تەنیا بە ناوچە کوردیەکان تێپەریوە ماوەیەکی کەم خۆیان راگرتووە ماونەتەوە.

پاشان بزوتنەوەیەکی تر پەیدابوو ئەویش بەسەر کردایەتی (ئەبوو مریم سعدتەمیمی) ڕووی کردە ناوچەی شارەزوور زۆربەی لایەنگرانی مەوالی بوونە، هیچ عەرەبیات لەگەڵ نەبووە تەنیا چواریان نەبێت، کەخۆی یەکێك بوو لەوان[٥٤]، هەرچەندە عەلی کوری ئەبو تالب (ر.خ) داوایی لێکرد خۆی تسلیم بکات بەڵام رازی نەبوو، ووتی: هیچ شتێکمان لە نێواندا نیە، تەنیا شەر نەبێت، بۆیە خەلیفە سوپایەکی بۆ نارد بەسەرکردایەتی شریح کوری هانی لەگەڵ حەوسەد کەس توانی لە ناویان ببات[٥٥].

بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە کوردەوە هەبێت، لەبەر ئەوەی بزووتنەوەکە هاتۆتە ناوچەکوردیەکان کوردەکان بەشداریان لە بزووتنەکەدا کردبێت، چونکە ئەوانەی لە گەڵی دابوونە زۆربەی مەوالی بوونە تەنیا چواریان نەبێت ، لە لایەکی ترەوە ئەگەر ژمارەیەکی زۆر لەگەڵ بزوتنەوەکە نەبوایە ئە وا عەلی گرینگی پێ نەدەدا داوایی نەکرد لە ناوبەبرێت.

## بــارودۆخی سیاسی کوردلەدەولەتــی ئومەویی:

ئەوەی لێرەدا جێگای ئاماژە بۆکردنە لەبەر ئەوەی کورد مێژوونوسی نەبووە، بۆ ئەوەی تەنیا ئەو ڕووداوانە بنووسێتەوە پەیوەندی بەکوردەوە هەبێت بەڵکو زۆربەی ئەو چالاکیانەی کوردەکان کردویانە تێکەڵ بە نەتەوەکانی تر کراوە کەبەمەوالی دانراوە، بۆیە شتێکی وا ئاسان نیە باسی کورد بکەین لەسەردەمی دەولەتی ئومەویی چونکە، وا پێویست دەکات،

باسی زۆرلایەنی ئابوری ئیداری و ژیانی کۆمەڵایەتی بکەین بەڵام بەهۆی کەمی زانیاری کورد ناتوانرێت بەتەواویی باسی بکەین، ئەگەر باسیشی بکەین دەبێت بەوێکچوون و بەراوردکاری باسی شتەکان بکەین.
تەنیا لایەنە سیاسی و کێشەکان نەبێت، ئەگەر ئەو کێشانەش نەبوایە لەوانەیە ئەوندە زانیارەیەشمان دەربارەی ناوچە کوردییەکان دەست نەکەوتایە لەسەردەمی ئومەوییی ، بۆیە لێردا شتێکی ئاسان نیە، بۆ ئەوەی مەوالی کورد لێك جیابکەینەوە تەنیا باسی ئەوانە بکەین پەیوەندی بە کوردەوە هەبێت..

دەوڵەتی ئومەویی لەساڵی( ٤١ك) دامەزراوە[٥٦]، لە دوای کوژرانی عەلی کوری ئەبو تالب(ر.خ) و خۆکێشانەوەی حەسەنی کوری عەلی(ر.خ) لەفەرمانڕەوایی خەلافەت بۆ معاویە کوری ابوسفیان [٥٧]، معاویەش حکومەتێکی مەلەکی وراسی دامەزراند [٥٨]. دوای ئەوەی لایەنگیری حەسەنی کوری عەلی(ر.خ) و خەڵکی کوفە وەرگرت بەم ساڵەش ووتراوە، ساڵی کۆمەڵ [٥٩].
ئەم دەوڵەتەش ناونراوە بە(دەولەتی ئومەویی) چونکە دامەزرێنەرەکەی بۆ معاویەی کوری ئەبوسفیان دەگەرێتەوە، سەربەرچەڵەکی بن قصی اموی [٦٠]، لە(٨ك ) لەرۆژی فەتحکردنی مەککەدا هاتنە ناو ئیسلامەوە [٦١] ، هەموو خەلیفەکانی تری ئومەویی بەهەردوو لقی سوفیانی ومەروانی دەگەرێنەوە سەر بنەماڵەی (امیە) [٦٢] .

لەگەڵ دامەزراندنی دەولەتی ئومەویی شاری دیمەشق کراوە بە پایتەختی ئەم دەوڵەتە [٦٣]. ئەمەش خالێکی وەرچەرخان بووە چونکە مەدینە بەلای سەراپای موسلمانەکان پایتەختی پێغەمبەر(د.خ) و خەلیفەی راشیدی بووە [٦٤].

لەماوەی نەوەدو یەك ساڵەی تەمەنی دەولەتی ئومەویی دا(١٥) پازدە خەلیفە لە هەردو لقی سوفیانی مەروانی فەرمانڕەوایەتیان کردووە[٦٥].

سەبارەت بە بارودۆخی کوردستانیش ** لەژێرباری خەلافەت یاخود دەولەتی ئومەویی دا. ئەوا معاویە هەردوای ئەوەی هاتە سەر حوکم دەولەتی ئومەویی کردە (دە) بەش لەرووی ئیداریەوە ناوچە کوردیەکانیش دابەش بوون بۆ سەر چەند وولایەتێك [٦٦]، زۆربەی ناوچە کوردیەکان لەسەرەتایی دەولەتی ئومەوییدا سەربەخۆ نەبوونە، بەڵکو تابعی کوفە و بەسرا بوونە وە هەندێکی تریان تابعی وولایەتەکانی تری دەولەتی ئومەویی بوونە[٦٧].

وە لە هەندێ ناوچەی کوردی باج و سەرانەیان وەرگرتووە [٦٨]، معاویە هەوڵی داوە سوود لەمەوالی وەربگرێت لەرووی ئیداری وەمالیەوە پشت بە مەوالی دەبەست لەرێکخستنی ئیداریی دا [٦٩]. ناوچە کوردیەکانیش لەسەردەمی ئومەویی دا تووشی ئاژاوە هاتن [٧٠]، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ شوێنی ستراتیجی کوردنشینەکان وەکو شانۆیەك وابووە چونکە چەندین بزووتنەوەی دژ بەدولەتی ئومەویی چالاکیان تێدا ئەنجامداوە، لەوانە خەواریج و مەوالی ...تد، کوردەکانیش لەم لایەنەوە سیاسەتێکی

دوولایەنەیان هەبووە ، هەندێك جار لایەنگری ئەو بزووتنەوانەیان كردوە دژ بە ئومەوییەكان [٧١]، لە هەمانكاتیشدا سە ربە ئومەوییەكان بوونە [٧٢] .

لەسەردەمی خەلافەتی معاویەی كوری ئەبو سوفیان موسلمانەكان بوونە یەك [٧٣]، تاڕادەیەك هێمنی وولاتی گرتەوە، موسلمانەكان لشكركێشیان دەست پێ كردەوە گەلێك شارو ناوچەی باكوری ڕۆژ هەلات و ڕۆژئاوایان خستۆتە ژێر دەسەلاتیان[٧٤]، وەكوردەكان لایەنگیری معاویەی كوری ئەبو سوفیان و دەولەتی ئومەویان كردوە بەلام ئەمەش بۆ ماوەكی كەم بووەچونكە دوای مردنی معاویە كوری ئەبوسفیان ئەم ڕووبەرە فراوانەی دەولەتی ئیسلامی بەهێمنی نەمایەوە، بەتایبەتیش [٧٥]،دوایی هاتنی یەزیدی كوری معاویەو خەلیفەكانی تر ئەوا كۆمەلێك شۆرش و ڕاپەرین دژ بەدەولەتی ئومەویی سەری هەلدا، لەوانەش (بزووتنەوەی تەوابین بزوتنەوەی خەواریج مەوالی، شۆرشی موختار كوری عبید السەقەفی بزووتنەوەی عبدوللای كوری زوبێر..... تد) [٧٦]، ژمارییەكی زۆر لەو بزووتنەوانە دژایەتی ئومەوییەكانیان دەكرد لەناوچە كوردیەكان چالاكیان ئەنجامدەدا دژ بە خەلافەت [٧٧] .

لەسەردەمی خەلیفە عبدولمەلیكی كوری مەروان ( ٦٥– ٨٦ك ) والی عێراق (موصعب كوری زوبێر) بوو پاش شكست خواردنی موصعب، عبدولمەلیك ( حجاجی كوری یوسف سەقەفی) كردە والی عێراق [٧٨]، بەمەش كوردەكان كەوتنە بەر زولم ورقی حجاج، هەر بۆیە لەكاتی بزووتنەوەكەی عبدولرحمان كوری ئەشعەس،سالی( ٨٣ك)، پەیدا بوو كوردەكان یارمەتیانداوە دژ بەحجاج[٧٩] .

ئەوەش بەهۆی ئەوزولّم و زۆردارەیە و نایەکسانیە وە داناناني بە هاولاتی پلەدوو سێ [٨٠] ، ئەمەش وای لەکورد کرد بەلای بزووتنەوەکەی ئەشعس دابچێ [٨١٠]، بەتایبەتی کوردەکانی هەرێمی چیا[٨٢]، وولاتی فارس [٨٣] .

تەبەری دەلیّ: هەموو کۆبونەوە بەکۆمەلّ بۆ ڕووبەرووبونەوەی حجاج هەموویان ڕقیان لێی بوو [٨٤]. ابن الاشعس لەگەلّ کوردەکانی هەرێمی فارس لەدژی حجاج ڕێکەوت بوون لە سالّی (٨٣ك) هێرشیان کردە سەری [٨٥]، بۆیە کوردەکان تووشی زولّم و زۆری حجاج هاتوون[٨٦] . لەماوەی فەرمانڕەوایی بیست سالّەی حجاج سەقەفی ژمارەی قوربانیان بەهەزاران بوون بزووتنەوی خەواریج و مەوالیەکانی لەعێراق و ئیران لە خوێن گەوزاند [٨٧]. ابن خیاط دەلیّ: حجاج لە سالّی(٨٣ك) ( موحەمەدی کوڕی قاسمی ) کرد بە والی عێراق فرمانی پێداوە کوشتاری کوردەکان بکات [٨٨]، ابن قاسم بەفرمانی حجاج ملی بە کوردەکاندا [٨٩]، ئەم دلّ رقی و بێ بەزەیی و توندو تیژیەی حجاج ، ئەوچاکسازیانەی خەلیفە عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان کردبوونی یارمەتی سەقامگیربوونی دەسەلاّتی ئومەوییدا لەناوچەکوردییەکاندا، بەلاّم جمو جۆلی و چالاکی خەواریج و مەوالی لە ناوچە کوردیەکان هەر درێژەی هەبووە [٩٠] .

شێوازی چەوسانەوی دەرەبەگایەتی [٩١] ، سیاسەتی ناعادیلانەی ئومەوییەکان دژایەتی کردنی بۆ بنەمالّەی فەرمانڕەوا زیاتر کرد [٩٢] ، بەم جۆرە ئەم نارەزایە زۆربەی مەوالی لەنێوانیشیاندا کوردەکان وە هەندێ لە هۆزەکانی عەرەبیشی گرتەوە [٩٣]، هەر بۆیە دەسەلاّتدارانی فەرمانڕەوایی ناچارکرد کە سیاسەتێکی نەرم لەگەلّیاندا بەکاربهێنن، [٩٤]، لە وانەیە ئەم

سیاسەتە ناوچە کوردیەکانیشی گرتبێتەوە، کە خەلیفە عومەری کوری عبدولعزیز بە پەیڕەوکردنی ئەم سیاسەتە ناسراوە بەمەبەستی پتەو کردنی دەسەڵاتی ئەمەوییەکان هەندێ چاکسازی کرد [٩٥]، بەمەش کوردەکانی شارەزوور لایەنگری ئومەویی بوونە [٩٦] . چونکە خەلیفە عومەری کوری عبدولعزیز دادپەروەر بووە کوردەکان بەخلیفە صالح ناوی دەبەن [٩٧]، تەنانەت خەواریج و مەوالیەکانیش شاهێدی دادپەروەری راستگۆی لێبوردەی بۆ دەدەن [٩٨] .

لە سەردەمی خەلیفە هیشامی کوری عبدالملیك ( ك١٠٥– ك١٢٥) ناوچەکانی ئەرمینیاو ئازەربیجان لەلایەن خەزەرەکانەوە [٩٩]، دووچاری پەلاماردان و داگیرکردن بویتەوە [١٠٠]، بۆ شەرکردن لەگەڵ خەزەرەکان کوردەکان رۆڵی خۆیان هەبووە لەم بارەیەوە ابن ئەعزم الکوفی دەڵێ ( سەعدی کوری عومەر ) بە بەهەر شارێکدا دەڕۆی کوردەکان دەهاتنە پاڵێ تاگەیشتنە شاری ئەرزن، ژمارەی ئەوانەی هاتنە پاڵی دەگەیشتە (٣٠) هەزار ئەمەش بوە هۆی شکاندنی خەزەرەکان [١٠١] .

لەسەردەمی خەلیفە مەروانی کوری محمد ( ١٢٧ك–١٣٢ك) دەولەتی ئومەویی توشی ئاژاوەی زۆر هات، چەندین شۆرش و ڕاپەرین لەدژی خەلافەت بەرپابوو بەمەبەستی لاوازکردن و ڕووخاندنی [١٠٢]، کوردەکان پشتگیریان لە خەلیفە مەروانی کوری محمد کردوە لەوکاتەی لە دژی سلێمانی کوری هیشام وەستاوە [١٠٣] ، زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن دایکی مەروان کورد بووە ناوی ( لبابە ) یە [١٠٤]، وا دیارە مەروان لەو ماوەی کە والی بووە، لەجەزیرە لایەنگری زۆری پەیداکردوە [١٠٥]، بۆیە

دوای ئـەوەی هاتـە سـەر دەسـەڵات ژمارەیـەکی زۆر لەخـەڵکی جـەزیرە بەیعەتیان پێداوە، هەر وەکو باسمان کرد لەسـەردەمی خەلافـەتی مـەروانی کوری موحەمەد دەوڵەت تووشی زۆرێك لەشۆرش و راپەرین بۆتەوە دەولەتی ئومەویی بەرەو لاوازی دەرۆی ئاژاوە و ناکۆکیش کەوتە نێوان لایـەنگرانی مـەروان (١٠٦)، لەوماوەیـەش دا بانگـەوازی عەبباسـیەکان دەسـتی پـێ کردبـوو(١٠٧) ، مەوالیـەکان لەنێونیـشیان دا کوردەکـان پەیوەنـدیان بـە عەباسیەکان کردبوو (١٠٨).

بزووتنەویـەکی گـەورە بەسـەرکردایەتی ( ابومـسلمی خوراسـانی )* پەیـدابوو وە بەخێرایـەکی زۆر ناوچـەکانی رۆژئـاوای ئێرانـی بـە ناوچـە کوردیەکانیش گرتەوە بەرە بەر هێزی ئومەویی توانای خـۆراگرتنی نـەدەما بەرامبـەر بـە هێـزی عەباسـیەکان لـە نێـوان سـاڵانی (١٣٠ك- ١٣٢ك) نەهاوەنـدو پاشـان حلـوانیش کەوتـە دەسـت عەباسـیەکان (١٠٩)، قەحتەبـەی کوری شەبیبی فەرمانـدەی سـەربازی ئەبوموسـلیمی خوراسـانی هێزەکـانی نـاردە شارەزور(١١٠)، ا بن اثیر دەڵێ : ئەم هێزە چوار هـەزار کـەس پێـك هـات بوو لەژێر فەرماندەی ئەباعەون توانیـان هێـزی ئومەوییـەکان کـە عوسمـانی کـوری سـوفیان سـەرکردایەتی دەکـرد ، تێـك بـشکێنن شـارەزووریش داگـیر بکەن پاشان ( قرمسین _ کرمشان) نیش داگیرکرد(١١١). کوردەکـانیش بـەرە بـەر ملیـان بـۆ عەبباسـیەکاندەدا ، هاوکاریـان دەکـردن (١١٢) پاشـان هێـزی عەباسـیەکان بـەرەو ناوچـەی موسـل پێـشرەوی کـرد (١١٣)، مـەروانی کـوری موحەمەد هێزەکەی خۆی لەناوچەی زێی گەورە ئامادەکرد دوای شەرێکی نۆ رۆژە هێزەکانی مەروان تێك شکا، مەروان لەگەڵ هەندێ لەهێزەکەی هەڵهات

بۆ مسر لەوێ لە دێیەك بەناوی (صعید) كوژرا[114] ، بەمەش كۆتایی بەدەولەتی ئومەویی هێنرا لەرۆژهەلاتدا [115]

## رۆڵی ئابوری و كۆمەلایەتی كورد لە دەولەتی ئومەویی دا :

مەوالیەكان رۆلێكی گرینگیان لە ژیانی ئابوری دەولەتی ئەمەویی دا هەبوو، چونكە دوای فراوان بوونی سنوری دەسەلاتی ئیسلام لە نیمچە دورگەی عەرەبیدا ئەوا بەشێكی زۆر ناوچە بەپیتەكانی عێراق ناوچەكانی فارس و كورد خاكە رەش(الارض سواد) كەوتە ژێردەستیان زۆربەی خەلكەكەی بەكشتوكالّ خەریك بوون، هەرچی عەرەبەكان بوون، زیاتر كاری بازرگانیان دەزانی،بەلام بەهۆی خەریك بوونیان بەجەنگەوە بازرگانیان كەم بۆوە، بۆیە زۆربەی داهاتی دەولّەت لەسەرشانی مەوالیەكان بوون، تاوای لێهات ئومەوییەكان باجیان زیاد كرد وە باجیان لەوانەش وەردەگرت، كە موسلمان بوون[116]،كوردیش یەكێك بووە لەو نەتەوانەی باج و خەراجیان بە ئومەوییەكانداوە، بەلام ئەگەر ئەو باجانە بەراورد بكەین لەگەلّ ئەو باجانەی لەسەردەمی فارسەكان و رۆمەكان وەردەگیرا زۆر كەمتر بووە.

لەدەولّەتی ئیسلامدا ئەگەر جووتیار بوایە موسلمان لەسەر زەویەكەی خۆی بمایەوە بەرهەمی بهێنایە دەبوایە دەیەك بدات، بەلام لەسەردەمی ئەمەوییەكاندا جووتیاری نا عەرەب دەبوایە جگە لەباجی زەوی جزیەو بڕیك خۆراك چەند ئمتیازاتی ئابووری پێ بەخشرا بوو دەبوایە بیدات[117] ئەم شێوازی باج وەرگرتنەش لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر جیاواز بوو، ئەوانەی نزیك سنورەكان بوون زیاتر قوربانی ستەمی عەرەبەكان بوون[118]،

هەندێ خاوەن زەوی بەهۆی زۆری باج و خەراج وای کردبوو، بەتایبەتی ئەوانەی عەرەب نەبوون ، بەمەوالی دادەنران موڵکایەتی زەویان بەناوی دەسەڵاتدارێکی دەوڵەتەوە تۆمار دەکرد، لەبەرامبەر ئەوەدا، دەستیان لە برێك بەروبوومی زەوی خۆی هەڵدەگرت، بەجۆریك لە ماوەیەکی کەم دا ئەو زەویانە دەبوونەموڵکی دەسەڵاتدارێك چونکە لەسایەی دەولەتی ئەمەویی دا مەوالی سەرەڕای بە ئایین موسلمان بوون، بە هاولاتی پلە دوو حساب دەکران، ئەم هەڵسوکەوتەی ئەمەوییەکان لەکاتێکدا بوو کە مەوالیەکان بە شێکی گەورەی دارایی دەوڵەتیان لەسەر شاندابوو، بەلام لەسەردەمی عومەری کوری عبدالعزیز تاڕادەیەك باری ئابوری باشتر بوو خەلیفە باجی لەسەر هەلگرتن، کوردەکان بارودۆخیان باشتر بوو، جیاوازی نەدەکرا لەنێوان عەرەب و مەوالی، بەلام لەسەردەمی خەلیفەکانی تر باردۆخیان وەکو خۆی لێهاتەوە [١١٩].

بنەماڵەی ئەمەویی لە سیاسەتیان بنەماڵەی عەرەبیان خسۆتە پێش موسلمانی ترەوە، پلەو پایەی بەرزیان هەبووە لە دەوڵەت مەوالیەکانیش کاری کشتوکاڵ و پیشەسازیان ئەنجامدەدا ، ئەمەش جۆرێك لە هەستکردن لەنایەکسانی دروست کرد، مەیلە بۆ قەبیلە دووبارەبۆوە، بەلام بە شێوازێکی تر[١٢٠]، هەروەها مەوالی پلەی کۆمەلایەتیان نزمترە، دووریان خستۆنەتەوە لەسیاسەت [١٢١]، تێروانینی مەوالی بۆخۆیان لە ڕووی هەڵسوکەوتی ئەمەوییەکان لەگەڵیان ڕوون نەبوو، بەڵکو دەمارگیری ئەمەوییەکان بووە هۆی ئەوەی زۆربەی مەوالیەکان بە کوردەوە بێنە ناو بزووتنەوە بەر هەڵسکارەکانی دژ بەبنەماڵەی ئومەویی[١٢٢]، هەروەها لەگەڵ ئەوەی

یەکسان نەبوونە لەگەڵ عەرەبەکان ئەگەرچی نەخشەیەکی گەورەشیان لەژیانی سیاسی روناکبیری لەناوچەکانی خەلافەتدا هەبووە[١٢٣]، کە چەند سەرکردایەکی سەربازی دیاریان لێدەرکەوت[١٢٤][١٢٥].

مەوالیەکان رۆڵی دیاریان هەبووە لەکرداری بەعەرەبکردن بە تایبەتی لەسەردەمی خەلیفە عبدولمەلیکی کوری مەروان وەلیدی کوری، نووسراوەکانی مسر و فارسی یۆنانی وەر ئەگێران بۆ عەرەبی ئەمەش بوە هاندەر بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی لەناوچە فەتحکراوەکان، تاوای لێهات ئەوانە مەوالی بوون باشترین بۆزمانی عەرەبی و عبدالملیك کوری مروان دەستی کرد بەعەرەبکردنی تۆمارگەی خەراج لەشام فەرمانی دا بە نووسەرەکەی ( سلێمان سعد الخشی ) کە ئەم تۆمارگەیە لە رۆمی بگۆرێت بۆ عەرەبی لەساڵی (٨١ك) لەعێراق لەسەردەمی حجاج کراوە بە عەرەب[١٢٦]، کوردەکانیش بەشداریان لەم بەعەرەبکردنە نەکردووە چونکە ئەوکاتی کورد زاناو بیرمەندی تێدا هەلنەکەوتووە وە ئاستی رۆشنبیریشیان زۆرکەم بووەکاتی کورد رێزمانی نووسینی نەبووە، بەلگەش بۆ ئەوە کوردەکان مێژوو نووسێکیان تێدا هەڵنەکەوتووە، یان زانایەکیان دەرنەکەوتووە تاوەکو ئێستا دەسنووسەکانیان مابێت*

**بەشـــــداری کـورد**

**لەهـــەندێ بزووتنەوەی دژ بەخەلافەتی ئومەویی :**

**-بزوتنەوەی تەوابین (٦٥ك):-**

ئــەم بزووتنەوەیــەش بەســەرکردایەتی ســلێمان بــن ســرد خــوزاعی پەیدابوون[١٢٧] ، هۆکاریی دەرچوونیشیان دەگەڕێتەوە بۆ کوشتنی حوسینی کوڕی عەلی ئەوانە بەهۆی بەجێهێشتنی حوسـین کـوڕی عـەلی بۆیـە پەشیمان بوونەوە، ئەوا ناویان لە خۆیان ناوە ( تۆبەکار)[١٢٨]، واتا تۆبیـەیان کـردووە لەسەرئەوەی حوسینی کوری عەلی یان بە جێهێشتوە..

ئەم بزوتنەوەیەش دەستیانکرد بەبانگەوازیکردن بـۆ تۆلەسـەندنەوەی حوسینی کوری عەلی[١٢٩]، ئەمانە ڕوویان کردۆتە ناوچەکانی جزیرە[١٣٠]، ئەم بزووتنەوەیــەش لەوانەیــە کوردەکــانی جزیــرە هاتبنــە پــاڵی لەبــەر ئــەوەی بزوتنەوەکەی بانگەشـەی تۆلەسـەندنەوەی حوسـینی دەکـرد، وە بۆمـاوەی چوار ساڵ لەناوچەکان گراون لایەنگیریان بۆ خۆیان پەیداکردووە.. لەلایەکی تــرەوە هــاتنی ئــەو ســوپا زۆرەی ئومەوییــەکان بەســەرکردایەتی عبـدوللای کوڕی زیاد لەشەرێك لە نێوانیان ڕوودەدا لەسـاڵی(٦٥ك) لـە(عـین وردە) لـە هــەرێمی جزیــرە، لــەم شــەردا ســوپای ئومەییــەکان ســەرکەوت کۆتــایی بــە بزووتنەوەی تەوابین هێنا [١٣١].

**- بزوتنەوەی عبدوللای کوڕی زوبیــــر :-**

پــاش هــاتنی خەلیفــەی دووەمــی ئومــەویی ( یەزیـد کـوری معاویــە) لەســاڵی(٦٠ك ) ئەمــەش دەرفــەتێك بــوو بــۆ بۆعبـدوللای کــوری زوبــیر

تاوەکوخەلافەتی خۆی رابگەینێ، خەڵکی حیجاز بەیعەتیان پێدا [١٣٢]، لە پاش ئەمەش ناوچەکانی هەرێمی فارس و عێراق و خوراسان و هەرێمی جزیرە و موسل[١٣٣]، بەعەتیان پێدا[١٣٤]، تەنیا ناوچەکانی شام نەبێت بەیعەتیان پێ نەدا ئەمەش لەبەر ئەوەی زۆربەی بنەماڵەی ئومەوییەکانی لێ بوو [١٣٥]،ئەم دەسەلاتەی عبدالرحمن کوری زوبیر لە دوایی لە ناوچوونی بزووتنەوەکەی موختار سەقەفی دابوو، عبدوللای کوری زوبیر لە رێگایی مصعب ی برایەوە توانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر زۆربەی ناوچەکانی خەلافەت بسەپێنێ ئەمەش دوای ئەوەی شەرێك لە نێوان موختارو مصعب روویدا لە ناوچەی کوفە بەسەر کەوتنی مصعب کۆتایی پێ هات، ئەمەش وایی کرد زۆربەی ئەو ناوچانەی پێشتر لە ژێردەستی موختار بوو بکەوێتە ژێردەستی عبدوڵلای کوری زوبیر، وە ئەمەش ناوچەکانی ( هەرێمی چیا، ئەرمینیا و ئازەربیجان و جزیرە ..)، محمد ابن الاشعسی کردە والی بەسەر موسلەوە [١٣٦] ، زۆر لە سەر چاوەکان ئاماژە بەشداری بەکردەوەی مەوالی دەکەن لە بزوتنەوەکەی عبدوللای کوری زوبیر، هەر لەسەرەتایی راگەیاندنی خەلافەت ژمارەیەکی زۆر لە مەوالیەکان هاتنە رێزی بزووتنەوەکەی بەیعەتیان پێدا [١٣٧] ، ئەگەر پیشتر زوریەی مەوالیەکان لەساڵی (٦٦ك) چووبوونە ریزی بزوتنە وەی موختاری سەقەفیە وە،چونکە موختار بایەخێکی زۆری بەمەوالیەکان دەدا [١٣٨]، بەلام لەپاش ئەوەی (موصعەبی کوری زوبیر) توانی بزوتنەوەی موختار لەناو بەبات ئیتر ناوچە کان کەوتنەژێر دەستی عبدوللای کوری زوبیر دەسەڵاتی خوی لەم ناوچانەدا سەپاند[١٣٩]، مەوالیەکانی ئەم ناوچانە هاوکاری ولایەنگری عبدوللای کوری

زوبیر یان کرد وبەشداریان کرد لەسوپاکەی، دەسەلاتی عبدوللا بەم شێوەیە لەسەر ناوچە مایەوە تاسالّی (٧١ك) کە(عبدوالملیکی کوری مەروان)سوپایەکی نارد بەسەرۆکایەتی خایدی کوری عبدوللای کوری ئەسەد[١٤٠]، ڕووی لەناوچەکانی ژێردەسەلاّتی (عبدوللای کوڕی زوبیر ) کرد ولەپاش شەڕێك توانی موصعەبی کوری زوبیری بکوژێت، دەسەلاّتی دەولّەتی ئومەویی گەڕایەوە بۆئەوناوچانەی ئەمەش پاش بزووتنەوەی عبدوللای کوڕی زوبیر ونەمانی لەم ناوچانەدا[١٤١]

## -بزوتنەوەی موختاری کوری عبید سەقەفی ( ٦٦ك )

موختاری کوری عبید سەقەفی لە سالّی (٦٦ك) دەرکەوت لەشاری کوفە خەلّکی لێی کۆبوونەوە کە بریتی بوون لە شیعەکان ئەوانەی دەیان ویست تۆلّەی حوسینی کوری عەلی بکەنەوە[١٤٢]، هۆکاری هەلّگیرساندنی بزووتنەوەکەشی دەگەڕێنێتەوە بۆ کوژرانی حوسینی کوڕی عەلی[١٤٣]،موختار خاوەن بیروباوەڕی تایبەت بووە، هەندێ لە مێژوونوسان وای بۆ دەچن ئەو بیروباوەڕەی موختار هەیبووە نزیك بوو لە بیروباوەڕی زەردەشت و مانی مەزدەکی [١٤٤].

هەر لەسەرەتاوە موختار توانی چەند ناوچەیەکی کورد بخاتە ژێر دەستی خۆیەوە والی خۆی تێدا دامەزراند[١٤٥]، هەروەها ( ابن مالك البکراو )ی لە حلوان ماسبزان دامەزراند، هەروەها لەناوچە کوردییەکان یارمەتی دەدرا، وەکو هەرێمی چیاو جزیرە [١٤٦] ، وا دیارە خەلّکی ئەوناوچانە هاتونەتە

ریزی بزووتنەوەکەی، ابن ئەثیر ئاماژە بە فەرمانی موختـار دەکـات بـۆ والی حلوان، کە سعید کوری حزیفەی ناردە حلوان فەرمانی پێ کردوە بەکوشتنی کوردەکانی (مەوالی)[١٤٧]، موختار هەوڵی داوە پشت بە مـەوالی بەبـستێ[١٤٨] لـەرووی سـەربازی داریـەوە مەوالیـەکان یارمـەتی زۆریانـداوە لـە ناویـشیان کوردەکان.

لە کەناری روباری خازەر لە نزیك موسل شەرێکی گەورە روویـدا لـە( ٦٧ك) لە نێوان سوپای موختارو سوپایی ئومەوییەکان، سوپای موختار توانی سەر بکەوێت و چەند کەسێکی نـاوداری ئومەوییـەکان بکـوژێ لەوانـە عبـدوللای کوری زیاد بن ئەبی کە دەستی هەبووە لە(کوشتنی حوسنی کوری عـەلی )* ، لەئەنجام ناوچەکانی نصبین و دارا وسـنجار گرتـە دەسـت والی خـۆی لـەم ناوچانەدامەزراند[١٤٩].

موختار بۆ ئەوەی زیاتر پشتگیری کوردو مەوالی بەدەسـت بهێنـێ هەڵسا بـە یەکـسانی کردنـی مـەوالی و عـەرەب، وە بەشـداری پێکردنـی مـەوالی لـە کاروبـاری ئیـداری هاوبەشـیکردن لەدەسـتکەوتەکانی جـەنگ[١٥٠]. هـەروەها دینوەری دەلێت: موختار ئەوا بڕوای بە مەوالیەکان پتەو بوو کـە وای لێهـات ،سەروەت و سامانەکەی لای پیاوێکی مەوالی دابنێت ، ئەمـەش دەگەرێتـەوە بۆ ئەوەی موختار پشتی زۆری بە مەوالی بەستاوە هەروەکو موختـار ئامـاژە بـەو هاوکاریـەی مـەوالی کردوەلەچـاو عەرەبـەکان هـەروەکو دەلێـت ( ئێـوە مەبەست لە عەرەبەکان بووە کاتێك رێـزم دەگـرتن خۆتـان بـەرزرادەگرتن ، کاتێك دەمکردنە والی خەراجتان نەدەدا، بەڵام ئەو مەوالیانە لە ئێوە باشتر و بەوەفاترن هەرجیم بویستایە بۆیان دەکردم[١٥١].

بەڵام موختار بەم شێوەیە نەمایەوە بەڵکو کۆتایی بە بزووتنەوەکەی هێنرا لە لایەن عبدوڵلای کوری زوبێر دوای چوار مانگ شەروکوشتار [١٥٢]، بەمەش ناوچەکانی موصل و هەرێمی چیاو جزیرە کەوتە ژێردەستی عبدوللای کوری زوبێر[١٥٣].

- بزووتنەوەی عەبدولرەحمانی کوری ئەشعەس :

پاش ڕوودانی شەری ( دیرالجماجم*) لەسالی (٨٣ك ) لە نێوان حجاج و عبدالرححمن دا، خەڵکی عێراق نەیان دەویست لە مەوالیەکان بکوژن بۆیە حجاج ناچار بوو لە وولاتی شامەوە سوپا بهێنێت تا دژی عبدالرحمن بوەستن [١٥٤] عبدالرححمن ناچاربوو بگەرێتەوە بۆ ناوچەکانی (سجستان و خوراسان و کرمان) بەناوچەی فارس دا تێپەری [١٥٥].

عبدالرحمن بزووتنەوەکەی ناوچەی فارس دەست پێ کرد و مەوالیەکانی ئەم هەرێمە چوونە ریزی ئەم بزووتنەوەیە [١٥٦]، وهەروەها لەناوچەکانی هەرێمی چیادا چوونەریزی بزووتنەوەکەی عبدولرحمان، ئەوەی مسعودی دەلێت(( خەڵکی چیا چوونە ریزی بزووتنەوەکەی عبدالرحمن کوری ئەشعس [١٥٧]، ئەمەش پاش ئەوەی حجاج هەڵگەرایەوە هەروەها لە ناوچەکانی ( سجستان) مەوالیەکانی ئەم ناوچەیە پەیوەندیان پێوەکرد لەم بارەیەوە ابن خلدون دەلێت: کاتێك عبدولرحمان چووە ناوچەکانی سجستان سوپای حەجاج بەدوایەوە بوو تا گەیشتە ناوچەی سابور مەوالیەکان لێی کۆبوونەوە [١٥٨].

ئـەم هاوکاریـەی مەوالیـەکان کـە کـوردیش دەگرێتـەوە بـۆ مەوالیـەکان دانراوە زیانی زۆر بە ناوچەکوردیەکان گەیاندوە چونکە لـە وکاتـەحجاج والی عێراق بوو کە بەسیاسیەتێکی توندو تیژ ناسراوە بۆیە حجاج محمدی کوری قـاسمی دانـاوە بەسـەر ناوچـە کوردیـەکان فـەرمانی پێـداوە کوشـتاری کوردەکان (مەوالی) بکات [١٥٩].

هـەروەها حجـاج هێرشـی کـردە سەرناوچـەکانی ئـەهواز کـە لایـەنگرانی ئەشعەسی تێدا بوو، کوشتارێکی زۆری لێیان کردووە[١٦٠]، پاشانیش هێرشی کردۆتـە سـەر هـەرێمی فـارس لەسـاڵی(٩٠ك) ژماریـەکی زۆری مـەوالی تێـدا بـووە[١٦١].

عبدالرحمن دوای شکستهێنانی چوو ناوچەی سجستان و پەیوەندی کرد بە رتبیل [١٦٢]، بەڵام حجاج نوێنەری خۆی ناردە لای رتبیل بۆ ئەوەی عبدالرحمن تسلیم بکاتەوە[١٦٣]، بەم شێوەیە بزوتنەوەکەی عبدالرحمن کۆتایی بە بزووتنەوەکەی هات ناوچە کوردیەکانیش تووشی زیان شەرو شۆری زۆر هاتوون

*　　　*　　　*

## ئەنـــجــــــام

دەرئەنجامی ئەم توێژینەوە لەسەر بارودۆخی کورد لە دەولەتی ئومەویی دەگەیینە ئەم دەرئەنجامانەی خوارەو:

– لەسەرەتایی فتوحاتی ئیسلامی گۆرانکاریەکی گەورە بەسەر بارودۆخی ناوچە کوردیەکاندا هاتووە، چونکە کوردەکان بۆ ماوەیەکی زۆر لە ژێردەستی ئیمپراتۆرەکانی یەك لە دوایی یەکەکانی ساسانی و بیزەنتی بوونە، نەیانتوانیوە کیانێکی ئیداری سەر بە خۆیان هەبێت بە ڵکو هەردەم لە ژێردەستی فارسەکان یان رۆمەکان بوونە، زیاتر ژێردەستەی فارسەکان بوونە.

بەڵام دوایی هاتنی سوپایی ئیسلام و موسلمانەکان ئەوا کوردەکان تارادەیەکی زۆر لە دەستی باج و زوڵم و زۆرداری فارسەکان ر رۆمەکان رزگاریان بووە، وە بائاسانی هاتوونەتە ناوئیسلام قبوڵیان کردوە هەروەکو محەمەد ئەمین زەکی دەڵێ: کوردەکان ئایینی ئیسلامیان قبول کرد هیچ نەتەوەیەك بەم ئاسانیە قبولیان نەکردوە دوایی هاتنی ئیسلام ئەوا ناوچە کوردییەکان بەتەواوەتی کەوتە ژێر باری خەلافەت ،ئەوا ناوچە کوردەکانیان دابەشبوو، بۆ چەند یەکەیەکی ئیداری جیاوازو هەریەك لەوناوچانەتابعی ناوچەیەك یان هەرێمێکی دەولەت بوونە.

کورد یەکێك بووە لەو نەتەوانەی لەچەند هەرێمێکی دیاری کراودا لە ژێر باری خەلافەتی ئیسلام ژیاوە، بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت کورد بە مەوالی دانراوە، بەڵام ئەمەش ئەوەناگەینێ کە بەچاوێکی سوك سەیریان کراوە،

بەڵكو لە هەندێك ئەرك و ماف، جیاوازیان هەبووە لە گەل عەربەكان.

بەلام مەوالی لەسەردەمی ئومەویەكاندا دەستەیەكی كۆمەلایەتی گەورە بوونەكە معارەزەی سیاسەتی بنەماڵەی ئومەویەكانیان دەكردئەمەش لە زیاد بوون دابووەبە زیاد بوونی ژمارەی بزووتنەوەكانی دژ بە ئومەویی.

هەروەها مەوالیش ناتوانرێت پێناسیەكی تەواو دیاری كراوی بۆ بكەین بەڵكو بە پێی سەردەمی خەلیفەكان و بارودۆخی دەولەتەكە گۆراوە، چونكە لەسەردەمی هەندێ خەلیفە مەوالی مافی تەواویان هەبووە، جیانەكراونەتەوە لە عەرەبی ئیسلامی، بەلام بە گۆرانی خەلیفەو سیاسەتی دەولەت گۆراوە بەرامبەریان، وە هەندێ خەلیفە پشتیان پێیان دەبەست لە لەبەرێوەبردن و كارگێری چونكە هەندێ لە مەوالیەكان پلەی كارگێریان هەبووە لەسەردەمی فارسەكان یاخود رۆمەكان، شارەزایان هەبووەلەكارگێری، عەربەكان هەوڵیان داوە سودیان لێوەر بگرن لە بەرێوەبردن، ئەو كارانە مەوالیەكان پێی هەڵسان ئەویش بە عەربكردنی دیوانی خەراج بووە كە ئەو سەردەم تۆمارەكان بە زمانی فارسی بوونە، وەرگێرانە سەرزمانی عەرەبی لە لایەن مەوالیەكانەوە.

كورد ئەگەر چی مێژوو نووسێكی نەبووە لەسەردەمی ئومەوی تا ڕووداوەكان بنووسێتەوە، یاخود گرینگیان بە نووسینەوەی مێژوو نەداوە، بۆیە ئەگەربێت باسی كورد لەسەردەمی ئومەویی بكەین دەبێت بگەرێنەوە بۆ سەر چاوە ئیسلامی عەربیەكان ، ئەمەش تێك هەلكێشیەك هەیە، ماندوو بوونی زۆری دەوێ بۆ جیاكردنەوەی ڕووداوەكانی پەیوەندی بە كوردەوەهەیە.

لەسەردەمی ئومەویش کورد ئەگەر چی یارمەتی هەندێ بزووتەوەی داوە دژ بەخەلافەتی ئومەوی ئەمەش مانایی ئەوەنیە هەردەم کوردەکان دژ بەخەلافەت بوونە، بەڵکو ئەو دژایەتی کردنە دەگرێتەوە بۆ ئەوەی سیاسەتەتوندەی کە لەسەردەمی هەندێ خەلیفە بەرامبەریان بەکارهاتووە، بەڵام پێچەوانەش لەسەردەمی هەندێ خەلیفە یارمەتی ئومەوییەکانیانداوە دژ بە هەر هێرشێکی دەرەکی لەوانەش هێرشی خەزەرەکان ئەوا کوردەکان ژمارەیەکی زۆر هاتوونەتە سوپایی ئومەویی بۆ پێش پێگرتنیان.

## پەراوێزو سەرچاوەکان

(١)العسقلانی، فتح البری بشرح الصحیح البخاری ، قاهیرة ١٩٨٦، ج٧,٩٧.

(٢) حسین قاسم العزیز، البابکیة، رسالةالدکتورا فی الجامعة موسکو، ١٩٦٦،ل٨٦.

(٣) سورة الاحزاب، ئایەتی (٥)

(٤) العقد الفرید، بیروت،١٩٨٧، ج٤، ل٤٣٤.

(٥) دولة العربیة وسقوطها، دیمشق،،١٩٥٦،ل٦٠.

(٦) ابن الاثیر، الکامل فی التاریخ، ج٧،ل٢٤٠.

(٧)ئارشاك پۆلا، کورد لەسەر چاوە عەرەبیەکاندا، وەرگێرانی ئازاد عوبید، چاپخانەی ، ل٤٠.

(٨) تاریخ العرب، بیروت،١٩٧٤،ل ٢٣١.

(٩) ابو فیداء ، تقویم البلدان، بیروت،د.ت،ل٨٥.

(١٠) هەمان سەرچاوە،ل٣٢٨.

(١١) ابن الفقیة، مختصرکتاب البلدان، لیدن،١٨٨٥،ل١٣١.

(١٢) المسعودی ، مروج الذهب ومعادن الجوهر،ج٢، بیروت،د.ت،ل١٠١، ابن الحوقل، صورة الارض، بیروت، ١٩٧٩،ل١٢٩.

(١٣) خلیل اسماعیل محمد، اقلیم کردستان العراق، اربیل١٩٩٨،ل٨٣.

(١٤) البلاذری، الفتوح البلدان، المراجعوالتعلیق رضوان محمد، بیروت،١٣٩٨ه/١٩٧٨م،ج١، ل٣٢٣.

(١٥) یاقوت الحموی، معجم البلدان، بیروت،د.ت،ج٢،ل٢٤٠.

(١٦) محمد امین زەکی بەگ، خولاصەیەکی تاریی کوردو کوردستان، چاپی دووەم، سلێمانی ، سەردەم، ٢٠٠٠، ل٦٦،

(١٧) یاقوت الحموی، معجم البلدان، ،ج٢،ل٣٠٤.

(١٨) البلاذری، الفتوح البلدان، ل٤١٠، ابن الحوقل، صورة الارض، ل٣١٤، فائزة محمد عزت، الکرد فی الاقلیم الجزیرة وشهرزور فی صدر الاسلام(ف١٦-١٣٢ه) رسالة ماجستیر مقدم الکلیة الاداب، جامعة صلاح الدین، هەولێر، ١٩٩١، ل٥٢.

(١٩) شوان عوسمان مستەفا، کوردستان و پرۆسەی بە ئیسلام کردنی کورد، چاپی یەکەم، سلێمانی ،٢٠٠٢،ل٣٧.

(٢٠)هەمان سەرچاوەی پێشوو،ل ل٥١-٥٢.

(٢١)کرخ وجدان شارێکە دەکەوێتە نزیك خانەقین، یاقوت الحموی، معجم البلدان، ،ج٤،ل٢٤٩.

(٢٢)حسام الدین النقشبندی، الکرد فی الدینورو شهرزورقرن(٤-٥ه) رسالة ماجستر،بغداد،١٩٧٥،ل٤٥.

(٢٣) یاقوت الحموی، معجم البلدان، ،ج٢،ل١٣٨.

(٢٤) ابوفیدا، تقویم البلدان،ل٤١٥، ابن عبد ربە، العقد الفرید، بیروت،١٩٤٥،ج٧،ل٢٤٣.

(٢٥)ابن حوقل، صورةالارض، ل٢١٥.

(٢٦) عدنان علی کرموشی الفرجی، الخلافة الامویة(٩٦-١٠٥ه) رسالة ماجستر،بغداد،١٩٨٧،ل١١٥.

(٢٧)حسن محمود حمە کریم، کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامی،چاپخانەی سلێمانی ٢٠٠،ل٦٧.

(٢٨) یاقوت الحموی، معجم البلدان، ،ج٢،ل١٣٨.

(٢٩) فائزة محمد عزت، الکرد فی الاقلیم الجزیرة وشهرزور فی صدر الاسلام فی (١٦-١٣٢ه)،ل٢٦.

(٣٠)محمد جاسم الحمادی، الجزیرة الفراتیة والموصل،(١٢٧-٢١٨)،ط١، بغداد،١٩٧٧،ل٣٢٢.

* بە بەشی رۆژئاوایی مەلبەندی چیا(اقلیم جیبال) بە کوردستان ناوبراوە، شەرفخانی بەدلیسی، شەرفنامە، چاپی یەکەم،وەرگێرانی هەژار موکریانی ، چاپخانەی نەجف، ١٩٧٢،ل١١٩.

(٣١) یاقوت الحموی، معجم البلدان، ،ج٢،ل٤٠.

(٣٢) هەمان سەرچاوە،ج٢،ل٤٠.

(٣٣)احمد میرزا میرزا، غرب اقلیم الجیبال فی صدر الاسلام حتی١٣٢ه رسالة ماجستیرمقدمة الکلیة الاداب جامعة صلاح الدین، هەولێر،١٩٩٥.

(٣٤) البلاذری، انساب،ج ٢ ،ل٤٥، المسعودی ، التنبیة والاشراف، بیروت،١٩٨١،ج٣،ل٩٤.

(٣٥) صورة الارض،ل١٢٠.

(٣٦) البلاذری، انساب، ج ٢ ،ل ٤٥. المسعودی ، مروج الذهب، ج، ل١٠، زوبیر بیلال الاکراد فی کتاب ابن الاثیر، گۆڤاری کاروان ، ژمارە( ) سالی(١٩٨٦) ل٤٢.

(٣٧)صورة الارض، ل١٢٠.

* ناوی ئازەر بیجان: بە شێوازی جیا هاتووە( اترۆپاتین، ادرباذاکان..... بۆ زیاتر زانیاری بروانە حسام الدین علی غالب النقشبندی، ازربیجان(٤٢٠-٦٥٤) رسالة دکتۆرامقدمة الکلیة الادابجامعة، بغداد،١٩٨٤،ل٣٧.

(٣٨) حسام الدین علی غالب النقشبندی، ازربیجان،٣٧.

(٣٩) هەمان سەرچاوە،ل٣٧.

(٤٠) البلاذری، فتوح البلدان،ل ٧٢ .

(٤١) احمد عبدالعزیز الهزبانیون فی ازربیجان وبلاد اران و الجزیرة الفراتیة، چاپی یەکەم، هەولێر-ئاراس،٢٠٠٢،ل١٧.

(٤٢) حسام الدین علی غالب النقشبندی، ازربیجان،ل٣٧.

(٤٣)کوثر اسماعیل حسین، الحیاة الاجتماعیة فی اقلیم ازربیجان واران، رسالة ماجسترمقدمة الکلیة الاداب،جامعة صلاح الدین،اربیل،٢٠٠٢،ل٩.

(٤٤) هەمان سەرچاوە،ل٢٤٠.

(٤٥) تاريخ الدولة العربية منذ ضهور الاسلام حتى سقوط الدولة العربية، الاسكندرية، ١٩٧٤، ل٢٧٦.

(٤٦) الطبری، تاريخ،ج٤، ل٣٤٨، ابن الاثير، الكامل، مج٣، ل١٢٨، ابن خلدون، ج٢، ل٥٦٨، مروج الذهب، مج١، ل٦٣٣. بۆزیاتر زانیاری، تەماشایان بکە.

(٤٧) ابن القتيبة، الامام والسياسة، القاهرة، ١٩٦٣، ج١ل ٣٠.

(٤٨) اليعقوبی، يعقوبی، بيروت، ١٩٦٠، ل ل٧٥-٧٦.

(٤٩) البلاذری، فتوح البلدان، ج١، ل٢١٩.

(٥٠) البلاذری، فتوح البلدان، ج١، ل٩٤.

(٥١٠) الطبری، تاريخ، ج٤، ل٤٢٧، ابن الاثير، الكامل ، ج٣،ل١٨٠.

(٥٢) ابن كثير ، البداية والنهاية، ج٤، ل٢٢٦. بۆ زیاتر زانیاری بروانە ئەم سەرصاوانە (البلاذری، اساب الاشراف،ج٢، ل٢١، ابن الاثير، الكامل ، ج٣،ل٢١٨).

( جەنگی جەمەل و صەفین): جەنگی جەمەل: ئەو جەنگە بوو لە نێوان موسلمانەکان و خۆیان روویدا، ئەم جەنگە عەلی کوری ئەبو تالب (ر.خ) لەبەرەیەك و عائیشەی خێزانی پێغەمبەر(ر.خ) تەلحەی کوری عبدوللا و عبدوللای کوری عەوام لەیەلاکی ترەوە شەرو کوشتاری زۆریان لێکرد خوێنێکی زۆری موسلمانەکان بە ناهەق بووە قوربانی ئەم جەنگانە لەم جەنگەشدا تەلحەی کوری عبدوللا و زوبیری کوری عەوام کوژران...

( جەنگی صەفین): ئەو جەنگە بوو لە نێوان معاویەی کوری ئەبو سوفیان(ر.خ) و عەلی کوری ئەبو تالیب(ر.خ) روویدا، لەم شەردا زۆر کوژران لە هەردوولادا، معاویەی داوایی بکوژانی عوسمانی کوری عەففانی دەکرد،

(٥٣) ابن الاثير، الكامل، ج٥،ل ٣٧١.

(٥٤) هەمان سەرچاوە، ج٣، ل١٨٧.

(٥٥) هەمان سەرچاوە، ج٣، ل١٨٧.

(٥٦)دائرة المعارف الاسلامية، مادة امية، ترجمة ابراهيم زكی القاهيرة،١٩٦٩،ج٨ل٦٦٥.

(٥٧)سيد امير علی، مختصرتاريخ العرب، ترجمةتحقيقالبعلبكی، بيروت،١٩٦١،ل٧٨.

(٥٨)سيد عبدالرزاق الحسنى ، تاريخ العراق السياسى الحديث،ط١،
بغداد،١٩٨٩.ج١،ل٢٩٠.

(٥٩)محمد كردعلى، الاسلام والحضارة العربية قاهيرة١٩٥٠،ط١،ل٣٩٣.

(٦٠)ابن كثير، البداية والنهاية، بيروت،١٩٦٦ ،ج٨ ،ل٢٠، السيوطى، تاريخ الخلفاء، تحقيق محمد محى الدين عبدالحميد، القاهيرة١٩٥٩،ل١٩٤.

(٦١)ابن قتيبة، المعارفو تحقيق ثروة عكاشة،بيروت،١٩٦٠، ابن كثير، بدايةوالنهاية،ج٨،ل٥٠، ابن الطقطقى، كتاب الصخرى فى الاداب السلطانية الدولة الاسلاميةو بيروت، ١٩٦٠،ل٧٩.

(٦٢) عدنان على كرموشى الفرجى، الخلافة الاموية(٩٦-١٠٥ه)، ل١٠.

(٦٣) عبدالرزاق الانبارى، تاريخ الدولة العربية العصر الرشدى والاموى، رسالة ماجستر مقدمة الكلية الاداب، بغداد، بغداد، ١٩٨٥، ل١٥٣.

(٦٤) عدنان على كرموشى الفرجى، الخلافة الاموية(٩٦-١٠٥ه)، ل١٠.

(٦٥) عبدالمنعم ماجد ، تاريخ السياسى الدولة العربية العصر الخلفاء الامويين، القاهيرة، ١٩٧١، ج٢، ل١٢٤

(*)حمدللـه قـەزوینی دەڵێ لـە نیـوەی دوەمـی سـەدەی شەشـەم سـولتان سـەنجەری سەلجوقی بۆ یەکـەم جـار نـاوی کوردسـتانی هێنـاوە، واسـیل نکـتین، کـوردو کوردسـتان وەرگێرانی خالیدحسامی (هێدی) چاپی یەکەم، هەولێر١٩٩٧،ل١١١، جمـال رشـيد، تـاريخ كوردالقديم، اربيل١٩٩٠، ل١٢.

(٦٦) جرجى زيدان، تاريخ التمدن الاسلامى، بيروت، د.ت،ج١،ل٧٧.

(٦٧) ابن الفقية، مختصر كتاب البلدان، مطبعة بريل،ليدة،١٨٨٩،ل٦٦.

(٦٨) حسن قاسم العزيز، البابكية، رسالة دكتۆرا، فى جامعة موسكۆ، طبعةالاولى، رسالة غير منشورة،ل٨٦.

(٦٩) ابراهيم العدوى، الامويون والبيزنطيون، ط٣،بيروت،١٩٧٩، ل٢٩٨.

(٧٠) احمد ميرزا ميرزا،غرب اقليم الجيبال فى صدر الاسلام حتى١٣٢ه،ل١٠٨.

(٧١ ) ) فائزة محمد عزت، الكرد فى الاقليم الجزيرة وشهرزور فى صدر الاسلام(ف١٦-١٣٢ه)،ل١١٠.

(٧٢) هەمان سەرچاوە، ل١١٠.

(٧٣) ابن كثير ، البداية والنهاية، ج٨، ل٢٨.

(٧٤) عبدالرزاق على الانبار، تاريخ الدولة العربية، خلافة الراشدى والاموى بين مط والارشاد،بغداد، ١٩٧٩، ل٢٥.

(٧٥) ابن كارزونى، مختصر التاريخ من اول زمان الى منتهى دولة بنى العباس، تحقيق، دمصطفى جواد، بغداد،١٩٧٠، ل٨١.

(٧٦)عبدالجبار ناجى، عمر عبدالعزيز، الخايفة الاموى دراسة تحليلية، الفترة الاموى(٩٩-١٠١ه) مجلة كلية الاداب جامعة بغداد، عدد(١٠)، ١٩٧٦، لل١٦٨.

(٧٧) فائزة محمد عزت، الكرد فى الإقليم الجزيرة وشهرزور فى صدر الإسلام(ف١٦-١٣٢ه)،ل١٦٨.

(٧٨)الطبرى، تاريخ، ج٦، ل٢٠٢.

(٧٩) الطبرى، تاريخ، ج٦، ل٢٠٢، ابن الاثير، الكامل ، ج٤،ل٨٧، الذهبى تاريخ الاسلام، ج٥، ل٨٥.

(٨٠) فائزة محمد عزت، دور الكرد فى الحركة المطرف بن مغيرة ، عبدالرحمن بن الاشعث، مجلة زانكو، مج١، عدد(١)، ١٩٩٨، ل١٠٥.

(٨١) هەمان سەرچاوە،ل١٠٦.

(٨٢) مسعودى ، مروج الزهب، ج، ٣ل١٢٦.

(٨٣) ابن خياط، تاريخ خليفة ابن خياط، تحقيق اكرم ضياء حمدى،ط١، بيروت، ١٩٧٧، ل٣٧٥، ابن كثير ، البداية والنهاية، ج٩، ل٥٢.

(٨٤) الطبرى، تاريخ، ج٦، ل٣٢٠.

(٨٥) فائزة محمد عزت، دور الكرد فى الحركة المطرف بن مغيرة ، عبدالرحمن بن الاشعث، ل١٠٧.

(٨٦) محمد امین زەکی بەگ، خولاصەیەکی تاریی کوردو کوردستان، ل٩٣.

(٨٧) ئارشاك پۆلا، کورد لەسەر چاوە عەرەبیەکاندا، ل٤٥.

(٨٨) تاریخ خلیفة ، ٢٣٣، فائزة محمد عزت، دور الکرد فی الحرکة المطرف بن مغیرة وعبدالرحمن بن الاشعث، ل١٠٧.

(٨٩) الذهبی، تاریخ الاسلام، ج٣، ل٢٣٣.

(٩٠) ئارشاك پۆلا، کورد لەسەر چاوە عەرەبیەکاندا، ل٤٩.

(٩١) هەمان سەرچاوە، ل٥٠.

(٩٢) نەبەزمجید امین، دەولەتی ئومەویی کەساسەتی خەلیفەکان لە دیدو بۆچوونی هەندێ لە رۆژهەلاتناسان، گۆگارە سلێمانی ، ژمارە(٨) سالی٢٠٠١، ل٥.

(٩٣) خربوطلی تاریخ العراق فی ظل حکم الاموی، ج٢، ل٥٩.

(٩٤) ئارشاك پۆلا، کورد لەسەر چاوە عەرەبیەکاندا، ل٤٩.

(٩٥) کارل بروکمان، تاریخ الشعوب الاسلامیة، العرب والامبراطوریة، ١٩٦٠،ترجمة نبیةفارس ومنیربعلبکی، ط٣، بیروت، ل١٠٥.

(٩٦) حسام الدین النقشبندی، شهرزور، رسالة الثانیة،لة فائزة وقرطیراوة.

(٩٧) فائزة محمد عزت، الکرد فی الإقلیم الجزیرة وشهرزور فی صدر الإسلام(ف١٦()١٣٢ه)،ل١٢٦.

(٩٨) ئەنتەر نێت www.m 1000.Com، بۆ زیاتر زانیاری بروانە عبدالجبار ناجی الخارجی، (عمر عبدالعزیز خلیفة الاموی) مجلة الاداب، بصرا، عدد(١)، ١٩٧٦، ل١٧٠.

(٩٩) خەزەر نەتەوەیەکی سیکپی ئەوروپایی رۆژهەلات بوون لەسەدەی پێنجەمی کۆچی دا لەسەر هەردوولای کەناری ڤۆلکای خواروو نیشتە جێ بوون، ئاڤاریان لە ٦٢٤، داگیری کرد، مەملەکەتی پێك هێنا بە یارمەتی هەرقلی رۆم هێرشیان کردە سەروولاتی فارس هەرێمەکانی تری ئیسلامی ، بروانە دائرة المعارف اللبستانی، مجلد٤، بیروت، ل٣٧١.

(١٠٠) ابن الاثیر، الکامل، ج٥،ل ٣٧١.

(١٠١) فائزة محمد عزت، الكرد فی الإقليم الجزيرة وشهرزور فی صدر الإسلام(فی١٣٢ـ٦١٦ه)، ل٢٨.

(١٠٢) سعيد ابو حبيب، مروان بن محمد اسباب سقوط الدولة الاموية، بيروت، د.ت،ل٢٦.

(١٠٣) محمد امين زەکی بەگ، خولاصەیەکی تاریی کوردو کوردستان، ل٩٣.

(١٠٤) ابن كثير،البداية والنهاية، مج٥، ج١٠، ل٤٦، زوبير بيلال اسماعيل، اربيل فی ادوراها التاريخية، ١٩٧٦، ل١٢٤.

(١٠٥) ابن كثير،البداية ، ج١٠، ل٤٦.

(١٠٦) مهند ماهر الحركة المناهضة لخلافقت مروان بن محمد، ل١٣٢.

(١٠٧) بانگەوازی عەبباسیەکان لە چارەکی کۆتایی حوکمی ئومەویی دەستی پێکرد واتا لە نزیکەی سالی( ١٠٠ك)، الطبری، تاريخ،ج٨،ل١٣٥.

(١٠٨)عبدالعزيز الدوری، العصر العباسی الاول، بغداد، ج٨، ل١٣٥.

(*) هەندێ سەرچاوە دەلێن اباسلم بە رەسەن کوردە، بڕوانە ابن خلكان، وفيات الاعيان وابناء الزمان، تحقيق د.احسان عباس، بيروت، ١٩٧١،ج٣، ل٣٥٥، بدليسی، شەرفنامە، ل٩٥، مەلا جميل رۆژبەيانی ، مێژوویی حسنهەویی عەییار، ١٩٩٦، ل٦٦.

(١٠٩) الطبری، تاريخ، ج٧، ل٤٠٨.

(١١٠) ابن الاثير، الكامل، ج٤،ل ٣١٩، محمد امين زەکی بەگ، خولاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان، ل٩٣.

(١١١) ابن الاثير، الكامل، ج٤،ل ٣١٩

(١١٢) ئارشاك پۆلا، کورد لەسەر چاوە عەرەبیەکاندا، ل٥٣، محمد جاسم الحمادی، الجزيرة الفراتية والموصل،ل٢٩٠.

(١١٣) الطبری، تاريخ، ج٧، ل٤٠٨، ابن الاثير، الكامل، ج٤،ل ٣٢٨.

(١١٤) ابن خياط، تاريخ خليفة ابن خياط،ل٤٠٤،

(١١٥) البلاذری، اساب الاشراف، ج٨ ،ل٣، حسن ابراهيم حسن تاريخ الاسلام السياسی والدينی والثقافی والاجتماعية، دار الاحيا، ط١، ج٣، ١٩٦٤، ل٤٥.

(١١٦) البلاذري، فتوح البلدان، ل٤٢٠.

(١١٥) حسن قاسم العزيز، البابكية، ل٥٥.

(١١٦) عباس عبدالكريم، كۆمەڵگا لەسایەی دەوڵەتی خەلافەتدا، ل٩٦.

(١١٧) هەمان سەرچاوەی ، ل٩٦.

(١١٨) حسن قاسم العزيز، البابكية، ل٨٦.

(١١٩) عدنان على كرموشى الخراجي، خلافة الاموية، دراسة في التاريخ السياسى و الادارية، رسالة ماجستر، ل٣١٦.

(١٢٠) عدنان على كرموشى الخراجي، خلافة الاموية، دراسة في التاريخ السياسى و الادارية، رسالة ماجستر، ل٣١٦.

(١٢١) فلهاوزن، تاريخ الدولة العربية من ظهور الاسلام الى نهاية الدولة الاموية، ل٢٤.

(١٢٢) فاروق عباس وهب، الحياة الاجتماعية في ديمشق في عصر الاموي، رسالة ماجستر، بغداد، ل٢٥٢.

(١٢٣) توفيق سلطان اليوزبكى، دراسات في نظم العربية الاسلامية، ١٩٨٨، ل١٢١.

(١٢٤) پێناچێ سەرکردایەتی کورد لەم کاتە دەر کەوتبێت واتا هیچ سەرکردەیەك یاخود زانایەك، تەنیا لە جارێکی کۆتایی ١٠٠ کوچی نەبێت بەتایبەتی دوایی هاتنی عەباسیەکان ناوچە کوردیەکان زیاتر کرانەوەی پێوەدیار بووە، کوردەکان لە هەندێ کاروباری کارگێری خۆیان بەناوی خەلافەتەوە بەرێوە بردوە ئەمەش دەگرێتەوە سنورە فراوانەکەی خەلافەتی عەباسی نەدەتوانی ناوچە کان بەرێوە ببات بە یارمەتی و هاوکاری دانیشتوانی ناوچە کان نەبێت

(١٢٥) ئەو مەوالیانەی رۆلی سەرکردایەتی سەربازیان گێراوە تارق کوری زیاد و موسی کوری نەسیر .....تد

(١٢٦) ابن الاثير ، الكامل فى تاريخ، ج٧، ل٤٧٢

(١٢٧) الطبرى، تاريخ،ج٧، ل٤٧ ،ابن الاثير، الكامل، ج٤، ل١٢٨ " ثابت اسماعيل الراوى، العراق في ظل حكم الاموى، ل١٩٥.

(١٢٨) الطبری، تاریخ، ج٧، ل٤٨ ، ابن الاثیر، الکامل،ج٤، ل١٦٠.

(١٢٩) ابن الاثیر، الکامل، ج٤، ل١٦٢.

(١٣٠) الطبری، ج٧، ل٥٥١ " ابن الاثیر، الکامل..،ج٤، ل١٨٤ ، المسعودی، مروج الذهب، ج٣، ل١٧٨. " عبدالمنعم ماجد، الحیاة السیاسیة لدولة الاموی،

(١٣١) الیعقوبی، تاریخ..،ج٣، ل٢٤٠" الطبری، ترایخ...،ج٧، ل٥٣.

(١٣٢) الطبری، تاریخ الرسل والملوك، ج٦، ل ل٢٢٢–٢٥٨.

(١٣٣) المسعودی، التنبیة والاسراف، لل٢٨٦ " الدینوری الاخبار الطوال، ل٢٨٧.

(١٣٤) الدینوری، الاخبار الطوال، ل٢٨٧.

(١٣٥) یعقوبی، تاریخ یعقوبی، ج٣، ل١٠.

(١٣٦) الطبری، تاریخ،ج، ل١١٦.

(١٣٧) الطبری، تاریخ، ج ، ل١١٦.

(١٣٨) هەمان سەرچاوە،ل١١٦.

(١٣٩) لە بزووتنەوەکەی موختار روونمان کردوە کە کوردەکان چەن هاوکاریان کردوە، لەوانەشە لەم شەرە زیاتر یارمەتی موختاریان دابێت .

(١٤٠)الطبری، تاریخ، ج٧، ل١٨٢.

(١٤١) ابن الاثیر، کامل فی التاریخ، ج٤،ل٢٢٣.

(١٤٢) الطبری، تاریخ، ج٥، ل٥٧٠. ابن الاثیر،الکامل فی التاریخ،ل٣٣٧

(١٤٣) هەمان سەرچاوە، ج٥، ل٥٧٠.

(١٤٤) الخربوطلی، العراق فی الظل حکم الاموی،ل١٤٩.

(١٤٥) الدینوری، الاخبار طوال،ل٢٩٢.

(١٤٦) هەمان سەرچاوە،ل٢٩٢.

(١٤٧) ابن الاثیر،الکامل فی التاریخ،ل٢٢٧.

(١٤٨) الدینوری، الاخبار طوال،ل٢٩٢.

(١٤٩) سەررچاوەی پێشوو،ج٤،ل٦٣.

(١٥٠) هەمان سەرچاوە.ج٤،ل٦٧

(١٥١) الدینوری، الاخبار طوال،ل٢٩٢.

(١٥٢) ابن الاثیر،الکامل فی التاریخ،ل٢٢٧.

(١٥٣) هەمان سەرچاوە.ج٤،ل٢٧٤.

* دیر الجماجم: ناوچەیەکە نزیك (٤٢)کم لە بەسرەوە دوورە، ئەم ناوەش لەوەوە هاتوە لەکاتی شەڕی نێوان (حەجاج و عبدالرحمن) لەم ناوچەیەدا سەری زۆربەی سوپای عبدالرحمن پەڕاندووە لە دوایدا( حەجاج) کۆکردۆتەوە و سوتاندنی ( یاقوت، معجم البلدان، ج٢، ل٥٠٤.

(١٥٤) الطبری، تاریخ الرسل و الملوك،ج ٦، ل٤٣٧.

(١٥٥) هەمان سەرچاوە، ج٦، ل٢٦٧-٣٦٨.

(١٥٦) ابن خیاط، تاریخ خلیفة، ل٣٧٥.

(١٥٧) المسعودی، مروج ذهب، ج٣، ل١٢٦.

(١٥٨) هەمان سەرچاوە، ج٣، ل١٢٦

(١٥٩) تاریخ ابن خلدون، ج٣، ل٥٠.

(١٦٠) ابن خیاط، تاریخ خلیفة، ل٣٧٥.

(١٦١) البلاذری، فتوح البلدان، ل٣١٩.

(١٦٢) الطبری، تاریخ...،ج٨، ل٣٣ " ابن کثیر، بدایة و النهایة، ج٩، ل٨١.

(١٦٣) ابن خیاط، تاریخ خلیفة، ل٣٧٥ ، عبدالحسین، الاخیار کوب، دوقرن سکوت، ل١٠٤

# ئەفسانە سۆمەریەکان

و : لوقمان باپیر

زانستی بەراوردکاری ئەفسانە کە ئەوە هەموو زانستەکانی دیکەش دەگرێتەوە، رەنگە ئامانج بپێکێ یان هەڵە بکات، ئەو زانستەش دوای دروست بوون و گەشەکردنی زانستی بەراوردکاری زمان، دروست بووەو گەشەی کرد، ئەو زانستەش واتە زانستی بەراوردکاری، زمان پرۆگرامی لێکۆڵینەوە تیایدا تەرخان کرا بۆ بنچینەی زمانەکان و ئەدەبەکەیان، ئەو زانستەش پێشکەوتنێکی ناوازەی بەدەستهێنا کە ئەمەش هۆکارەکەی بە پلەی یەکەم دەگەرێتەوە بۆ دانان بەو راستیەی کە زمانی (سانسکریتی) کە لای گەلانی کۆنی هیندی زمانی ئاینییە و هەروەها(زەند) یان زمانی فارسی کۆن کە بە زمانی ئاینی و ئەدەبی دادەنرێ لای گەلانی کۆنی ئێرانی، کە هەردووکیان لە زمانە هیند و ئەوروپیەکانن، راستی ئەوە دەرکەوت کە ئەو دووزمانە دەچنەوە سەر خێزانی زمانە ئەغریقی و لاتینیەکان.

ئەو پێشکەوتنەی کە زانستی لێکۆڵینەوەی زمانە هیند و ئەوروپیەکان بە دەستی هێنا بە شێوەیەکی فراوان پشبەستوبوو بە لێکۆڵینەوەی کەلتووری ئەدەبی کۆنی ئەغریقیەکان و هیندۆس و ئێرانیەکان، ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە بەئاسایی و بە شێوەیەکی راستەوخۆ پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی

بەراوردکاری هەبوو بۆ ئەفسانەکان و چیرۆکە داستانیەکانی کە پەیوەندیان بەو کەلتوورەوە هەیە و رەنگدانەوەی ئەون.

لە کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدە، هەندێ ئاسۆی نوێ کە پێشبینی نەدەکران، لە بوارەکانی زانستی ئەفسانەی بەراوردکاری، رووناکیان بەخۆوە دیت، ئەمەش لەئەنجامی ئەو پێشکەوتنەی کە ئەو هەولآنەی درابوون بۆ کردنەوەی سیمبولەکانی هەردوو نووسینی هیرۆگلیفی میسری و میخی (بزماری) بابلی ،بە خۆیانەوە دیت، وەك چۆن ئەو لێکۆلینەوانەی تەرخان کرابوون بۆ لێکۆڵینەوەی (تەورات) هۆکارێك بوون لە چەندانە کردنی هەوڵەکان کە هەر خێرا لە ئەنجامدا ئەو روونوەوە کە زۆر لە ناوەڕۆکی (تەورات) کەگەلێ تایبەتمەندی میتۆلۆژیان هەیە، بە لەچاو گرتنی ئەو وێکچوونە زۆرەی کە لە نێوان تەورات و ئەو ناوەڕۆکەی کە سەرچاوە میسری و بابلیەکان لەخۆیان گرتووە.

بەم شێوەیە دەبینین کە لێکۆڵینەوەی زانستی ئەفسانەی بەراوردکاری، کە هەمان رێی زانستی زمانی گرتەبەرو، کەپێشتر تەنیا بەلێکۆڵینەوەی زمانە هیندو ئەورووپیە کۆنەکان خەریك بوو، ئێستا زمانە سامیەکان و میسری کۆنیشی گرتە خۆ.

لە هەمان کاتدا لە دنیای مەعریفەدا زانستێکی تازە رێی خۆی بەرەو گەشەو پێشکەوتن دۆزییەوە، مەبەستیشمان لە(ئەنثرۆپۆلۆژیا) یە ئەو زانستەی کە دەرکەوت گرنگییەکی بنچینەیی هەیە لە لێکۆڵینەوەی زانستی ئەفسانەی بەراوردکاری.

ئەمە سەرەرای دۆزینەوەی کۆمەڵێك لەو گەل و هۆزانەی کە خاوەن قۆناغی شارستانی جیاواز بوون لە هەموو کیشوەرەکاندا جگە لە ئەوروپا، ئەو گەل و هۆزانەی جێگای گرنگیپێدانی گەشتیاران و زانستخوازان و نێردە زانستییەکان بوون، گرنگیان دا بە لێکۆڵینەوەی زمانی ئەو گەلانەو نەریتە سەیرەکانیان و شێوازی ژیان و بیروباوەڕ و رێوشوێنە ئاینییەکان، وە ئەو راستیە نوێیانەی کە لە لێکۆڵینەوەی گەلە جیاوازانە لە رێژەی پێشکەوتنی ژیانی سەرەتاییان هەڵێنجرا سەرچاوەیەکی کەرەستەی میتۆلۆجی یان پێکدێنا کە ئەمەش بەرۆلی خۆی بواری

لێکۆڵینەوەی زانستی ئەفسانەی بەراوردکاری فراوان کرد.

بەو شێوەیە بۆمان گونجا کە سەرچاوەی ئەو کەرەستانەی کە پشتی پێدەبەستن

لە لێکۆڵینەوەی زانستی ئەفسانەی بەبەراوردکاری دابەشیان کەین بۆ دوو کۆمەڵە یەکەمیان ئەو ئەفسانە و داستانانەی لەخۆ دەگرت کە لە رۆشنبیریە کۆنەکانی هیند و ئێرانیەکان و ئەغریقیەکان لە لایەك و، بابلی و میسری و عیبریەکان لەلایەکی دیکەوە، رەنگیان دەدایەوە. وەهەموو ئەو ئەفسانە و داستانانە بە شێوەیەکی روون فراوان تۆمارکراون، وەك چۆن گواسترایەوەو رەنگی دایەوە لە ئەدەبی ئەو گەلانەدا لە هەزارەی یەکەمی پێش زاین، وەدەکرێ ئەفسانە ئەسکەندەنافیەکان و ئەددیەکان و( Eddic ) و چینییەکان و ژاپۆنییەکان ....هتد. بخەینە سەر ئەو کۆمەڵەیە کە لەجۆرەها ئەدەبی سەردەمە کۆنەکانەوە درێژدەبنەوە.

کۆمەڵەی دووەم ئەو ئەفسانەو داستانانەی گەلە سەرەتاییەکان دەگرێتەوە وەکو لەم سەدەی دوایی (سەدەی بیستەم) دۆزرانەوە کە لەناوەڕۆکی ئەو زمانانە هەڵێنجراون کە زمانی ئاخاوتنی کەسانی ئەو گەلانەی ئەو سەردەمەن، کەگەڕۆك و کەسانی نێردەی زانستی و زانایانی ئەنثرۆپۆلۆژیا تۆماریان کردوون. پێویستیش بەوە ناکات کە بڵێین هەموو ئەو سەرچاوە ماددیە سەرەتاییانەی کە بەمدواییە دۆزرانەوە، کە لە بنچینەداو، بۆ مەودایەکی دووریش، بە خاوەن بەهایەکی زانستی دادەنرێن بۆ زانستی ئەفسانەی بەراوردکاری و ئەو زانستانەی کە پەیوەندیان پێیەوە هەیە، وە لە رووی گرنگییەوە بەهاکەی لە رۆشنبیریە کۆنەکان کەمتر نیە وەك سەرچاوەیەکی زیندوو و بنچینەیی لە سەرچاوەکانی ئەم زانستە.

وەروون و ئاشکرایە، کە ئەو کەلتوورە رۆشنبیریەی خۆی لە داهێنانە ئەدەبی و ئەفسانە کۆنەکانی ئەغریق و عیبری و هیندی و ئێرانی و بابلی ومیسریەکاندا دەنوێنیّ، دیارترین کاریگەری و شوێنەواری لە قەوارەی شارستانی رۆشنبیری ئێمەدا هەبووە، لەگەڵ ئەوەی ئەو بۆ چوونە رۆحی و ئایینیانەی کە ئەو ئەدەبە نواندویەتی خۆی خزاندوتە جیهانی نوێی پێشکەوتووی ئێمەوە، لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا شتێکی گرنگ هەیە کە ئێمە نایزانین، مەبەستیشمان ئەو ئەفسانە سۆمەریانەیە کە چیرۆکە ئایینیەکانی گەلێك پێك دێنن کە نە سەر بە گەلە سامیەکان و نە سەر بە هیندو ئەوروپییەکانەو،کە لە وڵاتی سۆمەردا نیشتە جیّ بوون لە سەردەمێکی مێژوویی کە دەکریّ بە شێوەیەکی نزیککراوەیی بە(٣٥٠٠)تا(٢٠٠٠)ساڵ بەر لەزایین دیاری بکەین، ئەم گەلە لەسەر رووبەرێك نیشتەجیّ بوون، کە

بەناوچەیەکی بچووك دادەنرێ، کە دەکەوێتە نێوان هەردوو رووباری دەجلە و فرەهات(دیجلە و فرات) و لەکەنداوی عەرەبیەوە درێژ دەبێتەوە لەباشورەوە تا دەگاتە بەغدای ئێستا لە باکوور ئەو ناوچەیەی کەبەراستی دەتوانین بە بێشکەی رۆشنبیری هەموو لایەکی رۆژهەلاتی نزیکی وەسف بکەین، ئەگەر خوێنەر بگەڕێتەوە بۆ ئەنسکلۆپیدیای (دائرة المعارف) ئایینی و ئەخلاق، دانراوی(جێمس هاستینگس) و، سەررنجێکی قووڵی ووتارێکی درێژی بدات دەربارەی ئەفسانە و دروست بوونی گەردوون و ئەفراندنی دنیا، ئەوا لێکۆڵینەوەیەکی تێرو تەسەل دەدۆزینەوە دەربارەی ئەو گەلە کۆن و نوێیانە و شەقڵەکانی پێشکەوتنی رۆشنبیریان لەگەڵ وەسفێکی شیکاری بیرو بۆچوونی ئەو گەلانە و بیروباوەڕیان دەربارەی دروستبوونی گەردوون، وە ئەگەر خوێنەر دیسان بگەڕێتەوە بۆ ئەو کۆمەڵە دانراوەی کە بەناونیشانی (ئەفسانەی رەگەزەکانی مرۆڤ) کە سێزدە بەرگی تەرخان کردووە بۆ توێژینەوەی بابەتی شیکردنەوەی ئافسانە گرنگەکان لەدنیا، ئەوا هەندێ ئاماژە و زانیاری دەربارەی ئەفسانە سۆمەریەکان دەدۆزنەوە، ئەو زانیارییانە لەگەڵ کەمیەکەشیان، پشت بە سووسەکردن و زەن بردنێکی هەڵێنجراو دەبەستێ لە دەقە دەستکاریکراو و هەموار کراوەکانی بابلیەکان کە کۆتایی هەزارەی سێیەمی پێش زاین بەسەر سۆمەریەکاندا زاڵ بوون داستانە سۆمەریەکانیان کردە بنچینەیەك بۆ پەرەپێدانی ئەفسانە تایبەتیەکانی خۆیان.

بەلأم ئەو راستییانەی کە زانراون کە سۆمەریەکان بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ کە نزیکەی لە(٢٥٠٠تاکو٢٠٠٠) ی پێش زاین درێژ دەبێتەوە ئەو کۆمەڵە

خەڵكانە بوون كە بەهۆی رۆشنبیریەكەیانەوە باڵیان بەسەر هەموو لایەكی رۆژهەڵاتی ناوەڕتستداكێشابوو، رەنگە هەر ئەوانیش شێوە نووسینی بزمارییان داهێنا بێ و بنچینەی بیرو بۆچونە روحی و ئاینیەكانیان دروست كردبێ كە لە هەموو ناوچەكانی رۆژهەڵاتی نزیكدا باوبوون، لە كۆتایشدا ئەوان بوون كە ئەدەبێكی پێشكەوتوویان داهێنا كە دەوڵەمەند بوون لە ناوەڕۆك و ناوازە بوو لە دارشتن و دەربڕین.

زیاد لەو هەموو شتانەی گوتمان، راستیەكی دیكە هەیە كە دەبێ لە بەرچاو بگیرێ كاتێ كە دەوڵەتی سۆمەریەكان لەناو چوو قەوارە سیاسیەكەیان رەش بۆوە وەك ئەنجامێكی سەركەوتنی میللەتە سامیەكان بەسەریاندا، زمانەكەشیان چووە رێزی زمانە مردووەكان و بەمەش وورده وورده زمانی (ئەكەدی) سامی بووە زمانی گفتوگۆ، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا زمانی سۆمەری هەر لە بەكارهێنانیدا مایەوە چونكە سەركەوتووە سامییەكان بۆ چەندین سەدە كردبوویان بەزمانی ئەدەب و ئاینی خۆیان وەك چۆن زمانی یۆنانی لە سەردەمی دەسەلآتی رۆمانی زمانی لاتینی لە سەدەكانی ناوەڕاستدا بەكاردەهاتن.

راستە كەزمانی سۆمەری زمانی بنچینەیی بوو كە قوتابخانەكانی فێركردنی خوێندن و بنكە رۆشنبیریی و رۆحیەكانی بابل و ئاشوور پشتیان پێدەبەستا، بەڵآم هەر لە و وڵآتانە نەوەستا، بەڵكو زۆرێك لە گەلانی دراوسێشی گرتەوە، وەك ئیلامیەكان و خووریەكان و حەبەشیەكان و كەنعانیەكان، روون و ئاشكرایە كە بیرو بۆ چوون و چیرۆكە ئەفسانەییە سۆمەریەكان، بەهۆی ناوەرۆك و رەسەنایەتیە مێژووییەكانەوە، خۆی خزاندە هەموو ناوچەكانی

ڕۆژهەڵاتی نزیک، بۆیە لێکۆڵینەوە لە داستانە سۆمەرییەکان بە گرنگترین ئەو ڕەگەزە زیندوانە دەژمێردرێ کە پشتی پێ ببەسترێ بۆ تێگەیشتن و لێکۆڵینەوە لە ئەفسانە باوەکانی ڕۆژهەڵاتی نزیکی کۆن، چونکە تا ڕادەیەکی زۆر بنەچەو پەرەسەندنیان ڕوون دەکاتەوە.

لاپەڕەکانی داهاتووی ئەم کتێبە، وێنەیەکی کورتی ئەفسانە سۆمەریەکان لەخۆوە دەگرێ کە پێشتر نەناسرابوون، هەڵی پێشکەشکردنیان بۆ نەگونجا، بەو ئەفسانانەش دەست پێدەکەم کە باس لە ئەفراندن و ڕێکخستنی گەردوون ئافەریدەکردنی مرۆڤ دەکەن، دواتریش ئەفسانەی (کوور) بە هەرسێ شێوەی کە باس لە چوونە خوارەوەی (ئانانا) دەکا بۆ جیهانی خوارەوە، پێشکەش دەکەم و ئەم لێکۆڵینەوەش بە پێشکەش کردنی چەند هێڵێکی فراوانی سێ ئەفسانەی دانسقەی جیاواز کۆتاییی پێدێنم.

هیوادارم خوێنەر وێنەیەکی گونجاو و ڕوونی دەربارەی ئەفسانە سۆمەریەکان دەست کەوتبێ، ئەو ئەفسانانەی کە بەفراوانی ناوەڕۆك و دەلالەتەکانی و وردەکاریە سەرسوڕهێنەرەکانی جیادەکرێنەوە، بە لەچاو گرتنی ئەو سەردەمە زەمینە ڕۆشنبیریەی کە تیایدا ئەو شاکارە ئەدەبیە دووبارە بوەوانەی تیا بەرهەم هاتووە.

بەشی دووەم

# ئەفسانەکانی دروست بوون

ئەو ئەفسانانەی کە ڕۆشنبیری هەر گەلێك دەینوێنێ، لە ڕووی گرنگی و دەلالەتیشەوە لە ڕیزی پێشەوەیە، ئەو ئەفسانانەن کە گەڕان بەدوای بنەچەی گەردوون و دروست بوونی و فەلسەفەی بوونەوەرەکان و ئەفراندن لە خۆ دەگرن، مەبەستیشمان لەمەدا ئەو چیرۆکە ئاینیانەیە کە هەوڵدەدەن کە بنەچەی گەردوون و بوونی خوداکان و مرۆڤ ڕوون بکەنەوە. ئەم بەشەش لێکۆڵینەوەو شرۆڤەیەکی قوڵ لە خۆ دەگرێ دەربارەی تیۆرەکانی ئەفراندن و ئەو چەمکانەی کە پەیوەندیان پێوە هەیە و لە وڵاتی سۆمەردا ناسرابوون لە هەزارەی سێیەمی پێش زاین، ئەم بەشە سێ بابەتی سەرەکی لە خۆ دەگرێ، ئەوانیش (١) ئەفراندنی گەردوون (٢) ڕێکخستنی گەردوون (٣) ئەفراندنی مرۆڤ.

## ئەفراندنی گەردوون

لە دێرەکانی سەرەتای ئەو قەسیدەیەی کە ناوم ناوە (گەلگامێش و ئەنکیدۆ لە جیهانی خوارەوە) بنەچە سەرەکیەکانی بۆچوونی سۆمەریەکان و چەمکەکانی تێگەیشتنی ئەوان دەربارەی گەردوون و ئەفراندن ڕوون دەبێتەوە، لێکۆڵینەوە لە مێژووی کردنەوەی سیمبوڵەکانی ئەو قەسیدەیە لە چێژو سوود بێبەش نیە، لە ساڵی ١٩٣٤ دا کاتێك بۆ یەکەمجار هەوڵی کردنەوەی سیمبوڵەکانم دا، بۆم دەرکەوت کە لەسەر هەشت پارچە قوڕ تۆمارکراوە حەوتیان لە (نەفەر) دۆزرانەوە، هەشتەمیشیان لە (ئور)

دۆزرایەوە، ئەو پارچانەش هەموویان لەبەریان گیراوەتەوە و(استنساخ) بلاوکراونەتەوە، (هۆگۆ راداو) کە لە مۆزەخانەی زانکۆدا کاری دەکرد، دوو پارچە لە کۆمەڵەی فلادلفیا و لە ساڵی ۱۹۱۰ دا بلاوکردەوە(ستیڤن لانگدۆن)یش دوو پارچەی لە کۆمەڵەی ئەستەنبۆڵ و لە ساڵی ۱۹۱٤ بلاوکردەوە، وەك چۆن (ئەدەوارد کیرا) هەر لە کۆمەڵەکەی ئەستەنبولْ پارچەیەکی لە ساڵی ۱۹۲٤دا بلاوکردەوە، جگە لەدوو پارچەی دیکەی کۆمەڵەکەی فلادلفیا کە لەساڵی ۱۹۳٤دا بلاوی کردنەوە، (سی.جی.گاد)یش لە مۆزەخانەی بەریتانیا پارچەیەکی بلاو کردەوە کە پارچەیەکی نەشکاو و باشبوو لە ساڵی ۱۹۳۰لە (ئور)دەستی کەوتبوو.

بەلام زیندووکردنەوەو وەرگێڕانی ئەو قەسیدە داستانییە بە شێوەیەکی دروست لە تواناادا نەبوو هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە زۆربەی ئەو پارچەو تابلۆ قورانەی کە لەسەری تۆمارکرابوو دوای پێککگرتنیان وا دەردەکەوت کە ناوەڕۆکێکی نامەعقولیان هەیە و لە هەندێ دەربڕیندا جیاوازی هەیە و لێناگەڕێ بە شێوەیەکی دروست ڕێکخرێ و ریزبەندبکرێ.

لە ساڵی ۱۹۳٦دا، دوای ئەوەی یەکەم وەرگێڕانی خۆم بۆ ئەفسانەی (دابەزینی ئانانا بۆ جیهانی خوارەوە) نارد بۆ رۆژنامەی (زانستە ئاشووریەکان)، سووربووم لەسەر بەگەڕخستنی هەموو توانایەکی هەمە بۆ زیندوکردنەوەی ئەو قەسیدەیە کە هەموو دەلالەتەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە چیرۆکێکی گرنگ سەرسوڕهێنەری لەخۆگرتووە هەوڵەکانم منیان گەیاندە دۆزینەوەی ئەو(ڕێبەرەی– دلیل)کە بەهۆیەوە ئەو ڕێگایەم دۆزیەوە بۆ ڕێکخستنی پارچەکانی بە شێوەیەکی دروست. ئەو ڕێبەرە بە ئاشکرا لە دوو

لایەنی گرنگ دەرکەوت کە لەروخسارەکانی شێوازی خودی شیعری سۆمەریدا خۆی دەنواند، لایەنی یەکەمیان لەگەڵ لاوازی دەلالەتە هونەریەکانیشیدا، بە هۆی پەیوەندی بەکردنەوەی سیمبولەکانی قەسیدەکە بەخاوەن گرنگیەکی گەورە دادەنرێ، بەڵکو بە خەلأتێکی بە نرخ دادەنرێ کە دەکرێ ناوەڕۆکەکەی لەمەی خوارەوەدا کورت بکرێتەوە:-

کاتێك شاعیری سۆمەری وای بەباش دەزانێ کە دێرێك لە قەسیدەکەیدا دووبارە بکاتەوە ئەوا بێ گۆڕین و لابردن و زیادکردن دووبارەی دەکاتەوە،با نموونەیەك بۆ ئەوە بهێنینەوە، ئەگەر پاڵەوانێك یا خواوەندێك فەرمان بە پەیامبەرێکی خۆی دەدا کە نامەیەکی بۆ بگەیەنێ، ئەوا ئەو نامەیە بێ گوێدانە بەدرێژی و ناوەڕۆکەکەی، ئەوا لەقەسیدەکەدا دووجار لەدوای یەك بەهەموو وردەکارییەکانەوە دووبارە دەبێتەوە،جاری یەکەم باس لەدەقی نامەکە دەکرێ وەك چۆن گەورەکەی بە پەیامبەرەکەداوە بیگەیەنێ، جاری دووەمیش کە ئەو نامەیە دەگاتە دەستی نامە بۆ نێردراو، لەهەر دوو بارەکەشدا دەقی نامەکە وەك خۆی باسیان لێوەدەکرێ، بەم شێوەیە ئەگەر داڕووشانێك لە پارچەیەکدا هەبێ، ئەوا چاکردنەوەی ئاسان دەبێ لە دەقی پارچەی دووەم کە رووبەرێکی هاوشێوەی دەقی یەکەمە.

بەڵام لایەنی دووەم کە سوودم لە روخسارەکانی شێوازی شیعری سۆمەری وەرگرت، ئەوەیە کە شاعیری سۆمەری بۆ خستنە رووی بابەتە داستانی و ئەفسانەیەکانی دوو دیالێکت بە کاردەهێنێ، ئەوانیش دیالێکتی سۆمەری رەسەن و دیالێکتێکی دی بەناوی (ئەمیسال)ە کە دیالێکتێکە تەوابە رەسەنەکە دەچێ تەنیا لە هەندێ جیاوازی سادده نەبێ لە هەندێ

دەنگ و بڕگەی فۆنیمی دیاریکراو، لەم کارەشدا سەیر لەوەدایە کە شاعیر کاتێك دیالێکتی (ئەمیسال) بەکاردەهێنێ کە بیەوێ ئەو قسانەی کە (ئانانا)ی شابانووی ئاسمان دەیانکا بەدیالێکی ئەمیسال دەکرێن سەرەرای ئەوەی کە بە دیالێکتە رەسەنەکەش باس دەکرێن.

بەم شێوەیە کە دەقێك دەبینم و لە حاڵەتێکدایە کە ئەستەمە ناوەڕۆکەکەی بزانرێ، دەتوانم هەمان دەق بدۆزمەوە بەدووبارە کراوەیی لە دیالێکتی (ئەمیسال) بەو (رێبەر)ی کە دەستم کەوت، توانیم بەشی یەکەم لە پارچەکانی قەسیدەکە بخەمە سەر یەك و لە ساڵی ١٩٣٨ دا بلاّووم کردەوە، بەلاّم بەشی دووەم تا ئێستا

زۆربەی روون نیە و تەنانەت بەشی یەکەمیش لە داڕووشان بێبەش نیە.

لە ساڵی ١٩٣٩دا، لە ئەستەمبوڵ پارچەیەکی شکاوم دۆزیەوە قەسیدەیەکی لەسەر تۆمارکرابوو، وە لەماوەی ساڵی رابردوو توانیم ناوەڕۆکی حەوت پارچەی دیکەش بزانم کە لە مۆزەخانەی زانکۆ بوون لە فلادلفیا و لەبەرم گرتنەوە، بەمەش تا ئێستا بووینە خاوەنی (١٦)پارچە کە قەسیدەکەیان لەسەر تۆمارکراوە، کە لەتوانادایە زیاتر لە دووسەدو پەنجا دێر لە دەقەکانی چاك بکرێتەوە دواتر وەربگێڕدرێ، ئێستاش دەتوانین ناوەڕۆکی قەسیدەکەمان بەم شێوەیە بخەینە روو:-

رۆژێ لە رۆژان درەختێ هەبوو کە پێیان دەووت درەختی (هۆڵۆپۆ) رەنگە (دار بی)بێ لە سەر رووباری فورات چاندرابوو و لە ئاوی رووبارەکەوە ئاوی دەخواردەوە، وارێکەوت کە بایەکی باشووری هەڵیکردو ئەو درەختەی لە رەگەوە هەڵکێشا لەو کاتەی کە زێی فورات لافاوی کردبوو، لە کاتێکدا کە

شابانۆی ئاسمان(ئانانا) لە لێواری فرەهاتدا پیاسەی دەکرد درەختەکەی بەدەست گرتووەو هێنایەوە بۆ (ئوروك) و لە باخچە پیرۆزەکەیدا رواندی، زۆری ئاگا لەو درەختە بوو چونکە دەیویست دوای گەورە بوونی، لەدارەکەی کورسییەك و چوارپایەك دروست بکات. دوای تێپەڕ بوونی چەند ساڵێك، درەختەکە تیایدا گەشەی کرد، ئانانا بۆی دەرکەوت کە ناتوانێ داوەکە ببڕێتەوە چونکە مارێك (کە سیحر کاری لێناکا) هێلانەکەی خۆی لێدانابوو، لەسەرەوەشیدا باڵندەی (ئەلزۆ) (کە ئافەریدەیەکی ئەفسانەییە) هێلانەی تێدا چێکردبوو بەچکەکانی تیادا دانابوو، لەناو قەدی درەختەکەشدا(لیلیت) پاکیزەی زەوییە خاپوورەکان،ماڵەکەی خۆی دروست کردبوو، بۆیە ئانانا پاکیزەی دڵخۆش، فرمێسکی خەم و حەسرەتی رشت، کە لەبەیانیدا و(ئۆتۆ)ی برای (خواوەندی هەتاو)لەژووری نووستنەکەی واگاهات، بەگریانەوە بۆی باس کرد کە درەختەکەی (هۆلۆپۆ) چی بەسەر هاتووە، وەکاتێك گلگامش پاڵەوانی مەزنی سۆمەری، باپیرەی (هیرۆکلیسی)ئەغریقی گوێی لە گریان و سکاڵای ئاننا بوو، بە شکۆی پیاوانەوە هاتە پێش و خۆی خستە بەر فەرمانی ئەنانا زرێ یەکەی لەبەرکرد کە کێشەکەی پەنجا (مەن) دەبوو، ئەمە کێشێکی بابلییە و بارتەقای نزیکەی پەنجا پاوەندی ئینگلیزییە، تەوەرەکەی کە حەفت(تالن)دەبوو بەدەستەوە گرت، تالن کێشێکی کۆنەو بارتەقای کێشێکە واتە ٦٠مەن بۆ سەر مارەکەی داهێنایەوەو سەری بڕی، هەرچی باڵندەی (ئەلزۆ)یە لەگەڵ بێچووەکانی رایان کرد بۆ چیاکان (لیلیت)یش ماڵەکەی هەڵکەندو فڕی و رایکرد بەرەو زەوییە خاپورەکان کە راهاتبوو جارجار سەریان لێبدا، بەم شێوەیە پیاوانی (ئوروك) کەلەگەڵ

گلگامش دابوون توانیان دارەکە ببڕنەوە و پێشکەشی ئانانای بکەن تا لە دارەکەی کورسیەك و چوارپایەکی لیٚ دروست بکات.

بەڵام ئانانا چی دروست کرد؟ لە دەمارەکانی هۆلۆپۆ شتێکی دروست کرد کەناوی (پەکۆ)بوو (رەنگە دەهۆڵ بێت) لە کرۆکەکەشی شتێکی دروست کرد ناوی (مەکۆ) بوو(رەنگە داری دەهۆڵ کوتان)بیٚ و کردیە خەڵاتی گلگامش وەك پاداشتێکی ئازایەتی و پیاوەتیەکەی.

دوایی ئەوە پارچەیەك دێت کەلە دوازدە دێر پێك هاتووە نەم توانی راستی ناوەڕۆکەکەی روون بکەمەوە لەگەڵ ئەوەی کە دەقەکە لەبارێکی وا دایە ........ دوای ئەوەی کە پارچە تەمومژاویەکەی تێدەپەڕێنین....

بەردەوام دەبین لە خوێندنەوەی دەقەکە بەرونی دەبینین کە (پەکۆ و مەکۆ)چونەتە خوارەوە بۆ جیهانی خوارەوە بە هۆی هاوار و قیژەی پاکیزە بچوکەکە ئەمەش لە رێی کونێکی زەوییەوە گلگامش سوردەبیٚ لەسەر هێنانەوەیان بەڵام دەبینیٚ کە نەبەدەستەکانی و بەپێیەکانی ناتوانیٚ بیانگاتیٚ... بەو شێوەی دەبینین خۆی لەبەر دەرگای دونیای خوارەوە خستووە شەپۆر دەکاو هاوار دەکا دەڵیٚ :

کێیە ئەو کەسەی (بەکۆ)ی خۆم لە جیهانی خوارەوە بۆ بهێنێتەوە ؟

کێیە ئەو کەسەی (مەکۆ)ی خۆم لە سەر رووی دونیای خوارەوە بۆ بهێنێتەوە، کاتێك (ئەنکیدۆ)ی هاورێی گلگامش و برادەری خۆشەویستی گوێی لێبوو کاتێك گوێی لە دەنگی گەورەکەی خۆی بوو وەڵامی دایەوەو وتی:

گەورەم بۆچی دەگری ؟ بۆ غەم دڵی داگرتووی ؟

ئەو (پەکۆ) یەی هی تۆیە..... من بۆت لە دونیای خوارەوە دەهێنمەوە.
ئەو (مەکۆ)یەتی تۆیە...... من لەسەر رووی جیهانی خوارەوە بۆت دەهێنمەوە، بەڵام گلگامش لە ئەنجامی چوونە خواررووی جیهانی خوارەوە وریایی کردەوە بە کورتی باسی ئەو قەدەغانەی کرد کە لەو دونیایەدا هەیە پێی گوت:

ئەگەر بچیە خوار بۆ جیهانی خوارەوە
وتەیەکت پێ دەڵێم گوێ لە وتەکەم بگرە
هەندێ ئامۆژگاریت دەدەمێ بە گوێم بکە
جل و بەرگێکی پاك لەبەر مەکە
وەگەر نا پاڵەوانە مردووەکان وەك دوژمن شاڵاوت بۆ دێنن
جەستەت بەو رۆنە چاکەی کە لە دەفرەکەدایە چەور مەکە
نەوەك بۆنی بکەن و دەورەت بگرن
رمەکەت مەهاوێ جیهانی خوارەوە
نەوەك ئەوانەی بەرم کوژران دەورەت دەگرن
سۆل پێکانت مەکە
لە دونیای خوارەوە مەگری
ژنە خۆشەویستەکەت ماچ مەکە
کوڕە خۆشەویستەکەت ماچ مەکە
ژنەکەت گەر رقت لێی ئەبێتەوە لێی مەدە
ئەو کورەی کە رقت لێیەتی لێی مەدە
نەوەك قیژە لە جیهانی خوارەوە دەست و پێت ببەستن

گریان بۆ ئەو خەوتووە لە پێناو ئەو خەوتووە

دایکی خواوەند(نەنەزۆ)ی خەوتوم

کە سەرپۆشێك جەستە پیرۆزەکەی داناپۆشێ

بەڵام ئەنکیدۆ گوێی بە ئامۆژگاریەکانی گەورەکەی نەداوە هەموو شتێکی پێچەوانەی ئاگاداریەکانی گلگامشی کرد بەو شێوەیە کەوتە بەر چەنگی جیهانی خوارەوە نەیتوانی بگەڕێتەوە سەر زەوی، گلگامش شلەژاو بە پەلە گەڕایەوە شاری (نەفەر) بەگریانەوە لەبەردەم (ئەنلیل)ی خواوەندی گەورەیی هەوا وەستا کە لە هەزارەی سێیەمی پێش زاییە سەرکردەی کۆمەڵەی خواوەندی سۆمەری بوو، ئەی (ئەنلیل)! ئەی باوکە(پەك)یم کەوتە دونیای خوارەوە (مەك)م کەوتە دونیای خوارەوە، ئەنکیدۆم نارد تا بۆم بێنێتەوە، کەچی کەوتە بەر چنگی دنیای خوارەوە، (غتار)(شەیتان)نەیگرتووە، (ئەشاك)(شەیتان) نەیگرتووە، جیهانی خوارەوە گرتوویەتی، لە حەشارگەی(ترگال)دا کە کەسێ لێی دەرباز نابێ....نەگیراوە، بەڵکو کەوتۆتە بەر چنگی جیهانی خوارەوە، لەو شەڕە قارەمانیانەی گەردوونی،نەکوژراوە، بەڵکو کەوتۆتە بەر چنگی جیهانی خوارەوە، بەڵام (ئەنلیل) رەتی کردەوە کە یارمەتی گلگامش بدات کە بەپەلە خۆی گەیاندە (ئەریدۆ) و لەبەردەم (ئەنکی) (خواوەندی ئاو) تکاخوازیەکەی دووبارە کردەوە (ئەنکی) (کە خواوەندی حیکمەتیشبوو) فەرمانی بە (ئۆتۆ) (خواوەندی هەتاو)دا کە کونێك لە جیهانی خوارەوە بکاو رێگا بەگیانی (ئەنکیدۆ)بدا بێتە سەرزەوی،(ئۆتۆ)بە فەرمانی گەورەکەی کونێکی کردو گیانی ئەنکیدۆ لەبەردەم گلگامیش بەدەرکەوت، ئاغا ئاوێزانی نۆکەرەکەی بوو، گلگامش پرسیاری کرد لە

ئەنکیدۆ کە چی لە جیهانی خوارەوە دیوە. لێرەوە ...... تا کۆتایی قەسیدەکە دەبینین کە ئەو پارچەیە زۆر شکاوە، بەڵام ئەوەی کە لەو پارچەیە ساغە بەشێك لەو گفتوگۆیەی لە خۆگرتووە کە لە نێوان گلگامش ئەنکیدۆ بەم شێوەیە کراوە:

گلگامش: ئەو کەسەت بینی کە تاقە کوڕێکی هەیە؟

ئەنکیدۆ: بەڵێ بینیم *

گلگامش: چۆن هەڵسوکەوتی لەتەکدا دەکرا؟

ئەنکیدۆ: (وەڵامەکەی داڕووشاوە)

گلگامش: ئایا ئەو کەسەت بینی کە دوو کوڕی لەدوا جێماوە؟

ئەنکیدۆ: بەڵێ بینیم

گلگامش: لە چ ماڵێکدا بوو؟

ئەنکیدۆ: (وەڵامەکەی ڕووشاوە)

گلگامش: ئەی ئەو کەسەی کەسێ منداڵی هەیە،نەتبینی؟

ئەنکیدۆ: بەڵێ بینیم

گلگامش: چۆنی لەگەڵ دەجوڵانەوە؟

ئەنکیدۆ: ئاوێکی زۆری دەخواردەوە

گلگامش: ئەرێ ئەوکەسەشت بینی کە چوار کوڕی هەیە؟

ئەنکیدۆ: بەڵێ ئەویشم بینی؟

ئەو لەوێدا چۆن بوو؟

ئەنکیدۆ: وەك.......دڵخۆشێك

گلگامش: ئەو کەسەی پێنج کوڕی لە دوای خۆی جێهێشتبوو بینیت؟

ئەنکیدۆ: بەڵێ بینیم

گلگامش: چۆنت بینی؟

ئەنکیدۆ: وەك میرزای باس باڵەکانی کرابوونەوە، دادپەروەری بۆ کۆشك دێنا

گلگامش: ئەی ئەو کەسەت بینی کە شەش کوڕی وەبەرهێناوە؟

ئەنکیدۆ: ئەرێ، دیتم

گلگامش: ئەی کاری ئەو چۆن بوو؟

ئەنکیدۆ: وەك ئەو کەسە وابوو کە خۆشی خرابێتە دڵیەوە

گلگامش: ئەوەی حەوت کوڕی هەیە لەوێ بینیت؟

ئەنکیدۆ: بەڵێ دیتم

گلگامش: ئەو لەوێ چۆن بوو؟

ئەنکیدۆ: وەك ئەو کەسە بوو کە لە خوداوند نزیك بێ، ئەو.....

پاشماوەی پرسیارەکان بەم شێوەیە دەڕوا:

گلگامش: ئەی ئەوەی لەش مردووەو لەسەر زەوی فڕێ دراوە، دۆزیتەوە؟

ئەنکیدۆ: گیانی ئەو لە جیهانی خوارەوە ئارامی نابینێت

قەسیدەکەمان بەم شێوەیە کۆتایی دێ....... بەڵام سەرچاوەی گرنگ بۆ ئەو بابەتەی کە زانیاری گرنگمان دەداتێ دەربارەی بۆ چوون و بیرباوەری سۆمەریەکان دەربارەی ئەفراندنی بوونەوەران، ئەوا ئەو پارچە روون و ئاشکرایەیە کە لەبەرایی قەسیدەکەیە و بەو دێرانە دەست پێدەکات:

دوای ئەوەی ئاسمان لە زەوی دوورکەوتەوە

دوای ئەوەی زەوی لە ئاسمان جیابوەوە

دوای ئەوەی ناوی مرۆڤ دیاریکرا

دوای ئەوەی ئاسمان کەوتە بەردەستی(ئان)

دوای ئەوەی زەوی کەوتە بەردەستی(ئەنلیل)

دوای ئەوەی(ئەرشیخیگال) بە دیاری برا بۆ (کوور)

دوای ئەوەی دەستی بەگەشتەکەی کرد، دوای ئەوەی دەستی بەگەشتەکەی کرد

دوای ئەوەی باوکی(کور)دەستی بەگەشتەکەی کرد

دوای ئەوەی(ئەنکی) دەستی بە گەشتەکەی کردبۆ(ئوور)

(کوور) بە بەردی بچووك لە پاشای دا

بەردی گەورەشی گرتە(ئەنکی)

بە بەردە بچووکەکانی کە لەدەستی بوو

بە بەردەگەورەکانی بۆ ..... کەشتیەکە

بەردی هاوێشتە بەرایی کەشتیەکەی(ئەنکی)

لە شەڕێکی کە دەتگوت گێژەنێکی وێرانکەرە، ووردو خاشکەربوو، ئاو لەبەرایی کەشتیدا هێرشی دەکردە سەر پاشا وەك چۆن گورگێك هەڵدەکوتێتە سەر نێچیرەکەی.

ئاو هێرشی دەکردە سەر(ئەنك)ی لە دواوەی کەشیدا وەك شێرێکی هێرشبەر. دوای شیکردنەوەی ناوەڕۆکی ئەم پارچەی قەسیدەیە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە لە بنچینەدا زەوی و ئاسمان پێکەوە نووسابوون و دواتر لەیەك جیابوونەوە، کە مرۆڤ ئافەریدەکرا، ئاسمان کەوتە دەست(ئان) (خوداوەندی ئاسمان) وەك چۆن زەوی کەوتە دەست(ئەنلیل)(خوداوەنی هەوا).

وادەردەکەوێ کە ئەو ڕووداوانەی دوای ئەوە هاتنە پێش، بوونە هۆی حاڵەتێکی شلەژاو چونکە خوداوەند(ئەرشخیگال)(کەلای یۆنانیەکان پەرسیفۆنەیە) لەلایەن(کوور)ەوە دەڕفێنرێ و دەبردرێتە جیهانی خوارەوە کە ئەمەش وا لە(ئەنك)ی دەکات کە بەگەشتێك هەڵسێ بۆ تۆلەسەندنەوە لە(کوور) بەڵام ئەمەی دواییان دەستەپاچە ناوەستێ لە ڕووی(ئانك)یدا بەڵکو دەستی بە بەردبارانی کەشتیەکەی کرد لە کاتێکدا ئاویش هێرشی دەبردە سەر بەرایی و دواوەی کەشتیەکە.

قەسیدەکەمان ئەنجامی ململانێی نێوان (ئانك)ی و (کوور) ی لە خۆ نەگرتووە چونکە پێشەکی ئەفسانەی ئەفراندن پەیوەندی بە ناوەڕۆکی سەرەکی قەسیدەی(گلگامش و ئەنکیدۆ و خوارەوە)نییە کەپێشتر ئاماژەی بۆ کرا بەڵکو ئەم پێشەکیە(پێشەکی ئەفسانەی ئەفراندن) وەك نەریتێکی باو لەلایەن نووسەرە سۆمەریەکان کە قەسیدەو چیرۆکەکانیان بە چەند دێرێك کە باس لە بابەتی ئەفراندن دەکرد، دەستپێدەکرد.خراوەتە بەرایی ئەو قەسیدەیە.

وەئەگەر نیوەی یەکەمی ئەو پێشەکیەمان شیکردەوە ئەوا ئاشنا دەبین بە بۆچوونی سۆمەریەکان دەربارەی ئەفراندنی بوونەوەران کە لەمانەی خوارەوەدا چڕدەبێتەوە:

١- کاتێك لە ئارادابووە کە زەوی و ئاسمان بەیەکەوە نووسابوون.

٢- هەندێ لە خواوەندی بەر لە جیابوونەوەی ئاسمان لە زەویش بوونیان هەبووە.

٣- دوای جیابوونەوەی ئاسمان لە زەوی، ئاسمان کەوتە بەر دەستی(ئان) خواوەندی ئاسمان لە کاتێکدا زەوی کەوتە بەردەستی (ئەنلیل)خواوەندی هەوا.

کەچی هەندێ خاڵی گرنگ هەن کەلەو پێشەکیەدا باس نەکراون،ئەوانیش:

١- ئایا سۆمەریەکان باوەڕییان بە ئەفراندنی ئاسمان و زەوی هەبوو؟ ئەگەر کارەکە ئاوابێ کەواتە کێ دروستی کردن؟

٢- بەو شێوەیەی کە سۆمەریەکان بۆی دەچوون ئایا شێوەی ئاسمان و زەوی چۆن بووە؟

٣- کێ ئاسمان و زەوی لەیەك کردووە؟

بە خۆشبەختیەوە توانیم وەڵامی ئەو پرسیارانە لە هەندێ دەقی سۆمەریەوە بەدەست بهێنم کە ئاوان:

١- لە تابلۆیەکدا کە ناوی خوداوەندەکانی سۆمەری لەخۆوە گرتووە، دەبینین کە خوداوەند(نەممۆ) کە ناوەکەی بە بڕگەیەکی وێنەیی نووسراوە و ووشەی(دەریا) دەردەبڕێ، واباس دەکرێ کە ئەو دایکەیە ئاسمان و زەوی بووە، بۆیە سۆمەریەکان باوەریان وایە کە ئاسمان و زەوی لە ئەفراندنی(دەریای یەکەم)ن.

٢- ئەفسانەی(گارانی دەغل ودان)کە وەسفی هەردوو خوداوەندی(گاڕان و دەغل ودان)لە خۆ دەگرێ کە لە ئاسمانەوە نێردراون بۆ ئەوەی بە خشش و خۆشگوزەرانی ببەخشنە رەگەزی مرۆڤ، ئەو داستانە بەم دوو دێرە دەست

پێدەکات:

لە سەر چیای ئاسمان و زەوی

(ئان)(ئانوناکی)یە هاورێکانی خۆی بوو.

لە ماقووڵی دوور ناکەوینەوە ئەگەر وای دابنێین کە سۆمەریەکان وای بۆ چوون کە ئاسمان و زەوی لە سەر شێوەی چیایەك یەکتریان گرتبێ کە بنکەکەی بنی زەوی بێ و لوتکەکەی لە بەرزایی ئاسمان.

٣- ئەفسانەی(ئەفراندنی بیور)یان(تەپشوو) کە باس لەوە دەکا کەی دەست بەبەکارهێنانی ئەو ئامێرە گرنگەی کوشتوکاڵی کراوە، ئەو ئەفسانەیە بەو پارچەیە

دەست پێدەکا:

ئەو خودایەی مافی هەیە، هەر ئەو بۆ هەمووانی ئاشکرا کرد.

ئەو خودایەی فەرمانەکانی ناگۆڕێن

(ئەنلیل)کە تۆ دێنێ بۆ زەوی بۆ داچاندنی

لێککردنەوەی ئاسمانی لە زەوی گرتە ژێر سەرپەرشتی خۆی

بەم شێوەیە وەلامی پرسیاری سێیەمان دەست دەکەوێ، کە ئەویش ئەوەی (ئەنلیل)خوداوەندی هەوا زەوی لە ئاسمان جیاکردۆتەوە.

وە دەکرێ کە بیرو باوەڕی سۆمەریەکان دەربارەی دروست بوونی گەردوون و بنەچەی ئەفراندن لە مانەی خوارەوەدا کورت بکرێنەوە :

١- لە سەرەتادا(دەریای یەکەم)هەبووە، بەلام دەریای بنەچەی بوونی باسێك

لە گۆڕێدا نیە و ڕەنگە سۆمەریەکان وای بۆ چووبن کە ئەو دەریایە لە ئەزەلەوە هەبوە.

٢- (دەریای یەکەم) دایکی چیای گەردوونیە کە ئاسمان و زەوی پێکەوە و بە یەکگرتوویی لە خۆ دەگرێ.

٣- سۆمەریەکان باوەریان وابوو کە خوداوەندەکان لەسەر شێوەی مرۆڤن و (ئان)خوداوەندی ئاسمان نێرینە بووە و (کی)ش کە مانای زەوی دەدا مێینە بووە و لەبەیەك گەیشتنیان(ئەنلیل) خوداوەندی هەوا لە دایك بووە.

٤- (ئەنلیل)خوداوەندی هەوا، ئاسمان و زەوی لێکدابڕی وەکاتێك ئاسمان کەوتە

دەست(ئان)ی باوکی (ئەنلیل)زەوی واتە(کی) کەوتە دەستی (ئەنلیل) وە لە ئەنجامی یەکگرتنی(ئەنلیل) و دایکی واتە(کی) قۆناغەکانی ڕێکخستنی گەردوون و

ئەفراندنی مرۆڤ و دامەزراندنی شارستانیەت، دیارکران.

ئەم باسە بەشێکە لە کتێبەکانی (ساموێل نوح کریمر) بە ناوی ئەفسانە سومەرییەکان
ساموێل نوح کریمر، الاساطیر السومریة، ترجمة یوسف داود عبدالقادر، بغداد، مطبعة المعرفة، ١٩٧١، وەرگێڕانی بۆ کوردی لوقمان باپیر

* وەرگێڕی عەرەبی دەڵێ کە هەندێ پرسیار و وەڵام لەو گفتوگۆیەدا بەیەك شێواز هاتوون و بۆ بێزارنەبوونی خوێنەر دارشتنی گۆریون بەڵام بەهەمان مانا، منیش هەروام کردووە،وەرگێڕی کوردی.

# گەشەکردنی بزوتنەوەی نیشتمانی لەئێران لە سالّی١٨٩٠ تاکو سالّی ١٩٣٥

حەربی محەمەد
و: د.محەمەد عەبدوللا کاکە سور

بەشی یەکەم

(پێشەکی وەرگێڕ)

ڕوشنبیری مێژوویی بوارێکی گرنگی روشنبیریە بە گشتی بۆیە وەرگێرانی کتێبی مێژوویی بۆ زمانی کوردی پێویستەکی بە پەلەی رۆشنبیری کوردیە ماوەیەکە خویندن لە کۆلیجە مرۆڤایەتیەکانی زانکۆکانی کوردستان کراوە بە کوردی . بەلاّم بە راداەیەکی زۆر دەگمەن نەبێ سەرچاوەی یارمەتیدەر بە زمانی کوردی لە بابەتە جۆربەجۆرەکانی مێژوودا نیە . ئەم :کەم و کوریە لە دەرەوەی زانکۆش هەستی پی دەکرێ.کتیبخانەی کوردی بەدەگمەن کتێبێکی مێژوویی بە زمانی کوردی سەبارەت بە مێژووی عەرەب یان ئێران یا ئەمریکای دەستدەکەوێت. بۆیە بۆ پڕکردنەوەی ئەم کەلینە بر یار درا کە ئەم کتیبە لە بابەت قۆناغیکی مێژوویی ئێران کە مێژووی نوێ و هاوچەرخی ئێرانە وەربگێریتە سەر زمانی کوردی ، تاکو قوتابیانی پۆلی سێیەمی بەشی مێژوو و خوێندەوارانی کورد بە گشتی سوودی لێ ببینن.بەو ئومیدەش کە چەندین کتیبی تری لە بابەتی مێژوویی تری بە دوا دا بیت. هیوادارین کە لەم رووەوە خزمەتیکی بچووکمان بە بواری رۆشنبیری مێژوویی کوردی و رۆشنبیری کوردی بە گشتی کردبێ، ئەم کتیبەش وەکو هەموو کتێبێکی تر بێ کەم و کوڕی نیەبەلام لە بەر چاو گرتنی ئەوەی کە لە سەردەمی شەری

عیراق ئێرانی ١٩٨٠ـ١٩٨٨ زیاترین ژمارەی کتێب بە زمانی عەرەبی لە سەر مێژووی ئێران و بە هاندانی دەسەلاتدارانی عیراقی دەرچوو، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەو رایەی تا رادەیەك لە ناو هەندێ خویندەواری کورد بلاوە.چەند بە هە لە داچووە کە دەڵی ئیمە نابێ بیجگە لە مێژووی کورد، مێژووی میلەتانی تر بخوینین، بە تایبەتی کە مێژووی میلەتانی دراوسێ زۆر گرنگە بۆ مێژووی کورد تەنانەت ئیمە دەبی لە ناو مێژووی ئەو میلەتانەش بۆ مێژووی کورد بگەڕێین.

## پێشەکی:

مێژووی ململانێ ی ئستعماری لە پێناو دەست بە سەر داگرتنی ئێران و سامانەکانی سروشتی و بازارەکانی لە هەمان کات دا خەباتی گەڵانی ئێران لە پێناو ئازادیو سەربەخۆی سیاسی و ئابوری و رزگار بوون هەموو شێوەکانی زاڵ بونی بێگانە دەنوێنێ . ئەم گەڵە خەبات کەرانەش چاو چنوکیان نەکردوە لە هەموو قوربانیەك بۆ روو بەرووبونەوە و وەستانەوە دژبە هەرجورێك لە ئاسان کاری و جیاوکێك کە خێزانە فەرمان ڕەواکانی زاڵبووی دیکتاتۆر بەخشیبوویان ئەوانەی کە بە دوای یەکتردا لە لەلایەن فەرمان ڕەوای ئێرانەوە بە دەوڵەت و کۆمپانیە بێگانەکان دەدرا. ئەوەو فەرمان رەواکان بە بێ رەچاو کردنی بەرژەوەندی وڵات و گەلانی ئەم جیاووکانەیان بەبێگانەکان دەبەخشی ، ئەمەش لەپێناو بە دەست هێنانی برێك پارە کە لەپێشەکیدا لە شێوەی قەرزیان بەخشین لە حەزوو ئارەزوکانیان سەرف دەکرد .

ئەم لێکوڵینەوەیە هەوڵ دەدات کەشارەزا بێت لە رەوتی بزوتنەوەی سیاسی لەئێران لەبەرە بەیانی سەدەی بیستەمەوە رونکردنەوەی هۆیەکانی ئەو قورتانەی کە تێی کەوت و ئەو ناخۆشیانەی کەروو بە رووی بووەوە بە تایبەتی لە دوای ئەو راپەرینە میللییە جوانەی کە لە پێك هێنانی بەرەی نیشتمانی و دەستەڵات گرتنە

دەستی لەوڵات دا و هەڵستانی بە خۆماڵی کردنی پیشەسازی نەوتی ئێرانی و لە دوایی دا لە پیلانی ئەنگلۆ–ئەمریکی دژی و لەناو بردنی هەموو دەسکەوتەکانی ڕەنگ دەداتەوە "لە دوای ئەوەش باسی بارو دۆخی بزوتنەوەی نیشتمانی لە کاتی ئیستاو ئاسۆ ئایندەییەکانی دەکەین.

## بەشی یەکەم

١٨٩٠–١٩٤١

پاری یەکەم

# شۆڕشی دەستوری

لە سەدەی نوزدەدا ئێران کەوتە ژێر کۆنترۆڵ و هاتنە ناوەی سەرمایەداری ئیستعماری ، کە بەشێوەی ڕێککەوت نامەی ئابوری وبازرگانی نابەرامبەر دەرکەوت ،دەوڵەتە بێگانە بەهێزەکان سەپاندیانە سەری ، لەساڵ ١٨٠٠ دا بریتانیا ڕێکەوت نامەیەکی بازرگانی بەسەر ئێران دا سەباند کە ئازادی هاتنە ناوەوەی ئێرانی بە کەلوپەل و بازرگانە بریتانیەکان دا، ئەو ململانیەی نێوان دەوڵەتە ئستعماریەکان لە پێناو بە دەست هێنانی جیاووك و ئاسانکارییەکان لە ئەو پەڕی دابوو، بەم شێوەیەش فەرەنسا توانی لە لایەن خۆیەوە لە ساڵی ١٨٠٧ ڕێکەوتنامەیەکی بازرگانی و سیاسی بەسەر ئێران دا بسەپێنێ ، لەساڵی١٨٢٨ڕێکەوت نامەیەکی ڕوسی ئێرانی هاوتا مور کرا ، لەدوای کوتایی هاتنی شەر لە نێوان دوو دەوڵەتەکەدا ڕێکەوتنامەی (تورکمانیا) مۆر کرا، ئەمەش بەرامبەر بە سەپاندنی وەکو ڕەسمی گومرگی. کوششە ئیستعماریەکانیش لەم ڕەوتەدا بەردەوام بوو، لەساڵی ١٨٤١ ڕێکەوت نامەیەکی بریتانی –ئیرانی مۆرکرا، هەرچی ویلایەتە یەککرتووەکانی ئەمریکا بوو ئەوە لە ساڵی ١٨٦٥ دا یەکەم ڕێکەوتنامەی ئەمریکی –ئێرانی لە بەرژەوەندی کۆمپانیاو بازرگانیە ئەمریکیەکان مۆر کرد، و لەساڵی

١٨٧٢ شای ئێران کە لەو کاتە دا ناسردین شا بوو یەکەم جیاوکی یە بارۆن جولیوس دوریوتر دامەزرێنەری ئاژانسی هەواڵی رویتەر دابۆ بنیات نانی ڕێگاو هێڵی ئاسمانی و کەناڵکان و کارو باری ئاودێری، بەرامبەر بە بەخشینی ئەو جیاووکەش ئەو پارانە دەست کەوت کە بۆ خەرجیەکانی خۆی پێویستی پیێ هەبەبوو.

گەلانی ئێران سلبی نەبون بەرامبەر بەم ڕێکەوت نامە ناهەقانە بەڵکو بە توندی و قایمی ڕووبەروی بوونەوە لە هەندێك کاتیش تاڕادەیەکی زۆر سەرکەوتوو بوون لە هەڵوەشاندنەوەی جیاووك یان ئاسان کاریەکان وەکو ئەوەی سەبارەت بە جیاووك و مۆنۆپۆل کردنی توتن رووی دا. لەساڵی ١٨٩٠ شا جیاوکێکی بەخشیە کۆمپانیەکی ئنگلیزی کە مانای مۆنۆپۆل کردنی هەبوو بەرهەمی توتنی پیێ دا، و بۆ ماوەی پەنجا ساڵ، ئەمەش بەرامبر بە (١٥) هەزار پاوەنی ئەسترلینی کە ساڵانە شا وەری بگرێت لە پاڵ زیاتر لە چارەگی قازانجە ساڵانییەکان لە دوای دانی تێچوونەکان و ەکو پشکێك لە سەرمایە.

دکتور عەلی وەردی دەڵێ: ((تنباك جۆریك لە توتن– لە سەدەی نۆزدە دا لە ئێران دا باو بوو ئەوە بوو لە نەرجیللە دا دەندرا بۆ ئەوەی بکێشرێ ، وە هێشتا ئێرانیەکان سیگارەیان نە ناسی بوو ، مەسەڵەی تەنباك لەکاتێکدا دروست بووە ناسرەدین شا ڕێکەوتنێکی لەگەڵ کۆمپانیەکی بریتانی مۆر کرد ئەوە بوو جیاووکی مۆنۆپول کردنی تنباك فرۆشتنی لە هەموو لایەکانی ئێرانی پێدا. ئەمەش بۆ هۆی سەر هەڵدانی بێزاریەکی توند کە هەموو وڵاتی گرتەوە لە کوتای دا وەکو شورشێکی میللی گەورەی لێهات)) ئەوەو بزوتنەوەیەکی میللی فراوان دژی جیاووکەکە پەرەی سەند ، ئەوەی کە لە لایەك پردانی حسوسیەتەکانی هاوڵاتیە ، و کونترۆل کردنی بریتیانە لە کۆمپانیایەکە لە لایەکی ترەوە . هەروەها دژی حکومەتی ئێرانی لەسەرروویشەوە شا. کەچی حکومەت سوور بوو لە سەر

هەڵوێستی خۆی و لە سەرەتا ڕازی نەبوو بەوەی كە گوێ بداتە داوا كاریەكانی جەماوەر ، پیاوانی ئاینی ئەو جوڵانەوە جەماوەرییە فراوانەیان بە كارهێنا . ئەوانەش دژی شارستانیەتی ئەوروپی و بیدعەكانی دەوەستان ئەوانەی كە دەستیان پێ كرد بوو لە ئێران دا بڵاو ببنەوە ئەو هەلەشیان قوزتەوە دەست پێشخەریان كرد بو هەڵكێشانی هەموو سیستەمە نوێیەكان ئەوانەی كە لە سەردەمی ناسرەددین شا هاتبونە ئێران. ئینجا روسیا ی ئەم ڕێكەوت نامەی بۆ بەرژەوەندی خۆی بەكار هێنا . حكومەتی ڕوسی كۆششێكی زوری كرد لە پێناو وروژاندنی خەڵك دژی ڕێكەوتنامەی تنباك لە تاران دا سەفیری ڕوسی سەر سوڕمانی خۆی دەربڕی بەو هەرایە گشتییەی دژی ڕێكەوتنامەكە بینی و بە بەڵگەیەكی دانا لەسەر دڵسۆزی و پەروش بوونی ئیرانییەكان بۆ ئاینەكەیان وەكو زانراویشە كە ململانێ لە نێوان روسیا تزاری و بریتانیا توند بەردەوام بوو و بە ئاشكراش ئەمەش لەپێناو خوشەویستی حكومەتی ئێرانی یان گەڵانی ئیران و بەدەست هێنانی جیاووك و ئاسانكاری زیاتریش لە ناو وڵات دا . لە كوتایەكانی تەموزی ١٨٩١ شیرازی بروسكەیەكی بۆ شا نارد و تێیدا داوای لێ كرد كە بە پیر ئارەرەزوی ڕەعبێتەوە لە هەڵ وەشاندنەوەی ڕێكەوتنامەیەكە بێت، بەڵام شا ڕازی نەبوو وە لە دوای ئەمەش حاجی میرزا محەمەد حەسەن شیرازی فەتوا بەناو بانگەكەی بە حەرام كردنی تەنباك دەركرد، یەكسەر بزوتنەوەیەكی لایەنگیری كردنی گەورە بۆ ئەم فەتوایە وڵاتی گرتەوە ، ئەمەش خۆی لە واز هێنان لە توتن و نەرگیلەو غلیۆن كێشان بێنێ وە ئەمەش وانەیەكی بە مانا بوو كە جەماوەری ئێران لە ڕێگای یەكێتی پتەویەوە بە شاو وەزیرەكانی گەیاند . وە لەساڵی ١٨٩٢ جیاووكەكە هەڵوەشێندرایەوە ، واتە دوای دوو ساڵ لە جوڵانەوەی كارای جەماوەری ، وە ئەم جەماوەرەش ڕادەی توانای خۆی زانی لە جوڵانەوەی و

یەکبونی لە بواری سیاسی و لە پیناو بەرژەوەندی هاوبەشیان. شا قەرەبوویەکی بە رادەی نیو ملیون پاوەنی ئەستەرلینی دا بە کۆمپانیای بریتانیەکان ئەم پارەیەش لە بانکی بەریتانی لە تاران قەرز کردبوو،ئەمەش سەرەتای قەرزە بیگانەیەکانی سەر حکومەتی ئیران بوو. سەرەرای ئەو دەرسەی کە جەماوەری ئیرانی بە خیزانی فەرمانرەوایی قاجارییان دا کەچی، ئەوەی دواییان هەر لە سالی ١٩٠١ هەستا بە دانانی جیاووکیك بۆ ولیام نوکس دارسی بەریتانی رەگەز، بۆ گەران بە دوای نەوت لە ئیران دا، ئەمەش یەکەم جیاووکی نەوتی بوو کە لە رۆژهەلاتی ناوەراست درا ئەمەش بەردی بناغەی مۆنۆپۆ لە نەوتیەکانی جیهانی دانا ، ئەوە و شەپۆلیکی بیزاری فراوانی دژی پیدانی جیاووکەکە ولاتی گرتەوە. لە سالی ١٩٠٢ تزاری توانی دەسکەوتیك لە ناو ئیران بە دەست بێنێت ئەمەش لە سەر حسابی گەلانی ئیران بوو و وتووێژ لە نێوان رووس و مسیونوسی بەلجیکی رەگەزنامە ساز کرا دوایی لە لایەن حکومەتی ئیرانەوە وەك و بەریوەبەری فەرمانگەی گومرگ لە کرماشان و تەوریز دانرا ، وتوویژیش لە نیوانیان دا بە دانانی تەعریفیکی نویٚ بۆ هەردوولاکە کۆتا یی هات ئەمەڤش بە رامبەر بە هەندی پارەی بۆ شا کە زۆر حەزی لە سەفەر کردن بۆ ئەورووپا و کات تیادا بردنە سەری دەکرد ، ئەوە و تەعریفە نوێیەکە لە کانوونی یەکەمی سالە ١٩٠٢ واژۆ کرا کەچی لە شوباتی سالی ١٩٠٣ راگەیاندرا . ئەوە و ئەو باجە نوێیانە کە هەردوو لایەنی رووسی و ئیرانی لەسەری پێك هاتبوون لە بەرژەوەندی بازرگانە رووسەکان بوو قورساییەکی نوێی خستە سەر هاولاتیە ئیرانیەکان شا هوونەری زۆر ی نواند لە کۆکردنەوەی باج لە هاولاتیان هەروەها فەرمانبەرە خۆجێیەکان و بیگانەکانیش کە حکومەتی ئیران دایمەزراندبوون هونەریان دەنواند بە سەپاندنی چەندین جۆری جیاواز لە باجەکان.

پێنج جۆر باج هەبوون ئەو باجانە سەپێنرابونە سەر موچەکان، ئەو باجانەی لەو ڕێگای بەدیهێنانی دادەوە بەدەست دەهێنران، وە لە فرۆشتنی پایەکانی دووەمی فەرمانرەواکان بە پایەکانی تر، وە لەناردنی فەرمانبەرە بەرپرسیارەکان بۆ لیکۆلینەوە لەو شکاتانەی هاولاَتیان پیشکەشیان دەکەن، ئەو باجەی لە سەر زەوی دانرابوو.

تەنها لە ساڵی ۱۹۰۵ فەرمانرەوایی گشتی ناوچەی خوراسان و دەورو بەری سی هەزار پاوەنی ئیسترلینی کۆکردەوە لەوانە چواردە هەزار پاوەن پشکی شا و ( شەش هەزار) پاوەن بۆ عەین ئەلدەوللە، ئەوە و جەماوەری ئیران بیزار بوو لەو بارو دۆخە ئابوریە خراپەی لە ولات دا باو بوو، لەو کاتەی کە باجی زیاتر دەدرا ئەوە شا لە حەزو ئارەزوەکانی خۆی و لە شوێنەکانی ڕابواردن لە ئەورووپا دا سەرفی دەکرد هەر دەبوایە کارێکی فراوانی جەماوەری هەبووایە کە بێ باکی شای بواستاندبایە، وە رادەیەکیشی بۆ دەستەڵاتەکانی و دیکتاتوریەتی دانابایە ، شا موزەفەرەدین وەکو باوکی خووی بە سەفەرکردن بۆ ئەورووپا گرتبوو، کەچی لە ڕۆژانی ئەوان دا خەزێنە خاڵی بوو بۆیە ناچار بوو کە پەنا بەرێتە بەر قەرزی بێگانەکان ئەوەو روسیاش ئەم هەلەیان قوزتەوە قەرزی پێ دەدا و هەندێ سوود و جیاووکی گومرگی لی وەردەگرت ئەوەی کە بۆ مایەی بلاَوبونەوەی بێزاری لەنێوان بازرگان و خەڵکی بازار واتە پیشەگەران و خاوەن دووکانەکان و خەڵکی بازار تاکو ئێستاش چینێك پێك دەهێنن کە گرنگەیەکی کەمی نیە لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیشدا ئەگەر بریاریان دا دوکانەکانیان دابخەن وەکو نارەزایی دەربرین لە سەر کاریك لە کارەکان ئەوە وەکو جورێك لە مان گرتنی گشتیەوە ژیانی ئابوری تووشی ئیفلیجی بوون دەکەن. لە پاڵ ئەوەشدا خەڵکی بازار کاری گەریان بە سەر پیاوانی ئاینی و پەیوەندی بە ژیانیان بەوانەوە هەیە، ئەگەر شتێك ئازاریان بدات

ئەوە هەر زوو شکاتیان دەگاتە پیاوانی ئاینی ئەوانیش فەتوای گونجاویان بۆ دەر دەکردن ئەو قەرزانەی کەوتبوونە سەر شانی وڵات و باجە زیادبوەکان لە سەر هاوڵاتیان بوە پتر بونی بێزاری جەماوەری وەکو زانراویشە کە لە ساڵی ١٩٠٥ شورشێك لە روسیادا دژی تزار رویدا بەڵام سەرنە کەوت و تزارو دارو دەستەکەی نیشتمان پەروەرو سەرکردە دیارەکانیان ڕاو ناوهێندێکیان ڕایان کردە ئێران و دەستیان کرد بە دامەزراندنی ۆژنامەو دەستیان کرد بەوەی کە جەماوەر بەرەو بیری دیموکراتی و سۆشیالیزمی ئاراستەبکەن ئەوەی کە بووە مایەی قوولّ کردنەوەی هۆشیاری و پێگەیشتنی سیاسی لە نێوان هاوڵاتیان دا . بارو دۆخی ئەو کات پیگەیوو بوو شۆرش بە تایبەتی بۆ بزوتنەوەی دەستوری " مەشروتیەت" ئەم بزوتنەوەیەش کاتێك دەستی پێ کرد کە فەرمان ڕەوای تەهران هەڵستا بە سوکایەتی کردن هەندێ مەلاو بازرگان و جەند کەسێك لە بازار وبە ڕاکێشانی قاچەکانیان لە فەلاقەدا سزای دان بەرامبەر بەوەش وەکو نارازی دەربڕین بەرامبەر بەم رەفتارەش ژمارەیەك لە بازرگان و بازاریەکان دەستیان کرد بە سەرپێچی کردن ،پەنایان بردە بەر مەسجد شا ، وە پەنا بردنە بەریش لە و دابانەیە کە ئێرانیەکان لە سەردەمی سەفەوی یەوە لە سەری راهاتون ، ئەوان بە "بست " ناوی دەنێن، مانای ئەوەیە کە خەڵك بچنە شوێنی دیاری کراو وەکو مزگەوتەکان یان مەزارگەکان یان ماڵی موحتەهیدیەکان یان سەفارەتەکانی بێگانە یان تەویلە شایانییەکان یان گۆڕەپانی تۆپخانە یان وێسگەکانی تەلەگراف ، کە حکومەت لەو جێگایانە داناتوانێ بیان گرێت. لە گەڵ ئەوەش دا میر" عەین ئەلدەولە" ی زاوای شا موزەفەرەدین فەرمانی بۆ پۆلیسەکانی دەرکرد بە دەرهێنانیان لە مزگەوت ،و کاتێك چوونە دەرەوەش خەڵکی تریش چوونە پاڵیان ، و روویان کردە شارۆچکەی شا عەبدولعەزیم لە دوری چەند میلێك لە تاران و پەنایان بردە بەر ئەو مەزارگا

پیروزەی کە تیایدا بوو، لە وێش دا ڕایان گەیانگد کە تەنیا دوای بە پیرەوە هاتنی داواکارییەکانیان لە شوێنەکە دەچنە دەرەوە ، لەو داوا کاریانەش لابردنی " عەین ئەلدەولە" بوو لە پایەکەی دا ، دامەزراندنی خانەی داد . لەژێر فشاری جەماوەر دا کە پشتگیریان لە بزوتنەوەکە کرد شا ناچاربوو کە بەڵێن بدات " عەین ئەلدەولە " لە سەر کا لابدات و خانەی داد دابمەزرێنی،کەچی تاکو بەهاری ساڵی ١٩٠٦ بەڵێنەکەی خۆی جێ بە جێ نەکرد بە دەراوتنی دەر کردنی بەیانێك کە تێیدا بەڵێن دەدرێت بە دانانی یاسایەکی نوێ و ئەنجومەنێك بۆ سەیر کردنی مەسەلەی چاکسازییەکان . لە ئابی هەمان ساڵیش دا عەین ئەلدەولە هەوڵی دا کە بەڕێز محەمەد تەباتەبایی بگرێ، بارو دوخەکەش تا رادەیەکی زۆر بەرەو خراپی چوو کاتێك کە یەکێك لە سەربازەکانی شا تەقەی لە کوبونەوەیەکی جەماوەری کرد ئەمەش لە هەوڵێك دا بوو بۆ بلاوە پێکردنی ، و یەکێك لە قوتابیە ئاینیەکان کوژرا . لە کاتی بەڕێ کردنی تەرمی قوتابییەکەش زیاتر لە یازدە کەس بەهۆی پەشێویی بەیەك دانەکانی نێوان سەربازەکان و ئەوانەی تەرمەکەیان بەڕێ دەکرد — کوژران . خۆپێشاندەرەکانیش پەنایان بردە بەر مزگەوتی جەمعیە، شا تەنها ڕێگای بە موجتەهیدەکان دا کە بچنە شاری قوم، ئەوانەش هەڕەشەیان کرد کە وەکو ناڕازی دەربڕین بەرامبەر بە ڕەفتاری دەستەڵات داران لە وڵات بجنە دەرەوە ئەمەش بووە مایەی پتر بونی ژمارەی ناڕازیەکان و خۆپێشاندەرەکان دژی شاو دارو دەستەکەی گەیشتە (١٢) هەزار کەس کە داواکارییەکانییان لە دەورو بەری لەکار لادانی عەین ئەلدەولە و دەرکردنی یاسای بنەڕەتی و گەڕاندەوەی موجتەهیدە دور خراوەکان بۆ قوم چڕ دەبوو وە کەچی داواکاریەکان گەشەیان کرد بۆ ئەوەی دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی نیشتمانی ( ئەنجومەن ) گرینتیەك بەخۆوەو دەگرێت کە پشگیری لە نیەت چاکی شا دەکات.

لە ڕێگای نوێنەرێکی بەریتانیەوە وتوویژ لە نێوان شاندی بزوتنەوەی میللی کە داوای دەستوری دەکرد و شاندی شا ڕووی دا ، بە خۆ بەدەستەوە دانی شا کۆتای هات ولە ٥ ئابی ١٩٠٦ فەرمانێکی دەرکرد بە دانانی ئەنجومەنێکی نیشتمانی هەڵبژێردراوە، هەروەها لێخۆش بوونی گشتی لەسەر هەموو ئەو کەسانەی ڕاگەیاند کە بەشداری خۆپێشاندانەکانیان کرد. وە ئەنجومەنی نیشتمانی هەڵبژێردراو یەکەم جار لە تشرینی یەکەمی هەمان ساڵدا کۆبووەوە، ئەم ئەنجومەنە دەستورێکی خستە ڕوو لە کانونی یەکەمی ١٩٠٦ لە لایەن شاوە واژۆ کرا ، ئەمەش داواکاری فەرمی بوو کە لە ژیانی دا پێی هەڵبستێت، ئەوە بوو مرد، وکورەکەی محەمەد عەلی شا بە دوای دا هات .

شای نویێ دوژمنایەتیەکی گەورەی شاردبوەوە بۆ دەسکەوتەکانی جەماوەری ئێرانی و لە پێشەکیشیان دا دەستوری ساڵی ١٩٠٦ ئەوە بوو بە دوو کودەتا هەڵستا، ئەنجامەکەشی کوشتنی ژمارەیەك لە هاوڵاتیانی ئێرانی بوو لە کاتی خۆپێشاندانەکان و پەشێوییەکان ئەو شەڕە ناوخۆییەی کە لە لایەکانی وڵات دا هەڵگیرسا.

ئەو بزوتنەوە دەستورییەی کە جەماوەری ئێرانی سەرکردایەتی کرد لە پێناو کەم کردنەوەی دەسەڵات و کونترۆڵ کردنی خێرای فەرمانڕەوا ڕووبەڕووی بزوتنەوەیەکی لە ناکاوی دژ بووەوە لە لایەن شای نوێیەوە : " فەرمان ڕەوای نوێ محەمەد عەلی شا هەوڵی دا کە دەستوری نوێ لە ناو ببات ، لە کانونی یەکەمی ١٩٠٧ هەوڵی دا کە کودەتایەك بکات ، ئەمەش بووە هۆی کاردانەوەیەکی مەترسی دار ، ولە ئەنجامی کاری دبلوماسی هاوبەش لە لایەن بەریتانیەکان و ڕوس و تەخت گەڕانەوەی ئەوانەی کە لە ئابی ١٩٠٧ ڕێکەوت نامەی ئەنگلۆ ڕوسیان دەربارەی فارس واژۆ کرد . لە دوای ئەم هەوڵە شا دەستی کرد بە خۆ ئامادە

كردن و ناردنی سیخور بۆ جێ بە جێ كردنی هەوڵی دوەمی . وە لە بیست و سێ حوزەیرانی ساڵی ١٩٠٨ شا بە كودەتایەكی دووەم هەڵستا و حكومەتی دەستوری كۆتایی پێ هیناو ئەو كەسانەی كە دژی بوون بەند كران ولە سێدارەی دان وە لە ناوی بردن وله ژێر سایەی سەركردەی تیپی قۆزاقی ڕووسی بارودۆخی نا ئاسایی لە تەهران دا راگەیاند . وە دەسەڵاتی تیرورو تۆقاندنی دژی لیبڕالەكان وەدەستورییەكان لە هەموو شارەكان دا بلاو كردەوە ، وە شەڕی ناو خۆیی لە ناوچە جۆر بە جورەكاندا وە بەتایبەتی لە تە بریز دا هەڵگیرسا، ئەوەو دەست تێوەردانی چەكداری ڕوسی بووە هۆی لە ناو بردنی ئەو كەسانەی كە دژی شا بوون ، وە لە ئەنجامی دژایەتی كردنی یەككگرتوو لە لایەن دەستوورییەكان و نەتەوەییەكان بەرامبەر بە توند ڕەوی شاو دەست تێوەردانی ڕوسی، لە وە دا سەركەوت و بوون كە محەمەد شا لەسەر تەخت لابدەن."

ئەمەش كۆتایی محەمەد عەلی بوو ، وە كورەكەی ئەحمەد شا لە جێگای ئەو دانرا ، كە تەمەنی سیانزە ساڵان بوو،(ئەزوەد ئەلمەلیك) وەكو وەسی لە سەر تەخت داندرا بەڵام یەكسەر مردوو لە جێگای ئەو دا سەلاح ئەڵدەولە بوو بە وەسی . لە ئەنجای شەڕی ناوخۆش پەشێوی لە كارو باری ئیداری و دارایی و سیاسی حكومەتی مەركەزی لە وڵاتدا بڵاو بوەوە ، وە خەزێنە توشی ئیفلاس بوون هات ، لەم بارو دۆخەش دا ڕەزا خان بە دیار كەوت كە بە زیرەكی و زۆر زانی و فێلبازی و توندی لە ناو بردنی دووژمنەكانی ناوبانگی دەركرد بوو،و زۆر بە تموح بوو، نوسەری ئەڵمانی فۆن بلوشەر باس لە روداوێك دەكات كە بەسەر ڕەزاخان دا هات كە قینی شاراوەی ئەو بەرامبەر بە هاولاتیانی تێدا ئاشكرا دەبێت ئەویش ئەوە بوو كە رەزا خان دوای ئەوەی كە بوو بە شا لە كێ بەركێی ئەسپ و لە تاران دا بە ئامادە بوونی هەموو دەستە دبلوماسیەكان لە سوارێكی توركمانی دا بوو ، وفۆن

بلوش دەڵێ" شا چەند هەنگاوێك لە بازنەکە نزیك بوەوە هەر کە سوارە تورکەمەنیەکە گەیشتە دەستی بە توندی و بە هێز لە سەری دا لێدانێك کە تەنیا یاریزانە لێاتووەکانی مشتە کۆلە لە ئەنجامی مەشق پێ کردنێکی دوور و درێژ دەیهاوێژن ." لە دوو ڕۆژی دواتریش دوای ئەوەی ڕەزا خان بێ گوناهی سوارەکەی بۆ دەرکەوت سەد تومانی پێ دا .....! ڕەزا خان توانی پێش شەڕی یەکەمی جیهانی لە ڕوتبەی سەربازی بگاتە ڕوتبەی کۆلۆنیل، لە دوای شەڕیش وەکو ئەفسەرێکی فارسی نیزامی دڵ ڕەق ناوبانگی بڵاو بووەوە . لەئاداری ساڵی ١٩٢١ ڕەزاخان سەرکردەی تیپی قۆزاقی لە سوپای فارسی و بەڕێز زیائەلدین تەباتەبایی کە گەنجێکی سیاسی بوو مەیلی ئینگلیزەکانی هەبوو هەڵستان بە کودەتایەك و دوای سەرکەوتنیشی زیائەلدین بوو بە سەروك وەزیران، وە ڕەزا خان بوو بە سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکان. یەکەم هەنگاویش کە حکومەت گرتیە بەر هاندانی ئەنجومەن بوو بۆ واژۆ کردنی ڕێکەوتنامەی ڕوسی – فارسیەکان ، وە هەڵوەشاندنەوەی ڕێکەوت نامەی ئەنگلۆ فارسیەکان . ئەم هەنگاوەی ڕەزا خانیش تەنها مانوڕێکی فێڵاوی کە مەبەستی لێدانی " کوماری کوجك خان " بوو، ئەوە بوو حکومەتی ئێرانی داوای کێشانەوەی هێزەکانی ڕوسی لە لە گەیلان کرد، لە هەمان کاتیش دا داوای لە بەریتانیە کرد کەکێشانەوەی هێزەکانی خۆی لە فارس دوابخات.

وەکو زانراویشە کەهێزە نیشتمانیەکان لە ئێران دا لەدامەزراندنی ڕێکخراوە سۆشیالیستیەکان وگەشەکردنی بزوتنەوەی مەلا ئاینیەکان چڕ بووەوە ، ئەوە بوو لە ساڵی ١٩١٦ پارتی دادگەری سۆشیالیستی دیموکراتی دروست بوو کە لە ساڵی ١٩٢٠بوو بە پارتی شیوعی ئێرانی، هەر ڕاستەو خۆش دوای دروست بوونی ئەم پارتە سەرکردایەتی شۆڕشی گەیلان و کۆماری گەیلان شۆشیالیستی دیموکراتی

کرد کەچی ئەم شۆڕشە بە هۆی جۆر بە جۆرەوە توشی شکست بوو لەو هۆیانەش پێنەگەیشتنی چینی کرێکار ، وەهەلوێستە چەپ ڕەوە و توندڕەوەکان لە لایەن بورجوازییەتی نیشتمانیەوە ،وەه جیابونەوەی شۆڕشی گەیلان لە سەرجەم شۆڕشی ئێرانی ....هتد و لەو کاتە دا ڕەزا خان و زیائەلدین دوکەسی بەهێزیی مونافسی یەکتر بوون لە سەر دەسەڵات لە دوای دومانگ لە کودە تاکە ڕەزا شا توانی زیائەلدین دور بخاتەوە بەرەو تاراوگەی فەلەستین بینێری کە لەوێدا لە ژێر پارێزگاری بەریتانی ژیا تاکو دوای بیست ساڵ واتە دوای لە سەر کار لادانی ڕەزا خان لە ساڵی ١٩٤١ و پێکهنانی حکومەتێکی نوێ گەڕایەوە ئێران.

ڕەزاخان بەشێوەیەکی تەواو دەسەڵاتی بە سەر وڵات دا گرت ، لە پال پایەی سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکان بووە سەروك وەزیران، ئەمەش تاکو لە ساڵی ١٩٢٥ چووە سەر تەختی وڵات .

پاری دووەم

## دەرکەوتنی ڕەزا خان

ئەو ئامانجە سەرەکییەی کە ڕەزا خان هەوڵی بۆ دەدا توند کردنی کۆنترۆڵ کردنی بوو بۆ دەسەلات وە پەیڕەو کردنی دیکتاتوری تاك ڕەوی وپلیشاندنەوەی بزوتنەوەی نیشتمانی پەرە سەند و بوو لە شۆرشی دەستوری ساڵی ١٩٠٦ وە پەرت وبڵاو کردنەوەی دژایەتی کردن و لێدانی هەموو ئەو هەوڵانە بوو کە لەو کاتە دا بۆ پێکهینانی کۆماری دیموکراتی دەدران. ڕەزا خان هەموو ئامرازێکی بۆ بە دیهێنانی ئەم ئامانجە پەیڕەو کرد ئەمەش چ ئەو ئامرازانە هێزی زۆردارانەیان فرت وفێڵ بێت. لە ئەیلولی ساڵی ١٩٢١ و کاتێك هێزەکانی سۆڤیەتی کشانەوە ، گەیلان داگیر کرا و رادەیەکی بۆ کۆماری کوچك خان دانا ، وە ئەوەی دوایی گرتو بەرە تاران ڕاپێچی کرد کە لە تشرینی یەکەمی هەمان ساڵدا لەسێدارە درا . لە ساڵی

١٩٢٢ هێزی سەربازی زیاتری ناردە ئازەربایجان و کوردستان و خوزستان بۆ پەرت و بڵاو کردنەوەی هێزە نیشتمانیەکان و لە سێدارە دانی سەرکردەکانی بە تایبەتی ئەو ناوچانە لە حکومەتی مەرکەزی هەڵگرابوونەوە و دیکتاتوری ڕەزا خانیان ڕەت کرد بووەوە.

# بەشی یەکەم : شەڕەکانی خاچ دورشمەکان

## هۆیەکانی شەڕەکانی خاچ دورشمەکان

شەڕەکانی خاچ دورشمەکان بەو لەشکر کێشیانە دەوترێ کە ئەوروپیەکان لەهەردوو سەدەی دوازدەو سیازدە( لە نێوان سالآنی( ١٠٩٦- ١٢٧٥ز) کردیانە سەر رۆژهەلآت بەئامانجی ئیستعمار کردنی بەشێوەیەکی سەربازی، چین‌و توێژی جیاواز بەشدارییان لە لەشکرکێشییەکانی خاچ دورشمەکان دا کرد. بۆیە سروشتیە کە ئەو هۆکارو فاکتەرانەی کە پالّی بەو چین‌و توێژانە نا روو بکەنە رۆژهەلآت، جۆر بە جۆر بن.

سوارەکان لە دەرەبەگە بچوکەکان خەونیان بەوەوە دەبینی کە زەوی کشتوکالی بە جوتیارەکانیانەوە لە رۆژهەلآت بە دەست بێنن ، لە کاتێکدا زۆربەی زەوییەکان لە ئەوروپا کەوتبونە ژێر دەستی گەورە دەرەبەگەکان، هەروەها دەست گرتن بەسەر دارستان‌و مێرگەکان‌و ئینجا چاکردنەوەیان کردەوەیەکی قورسی درێژخایەنە، باشتریش لەوە ئەوەیەکە دەست بەسەر ئەو زەوییانە بگرن کە بۆ کوشتوکالّ دەست دەدات و ئامادەیە بۆ بەکارهێنان، ئەمەش لەو ناوچانەی کە لە رۆژهەلآتدا داگیری دەکەن. لە لایەکی ترەوە لە ئەوروپای سەدەی یازدە سیستەمێکی میراتی تایبەت باو بوو کە بە گوێرەی ئەو سیستەمە مولّکەکانی دەرەبەگ تەنیا بۆ کوڕی نۆبەرەی دەمایەوە، لە کاتێکدا کە منداڵەکانی تر لە میراتی باوکیان بێ بەش

دەکران، ئەم سیستەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە سوارەکان لە کورەدەرەبەگەکان هەبن، کە مولکیان نییە. بۆیە ئەم سوارانە دەستیان بەوە کرد بە دوای زەوی نوێ لە دەرەوەی ئەوروپادا بگەڕێن بۆ ئەوەی دەستی بەسەردا بگرن‌و کۆششی جوتیارەکانی بۆ خۆیان بەکار بێنن ، سەرەرای ئەوەش ئەو سوارانە خەونیان بە تالانکردنی سامانە ئەفسانەییەکانی رۆژهەلات دەبینی ،ئەوەی کە زۆر شتی زێدە رۆیی تیادا کراو سەبارەت بەو سامانە ئەفسانەییانە لە خەیالیاندا هەبوو.ئەوەو زۆر لەو سوارانە لەقەرزاندا نقوم ببون، بۆیە بەشداری کردنیان لەشەرەکانی خاچ دورشمەکان رێگایەك بوو بۆ ئەوەی خۆیان لە خاوەن قەرزەکان بشارنەوە.

ئەوەی پەیوەندی بە گەورە دەرەبەگەکانەوە هەبوو ( لەوانەش شاو دۆق و کۆنت‌و ئەوانەی تر) فراوان کردنی مولکەکانیان‌و پترکردنی سامانەکانیان وزیاتر کردنی قەلەمرەوی سیاسیان ئامانجیان بوو لە بەشداری کردن لە شەرەکانی خاچ دورشمەکاندا. ئەوانە خەونیان دەبینی بە دامەزراندنی میرنشینی دەرەبەگی یان میرنشین گەلێك بۆ خۆیان لەو ناوچانەی کە لە رۆژهەلاتدا داگیری دەکەن، سەرەرای ئەو خەونە کێشکەرانە تەنیا ژمارەیەکی کەم لەو گەورە دەرەبەگانە بەشدارییان لە لەشکر کێشییەکانی خاچ دورشمەکان دا کرد.

شارە ئەوروپیەکان( بەتایبەتی شارە ئیتالیەکان وەکو جەنەواو بیزاو بوندەقییە) بەشدارییەکی کاراو گەورەیان لە شەرەکانی خاچ دورشمەکان دا کرد.ئەو شارانە بەرژەوەندی بازرگانی گەورەیان لە بەشداری کردنیان لە لەشکر کێشییە جەنگیەکان بۆ رۆژهەلات هەبوو. سەلجوقیە تورکەکان‌و

بیزەنتیەكان دەستیان گرتبوو بەسەر رۆژئاوای ئاسیاو حەوزی رۆژهەڵاتی دەریای ناوەراست، بەمەش تەگەرەیان دەخستە بەردەم بازرگانی كردنی ئیتالیەكان لەگەڵ رۆژهەڵاتدا، لەسەر ئەو بنەمایەش شارە ئیتالیەكان حەزیان دەكرد ئەو كێ بركێ كەرانەیان رامالْنو بنكەی بازرگانی لەسەر كەناری رۆژهەڵاتی دەریای ناوەراست دابمەزرێنن بۆ ئەوەی رۆڵی ئالوگۆرِ كردنی بازرگانی ولاتانی رۆژهەلاتو ئەوروپای رۆژئاوا ببینن. بەڵام ئەو حەزەیان بەبێ بەكار هێنانی هێزی سەربازی نایەتە دی، ئەمەش جۆشوخرۆشی شارە ئیتالیەكان لە شەرەكانی خاچ دورشمەكانو پێشكەش كردنیان بۆ چەكو تفاقو كەشتی بۆ شەركەرە خاچ دورشمەكان لێك دەداتەوە.

ئەگەربەرژەوەندییە بازرگانیەكان پالی بە بازرگانەكانی شارە ئیتالیەكان نابێ بۆ بەشداری كردنی كارایان لە شەرەكانی خاچ دورشمەكان، ئەوە ئەو هۆكارو بارو دۆخانە چی بوون كە پالیان بە جەماوەری زەحمەتكێشی ئەوروپی لە جوتیارەكان و هی تر ناكە لە ولاتەكانیان كۆچ بكەن بۆ ئەوەی لە خاكی رۆژهەلاتدا بمرن؟ لەسەدەی یازدەدا زۆربەی جووتیارە ئەوروپیەكان بوون بە كۆیلەی زەوی لە لای دەرەبەگەكانیانو مولكەكانیانو ئازادیان لە دەست دا. لەبەرئەوەی ئەو جوتیارە هەژارانە لەژیانێكی پر لەمەینەتیو زەحمەت دا لەژێر سایەی رژێمی دەرەبەگایەتی دا دەژیان ئەوە هیچ هۆیەك نەبوو هانیان بدات لە ولاتیاندا بمێننەوە، بەڵكو بە پێچەوانەوە لەشەری خاچ دورشمەكاندا هەلێكیان بینیەوە بۆ رزگار بوون لە زۆرداریو چەوساندنەوەی دەرەبەگەكان، هەروەها خەونیان بینی بە بەدەست هێنانی سامان لە خاكی

ڕۆژهەڵات یان بەلانی کەم ئەو ئازادییەیان دەست دەکەوێ کە لە خاکی ئەورووپا ونیان کردبوو.

هەرچی سەبارەت بەو هۆکارو باودۆخانەیە کە پاڵی بەپیاوانی ئاینیو کەنیسەکانی ڕۆژئاوا بەسەرکردایەتی پاپەویەت نا بۆ وروژاندنی شەڕەکانی خاچ درشمەکانو بانگەشە بۆ کردنی و ڕەنگ ڕێژ کردنی بە سیمایەکی ئاینی ساختە. ئەوە پاپەویەت دەیویست کە دەسەڵاتو سەروەری خۆی بەسەر کەنیسەکانی ڕۆژهەلاتیو بیزەنتی کە لێی جیا ببوونەوە، بسەپێنێ. لەسەر ئەم بنەمایەش پاپائوربانی دووەم (١٠٨٨- ١٠٩٩ز) لەسەر داواکاری ئەلکسیۆس (کۆمنین)ی ئیمپراتۆری بیزەنتی ڕازی بوو، ئەوەی کە شاندێکی بۆ پاپای ڕۆما ناردبوو، داوای لێ دەکرد کە بە سوپایەك لە ڕۆژئاوای ئەورووپیەوە بەهانای بێ، کە یارمەتی بیزەنتە بدات لەتێك شکاندنی سەلاجیقە تورکەکان، ئەوانەی کە دەستیان بەسەر زۆربەی ئاسیای هەرە بچوكو ئەنتاکیاو قودسیش داگرتبوو، هەرچی نرخی ئەو یارمەتییە بوو ئەوە لابردنی لەت بوونی نێوان کەنیسەی ڕۆژهەڵاتی بیزەنتیو کەنیسەی ڕۆژئاوای پاپەوی بوو. ئەمەش بەمانای دەستەمۆ بوونی یەکەم بۆ دووەم بوو، بۆ ئەوەی شاندی بیزەنتی سۆزی پاپاو پیاوانی ئاینی ڕۆژئاوای (ئەوانەی کە لە کۆنگرەیەکیئاینی لە شاری بیلزانسی لەساڵی ١٠٩٥ز لەگەلیان دا کۆبووەوە) بووروژێنێ. بەزێدەڕۆییەکی گەورە وێنایەکی کاریگەری بۆ کێشان دەربارەی ئەو چەوساندنەوەی کە مەسیحییە ڕۆژهەڵاتییەکانی ژێر فەرمانرەوایی سەلجوقیەکان بە دەستیەوە ئازار دەچێژنو دەربارەی ئەو مامەڵە خراپەی کە حاجییە مەسیحییە هاتوەکان بۆ قودس توشی دەبن .

سەرەرای ئەوەی پێشوو ئەوە رزگارکردنی بێزەنتە لەوەی بکەوێتە دەست موسلمانە سەلجوقیەکان، سەبارەت بە پاپەوییەت بەمانای پارێزگاری کردن لەو شوورەییە دێت کە جیهیاتی مەسیحی لە لای رۆژهەلاتەوە دەپارێزێ. بەمەش دورخستنەوەی مەترسی سەلجووقی لە خودی ئەورووپا. لە لایەکی ترەوە پاپەویەت لەسەر سەروەری بالا لەگەل دەسەلاتی دنیایی لە ململانێ دابوو، پاپەویەت دەیویست سەروەری خۆی بەسەر ئیمپراتۆری ئەلمانی بسەپێنێ لە کاتێکدا کە ئیمپراتۆر هەولی دەدا بۆ ئەوەی دەسەلاتی خۆی بەسەر پاپەویەت دا بسەپێنێ، بەمەش پاپەویەت بە سەرکردایەتی کردنی بزووتنەوەی خاچ دورشمی کارێکی مەزنی بەدی هێنا.

ئەوە یارمەتی دەری دەبێ لە هەولە کانی بۆ سەپاندنی بەسەر دەسەلاتی دنیای، لەپاڵ سەقامگیرکردنی دەسەلاتی روحی، ئەوەو پاپەویەت لە ئەنجامی بەشداری کردنی لەشەری خاچ دورشمەکاندا پارەی زۆری دەست دەکەوێت، ئەوەبوو پیاوانی ئاینی لە هەموو لایەکانی ئەورووپا بلاو بوونەوە بەخشینەکان بەلکو باجەکانیان لە هەموو مرۆڤێك کۆدەکردەوە ئەمەش بە هەنجەتی پارە کۆکردنەوە هەلکوتانە سەر خاچ دورشمەکان ، بەلام ئەو پارانە هەمووی بۆ ئەو پرۆژەیە خەرج نەکران، کە بۆی کۆ کرابوونەوە بەلکو بەشی هەرە گەورەی چوە گیرفانی پیاوانی ئاینیو خەزێنەی پاپەوی ، سەرەای ئەمەش، تەنانەت دوای کۆتایی هاتنی شەرەکانی خاچو دروشمەکان ئەو بەخشینانە هەر کۆ دەکرانەوە.

لەشکر کێشی یەکەمی خاچ دورشمەکان:

کاتێك لە ساڵی (١٠٧١ز) سەلاجیقە تورکەکان لە شەڕی ملازگرد بەسەر بیزەنتیەکان دا سەرکەوتن‌و دەستیان بەسەر زۆربەی ناوچەکانی ئاسیای هەرە بچوك‌و سوریاو فەلەستین داگرت، بیزەنتە داوای یارمەتی سەربازی لە بابا گریگۆری حەوتەم کرد،پاپا بانگەوازێکی ئاراستەی شاو فەرمانرەواکانی ئەوروپا کرد بۆ پێك هێنانی لەشکر کێشیەکی خاچ دروشمانەو ناردنی بۆ رۆژهەلات بۆ شکست پێهێنانی سەلجوقیە موسلمانەکان. هەرەها ئەوەی راگەیاند کە لە پێشەوەی ئەو لەشکر کێشییە دەبێ. بەلام . گریگۆری حەوتەم بە ململانێ لەگەڵ هنری چوارەمی ئیمپراتۆری ئەڵمانی خەریك بوو، ئەمەش بۆ ئەوەی دەسەڵاتی رۆحی پاپا لە سەرووی دەسەڵاتی دنیایی ئیمپراتۆر بێ، ئەوەی کە وای لێکرد لە پرۆژەی لەشکر کێشی خاچ دورشمانەکە نیاز وابوو پێك بهێنرێ دوور بکەوێتەوە، بەم شێوەیەش بابا گریگۆری حەوتەم نەیتوانی ئەو ئەرکە جێ بەجێ بکات کە لە ئەستوی خۆی دانابوو، کە چی بنەماکانی پرۆژەی لەشکر کێشییە خاچ دروشمەکەی داناو ئەرکی جێ بەجێ کردنی بۆ پاپا ئوربانی دووەم( ١٠٨٨-١٠٩٩ز) ی جێ نشینەکەی بەجێ هێشت.

لەسەردەمی پاپا ئوربانی دووەم بیزەنتە جارێکی تر ( بەزمانی ئەلکسیۆس )کۆمینینی ئیمپراتۆری بیزەنتی( ١٠٨١-١١١٨) داوای یارمەتی سەربازی لە پاپەویەت کرد، پاپا بە پیر ئەو داواکارییە هات تا دەستی پێکرد کە بانگی گەلان‌و فەرمانرەوایانی ئەوروپی بکات بۆ راگەیاندنی شەری (پیرۆز) دژی موسلمان. لە کۆتایی ئەو کۆرە ئاینییەی کە ساڵی ١٠٩٥ز لەشاری کلیرمون لە فەرەنسا بەسترا، پاپا ئوربانی دووەم وتارێکی دا بۆ ئاپۆرەی ئەو

خەلکەی لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی ئەوروپا هاتبوونە ئەو شارە، و تیادا داوای کرد لە لەشکرکێشیەکی خاچ دورشمانە ڕوو بکەنە شاری قودس بۆ رزگار کردنی لە دەسەلاتی موسلمانان. وپاپا ئەوەی لە یاد نەکرد کە ئاماژە بەو تالانییە بە نرخانە بکات کە لە خاکی رۆژهەلات چاوەڕێیان دەکات، ئەم داواکارییەی پاپا بەشێوەیەکی ئەرێی گەوەرەوەلامی درایەوە ئنجا هەر یەك لە ئامادە بووان دەستی بەوە کرد خاچێك لە قوماشی سوور رەنگ لەسەر جلی خۆی بدورێ، ئەمەش وەکو نیشانەیەك بۆ رازی بوونی لەسەر بەشداری کردن لەو لەشکر کێشییەی کە لەو کاتەوە پێی وترا (لەشکر کێشی خاچ دورشمەکان).

بۆ ئەوەی پاپەویەت خەلك هان بدات بۆ بەشداری کردن لە لەشکر کێشی خاچ دروشمانە زۆر ئاسانکاری‌و جیاوکی پێ بەخشین ئەوە بوو رایگەیاند کە پارێزگاری لە خێزان‌و مولك‌و مالی ئەو کەسانەدەکات کە بەشداری لەو لەشکر کێشییە دەکەن. هەروەها ئەوەی راگەیاند کە ئەو کەسەی قەرزێکی لەسەر بێ ئەوە بە درێژایی دوورکەوتنەوەی لە نیشتمانەکەی لە قەرزەکەی دەبوردرێت، هەر یەکێك لە جوتیاران‌و دەست‌و پێوەندان لە لەشکر کێشی خاچ دروشمانە بەشداری بکات ئەوە لە دەست‌و پێوەندی بۆ خاوەنەکەی رزگاری دەبێت‌و تاکو هەتا هەتایە ئازادی بۆ دەگەرێتەوە. لەپاڵ ئەمەش پاپەویەت بانگەواز کەرانی لە پیاوانی ئاینی بۆ ناوچە جیاوازەکانی ولاتانی ئەوروپا نارد تاکو داوا لە خەلکی بکەن بەشدار بن لەو لەشکر کێشییە تەنیا نیاز وابوو بۆ رۆژهەلات بنێردری. ئەم بانگەوازکەرانە توانیان جۆش‌و خرۆشی ئەورووپیەکان بوروژێنن. لە ماوەی یەك سالدا ئاپۆرەیەکی بێ شومار لە خاچ

دروشمەکان کۆکرانەوە ئنجا ساڵی ١٠٩٦ ز بەدوو تەوژم بەرەو ڕۆژهەڵات دەرپەڕین.

لەسەرەتاکانی ساڵی ١٠٩٦ کۆمەڵ کۆمەڵ لە جوتیارانی هەژار لە ئەوروپا بەرەو ڕۆژهەڵات دەرپەڕین، هەروەها هەندێ تاوانباران و ڕێگران چونە پالیان، ئەوەو بوترسی ناسكو هەندێ لە پیاوانی ئاینی تر کە هەندێ سەرچاوە بە دەبەنگی وەسفیان دەکەن لەپێشەوەی ئەم کۆمەل کۆمەڵە نارێكو پیکانە ڕۆیشتن، جۆش و خرۆش ئەو جەماوەرە هەژارانەیان دەوروژاند و بەبێ هوشیاری و مەزەندەکردنی دەرئەنجامەکان بەرەو فەوتاندن سەرکردایەتیان کردن. زۆربەی ئەو خاچ دروشمە هەژارانە لە ناوەراستی فەرەنساو باکوری و لە ڕۆژئاوای ئەڵمانیاوە بوون. خاچ دروشمەهەژارەکان بەرێگای هەنگاریاو بولگاریاو بەو ڕێگا وشکانیەدا تێ پەرین کە حەجکەران بەرەو قوستەنتینیە لەوێشەوە بەرەو فەلەستین پێی تێ دەپەڕین. ئەو خاچ دروشمانەش خۆراکی پێویستیان لەلا نەبوو. پەنایان بردە بەر تاڵان و بڕۆو بەکار هێنانی هێز لە پێناو بەدەست هێنانی خۆراك لەو شوێنانەی پیایدا تێ دەپەڕین. بەمەش هەنگاریەکان و بولگاریەکان ڕووبەڕوویان بوونەوەو ژمارەیەکیان لێ کوشتن. لە کاتێکدا هەندێکی تریان بەرەو وڵاتەکانیان هەڵهاتن. هەرچی ئەوانەی تر بوون ئەوە لە بارودۆخێکی کەمایەی بەزەیی پێداهاتنەوە بوو گەیشتنە قوستەنتینیە. ئیمپراتۆری بیزەنتی چاوەڕوانی ئەو جۆرە یارمەتیە نەبوو لە ئەوروپا کە هیچ سودێکی لێ چاوەڕوان نەدەکراو، خاچ دروشمان خۆیان لەوە نەبوارد خودی کەنیسە مەسیحیەکانیش بدزن.

لەسەر ئەم بنەمایەش ئیمپراتۆر ئەلیكسیۆس كومنین كاری كرد بۆ ئەوەی خۆی لە خاچ دورشمە هژارەكان قوتار بكات، كاری تێ پەرینیانی بۆ ئاسیا هەرە بچوك ئاسان كرد، كە سەلجوقیەكان كەوتنە سەریان‌و زۆریان لێ كوشتن. لە كاتێكدا كە پاشماوەكانیان بەسەركردایەتی بوترسی ناسك گەرانەوە قوستەنتینیە بۆ ئەوەی چاوەراونی هاتنی لەشكر كێشی دەرەبەگەكان بكەن. بەمەش لەشكر كێشی میللی خاچ دروشمانە بەكارەسات گەیشت، هەر لە سەرەتاشەوە رق لێبونەوەی نێوان بیزەنتیەكان‌و ئەورووپیەكانی پتر كرد. هەروەها كۆسپ‌و تەگەرەی خستە بەردەم لەشكركێشی میرەكان كەپاش ماوەیەكی كەم هاتە قوستەنتینیە.

لەشكركێشی میرە دەرەبەگەكان لە چوار گروپی گەورە پێك دەهات:

١- گروپی یەكەم: سوارەكانی ناوچەی لۆرینی فەرەنسی‌بەخۆوە دەگرت، دۆق غود فرواو بلدوین ی برای سەرۆكایەتیان كرد.

٢- گروپی دووەم : سوارەكانی ناوچەی باكور لە فەرەنساو سوارەكانی دۆقیەی نۆرماندی فەرەنسی بەخۆوە دەگرت. روبیر دوقی نورماندی سەرۆكایەتیان كرد.

٣- گروپی سێیەم: سوارەكانی ناوچەی بروفانسەی لە باكوری فەرەنسا بەخۆوە گرت، وە ریمونت كونتی شاری تولوز سەۆكایەتی كرد، هەروەها ئادیمار نوێنەری پاپەوی یاوەری كرد.

٤- گروپی چوارەم : سوارەكانی نۆرماندی لە شانشینی نورماندی كە لە باشوری ئیتالیا دامەزرابوو، بەخۆوە گرت. بویموند كوری روبیرغیسكارو كوری براكەی كە ناوی تانكرد بوو سەرۆكایەتیان كرد.

بەم شێوەیەش هێزەکانی خاچ دروشمەکان یەك سەرکردایەتیان نەبوو، بەڵکو هەر گروپێك یەکەیەکی سەربازی سەربەخۆی پێك دەهێنا کە سەرکردایەتی تایبەتی خۆی هەبووە. ئەم هێزە دەرەبەگایەتیانەش چەكو داراییو ئازووقەیان بۆ دابین کرابوو. هەروەها زۆر لەو هێزە میللیانە باشتر بوو کە بۆ قوستەنتینیە رەوانە کرابوون.

لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٠٩٦ز هێزەکانی میرە دەرەبەگەکان لە ئەوروپا بۆ رۆژهەلات بەرێ کەوتن، ئەم هێزانە بەرێگای جیاواز تێ پەرین، بەشی یەکەمیان بەرێگای وشکانی هاوشانی هەردوو رووباری راینو دانوب تێ پەرین. بەشی دووەمیش بە رێگای وشکانی هاوشانی دەریای ئەدریاتیکی تێ پەرین، و بەشی سێیەمیش بە ئیتالیا تێ پەرینو لەوێوە بەرێگای دەریاوە بەرەو بەڵقان چوون. ولەبەهاری ١٠٩٧ ز هێزەکانی میرە دەرەبەگەکان گەیشتنە تەنیشت قوستەنتینیە و ژمارەشیان لە نێوان شەست هەزار تا سەد هەزار دابوو، پێش ئەوەی خاچ دورشمەکان بچنە پایتەختی بیزەنتی ناکۆکیەك لە نێوان ئەوانو بیزەنتیەکان بەرپابوو، ئەلکسیۆس کومنینی ئیمپراتۆری بیزەنتی بە پارێز بوو لە نیەتی خاچ دورشمەکانو لە هەلسوکەوتو کردەوەکانی تالانو برۆیان بەرامبەر بە مەسیحیەت رۆژهەڵاتیەکان بێزار بوو،بۆیە لەسەرەتادا دەرگاکانی قوستەنتینیەی بۆ نەکردنەوە. هەرچی خاچ دورشمەکانە ئەوە ئامانجیان لەو هەلکوتانە سەرەی تیادا هاتبوون، یارمەتی دانی بیزەنتە نەبوو لەو هەرێمانەی کە سەلجووقیەکان لێیان داگیر کردبوون، بەلکو ئامانجی راستەقینەیان

دامەزراندنی هەندێ میرنشین بوو بۆ خۆیان لە ڕۆژهەڵاتو بەدەست هێنانی دەستکەوتی ئابووریو هی تر بوو.

وە لەبەر ئەوەی ئیمپراتۆری بیزەنتی لەخاچ دورشمەکانی دەویست کە لە پێناو بیزەنتە شەڕ بکەن، ئەوە ڕێگای نەدان کە بێنە ناو پایتەختەکەی تەنیا دوای ئەوەی گەورە سەرکردەکانی سوێندیان بۆ خواردو بەڵێنیان پێ دان کە پابەندبن بە دەسەڵاتەکەیو ئەو خاکە بیزەنتیانەی لە سەلجوقیەکان دەستێننەوە بێجگە لە فەلەستین، پێی بدەن– لە لایەکی ترەوە ئیمپراتۆری بیزەنتی بەڵێنی بەو خاچ دورشمانە دا کە ئازووقەو هەموو یارمەتیەکیان بکرێ پێ بدات، کە یارمەتی دەریان بێ لە بەدێ هێنانی سەرکەوتن ، لە ڕاستیدا ئیمپراتۆری بیزەنتی متمانەی بەو سوێندی پابەند بوونە نەبوو کەمیرە ئەوروپیەکان خواردبوویان. هەروەها ئەوانەش لە نیەتیاندا نەبوو ئەوەی سوێندیان لەسەری خواردبوو و بەلێنیان پێ دابوو، جێ بەجێی بکەن.

لە دوای ئەوەی ڕێکەوتن لە نێوان ئیمپراتۆری بیزەنتیو خاچ دروشمەکان ڕوویدا، هێزەکانی خاچ دروشمەکان بسفۆریان بڕیو دەستیان بەوە کرد بە ئاسیای بچووکدا بچنە ژوورەوە. یەکەم کار کە خاچ دروشمەکان دژی سەلجوقیەکان پێی هەڵستان ئابلووقەدانی شاری نیقیە بوو،کە لە ساڵی ١٠٨١ز سولتانی سەلجوقی سلێمان لە بیزەنتەی داگیر کردبوو، لە دوای ئابلووقە دانیش زیاتر لە مانگێکی خایاند، تیایدا خاچ دوروشمەکان شکستیان بەو هێزە سەلجوقیانە هێنا کە بۆ بەهانا هاتنی شارە ئابلوقە دراوەکە هاتبوون. تێبینی ئەوە کرا کە ئاڵای بیزەنتی لەسەر شورەکانی نیقیا بەرز

کرابوەوە، ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی گفتوگۆی نهێنی لەگەڵ دانیشتوانی شارەکە ئەنجام داوەو رازی بوون لەسەر خۆبەدەستەوەدانی بیزەنتەی بەدەست هێنابوو ئەمەش بەرامبەر بەپارێزگاری کردن لە ژیانیان‌و تووشی چەوساندنەوە نەبوونیان لە دوای گەراندنەوەی شاری نیقیا لە سەلجووقیەکان ئەلکسیۆس کومینی ئیمپراتۆر داوای لە هاوپەیمانی خاچ دروشمەکان کرد بە تەنیا بچنە ناو ئاسیای هەرەبچووك‌و هیواداری سەرکەوتنی بۆ خواستن.

وەلە یەکی تەموززی ساڵی ١٠٩٧ز هێزەکانی خاچ دورشمەکان سەرکەوتنێکیان بەسەر هێزەکانی سەلجووقیەکان لەدەشتی ئەرزەرۆم بەدەست هێنا،ئینجا هەردوو شاری قۆنیەو هرقلەیان داگیر کرد، لە وێشەوە خاچ دورشمەکان بەرەو ئەرمینیای هەرەبچووك پەڕینەوە.

لەدوای بەدیهێنانی ئەو سەرکەوتنانەی پێشتر باس کرا چاوتێبرین‌و بەرژەوەندیە تایبەتیەکان لەلای هەندێ لەمیرە خاچ دروشمەکان بەدیار کەوتن، میر بەلدیون بەهێزەکاننیەوە لە خاچ دورشمەکانی تر جیابووەوە بەرەو شاری رەها ( ئورفە) چوو، فەرمان رەوا ئەرمەنیەکەی ئەو شارە دەرگاکانی شارەکەی بۆ ئەو میرە خاچ دورشمە کردەوەو دەستی لە فەرمانرەوایی کردنی شارەکە هەلگرت بۆ ئەو. بەمەش لە ساڵی ١٠٩٨ز یەکەمین میر نشینەکانی خاچ دروشمەکان لەرۆژهەلات پێك هات، هەرچی خاچ دورشمەکانی ترە ئەوە بە ئاراستەی باشوور بەرەو ئەنتاکیا چوون، ئابلووقەی خاچ دروشمەکان بۆ شاری ئەنتاکیا ماوەی حەفت مانگی خایاند ئەمەش لەلایەك بەهۆی قایمی شوراو قەڵاکانیو، لەلایەکی تریشەوە بەهۆی

لەدەست دانی سەرکردایەتییەکی یەکگرتوو لەلایەن خاچ دروشمەکانەوە. لە کۆتاییدا بویموندی میری نورماندی توانی بە یارمەتی هەندێ کەس لە دانیشتوانی شارەکە دەست بەسەر یەکێك لە تاوەرەکانی شارەکەدا بگرێ. ئنجا دەرگاکانی کردەوەو لەساڵی ١٠٩٨ز خاچ دروشمەکان چوونە ئەنتاکیا. بویموندی میری نورماندی ویستی بەتەنیا فەرمانرەوایی ئەم شارە بکات لە کاتێکا هەندێ لە میرەکان کێ برکێیان لەسەر فەرمانرەوایی کردنی کرد ئەوانەی تر ویستیان بە گوێرەی ئەو بەڵێنانەی دابوویان بیدەنە دەست ئیمپراتۆری بیزەنتی، لە کۆتایدا بویموندی نورماندی بەسەر کێ برکێ کەرانی دا سەرکەوت، و میرنشینێکی خاچ دروشمانەی سەربەخۆی لەئەنتاکیا دامەزراندو خۆی فەرمانرەوایی کرد.

لەدوای داگیرکردنی ئەنتاکیاو دامەزراندنی میرنشینێکی خاچ دروشمانەی نۆرماندییەکان، خاچ دروشمەکانی تر بەسەرکردایەتی ریموندو تانکردو بیروغودفرواکشانیان بەرەو قودس دەست پێکردەوە.و لە دوای ئابلووقە دانێك کە زیاتر لە مانگێکی خایاند خاچ دروشمەکان توانیان شوراکانی شارەکە ببرن، لەساڵی ١٠٩٩ز قودس کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەو ئیستعمارە ئەوروپیانە. ئەوەو خاچ دروشمەکان بەوەحشی گەریەك کە تاکوو هەتاهەتایە مۆری شەرمەزاری لە نێو چەوانیان دا مامەلەیان لەگەڵ دانیشتوانی قودس لە موسڵمانەکانو مەسیحیەکان بەیەکەوە کرد. ئەمەش لەگەڵ رێنماییەکانی مەسیح دژ بەیەك بوو لە کاتێکدا ئەوان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە بۆ ئەوە هاتوون کە گۆرەکەی لە دەستی موسلمانەکان رزگار بکەن ئەمەش بۆ شاردنەوەی چاوتێبرینە ئیستعمارییەکانیانو بەرژەوەندییە ئابوریەکانیان

بوو. بەم شێوەیەش میرنشینی خاچ دروشمانەی سێیەم لە رۆژهەڵاتی عەرەبی لەشاری قودس پێك هات.

ئەرکی سوپا خاچ دورشمە ئیستعمارییەکان بە داگیرکردنی قوودس کۆتایی پێ نەهات ، لە کاتێکدا کە هێشتا هەندێ شاری کەناری وەك( قیسارییەو عەکاو سورو تەرابلوس) و ناوخۆیی( وەکو دیمەشقو حومسو حەماو حەلەب) لەژێر دەسەڵاتی موسڵمانان دابوون. ئەو خاچ دروشمانە لەپێویستی دەست بەسەرداگرتنی شارە کەناریەکان گەیشتن، ئەمەش بۆ مسۆگەر کردنی پەیوەندی کردنیان بە ئەورووپا لە رێگای دەریاوە.
داوایان لەشارە ئیتالیەکان( جەنەواو بیزا) کرد کە کەشتیگەلێکی دەرياييان پێ بدات یارمەتی دەریان بێ لە داگیر کردنی کەنارەکانی وڵاتی شام، ئەمەش بەرامبەر ئەوەی ئەو شارانە یەك لەسەر سێی ئەو دەستکەوتانەیان بەرکەوێ کە بەدەستی دەهێنن وبازاری بازرگانی ئازادیشیان لەهەر شارێك کە داگیری دەکەن هەبێ. بەیارمەتی دانی کەشتیەئیتالیەکانیش خاچ دورشمەکان لەساڵی ١١٠١قیسارییە و لە ساڵی ١١٠٤ز عەکاو لەساڵی ١١٠٩ تەرابلوسو لەساڵی ١١٢٤ز سوریان داگیر کرد.

لەسەرەتاکانی سەدەی دوازدەم چەند لەشکر کێشییەکی بچووك لە ئەورووپا بە رێکەوتن و هاتنە ئاسیای هەرەبچوك بۆ بەهانا هاتنی خاچ دروشمەکان لەرۆژهەلاتو یارمەتی دانیان دژی سەلجوقییە تورکەکان. و یەکێك لەو لەشکر کێشییە خاچ دروشمانەیە کە باسیان لێوە کرا توانی بویموندی میری ئەنتاکیا ئازاد بکا ئەوەی کە لەساڵی ١١٠٠ز بە دیلی کەوتبووە دەست سەلجووقیە تورکەکان. بەهەموو شێوەیەك لەشکر کێشی بەهانا

هێنەرەکانی خاچ دروشمانەییەکان لە ململانێیان لەگەڵ سەلجوقییە تورکەکان لەئاسیای هەرەبچووك توشی شکست بوون. هەروەها ئەوانەی لە خاچ دورشمەکان بەزیندوویی مابوونەوە بەڕاکردن کشانەوە .

لەشکر کێشی خاچ دروشمانەی دووەم:

لەساڵی ١١٤٤ ز عیمادەدین زەنکی سەلجوقی ئەتابەکی موسڵ میرنشینی رەهای لە خاچ دروشمەکان سەندەوە، ئەورووپیەکان لەوە ترسان کە میرنشینەکانی تری خاچ دروشمەکانیش لە رۆژهەلات لە دەست بدەن بۆ یە لەشکر کێشی خاچ دروشمانەی دوەمیان پێك هێنا، لە ساڵی ١١٤٧ ز بەسەرکردایەتی کونرادی سێیەم ئیمپراتۆری ئەڵمانیاو لویسی حەوتەمی شای فەرەنسا بەڕێکەوت. ئامانجی سەرەکیش لەو لەشکر کێشی خاچ دورشمانە گەڕاندنەوەی شاری رەها بوو لە دەستی سەلجووقیەکان لەبەر ئەو گرنگییە ئاینیو ئیستراتیجییەی کە هەیبوو، مەسیحیەت لەرۆژهەڵات لەوێ لەسەرەتادا نەشونمای کردو، یەکەمیان میرنشینە خاچ دروشمەکانە لە رۆژهەڵات، هەروەها هەڵکەوتنەکەی لەنێوان باکوری عێراقو وڵاتی شام لەوانەیە وای لێ بکات رێگر بێ لەبەردەم یەکگرتنی هێزە ئیسلامییەکان لە هەردوو ناوچەکەدا، کەچی لەشکر کێشی خاچ دروشمانەی دووەم، لە گەیشتن بە ئامانجە سەرەکییەکە تووشی شکست بوو، ئەوەبوو سوپای ئەڵمانی لە ئاسیای هەرەبچوك دا توشی زیانی گەورە بوو لەسەر دەستی سەلجووقیەکان، هەروەکو سوپای فەرەنسی لەکاتی بەر یەك کەوتنی بە هێزی سەلجوقی لە هەرێمی فیرجیا تووشی شکستو پارچە بوون بوو. وتەنیا ژمارەیەکی کەم لە هێزەکانی ئەورووپی مانەوە، ئەوانەش نەیاندەتوانی هێرش

بەنە سەر رەها بۆیە بەیارمەتی بلدوینی دووەمی شای خاچ دروشم ڕوویان کردە دیمەشق و ئابلووقەیان دا.

بلدوینی دووەم خاتر جەم نەبوو لە هاتنی هێزەکانی ئەورووپی بەسەرکردایەتی ئیمپراتۆری ئەڵمانی وشای فەرەنسی( لەپایەو بەرژەوەندیە تایبەتییەکانی دا خۆی دەترسا لە ئەوانەوە) بۆیە فەرمانی بە هێزەکانی دا ئابلووقەی سەر شاری دیمەشق بکەنەوە، ئەوەی کە بوە مایەی ورووژاندنی تووڕەیی کونرادی سێیەم و لویسی حەفتەم و ناچاری کردن کە بۆ قودس بکشێنەوەو لەوێش بەساردی پێشوازیان لێکرا، لەدوای بەسەربردنی چەند رۆژێك لە فەلەستین ئیمپراتۆری ئەڵمانی وشای فەرەنسی لەگەڵ هێزەکانیان گەڕانەوە ئەورووپا لە کاتێکدا کە سێبەری شکست و سەرنەکەوتن باڵی بەسەردا کێشا بوون. بەم شێوەش لەشکرکێشی خاچ دوشمانەی دووەم لە بەدیهێنانی ئەرکەکەیدا سەرنەکەوت. یەکەم شت خاچ دروشمەکان لەسەردەستی سەلجووقیە تورکەکان تووشی شکستی گەورەبوون دووەم شتیش، بیزەنتیەکان یارمەتی خاچ دروشمەکانیان نەدا، بەڵکو مانول کومنینی ئیمپراتۆری بیزەنتی هانی مەسعود سولتانی سەلجوقی قۆنیەی دا لەسەر دانانی کۆسپ بەڕووی خاچ دروشمەکان و سێیەمیش خاچ دروشمە پێشووەکان لەرۆژهەڵات هاوکارییان لەگەڵ خاچ دروشمە هاتووەکاندا نەکرد، بەڵکو بەنابەدڵییەوە پێشوازیان لێکردن ئەمەش لەترسی ئەوەی لەسەر پایەو دەسکەوتە مادییەکان کێ برکێیان لەگەڵ دا بکەن.

**یەکیەتی میسرو سوریاو عێراق لەسەردەمی سەلاحەددینی ئەیوبی :**

هۆیەکانی ئەو سەرکەوتننانەی خاچ دروشمەکان لەبەرەبەیانی سەدەی

دوازدە بەدەستیان هێنا بۆ نەبوونی یەکیەتی نێوان هێزە ئیسلامییەکان لەرۆژهەڵات دەگەڕێتەوە وکاتێك لە ( نیوەی دووەمی سەدەی دوازدە) هێزەکانی میسرو سوریاو عێراق یەکیان گرت. توانیان کەوانەیەکی قورس بەئیستعمار کەرە ئەوروپیەکان بلێنەوە زیانی گەورەیان پێ بگەیەنن. لەساڵی ١١٤٦ز عیمادەدین زەنگی ئەتابەگی موسڵ مرد، ئەمەش دوای ئەوەی شاری رەهای لەخاچ دروشمەکان رزگار کرد و حەلەبی خستە سەر میرنشینی موسڵ( لەباکوری عێراق) . و نورەدین مەحمودی کوڕی هەوڵی یەکیەتی لەنێوان عێراقو سوریاو میسردا بۆ ئەوەی هەموو هێزەکانی ئەو ولاتە دژی خاچ دروشمەکان کۆبکاتەوە. و لەساڵی ١١٥٤ز نورەدین مەحموود توانی شاری دیمەشق بخاتە سەر میرنشینەکەی هەروەها خۆی ئامادەکرد بۆ ڕووکردنە ئاراستەی میسر، کەچی ئامورە یەکەم شای خاچ دورشم لە قودس دەستی بەوە کرد لەدەست بەسەراگرتنی میسر کێ برکێ لەگەڵ نورەددین مەحمود بکات ، و لەبەر ئەوەی خەلافەتی فاتیمی لەمیسر بێ هێز ببوو، ئەوەو ئاموری یەکەم توانی چوار لەشکرکێشی سەربازی دژی بنێرێ، هەروەکو بیزەنتیەکانیش یارمەتیان دا.

ئەوە بوو لەساڵی ١١٦٩ ز کەشتی گەلێکیان نارد ئابلووقەی شاری دومیاتی دا کەچی ئەو هێزە سەرابازییانەی کە نورەدین بۆ میسری ناردبوو توانی هەوڵەکەی کەشتی گەلی بیزەنتی بە داگیرکردنی شاری دومیات شکست پێ بهێنێ، هەروەها بە ڕووی‌ئەو خاچ دروشمانە وەستایەوە کە لە فەلەستینەوە هاتبوون و گەراندنیانەوە شوێنی خۆیان لە ساڵی ١١٧٣ز نورەدین مەحموود مردو ئەرکی تەواو کردنی پەیمانەکەی لە یەکخستنی هێزە

ئیسلامیەکانو شەرکردن دژی خاچ دروشمەکان بۆ سەلاحەددین بەجێ هێشتو بەراستی سەلاحەدین لێهاتوویی خۆی لە جێ بەجێ کردنی ئەو ئەرکەی خرابووە سەر ئەستۆی پیشان دا، میسرو شامو باکوری عێراقی لە ژێر دەسەلاتی خۆیەکخست هەروەها هێزەکانی هەرسێ وڵاتی لەژێر سەرکردایەتی خۆیدا کۆکردوە، لەساڵی ١١٨٧ز هێزەکانی ئیسلامی شەرێکی هارەریان لەگەڵ هێزەکانی خاچ دروشمەکان لەدەشتی حتین نزیك دەریاچەی تەبەریە لەفەلەستین کرد. شەری حەتینیش هەڵوێستەکەی لە رۆژهەلات بۆ بەرژەوەندی موسڵمانەکان یەکلا کردەوە، کەزۆبەی هێزەکانی خاچ دروشمەکان تیادا لەناو بردرا، و لەدوای شەری حەتین هێزەکانی سەلاحەدین چوونە ناو عەکاو یافاو بەیروتو عەسقەلان . بەمەش کەناری شام بێجگە لەشاری سور لەدەسەلاتی خاچ دروشمەکان رزگار کرا. ئەم شارەش بەهۆی یارمەتی کەشتیە ئیتالیەکان لەلای دەریاوە توانی خۆی بگرێ. هەروەها شاری قودس کەوتە ژێر دەستی موسلمانەکانو رێگایان بەو ئەوروپیانە دا کەلە شارەکە بوون بەجێی بهێڵن، ئەوەو موسڵمانەکان زۆر لە خاچ دروشمە ئەوروپیەکان بەبەزەیی تر بوون ئەوانەی کەلە ساڵی ١٠٩٩ ز لە کاتی داگیرکردنی قودس تاوانی گەورەیان ئەنجام داو دانیشتوانەکەیان ئەتککرد.

سەلاحەدینی ئەیوبی زۆربەی ئەو ناوچانەی رزگار کرد کە خاچ دروشمەکان داگیریان کردبوو ، بێجگە لە هەندێ شوێنگە لەبەشی باکوری کەناری شام هیچی بۆ نەهێشتنەوە، ئەوەو ئەو خاچ دروشمانەی لەرۆژهەلات مابوونەوە لەتوانایان دانەبوو سوپایەکی نوێ ئامادەبکەن. ئەگەر بشیان ویستبایە ئەو ناوچانەی لە دەستیان دابوو بگەرێننەوە، هەر دەبوایە لەشکرکێشیەکی تری

خاچ دروشمانە لە ئەوروپاوە بهاتابایە، بۆ ئەوەی لەم ڕووەوە یارمەتی دەریان بێت، هەر ئەمەش ڕووی دا.

لەشکر کێشی سێیەمی خاچ دروشمەکان:

لەدوای گەڕاندنەوەی قودسو بەندەرە کەنارییەکان بۆ دەسەڵاتی موسڵمانەکان ئەوروپیەکان هەلکوتانە سەرێکی سێیەمی خاچ دروشمانەیان بۆ سەر رۆژهەڵات پێك هێنا، لەساڵی ١١٨٩ ز لەشکرکێشی سێیەمی خاچ دروشمانە بەسەرکردایەتی فردریك بەربرۆسای ئیمپراتۆری ئەڵمانی و فلیبی دووەمی شای فەرەنسی و ریچاردی یەکەمی ناسراو بە (شێر دڵ) لەئەوروپا بەڕێ کەوت، لەشکر کێشی سێیەمی خاچ دروشمانە گەیشتە رۆژهەڵات بەڵام سەرکەوتنی گەورەی بەدەست نەهێنا ئیمپراتۆری ئەڵمانی لەکاتی پەڕینەوەی هێزەکانی لەئاسیای هەرە بچوکدا لە ڕوبارێکدا نقووم بوو، بەشێك لەسوپاکەی گەرایەوە ئەڵمانیاو بەشەکەی تریش چوونە پاڵ هێزە فەرەنسیو ئینگلیزییەکان، هەرچی ئینگلیزو فەرەنسیەکان بوون ئەوا ناکۆکی لە نێوانیاندا سەری هەڵداو لایەنی نەتەوایەتی لەلایان سەری هەڵدا، سەرەڕای ئەمەش دەستیان بەسەر عەکاو یافادا گرت. لەدوای دەست بەسەرداگرتنی خاچ دروشمەکان بەسەر هەندێ بەندەری کەناری، فلیبی دوەمی شای فەرەنسی گەرایەوە وڵاتەکەی ، لەکاتێکدا کە ریچاردی ( شێردڵ) ی شای ئینگلیزی ماوەیەکی درێژ لەشام مایەوە.

لە ساڵی ١١٩٢ز ئاشتینامەیەك لە نێوان ریچارد (شێردڵ) و سەلاحەدینی ئەیوبی بەستراو هەردوکیان لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە خاچ دورشمەکان بەشی کەناری درێژ بووەوە لە نێوان سوریاو یافا لە پاڵ ئەنتاکیا یان

بمێنێتەوە. لە کاتێکدا کە موسڵمانەکان شاری قودس‌و ناوچەکانی تری فەلەستینیان لەژێر دەستدا بێ‌و موسڵمانەکان بەڵێنیان دا کە ڕێگا بە حاجیە مەسیحیەکان بدەن سەردانی شوێنە پیرۆزەکان لە فەلەستین بکەن.

لەشکر کێشی چوارەمی خاچ دروشمانە:

خاچ دروشمەکان گێرانەوەی قودسیان بۆ موسڵمانەکان کردە بیانوو بۆ پێك هێنانی لەشکر کێشی چوارەمی خاچ دروشمانەو ڕەوانە کردنی بۆ رۆژهەلات، پاپا ئەنوسنتی سێیەم ١١٩٨- ١٢١٦ز ویستی سەرکردایەتییەکی جیهانی لەناو خۆو دەرەوەی ئەورووپا بۆ خۆی بەدی بهێنێ .و هێزە سەربازییەکانیان لەلەشکرکێشییەکی خاچ دروشمانە بۆ ڕۆژهەڵات بنێرن. ئەم جارەیان نەشای ئینگلتراو نەشای فەرەنسا و نەئیمپراتۆری ئەڵمانیا بە پیل بانگەوازەکەی پاپاوە نەهاتن. بەڵکو هەندێ میری دەرەبەگایەتیەکان لە فەرەنساو ئیتالیاو ئەڵمانیا بەپیل بانگەوازەکەیەوە نەچوون. شاری ڤینیسیای ئیتالی بەو هێزە دەریاییەی هەیبوو توانی جلەوی هەلکوتانە سەری چوارەمی خاچ دروشمانە بگرێتە دەست‌و بەگوێرەی بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی ئاراستەی بکات. دۆقی شاری ڤینیسیا بەرامبەر بە گواستنەوەیان بۆ میسر لەسەر کەشتی ڤینسی داوای (٨٥٠٠٠) مارکی زیوی لە خاچ دروشمەکان کرد. لەبەرئەوەی خاچ دروشمەکان ئەو برە پارەیان نەبوو ئەوە دۆقی فینیسیا داوای لێکردن هێرش بکەنە سەر شاری زارا( لەسەر کەناری دالماسیا) و تالآن کردنی بۆ دانەوەی پارە داواکراوەکە. ئەوەی لەوەش سەیرترە پاپا لەسەر هێش کردنە سەر ئەو شارە مەسیحیە

ڕازی بوو ئەوەی کە بەڵگەیە لەسەر هەڵوەشانەوەی پاڵنەری ئاینی لەبەردەم بەرژەوەندییە تایبەتیەکان.

ئەو خاچ دروشمانەی لە فەرەنساو ئیتالیاو ئەڵمانیا بەسەرکردایەتی پاپا کۆببوونەوە دەیانویست لەشکر کێشی چوارەم بەرەو میسر بچێ ، لەبەر ئەوەی میسر بووە سەنتەری هێزی ئیسلامی لەرۆژهەلات، ئەگەر دەستی بەسەردا بگرن ئەوە لەتوانایان دا دادەبێ دەست بەسەر قودس دا بگرن. هەرچی بازرگانە ڤینیسیەکان بوون ئەوە دەیانویست لەشکرکێشی چوارەمی خاچ دروشمانە ئاراستەی بیزەنتە بکرێ کە لە بازرگانی کردن لە نێوان رۆژهەلاتو رۆژئاوا کێ برکێی لەگەڵ دا دەکردن، هەروەها (ئەلکسیۆسی سێیەم ئەنجلیۆس) فشاری خستبووە سەر رەواندی ڤینیسی بازرگانی لە قوستەنتینیە ، لەکاتێکادا کە جیاوکەکانی بەسەر کێ بڕکێ کەرانیان لە بازرگانەکانی شاری بیزای ئیتالی دا باراندبوو ، بارودۆخەکە یارمەتی بازرگانەکانی ڤینیسیەی دا لە بەدیهێنانی ئارەزوویان لە هێرش کردنە سەر قوستەنتینەدا. ئەلکسیۆسی سێیەم تەختی لە ئیسحاقی برای زەوت کردبوو ئەویشی بەند کردبوو لە کاتێکدا کە کوڕی ئیسحاق( ئەویش ناوی ئەلکسیۆسە) بەرەو ئەوروپا رای کردبوو لە گەڕاندنەوەی تەختی باوکی یارمەتی بدەن، وئەلیکسیۆسی کوڕی ئیسحاق بەلێنی بەپاپا دابوو کە کەنیسەی بیزەنتیبخاتە ژێر دەسەلاتی پاپەویەت هەروەها بەڵێنی بەخاچ دروشمەکانیش دابوو کە بۆ گەڕاندنەوەی قودس یارمەتی دارایی و سەربازییان پێشکەش بکات، ئەمەش ئەگەر تەختی بیزەنتی بۆ خۆی یان کوڕەکەی بگێڕنەوە. بەمەش لەشکر کێشی چوارەمی خاچ دروشمانە لە ئامانجی

یەکەمی ( کە هێرش کردنە سەر میسرو دەست بەسەرداگرتنی بوو) لای داو بەئاراستەی قوستەنتینییە چوو.

لەساڵی ١٢٠٤ خاچ دروشمەکان پایتەختی بیزەنتیان گرت و هەندێ لە گەرەکەکانیان سوتاندو سامانە گرانبەهاکانیان تاڵان کرد، تەنانەت پەیکەرە برۆنزییەکانیشیان شکاند بۆ ئەوەی دراوی لێ دروست بکەن ئەمەو کەنیسەو دیرە بیزەنتیەکانیش لە دزین و تاڵان کردن بەدەستی ئەو خاچ دروشمە ئەوروپیانە بێ بەش نەبوون.

لەدوای داگیرکردنی قوستەنتینییە خاچ دروشمەکان لەسەر فراوانخوازییان لە خاکی بیزەنتی بەردەوام بوون تاکو دەستیان بەسەر زۆربەی داگرت. خاچ دروشمەکان تەختی بیزەنتیان بۆ ئیسحاق ئیمپرتۆری لە سەرکار لادراویان بۆ ئەلکسیۆسی کوڕی نەگێڕایەوە، هەروەها ئەوان بیریان لەوە نەکردەوە ڕووبکەنە میسریان قودس بەڵکو دەوڵەتێکی تایبەتیان بۆ خۆیان لە بیزەنتە دامەزراند ئەو دەوڵەتە خاچ دروشمانە نوێیە بە ( ئیمپراتۆریەتی لاتینی) ناونرا.

**لەشکر کێشییەکانی تری خاچ دروشمانە لەسەدەی سیانزدەدا:**

لەدوای هەلکوتانە سەری چوارەمی خاچ دروشمانە جۆشو خرۆشی دەروونی ئەو کەسانەی دەیانویست بەشداری لە هەڵکوتانە سەری سەربازی بۆ رۆژهەلات بکەن کپو کەم بووەوە. بۆیە پاپەویەت پەنای بردە بەر بەکارهێنانی شێوازێکی نوێ لە بانگەواز کرد بۆ بەشداری کردن لە لەشکرکێشییە خاچ دروشمانەکانی ترا. ئەوەبوو پاپەویەت پروپاگەندەیەکی باو پێدا کە دەیوت پیاوە گەورەکان سەرکەوتنی دیاریان لەشەرەکانی خاچ

دروشمەکان بەدی نەهێنا لەبەر ئەوەی ئەوان خاوەن خەتاو لەگوناهان نقووم بوونە. هەرچی گەنجە بچووکەکانن ئەوە دەتوانن پەیجووەکان بەدی بهێنن لەبەر ئەوەی گوناهو خەتایان نییە،پاپەوییەت بەستیڤانی گەنجی ( کەشوان بوو) وت ئەوە لە نێوان هاوتەمەنەکانی دا بڵاو بکاتەوە کە مەسیح سڵاوی خودای لەسەر بێ فەرمانی پێ کردووە بەشداری لەشەڕی خاچ دروشمەکان لەسەر رۆژهەلات دا بکات لەسەر ئەم بنەمایەش نزیکەی هەزار گەنج لەناوچە جۆربەجۆرەکانی ئەوروپاوە لەشاری مرسیلیا کۆ بوونەوە. لەمەرسیلیاش بازرگانەکانو خاوەن کەشتیەکان بەڵێنیان دا کە ئەو گەنجانە بەرەو فەلەستین بگوازنەوە. لەساڵی ١٢١٢ز بەرەو دەریایان بردن ئەوەبوو هەندێکیان نقووم بوون و ئەوانەی تر لە بازاڕی کۆیلە لە تونس و میسر فرۆشران.

لەشکر کێشی پێنجەم لە ئەوروپا پێك هات و لەساڵی ١٢١٧ز بەمەبەستی داگیر کردنی میسر یەکەمجارو ئینجا داگیرکردنی فەلەستین بەڕێکەوت لەوسەردەمە مێژوویەش شاعادلی ئەیوبی فەرمانرەوایی میسرو سوریای بەیەکەوە دەکرد، لەشکرکێشی پێنجەمی خاچ دروشمانە گەیشتە میسرو لەساڵی ١٢١٩ز دەستی بەسەر شاری دومیات داگرت، ئینجا لەوێوە بەرەو قاهیرە چوو بەڵام ئەوناکۆکییەی لەو کاتەدا لەنێوان خودی خاچ دروشمەکان بەرپا بوو سەرەڕای نەزانینی سەرکردەکانیان لە رووی کاروباری جەنگییەوە، هەموو ئەوانە بوونە مایەی سەرنەکەوتنی گەیشتنی لەشکرکێشیەکە بۆ قاهیرە. هەروەها لەساڵی ١٢٢١ ز خاچ دروشمەکان ناچار کران لەشاری دومیات بکشێنەوە.

لەشکر کێشی شەشەم لەئەڵمانیا پێك هات، لەساڵی ١٢٢٨ز بە سەرکردایەتی فردریك ی دووەمی ئیمپراتۆری ئەڵمانی ڕووی کردە ڕۆژهەلات. ئەم ئیمپراتۆرە لەگەڵ پاپاگریگۆری نۆیەم لە ململانێ دابوو لە کەنیسەی پاپەوی بی بەش کرا بوو، ئەمەش مانای ئەوەیە پاپا داوای ئەمی نەکردبوو حەزیشی لێ نەدەکرد. فردریکی دووەمی ئیمپراتۆر پشتی بە شێوازە دبلۆماسیو گفتوگۆ سیاسیەکان بەست پتر لەپشت بەستن بە چەك. قودس و بەیت لەحمو شریتێکی کەناری تەسکی لە فەلەستین بەدەست هێنا. (شاعادلی ئەیوبی) سوڵتانی میسر ڕێگای بە خاچ دروشمەکان دا ئەم شارو ناوچانە بگێڕنەوە ژێر دەسەلاتیان لەبەر ئەوەی لەگەڵ میری دیمەشق لە ململانێ دابوو، حەزی لەوە دەکرد کە هێزە خاچ دروشمەکان لەمپەرێك لەنێوان ئەوو میری دیمەشق پێك بهێنن. سەرەڕای ئەوەش فریدریکی دووەم بەڵێنی بەشادابوو کە لە ئایندەدا رێگا بگرێ لەخاچ دروشمەکان لەوەی هێرش بکەنە سەر میسر ، لەدوای گەڕانەوەی فریدریکی ئیمپراتۆر بۆ ئەڵمانیا ناکۆکی لەنێوان ئەو هێزانەی کە لە فەلەستین جێی هێشتبوون، بەرپا بوو ، ئەوەی کە لە ساڵی ١٢٤٤ز کاری شا سالحی ئەیوبی لە گەڕاندنەوەی قودسو دەرکردنی خاچ دروشمەکان لە فەلەستین ئاسان کرد.

لەساڵی ١٢٤٩ وبەسەرکردایەتی لویسی نۆیەمی شای فەرەنسا لەشکرکێشی حەفتەم لە فەرەنسا بەرێکەوت، و گەیشتە میسر بەلأم تووشی شکستی گەورە بووەوە، ئەوەبوو شالویسی نۆیەم بەدیل گیراو تەنیا دوای لەبری دانێکی گەورەدا ئازاد کرا هەروەها فەرەنسیەکان دوای ئەوەی زۆریان لێ کوژرا ، ئینجا گەرانەوە وڵاتەکەیان.

لویسی نۆیەمی شای فەرەنسی پەندی لەسەرنەکەوتنی لەشکرکێشی حەفتەمی خاچ دروشمانە بۆسەر میسر وەرنەگرت، بەڵکو لەساڵی ١٢٧٠ز سەرکردایەتی لەشکرکێشی هەشتەمی خاچ دروشمانەی بۆ سەر تونس کرد، بەڵام سوپای فەرەنسی تووشی نەخۆشی تاعوون بوو زۆربەیان بەخودی شاوە لەناو چوون ئەوانەی مابووشنەوە بەشکستەوە بۆ ولاتەکانیان گەڕانەوە.

لەدوای سەرنەکەوتنی لەشکرکێشی هەشتەمی خاچ دروشمانە پاپاکانی ڕۆما دەستیان پێکرد داوا لەشاو میرەکانی ئەوروپا بکەن کە بە هەڵکەوتنە سەری نوێی خاچ دروشمانە بۆ ڕۆژهەلات هەلبستن ،بەلام ئەم داواکارییانە سەرنەکەوت لەبەر ئەوەی ئەوروپییەکان گوێرایەڵی نەبوون، دواتر هیچ لەشکرکێشییەکی خاچ دروشمانە پێك هات، ئەوەو خاچ دروشمەکان لەرۆژهەلات یارمەتی سەربازییان لەئەوروپاوە پێنەدەگەیشت، میرنشینەکەیان بەرەو لاوازی هەلوەشانەوە چوو وئینجا بە تەواوی لەسەردەستی سوڵتانەکانی مەمالیك نەهێڵدران، لەساڵی ١٢٨٦ ز سولتان زاهیر بیبرس دەستی بەسەر میرنشینی تەرابلووس داگرت، لە کاتێك کە لە ساڵی ١٢٩١ز عەکا کەوتە ژێر دەستی سوڵتان ئەشرەف خەلیلی کوڕی قلاوون، ئەمە بەمانای نەمانی بوونی خاچ دروشمەکان بوو لە رۆژهەلات و تەنیا قوبرس بۆ خاچ دروشمەکان مایەوە.

**هۆیەکانی قەتیس بوونی بزووتنەوەی خاچ دروشمانەی ئیستعماری:**

لەشکر کێشی چوارەمی خاچ دروشمانە دوا هەلکوتانە سەری ئیستعماری گەورەبوو کەبۆ رۆژهەلات ناردران ژمارەیەکی زۆر لە جەماوەری هەژاری

ئەوروپی بەشدارییان لە هەر یەکە لە لەشکرکێشیە خاچ دروشمەکانی یەکەم و دووەمو سێیەمو چوارەمداکرد.

لەکاتێکدا کە تەنیا ژمارەیەکی کەم لە هەژارە ئەوروپیەکان بەشدارییان لەهەر یەکە لە لەشکرکێشییە خاچ دروشمییەکانی پێنجەمو شەشەمو حەوتەمو هەشتەم دا کرد. بەم شێوەیەش وای لێهات هەژارە ئەوروپیەکان بەپیل داواکارانی شەڕی ئیستعمارییەوە نەدەهاتن لەبەر ئەوەی بێجگە لە مردنی مسۆگەرانە هیچیان لەم شەڕانە دا نەدەبینی و لەلایەکی تریشەوە گەشەکردنێکی ئابوری‌لەئەورپا ڕویدا، ئەوەبوو ئامرازە کشتوکالیەکان و زەوییە بەیارەکان چاکتربون، ئەوەو گۆڕانێك بەسەر بارودۆخی جوتیاران داهات، هەندێکیان زەوییان لە دەرەبەگەکان کڕی‌و بوونە خاوەن موڵکی بچووك، هەندێکی تریش لە پابەند بونی ئابوری ڕزگار بوون‌و وایان لێهات زەوی لە دەرەبەگەکان بەکرێ بگرن‌و وەبەری بهێنن بەو مەرجەی کە وەك کرێکاری ساڵانە بڕێك پارەیان پێ بدەن، وکاتێك بارودۆخی ئابوری جوتیارەکان چاکتر بوو جۆش‌و خرۆشی شەڕکردنیان سست بوو و ڕازی نەبوون لەسەر بەشداری کردن لەوشەڕە شارەکانی ئەوروپی ئەوەی کەپاڵی بەزۆر لە جوتیارە هەژارەکان نا کەبۆ شارەکان کۆچ بکەن بۆ ئەوەی لە پیشەسازی دا کاربکەن‌و بژێوی ڕۆژانەی خۆیان بەدەست بهێنن.

هەروەها ڕژێمی سیاسیش لەئەوروپا گەشەی کرد، وای لێهات بیرۆکەی یەك ئیمپراتۆریەت‌و یەك کەنیسە ئەوروپا بە یەکتریەوە نەبەستێتەوە بەڵکو یەکێتی ڕۆژئاوای ئەوروپی تووشی پارچە پارچە بوونی سیاسی بوو دەوڵەتی نەتەوەیی جۆربەجۆرسەریان هەڵدا ، ئەوەو دەسەڵاتی شایانە لەناو هەموو

دەوڵەتێك بەهێز بوو، قەڵەمڕەوی گەورە دەرەبەگەکان لاواز ئەوانەی کەپێشتر کێ برکێیان دەکردد بۆ گەیشتن بەدەسەڵاتی شایانە. یان بەشداریان لەشەڕی ئستعماری دەکرد ئەمەش بەمەبەستی دامەزراندنی میرنشین یان شانشینی تایبەت بەخۆیان لەدەرەوەی سنوری وڵاتیان. و سوارە بچووکەکان بوونە سەربازی بەکرێ گیراو لەلای شایەکان، لەکاتێکدا کەشایەکان دەستیان بەوە کرد کە چالاکی ئیستعماری خۆیان لەچوار چێوەی خودی خاکە ئەورووپیەکان ئاراستە بکەن. لە دواییدا پاپەویەت وای بینی کە باشتر وایە کە ئەو جۆش‌و خرۆشە ئاینییەی لەلای هەندێ لە مەسیحییەکان ماوە لەپێك هێنانی لەشکرکێشیەکی خاچ دروشمانە بەکاربێنێ، ولە ئەو لەشکرکێشییە دژی ئەو گەلانە ئاراستەی بکات لەسەر کەنارەکانی دەریای بەلتیق دان‌و لە ڕووی باوەڕو ئاینزاشەوە لەئەوان جیاوازن.هەرچی بازرگانە ئەورووپیەکانن( وەکو بازرگانەکانی فینیسیاو جەنەوا هی تر) ڕێککەوتنی بازرگانیان لەگەل فەرمانڕەوا موسڵمانەکان بەستی کەبەدیهێنانی بەرژەوەندییە بازرگانییەکانیانی بۆ مسۆگەر دەکردن.

بۆیە لەدوای ئەمە پێویستیان بەناردنی لەشکرکێشی خاچ دروشمانانە دژی رۆژهەلات نەبوو.بەم شێوەیەش تێبینی ئەوە دەکەین کە هەموو ئەو چین‌و توێژانەی کەبە جۆش‌و خرۆشەوە بەشدارییان لە هەڵکوتانە سەرەکانی یەکەمەکانی خاچ دروشمانە کرد، ئەم جۆش‌و خرۆشەیان لە لا سست بوو، بەجۆرێك ئەو هۆکارو فاکتەرانەی پالیان پێوە دەنان بەشداری لە پرۆژە ئیستعمارییە مەترسیدارەکانی ئەودیوی دەریاکان بکەن،نەما.

بەلام هۆی سەرەکی قەتیس بوونی بزووتنەوەی خاچ دروشمانەو وەستانی شەپۆلە ئیستعمارییە ئەورووپییەکان لە ڕژانە سەر ڕۆژهەلاتی عەرەبی لەیەکیەتی نێوان میسرو سوریاو عێراق لەیەك بەرەدا دەمێنێتەوە، بەجۆرێك کەسوپاکانی ئەو بەرەیە وای لێهات کە بتوانێ لێدانی ڕێگاگر ئاراستەی ئیستعمارە ئەورووپییەکان بکەن و خاکی عەرەبی لەهێرشی ئیستعماری بپاریزێ.

**ئەنجامەکانی شەڕی خاچ دروشمەکان:**

ئەنجامەکانی شەڕی خاچ دروشمەکان سەبارەت بەئەورووپا گرنگییەکی گەورەی هەبوو، لەلایەنی شارستانی وای لە ئەورویەکان کرد کە ئاگاداری شارستانیەتی گەلانی ڕۆژهەلات( وەکو عەرەبو بیزەنتیەکان) بن‌و زۆر ڕوخساری شارستانیەتیان لێ وەربگرن، ئەروپیەکان هەندێ چاندراوی نوێیان ( وەکو برنج‌و کونجی‌و زەردەلوو و لیمۆ فستق) لە ڕۆژهەلاتەوە وەرگرت، هەروەها پیشەسازی شەکریشیان وەرگرت، وئەورووپیەکان سوودیان لە پێشکەوتنی پیشەسازی لە ڕۆژهەلات وەرگرت بۆ گەشەپێکردنی دورستکراوی چنین‌و کانزایی لە ئەورووپا.

وای لێهات زۆر لە چنراوە ئەورووپیەکان ناوێکی ڕۆژهەلاتی عەرەبی هەلبگرێ وەکو دامسکو بەگێڕانەوەی بۆ دیمەشق‌و موسلین بە گێڕانەوەی بۆموسل، ئەوەو هەندێ لە پیشەسازییەکان لە ئەورووپا لەسەر هاوردە کردنی ماددەی خاوی ڕۆژهەلات وەکو ئاوریشم لۆکە بۆیەکان‌و هیتر دامەزرابوون. هەروەها ئەورووپیەکان هەنێ ئامرازیشیان لەڕۆژهەلات وەرگرتبوو کە لە چەکدار کرنی سوپا بەکار دەهێنرێ وەکو گالیسکەی جەنگی‌و دروشمەکان

سیمبوڵەکان کە لەسەر قەلغانەکان دەنەخشێنران.

هەرچی لەلایەنی فیکریو رۆشنبیرییە ئەوە شەڕەکانی خاچ دروشمەکان بووە مایەی شارەزا بوونی ئەورووپیەکان بەزۆر لەزانستی عەرەبەکانو مەعریفەی یۆنانیو رۆژهەڵاتی کە عەرەب بۆ زمانی عەرەبیان وەرگێرابوو. و شەرەکانی خاچ دروشمەکان تاکە ئامرازی پەیوەندی کردنی شارستانیانەی نێوان ئەورووپاو رۆژهەلات نەبوو بەڵکو ئەورووپیەکان زۆر مەعریفەشیان لەو عەرەبانەی کە لە سقلیە و ئیسپانیا بوون وەرگرتبوو.

لەلایەنی کۆمەلایەتیش شەڕەکانی خاچ دروشمەکان یارمەتی دەربوون لەسەر گەشەکردنی پەیوەندیەکان لە نیوان چینە جۆربەجۆرەکان و بەشداری کرد لە خێراکردنی گۆرانکارییە کۆمەلایەتیەکان لەناو کۆمەلگای دەرەبەگایەتی لە ئەورووپا، ئەوەبوو هەندێ دەرەبەگە ئەورووپییەکان کە بەشداری شەرەکانی خاچ دروشمەکانیان کردبوو ناچار ببوون کە بەشێك لە زەوییەکانیا بفرۆشن. یان ئازادی بە ژمارەیەك لە جوتیارەکانیان بدەن ئەمەش بەرامبەر بەوەرگرتنی برێك پارە لە ئەوان بۆ ئەوەی تێچوونەکانیان لەکاتی لەشکر کێشیەکە پڕبکەنەوە ئەمەش لەلایەك بووە هۆی لاوازی چینی درەبەگایەتیو پتر بوونی ژمارەیمولکدارە بچووکەکانو جوتیارە ئازادەکان لەلایەکی ترەوە،لەئەنجامی رژانی سامانەکان لە رۆژهەلاتەوە بۆ سەر ئەورووپا، بازرگانیو پیشەسازی لە شارە ئەورووپیەکان گەشەیان کردو ژمارەی ئەندامانی چینی کرێکار پتر بوو، هەرەها چینێکی بۆرجوازی پێك هات کەوای لێهات پەیتا پەیتا دەست بەسەر جڵەوی کاروباری سیاسی دا بگرێ.

هەرچی لایەنی سیاسییە، شەڕەکانی خاچ دروشمەکان یارمەتی دەربوون لە پتر بوونی شکۆی شایەکانو بەهێزکردنی دەسەڵاتی شایانە لەئەورووپا، کەچینی دەرەبەگ ئەوەی بەگوێرەی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی یاری بە تەختی شایانە دەکرد لە ئەنجامی ئەم شەڕانە بێ هێز بوو، هەروەها لەکاتی شەڕەکانی خاچ دروشمەکان توندڕەوی نەتەوایەتیو ململانێ لە نێوان گەلە جۆربەجۆرەکان( وەکو فەرەنسیو ئینگلیز ئەڵمان) سەریان هەڵدا، وای لێهات بیرۆکەی یەك ئیمپراتۆریەتی ئەورووپی یەکگرتوو نەمێنێ، لە کاتێکدا کە دەوڵەتی نەتەوەیی خاوەن رژێمی شایانە دروست دەبوو. ولەلایەکی ترەوە شەڕەکان بوونە هۆی فراوان بوونی درزی نێوان رۆژئاوای ئەورووپی لاتینیو رۆژهەلاتی بیزەنتی یۆنانی.

ئەگەرئەنجامەکانی شەڕەکانی خاچ دروشمەکان ئەرێی بیو سوود بەخش بێ بۆ ئەورووپا ئەوا ئەوشەڕانە بێجگە بە وێرانیو کاولکاری هیچ شتێکی تریان بۆ وڵاتانی رۆژهەڵات نەهێنا،ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی نەیتوانی ئەو برینانەی چارەسەر بکات کە خاچ دروشمەکان لە لەشکرکێشی چوارەمیان ببوونە هۆی لە ئیمپڕاتۆریەتی لاتینیان لە قوستەنتینەو مولکەکانی تریان، و ئیستعمار کە خاچ دروشمەکان بێجگە لە یادەوەری خراپ لە کردەوە وەحشیگەرە تاوانبارییەکانیان هیچ شتێکی تریان لەدوای خۆیان لە وڵاتە عەرەبییەکان بەجێ نەهێشت، تاکو وای لێهات ناوی فەرەنجە لە هەموو لایەکی رۆژهەڵاتی عەرەبی مایەی رقو قێز لێبوونەوە بێت.

سەرچاوە

مەحمود شاکر، موسوعة الحضارات القديمة والحديثة وتاريخ الامم، الجزء الثاني، دار اسامة للنشر والتوزيع، عمان ،٢٠٠٢.

وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە بۆ کوردی:

د. محمد عبدالله کاکە سور .

پێداچوونەوەی

د. نیشتمان بشیر محمد.

# دەربارەی دۆزی کورد

## یاسای دوورخستنەوەو پارچە پارچەکردنی کورد

میر جەلادەت بەدرخان
و: جەمال گردەسۆری

ئاژانس و ئێستگەکان بەشێوەیەکی دەوری هەواڵمان پێدەدەن، کەوا تورك و فارس و ئێراقیەکان لەسەر سنووری هاوبەشیان، راوەدووی چەند کۆمەڵە کەسانێك دەنێن و، دادگای سەربەخۆیی " ئیستیقلال" ی تورکیاش بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ دەیان کوردی یاخیبوو دەرکردووەو...تد. کەواتە دۆزی کورد هەیە، ئەم دۆزە چییە؟ بنەڕەتەکەی چییە؟ ئەو ئامانجانە چین کە سەرکردەکانی کورد هەوڵی بۆ دەدەن؟ (رۆژنامەی ئەلشەرق،١ ی ئەیلوولی ١٩٣٤).

گومانی تێدا نییە کە دۆزی کورد بوونی هەیەو، هەتا لە هەسارەکەمان کورد چەوساوە بن ئەم دۆزە هەر دەشمێنێت. هەرگیز دۆزی کورد شتێکی نوێ نییە، ئەم دۆزە هی دوێنێ یان چەند ساڵێك لەمەوبەر نییە، بەڵکو چەندین سەدەیە هەر هەبووە، بەلاَم بەبێ چارەسەری ماوەتەوە، تاکو ئێستاش ئەم دۆزە لە ناو مێژوودا نەناسراوە، تەنها لە لای چەند کەسانێك نەبێ کە شارەزاییەکی فراوانیان هەیە، یان لای پسپۆرانی کاروباری رۆژهەلاَت و لای ئەو رێبوارانەش کە بە ولاَتمان تێپەڕیون. بەهۆی پێگەی جوگرافی کوردستان، لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی نەتوانراوە ئەم دۆزە بخرێتە

بەرباس وەك كێشەیەكی نێودەوڵەتی. ئەم جەنگە كە بووە هۆی پارچە پارچەكردنی سوڵتاننشینی عوسمانیەكان و، لەئەنجامدا دەرفەتێكی باشی رەخساند بۆ ئەو گەلانەی كە لەژێر چنگی عوسمانیەكان بوون و،زۆر لەو گەلانە توانیان سوود لەو دەرفەتە وەربگرن و دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان دابمەزرێنن. لەبەر ئەوەی ئامانجی ئەم وتارە بڵاوكردنەوەو شیكردنەوەی یاسای دوورخستنەوەیە، كە لە 5 ی ئاياری ساڵی 1932 دەرچووە،حكومەتی توركیاش دەیەوێت بەزووترین كات پیادەو جێبەجێی بكات، لەبەر ئەوە هەر دەبێ ئەگەر بەكورتیش بێ ، دەربارەی پێشكەوتنی مێژوویی دۆزی كورد بدوێین. لەلایەكی دیكەوەش ، هەر لەسەرەتای ئاگربەستەوە رێكخراوە هەمەجۆرەكان و كەسایەتییەكانی كورد هەوڵیان داوە كەوا دۆزی نیشتیمانیی كورد و داواكارییەكانی گەلی كورد بەجیهان بناسێنن، ئەمەش لەرێگەی چاپكردنی كتێب و نووسینی وتار لەرۆژنامەكاندا بەزمانە هەمەجۆرەكان. جا ئێمە نیازمان وایە پێش ئەوەی بچینە سەر بابەتە بنەڕەتییەكە، تەنها چەند وتەیەك بڵێین دەربارەی سەرچاوەو بنەچەی دۆزی كورد. وڵاتی كوردان "كوردستان" هەتا جەنگی یەكەمی جیهانیش بەشێوەیەكی بنەڕەتی دابەشكرابوو لەنێوان توركیاو ئێراندا، بەڵام دەستەواژەی " كوردستانی باشوور " و " كوردستانی رۆژئاوا " لەدوای جەنگ بەكارهێنران. ئەوەش لەرێگەی جیابوونەوەی ئەو وڵاتانە بوو لەدەوڵەتی عوسمانییەوە. كوردی قەوقازیش بەر لەجەنگی یەكەمی جیهانی لەژێر دەسەڵاتی رووسەكاندا بوون. لەئەنجامدا دەتوانرێ لێكۆڵینەوە لەسەر رابردووی دۆزی كورد بكەین لە هەموو بەشەكانی كوردستانی توركیاو ئێراندا.

هەر وەکو هەموومان دەزانین کەوا ئێران هەتا ئەو چەند ساڵەی دواییش خەواڵوو ببوو لەنێو متبوون و بێ دەسەڵاتیداو، ڕێگاو هێزو شێوازی وەهای نەبوو بتوانێ دەسەلاتی خۆی بەسەر کورددا بسەپێنێ و بەرەنگاری شۆڕشی سەرکردەکانیان ببێتەوە. ئەردەلان دوا میرنشینی کوردستان بوو لە ئێران، کەوا چەندین جار هەڕەشەی لە تەخت و تاراجی شایەکانی تاران دەکرد، گەر بەفێڵ نەبووایە ستەمکارانی فارس نەیاندەتوانی بەسەریا زاڵبن، بۆ گەیشتن بەم ئامانجەش شایەکانی ئێران هاوپەیمانیان لەگەڵ سەرکردەکانی کوردی ئەردەلان کرد. شاژنەکانی کۆشکی تاران، دایکانی سەرکردەکانی ئەردەلان بەدڵسۆزی و سەرکەوتنی چاکەوە فەرمانەکانی بابەی ئیمپراتۆریان جێبەجێ دەکرد لە کۆشکی سیناندز. هەتا بەگەیشتنی ئەو شاژنانە بۆ کۆشکی سەرکردەکانی ئەردەلان، "ئەفیون" وەکو خواردنەوەکانی دیکە لە وڵاتی فارس زۆر رەواجی هەبوو، بەلام لای سەرکردەکانی کورد تا ئەوکاتە بەکارنەهاتبوو، یاخود شارەزاییان لێ نەبوو. ئەو بە ژن تێکەڵبوونە کاری کردە سەر لایەنی بیروباوەڕی ئەو سەرکردانەش، هەرچەندە توندڕەوی مەزهەبی لەوسەردەمەدا هەبوو، بەپێچەوانەی پابەندبوونی کورد کە زۆرینەیان سوننەن، بەلام ئەوان مەزهەبی شیعەیان هەڵبژارد. ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کەوا زۆر لە هەیبەتی خۆیان لەدەست بدەن و توانای کارتێکردن لەسەر بیروبۆچوونەکانیان بەڕوون و ئاشکرایی نەمێنێت. لە وڵاتی فارسی ئێستاشدا، بەتایبەتیش لەوەتەی شای پەهلەوی دەسەلاتی گرتۆتەدەست، جگە لەلاسایی کردنەوەی تورکیای مستەفا کەمال هیچی دیکەی نەکردووە، هەموو سەرکردەکانی کوردی کوردستانی ئێران دوورخرانەوەو، بە بەردەوامی

لەپایتەختی وڵاتی فارسدا دەستبەسەر کران.هەروەك لە هەموو بۆنەو بوارێکدا هەوڵدەدەن دانیشتووانی کورد چەك بکەن و رێگەش دەگرن لەهەموو رێکخراوێکی کوردی ئینجا چ کۆمەڵایەتی بێ یاخود ئابووری یان ئەدەبی کە هەڵبستێ بە نواندنی چالاکییەکانیان. هەروەها هەناردنی کاسێت بە زمانی کوردی بۆ خاکی ئێران قەدەغە دەکەن، بەهەمان شێوەش لەتورکیادا بۆ ئەوەی کەس ناوی کورد نەهێنێ پێیان دەڵێن "تورکی چیا" لە وڵاتی فارسیشدا هەمان ناتۆرە لە کورد دەنێن و پێیان دەڵێن "فارسە چیاییەکان". ئێران کەوا وەکو تورکیا هێشتا کاروباری رێکنەخراوەو، پشتی بەسوپا نوێیەکەی نەدەبەست و نەشدەوێرا بەکاری دوورخستنەوەی بەکۆمەڵ و ئازارو ئەشکەنجەدان هەڵبستێ، لەلایەك بەهۆی هەبوونی بەرەنگاریبوونەوەی کوردو، لەلایەکی دیکەش لەبەر ئەو یاسای دوورخستنەوەیەی "کەوا ئێمە مەبەستمانە" لە تورکیا دەرچووە بێ ئەوەی باسی بابەتەکانی بکرێت. دەبا راستەوخۆ باسی کێشەی کورد بکەین وەك خۆی کە لە کوردستاندا هەیە، بەدرێژایی چەندین سەدە لەژێر دەسەڵات و چەپۆکی تورکیادا. هەر لەسەرەتای سەدەی شانزەهەمەوە سەرکردەکانی کورد بە ئاشتی و بەبێ شەڕ بۆ بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی رێککەوتنێکی دوو لایەنەیان لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئورك مۆر کرد. لەساڵی ١٥١٤ ز لەکاتی شەڕی نێوان سوڵتانی عوسمانی (سەلیمی یەکەم) و شای ئێران، بەڵام بەهۆی بارودۆخەوە کورد ناچارکران هەڵوێست وەربگرن بۆ هەڵبژاردنی یەکێك لە دوو ئیمبراتۆرییەکە" عوسمانی یان فارسی". هەرچەندە هەردوولایان (کوردو فارس) دەچنەوە سەر خێزانی گەورەی ئاری و سەر بەیەك رەگەزن، بەڵام کوردو فارس ناتوانن

ڕێکبکەون، چونکە کورد سەر بە مەزهەبی سوننەن بەڵام فارسەکان شیعەن. لەو سەردەمدا هەستی ئایینیش لای هەموو گەلان بەرزتر بوو لە هەموو هەستەکانی دیکە، لە ئەنجامدا سەرکردەکانی کورد بڕیاریاندا بچنە پاڵ سوڵتانی عوسمانی "سەلیمی یەکەم" ی گەورەی موسلمانانی تایەفەی سوننی، لەبەرئەوەی شای ئێران گەورەی موسلمانانی شیعە بوو. هەر لەو کاتەوە دۆزی کورد لە تۆمارگاکانی ئیمبراتۆریەتی عوسمانی بەدەرکەوت. بەگوێرەی ئەو سەردەم و جۆری چەمکەکانی تایبەتی خۆی سەیر دەکەین تیایدا گەلێ جیاوازی لە شێوەو ناوەڕۆکدا هەیە. جاری وا هەیە ئەم سەردەمە وەکو دیاردەیەکی دەرەبەگایەتی نموونەیی خۆی نیشان دەدا، جاری واش هەیە لەشێوەی ململانێی تایفەگەری، ئەمەش لە هەموو سەردەمە جۆراوجۆرەکانی خەلافەتی عوسمانیدا هەروابوو. بەڵام مەسەلەی مەزهەبی حەنەفی و مەزهەبی شافیعی مەودایەکی وای بۆ نەبوو کە ببێتە هۆی سەرهەڵدانی هەرایەکی گەورە. لەو سەردەمدا مەزهەبی حەنەفی لەوڵاتی تورکان کاری پێدەکرا، بەڵام لە ئەنادۆڵ تەنها کورد سەر بە مەزهەبی شافیعی بوون. هەروەها دەبینین ئەو کات سەردەمی شۆڕش کردن بوو دژی دەسەڵاتی تورك لەلایەن تیرەو هۆزە کوردییەکانەوە، کە خەریك بوو وردە وردە کورد ئازادی خۆیان بەدەست دەهێنایەوە. هەروەها سەرهەڵدانی بیری سەربەخۆیی ئایینی کە لەلایان هێندەی ژیان بەنرخ بوو. سیمای دۆزی کورد لە ئەمڕۆدا سیمایەکی تەواو نیشتیمانییە، ئەمەش شێوەیەکە لەشێوەکانی هیواو ئاوات کە لەو سەردەمەماندا ڕەنگی داوەتەوەو پێوەی دیارە، ئەم شێوەیە شتێکی نوێ نییە لای کورد. لە ئەدەبی کوردیدا کە لەسەدەی

حەڤدەهەمەوە دەست پێدەکات، شاعیری بەناوبانگی کورد ئەحمەدی خانی کە لەساڵی ١٠٦١ ك لەدایك بووە، پێشەنگی راستەقینەی میللەتی کوردە، ئەو شاعیرەی ئەفسانەی نەتەوەیی کوردی مەم و زینی ناساندو، بێجگە لە کوردو کوردستان لە شتێکی دیکە نادوێ، کەسایەتیەکانی بریتیە لەچەند هێمایەك، ئەو کەسەی کەوا گیراوێکە بەهێمای کوردستانی داناوە، بۆ هاوڕێ و نزیکەکانی ئەو رێگاو هەولآنە روون دەکاتەوە لەپێناو رزگارکردنیدا. لێرەدا بۆ زاخاوی مێشك دەگەرێینەوە بۆ دانراوێکی نێودەوڵەتی " فەرهەنگی رامیاری- بەشی یەکەم- لاپەڕە ١٢٠١-١٢٠٤ " لەوێدا وتارێك نووسراوە لەلایەن رۆژهەلآتناسی ناودار "باسیل نیکتین" کەوا بەچەند دێرێك دەمەکانی پێشکەوتنی کوردمان بۆ روون دەکاتەوە (هەرچۆنێکی بێ نابێ گومانمان لەوە هەبێ کە هەر لە ئێستاوە و لە داهاتووشدا، لەوەی کەوا کورد بوونی هەیەو، لەبواری نێودەوڵەتیشدا بوونێکی تایبەتی خۆی هەیە). پێش ئەوەی بچینە ناو کرۆکی بابەتەکەمان، با بەچەند وشەیەکی کەم لەسەردەمە سەرەکییەکانی پێشکەوتنی کورد پوخت بکەینەوە، ئەو دەمانەش بە تەواوەتی نادیارن، هەتا لە تۆمارگاکانی کۆنسوڵیەکاندا مرۆڤ هەر ئەوەی پێدەکرێت کەوا بگەڕێت بەناو ئەو تۆمارانەی کەوا هی ئەو سەردەمەن کە هەڵوێستی کورد تەنیا لە ئەنجامی سروشتی بزووتنەوە گەورەکانی ئەرمەن و کۆمکاری ئیسلامی بوو. دەتوانین سێ کاتی سەرەکی بۆ مێژووی نوێی کورد دابنێین:

١-کاتی ناڕازیبوونی دەرەبەگی کورد: بێزاربوونی بەردەوامی دەرەبەگ لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانی، باری شوێنکەوتەیی سەپێنراو بۆ

سەرکردایەتی(سەلیم) ی یەکەم.

٢-لەساڵی(١٨٤٧) دا بەنەمانی دوا میرنشینی دەرەبەگی کوردی لە بۆتاندا، نەهێشتنی یەکجارەکی بوو بۆ ئەم هاوسەنگیە سیاسییەی کە هەتا ئەو کاتە پارێزراوبوو. زنجیرەیەك شۆڕشی خوێناوی دژی رژێم و دەرەبەگی کورد دەستپێکرد، کەدەبووە رێگرێك بۆ هەموو هەوڵەکانی دەسەڵاتدارانی عوسمانی لەتێکشکاندنی هەبوونیاندا. کۆمکاری (عەبدولحەمید) ی ئیسلامی و چاکسازیە ئایینیەکانی لاوانی تورك، هیچ شتێکی گرنگی لە کێشەی کورد نەگۆڕی.

٣-جەنگی یەکەمی جیهانی(رێککەوتنی فەرەنسا-رووسیا) ساڵی(١٩١٦)، کەچەند گۆڕانکارییەکی هەرێمی و دادوەری بەدواداهات لەچەند بەشێکی کوردستاندا. بە هاتنی دەستەیەکی چالاك بۆ مەبەستێکی نوێ لە ناخی کۆمەڵە کوردیەکاندا سەریهەڵدا. رەنگ و سیمای ئێستای جوڵانەوەی کوردی جێگیر و پتەوکردو، خستیەسەر ئەو نەخشەیەی کە هیواو ئاواتەکان پێکدەچن، ئەوەی کە فێربووین و زانیومانە لە مێژووی رزگاریخوازی گەلاندا لەوەتەی هەڵگیرسانی شۆڕشی گەورەی فەرەنسا، کات و دەمی سێهەم بەئاشکرا سەریهەڵنەدا. تەنیا لە جاری دووەمی دروستبوونی دەوڵەتی عوسمانی نەبێ، ئەویش لەنێوان دەسەڵاتداریەتی سوڵتان(عەبدولحەمید)ی دووەمدا لە ساڵی(١٩٠٨). لەوسەردەمەدا رێکخستنی کۆمەڵە کوردییەکان لە(قوستەنتینیە) دەستپێکرد، هەروەها لەناو جەرگەی کوردستانیشدا. بەڵام لە سەردەمی دروستبوونی دەوڵەتی عوسمانیدا زۆر بەکەمی ئازادیی رێکخستنی کۆمەڵەکان بەردەوام دەبوو. (الوحدویون) یەکبوونخوازەکان

ئەوانەی کە لەشاخەکانی(رومیلیە) دەژیان وایان دادەنا کەوا ئیمامەکان سەر و ملی کاهینەکانی بولگاری و یۆنانی ماچ بکەن. هێندەی پێنەچوو دەمامکیان لەسەررووی خۆیان لادا و مەبەستەکانی خۆیان ئاشکرا کرد. هێرشیان کردە سەر هەر شتێ ئەگەر تورکی نەبێ، بەهۆی دەمارگیری شۆڤینی نەتەوەییانەوە، بەئاگر و بە ئاسن هەر رێکخراوەیەك تورکی نەبووایە لەناویان دەبرد. ئەم بارودۆخە تا ئاگربەستی ساڵی(١٩١٨) بەردەوام بوو بەهۆی ئەم ئاگربەستەوە سەردەمێکی ئاشتییانەی نوێ بۆ نەتەوە بچووك و چەوساوەکان دەستی پێکرد، هەرئەمەش بوو کە پیاوانی خێرخواز و رێبازپاك بیریان لێ دەکردەوە. هێز و سوپای هاوپەیمانان کە لە پێناوی ئاشتی و خۆشیی مرۆڤایەتی و لە پێناو رزگارکردنی نەتەوە بچووك و چەوساوەکان تێدەکۆشا، بەتەواوەتی سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو، بەڕادەیەك هیچ پەیمانێکی ئیمزا نەکرد، بەڵکو ویستی چەند گرێبەستێکی پابەندبوون بەسەر لایەنی دۆڕاودا بسەپێنێ. لەلایەکی دیکەوە ئەم شەڕە بێ ئامانە کەوا چوار ساڵی خایاند، زیانێکی وای بە مرۆڤایەتی گەیاند کە کاریگەریەکی زۆر خراپی لەسەر هەبوو،جا کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبە الامم) دامەزرێنرا،کە پێکهاتبوو لەلایەن نوێنەرانی وڵاتە پێشکەوتووەکان، بەمەبەستی پاراستن و دابینکردنی ئاشتی و سوودی مرۆڤایەتی. دامەزراندنی ئەم رێکخراوە "کۆمەڵەی نەتەوەکان" بەهەستێکی مرۆڤایەتی گەورەوە بوو، بەشێوەیەکی تایبەتی چارەنووسیان دیارنەبوو، هەروەها لەژێر چەوسانەوەو ئازاردانی نەتەوەکانی دیکە دەیان ناڵاند. لەڕاستیدا کاتێ شەڕ کۆتایی پێهات، وڵاتە سەرکەوتووەکان لەڕێگەی بڵاوکراوەی فەرمی پێیان لەسەر

ئەوە داگرت کە ماوە نەدەن هیچ گەلێك لەژێر دەسەلاتی گەلێکی دیکە بچەوسێتەوە. هەموو گەلان لە ئێستا بەدواوە چارەنووسیان لەدەست خۆیانەو مافی چارەی خۆنووسینیان هەیە. بەلام لەم دواییەدا ئەم روونکردنەوانە پیادەکران، بەلام نە لەپێناوی جێبەجێکردنی ئەو مەبدەئانەی کە پێشتر باسیان لێوە کرابوو، بەلکو تەنها بۆ دابینکردنی دەستکەوتەکانی جەنگ بوو بۆ ولاتە سەرکەوتووەکان، کەچاویان لەو دەستکەوتانە بڕیبوو تا وەك کرێیەك وەریبگرن بەرامبەر ئەو ماندووبوون و هەولانەی‌یکە داویانە لە ماوەی چوار سالی شەڕدا. هەروەها بڕیار نەدەدرا لەسەر چارەنووسی گەلانی ژێردەست، تەنها بەگوێرەی بەرژەوەندی رامیاری ولاتە سەرکەوتووەکە دەبوو. بەرژەوەندی ولاتە هاوپەیمانەکان لەسەرەتای ئاگربەستەکەدا وای لێکردن گرنگی بەدۆزی کورد بدەن و خۆیان بەدۆزی کورد خەریك بکەن. هەروەکو دەرکەوت و هەموومان دەزانین لەپەیمانی سیڤەر چارەسەری دۆزی کورد و کوردستان کرا، بەلام ئەو پەیمانە هەر جێبەجێ نەکرا!! ، لەم دوا دواییەشدا بەتایبەتی لەسەرەتای نزیکبوونەوەی رووسیا–تورکیا، کەوا کارێکی زۆری لەسیاسەتی ولاتە هاوپەیمانەکان کرد کە لە ولاتانی رۆژهەلاتدا پەیڕەویان دەکرد. لەئەنجامی ئەوەشدا بەشێوەیەکی بەرفراوان ئەو سیاسەتە گۆڕانکاری بەسەردا هات. هاوپەیمانەکان دۆزی کوردیان فەرامۆش کردو، وازیان لەکوردو هیوا نەتەوەییەکانیان هێنا. کوردیش کەوتە ژێر چەپۆکی حکومەتی ئەنقەرە، ئەو حکومەتەش تەنها کاری ئەوە بوو بەشێوەیەکی سەربازیانە کورد دابڕ دابڕ بکات، بەجۆرێك دەیویست کورد وەك تورك نیشان بدات و ناوی کورد بەهیچ جۆرێك نەهێلێت. لەڕاستیدا ولاتی تورکیا بۆ

ماوەیەکی درێژبوو بەتایبەتی دوای رژێمی دەستووری، کە لاوە تورکەکان لەساڵی ١٩٠٨ پێکیان هێنابوو، بەرنامەیەکی سەرکوتکەرانەی رێکوپێکیان دژی کورد گرتبووەبەر و هیچ جۆرە مافێکیان بەکورد رەوا نەدەبینی، هەتا لەداگیرکردن و دەربەدەرکردنیشیدا حکومەتی ئەنقەرە تا ئەو کاتە وای دادەنا کە ئەو رێیەی گرتوویەتیە بەر بۆ ئەو ئامانجەی هێشتا تەواو نییەو کەموکوڕی تیایە، بۆیە بڕیاریدا خۆی ئامادە بکات بە یەك لێدان بۆ تێکشکاندنی گەلی کورد، هەر بەو یاسایەی کەوا ئێمە لەبارەوەی دەدوێین و ماوەی دوو ساڵە "کەهێندەی نەماوە کۆمەڵەی نەتەوەکانیش دانی پیابنێن" ئامادەکرابوو و بلاّویش کرابۆوە، هەوڵیش دەدرا ئەم یاسایە پیادە بکرێت، بۆ ئەوەی بتوانێ بەرەنگاری "ئەنجوومەنی بالاّ" بکات، کە ئەرکی پاراستن و بەرگریکردن بوو لە بەرژەوەندییەکانی کەمە نەتەوەکان بەشێوەیەکی گشتی، هەروەها چاودێریکردنی مافی کەمایەتییەکان لەگەڵ هاوبەشەکانیدا. هەروەکو پێشتر زانیمان ساتی وەرگرتنی تورکیا لە کۆمەڵەی نەتەوەکاندا، هیچ ئەندامێك لە ئەنجوومەنی بالاّدا کاتێکی وای بۆ نەڕەخسا کەوا پابەند بێت بە مافی کەمایەتییەکان لە تورکیادا. بەرژەوەندی وڵاتە گەورەکانیش لەوەدا بوو کە بە هیچ شێوەیەك کۆماری تورکیا هەراسان نەکرێت. یەکبوونخوازەکان "الوحدویون" پێش جەنگی گەورە یاسایەکیان ئامادە کردبوو کە لە دەیان بەند پێکهاتبوو، لە لایەن خەلیفە سوڵتان محەمەد رەشادی پێنجەم واژوو کرابوو بەمەبەستی دوورخستنەوەی کورد لەخاك و زێدی باب و باپیرانیان. لەدوای شەڕی باسکراودا، دوای هاتنی کاتی لەناوبردنی هەموو گەلی ئەرمەن، حکومەتی ئیتیحاد و تەرەقی هەڵسا بە جێبەجێکردنی ئەم یاسایەی کە

باسمان کرد، بەگوێرەی ئەو یاسایەش کورد لەماڵەکانیان دەربەدەرکران و بەرەو هەرێمە تورک نشینەکان راپێچکران. دەبوایە دابەش کردنەکەش لە لادێ تورک نشینەکان بەرێژەی سەدا پێنجی ژمارەی تورکەکان زیاتر نەبێت، سەرۆك و پیاو ماقووڵەکانیش لە شارەکان نیشتەجێ بکرێن و بەهیچ شێوەیەك پەیوەندیان بە کوردی دیکەوە نەمێنێت. تۆمارەکانی بەڕێوەبەرایەتی کۆچکردن لە قوستەنتینیە ئەوە نیشان دەدەن کەوا ٧٠٠٠٠٠ کورد لە زێدی باب و باپیرانیان دوور خراونەتەوە، بەڵام حکومەتی تورکیا لە کۆتایی جەنگی جیهانیدا تاکو کۆتایی هاتنی پەیمانی لۆزان هەستی بەوە کرد کە لە مەترسی دایە، نەوەك بوونی نەتەوەیی خۆی لەدەست بدات، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی لەسەر ئەو کارە بەردەوام نەبێت کە ماوەیەك بوو دەستی پێکردبوو. هەرچۆنێك بێت خەڵکانێکی یەکجار زۆری دوورخراوە بەرگری ئەم دوورخستنەوەیان نەکرد، چونکە ئەوان هۆکاری راستەقینەی ئەم دوورخستنەوەیەیان نەدەزانی. بەڵکو ئەوان وایان لێکدەدایەوە کە ئەمە کارێکی ناچارییەو بەهۆی بارودۆخی جەنگەوەیە. لەئەنجامیشدا هەندێکیان بەهۆی نەهامەتی و برسیەتی هەر لە رێگادا مردن، هەندێکیشیان بەدەست جەندرمەکانی تورك کوژران، لەدوای جەنگیش ژمارەیەکی کەمی کورد توانیان بگەڕێنەوە وڵاتی رەسەنی خۆیان کە کوردستانە. لەکاتی ئاگربەست کورد لەبەردەم کۆنگرە نێودەوڵەتییەکانی ئاشتی بەمەبەستی بەدەستهێنانی مافەکانیان هەروەکو گەلانی دیکە بەچەند چالاکییەکی پێویست هەڵسان. هەموو کاروکردەوەکانیان خرابووە ئەستۆی رۆشنبیرەکان، کەوا بەم ئەرکە قورسە هەڵسابوون، حکومەتی تورکیاش فەرمانی لەسێدارەدانی بۆ دەرکردن

بەتۆمەتی خیانەتی گەورەو، ژمارەیەکی زۆریشی لێ لەسێدارەدان و ئەوانی دیکەش توانیان بۆ ولاَتانی بیانی رابکەن. ئەوانیش تۆمەتبارکران بەخیانەتکردن بۆ ئەورووپا. کە دەلێین خیانەتکردن بۆ ئەورووپا، هەرگیز نامانەوێت بلێین کەوا رۆشنبیرەکانی کورد کە لەلایەن ولاَتانی هاوپەیمانانەوە بانگ کرابوون بەزۆرەملێ، یاخود کە پێیان گوترابێ داوای مافی خۆیان بکەن و ، هەرکارێکیش پێویست بێ لەپێناوی ئاشکراکردنیدا دەبێ بیکەن، لەلایەکی دیکەوە هەروەکو لەسەرەتادا گوتمان، بیری نەتەوەیی لەمێژەوە دەستی پێکردووە. رێکخراوە کوردییەکانیش لەساڵی ۱۹۰۸ ەوە سەریانهەڵدا، خیانەتی ئەورووپا لە ولاَتانی گەورەی ئەورووپادا رەنگی دایەوە، پاش ئەوەی پەیمانی بە کورد دا کە لەدواجاردا مافەکانیان بەدیاربخات، بەلاَم ئەوانیان خستەوە ژێر چەپۆکی جەلادەکانیان، هەروەکو چۆن ئەم کارەیان لەگەڵ گەلێ نەتەوەی بچووکی دیکە کردبوو. لەساڵی ۱۹۲۵دا کاتێك کوردی تورکیا خەریکی بەدەستهێنانی ئەو مافانەیان بوون کە ئاشکرابوون لەلایەن ولاَتە پێشکەوتووەکانەوە، ئەو هەوڵدانەش لەلایەن ئەوانەوە خەڵتانی خوێن بوو، لەنێوان شۆڕشگێڕاندا هەزاران ئافرەت و منداڵ بێ بەزەییانە سەربڕان، ئەورووپای پێشکەوتووش هیچ گرنگییەکی نەدەدا بەم رەشەکوژیانە، هەتا هاوپەیمانەکان خۆیان بێلایەن گرت دەربارەی تورکیاو، رێیان بە سوپای تورکیاو کەلوپەل و ئازووقە دەدا کە بە ناوچەکانی ژێر دەسەلاَتیاندا تێبپەڕن، ئەمەشیان بۆ ئەوە بوو تا تورکیا بەخێرایی بەو شوێنانە بگات کە شۆڕشی لێ هەڵگیرسابوو بە مەبەستی دامرکاندنەوەی پێش ئەوەی تەشەنە بکات و بلاَو ببێتەوە بەناوچەکانی دیکە. دەبێ ئەوەش بلێین کە سەرکردە

شۆڕشگێڕەکانی کورد زۆر سوودیان لە دواکەوتنی سوپای تورکیا وەردەگرت لە پەڕینەوەیاندا لە زێی فورات و گەیشتنیان بە ناوچەکانی کوردستان. بەڵام ئەو کردەوەیەی کە ئەو سوپایانە پێی هەڵدەستان سەرکەوتنیان لەوە بەدەست هێنا کەبە هێڵی ئاسنینی سوریادا تێپەڕبوون، ئەمەش توخمێکی بنەڕەتی بوو لە توخمەکانی سەرنەکەوتنی شۆڕش. با بگەڕێینەوە سەر بابەتی بنەڕەتیمان، بۆ لای یاسای دوورخستنەوە، کە هەروەکو خۆی لە خوارەوە پیشانی دەدەین و دەیگوازینەوە بۆتان:

بەگوێرەی ئەو یاسایە، وەزیری ناوەخۆ رادەسپێردرێت بۆ بەراوردکردنی چڕی دانیشتووان کەوا سەر بە رۆشنبیری و کەلتووری تورکن لە تورکیادا، ئەمەش بە گوێرەی حوکمەکانی ئەم یاسایەو بەپێی بەرنامەی بڕیاردراو لە ئەنجوومەنی وەزیراندا. بەگوێرەی ئەو نەخشەیەی کە وەزیری ناوەخۆ دایڕشتبوو، لەلایەن وەزیرەکانیشەوە پەسندکرابوو، ئەوەبوو کە تورکیا دابەش بکرێ بۆ چوار هەرێمی نیشتەجێکردن:

هەرێمی ژمارە ١ : بریتیە لەو هەرێمەی کەوا دەیانەوێت چڕی دانیشتووانی تیادا پتر بکەن لەوانەی کە خاوەن کەلتووری تورکین.

هەرێمی ژمارە ٢ : بریتیە لەو هەرێمەی کەوا دەیانەوێت ئەو کەسانە تیایدا نیشتەجێ بکرێن، کە پێویستە لەسەریان کەلتوورو رۆشنبیری تورکی هەڵبگرن.

هەرێمی ژمارە ٣ : بریتیە لەو شوێنانەی کەوا کۆچ کردووەکانی خاوەن کەلتووری تورکی دەتوانن بەئازادیەوە تیایدا نیشتەجێ بن، بێ ئەوەی دەسەلاتداران یارمەتیان بدەن.

هەرێمی ژمارە ٤ : بریتیە لەو شوێنانەی کەوا دەیانەوێ چۆڵی بکەن، کە هەر شێوە نیشتەجێبوونێکی تیادا قەدەغەیە، لەبەر هۆیەکانی تەندروستی و ماددی و ڕۆشنبیری و هۆیەکانی ستراتیژی و ئاسایشی.

ئەو کەس و کۆمەڵانەی کە لە وڵاتانی بیانییەوە بەنیازی مانەوە بۆ تورکیا دێن، بەگوێرەی حوکمەکانی ئەم یاسایە وەزیری ناوەخۆ بڕیاری لێدەدات. بەڵام ئەو کەسانەی لە تورکیا وەرناگیرێن و مافی مانەوەیان پێنادرێت. ئەوکەسانەن کە کەلتووری تورکیان پێ قەبووڵ نییە، یاخود نەخۆشی زوهری و سفلس و ...هتد هەیە، ئەمەش خاووخێزانەکانیشیان دەگرێتەوە، هاوکات ئەوانەش دەگرێتەوە کەوا حوکمیان لەسەر دراوە بەو تاوانانەی کە سیاسی و سەربازی نین، هەروەها ئاژاوەچیان و سیخوڕان و دۆم و قەرەجەکان و ئەو کەسانەش کە لە وڵات دوورخراونەتەوە ناگرێتەوە. وەزیری ناوەخۆ ئەو مافەشی پێدراوە کە ئەو گوندانەی دانیشتووانەکەی ڕەوەندن یاخود شارستانین و کەوتوونەتە چەند هەرێمێکی بەرداوی یان زەویەکانی بەرتەسکن و فراوان نین و بێ بەشن لەهۆیەکانی ژیان، بیانگوێزێتەوە بۆ چەند شوێنێك کەوا مەرجی تەندروستی و ژیانی تێدابێت. هەروەها کۆکردنەوەی ئەو لادێیانەی کە خانووەکانیان بە پەرت و بڵاوی دروست کراوە، لەسەر شێوەی چەند ناوچەیەکی گونجاودا.

ئەوانەی کەوا گومانی سیخوڕییان لێدەکرێت

سەرۆك وەزیران بەبڕیاری ئەنجوومەنی وەزیران، مافی ئەوەی پێدراوە کە دۆم و قەرەج و ڕەوەندەکان، ئەوانەی خاوەن ڕەگەزنامەی تورکین، کە خاوەن کەلتوورو ڕۆشنبیری تورکین لەو لادێیانە نیشتەجێ بکات، هەروەها

لەشارەکانیش. بەمەرجێك كۆڕو كۆبوونەوە پێك نەهێنن. دوورخستنەوەی ئەو کەسانەش کەوا گومانی سیخوڕییان لێدەکرێت، لەگەڵ دوور خستنەوەی ئەو دۆم و ڕەوەندانەش کە ڕەگەزنامەی بیانیان هەیە بۆ ئەو دیو سنووری نەتەوەییەوە.

هۆزەکان: یاسا هیچ جۆرە کەسایەتییەکی بەرچاوی دیاری نەکردووە و، هەر مافێکی وەرگیراو لەم بوارەدا، هەتا ئەگەر جێگیریش بێت بەچەندان بەڵگەنامەو بڕیاری دیکە، دەسەڵاتدار بۆی هەیە هەر شتێ هەڵبوەشێنێتەوە، وەك دەسەڵاتی سەرکردە،بەگ، ئاغا، ریش سپی هۆز، هەتا هەموو ئەنداماں و دەزگاکان کە لەسەر پاڵپشت و بەڵگە جێگیرن، یاخود بەگوێرەی خووڕەوشتە کۆنەکان، هەموو ئەو زەویانەی کەوا دیاری کراون بەگوێرەی هەر گرێبەستێك یاخود پاڵپشتێك"مستند"، پێش دەرچوونی ئەو یاسایە ئەوە دەبێتەماڵی دەوڵەت.وەکو موڵك و سامانی کەسە دیارەکانی هۆزەکان وەکو سەرۆك و ئاغا و بەگ و شێخەکان.

پێش دەرچوونی یاسا: بەگوێرەی بڕیاری ئەنجوومەنی وەزیران و بڕیارەکانی حکومەت، ئەو خانووانە دابەش دەکرێن بە سەر کۆچ کردووەکان و جۆتیاران ، ئەوانەی پێویستیان بە زەوی هەیە. بەپێی بڕیاری ئەنجوومەنی وەزیران وەزیری ناوەخۆ ئەو دەسەڵاتەی هەیە لە گواستنەوەو نیشتەجێکردنی ئەو کەسانەی کە سەرۆك و ئاغا و شێخ و بەگی هۆزەکانن لە هەرێمی ژمارە ٢ ئەمەش پێش دەرچوونی ئەم یاسایە. بەهەمان شێوە ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کەوا گومانی سیخوڕییان لێدەکرێ لە نزیك سنووردا، هەروەها ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە خاوەن دەسەڵاتن لە ڕۆژهەڵاتدا.

ئەو کەسانەی کەوا زمانیان تورکی نییە: ئەوانەی کە بە زمانێکی ڕەسەن دەدوێن جگە لە زمانی تورکی، لێیان قەدەغە دەکرێت سەر لەنوێ گوندو گەڕەك و کۆمەڵەی پیشەیی و فەرمانبەری یان پێکهێنانی چەند چینێك دروست بکەن، یاخود هەڵسان بەکردەوەیەك کە پەیوەندی بەوانەوە هەیە، وەك دروست کردنی لادێ یان گەڕەك یان کۆمەڵەی پیشەیی یان کردنەوەی لقێکی کار. هەروەها بە بڕیاری ئەنجوومەنی وەزیران وەزیری ناوەخۆ دەسەڵاتی نەهێشتنی ئەو کۆڕو کۆمەڵانەشی هەیە، هەتاکو ئەوانەش کە ئێستاکە هەن، بیانییەکانیش نەیان دەتوانی لە لادێکان نیشتەجێ بن، بیانیانی دانیشتووی شارەکان و ولاّتانی بچووك، بەگوێرەی تۆمارگاکانی شارەوانی لە ٪۱۰ ی کۆی ژمارەی دانیشتووان تێپەڕ ناکەن. پرۆژەی یاساکە پێکهاتووە لەچەند حوکمێکی گرنگ کەوا پەیوەندی هەیە بەکاروباری زەوییەکان و یارمەتی دارایی دیاریکراو بۆ رۆشنبیری میللی دانیشتووانانی هەرێمەکان.

لێبووردن لە باجەکان: سەرەڕای ئەمەش هەندێ لە جۆرەکانی لێبووردنی باج شتێکی قەبووڵ کراوە. ئەو کەسانەی لە هەرێمەکانی ژمارە ۱ نیشتەجێن، یان ئەوانەی لە ولاّتانی دەرەوە هاتوون، یان ئەوانەی لە ناوەوەی ولاّت دان بە ئارەزووی خۆیان یاخود بە زۆرەملێ دەگوێزرێنەوە، هەر لەسەرەتاوە باجەکانیان لەسەر لادەبرێت لە رۆژی تۆمارکردنی ناوەکانیان. ساڵی یەکەم هیچ شتێکیان لێوەرناگیرێت، بەڵام لە ساڵانی سێیەم و چوارەم و پێنجەمدا نیوەی باجەکە راستەوخۆ دەدەن، لەگەڵ یارمەتیدانی بە پول و پارە رەسمی تۆمارکردنی ئەو زەویانە نادەن کە بە بێ بەرامبەر بەسەریان دابەش

دەکرێ. بەڵام ئەوانەی لە هەرێمەکانی ژمارە ٢ و ٣ نیشتەجێ دەبن، تەنها بۆ ماوەی دوو ساڵ باجە راستەوخۆکان و یارمەتی پول و پارەیان لەسەر هەڵدەگیرێت. ئەم دەقەی یاسایە کە پیت بە پیت نووسیمانەتەوەو بەم شێوەیە رێکخراوە، بەهەمان زاراوەش بۆ ئەو کەسانەی کەوا لە بارودۆخ و نەریتی ناوەخۆی تورکیا زانیارییان نییە، بەتایبەتیش ئەگەر شارەزاییەکیان لە دۆزی کورد نەبێ، دەتوانن سوودی لێ وەربگرن وەك پیادەکردنێکی تەواوی ئاشتیخوازانەی رۆشنبیری، تەنها ئامانجیش ئەوەیە تێکەڵکردنی " تورکی چیایە بە کەلتوورو رۆشنبیری تورکییەوە. هەوڵ دەدەین بچینە ناو ئامانجە راستەقینەکانی ئەم یاسایەو چارەسەرکردن و کردنەوەی ئەم گرێ کوێرە شاراوەیە لە ژێر پەردەی زانستیی رۆشنبیری تورك. بۆ ئەم کارەش دەست دەکەین بە شیکردنەوەی چینەکانی هەرچوار هەرێمەکە:

١- هەرێمی ژمارە ١: بریتیە لەو هەرێمەی کە دەیانەوێت چڕی دانیشتووانی تیادا پتر بکەن و بەمەرجێ خاوەن رۆشنبیری تورکی بن. ئەوەی ئاشکرایە کەوا پێویستە لێکۆڵینەوە لەو هەرێمانە بکەین لەو کەرتانەی کە دانیشتووانی دیکەیان تیایە و تورك نین، دەبێ دان بەوەشدا بنێین کە بەشێك لە تورکەکان زمانی دایك نازانن (زمانی تورکی)، وەکو ئەمڕۆ زمانی ئەلبانی یان عەرەبی یان بولگاری، لەسنوورەکانی کۆماری تورکیادا نەبوو، ئەوەی ئاشکرایە ئەم هەرێمانە تەنها لە وڵاتی کوردان هەیە. لەڕاستیدا ئەوانەی کەزمانی تورکی دەزانن لەکوردستاندا کەمایەتین، بەشێوەیەکی راستتر زمانی تورکی وەك زمانێکی رەسمی

تەنها لەچەند شارێکی کەمی کوردستان بلاْوبووەوە، بەلاْم گەلی کورد تا رادەیەك بەتەواوەتی زمانی تورکیان نەدەزانی.

٢- هەرێمی ژمارە ٢ : بریتیە لەو هەرێمانەی کە دەیانەوێ ئەو کەسانەی تیادا نیشتەجێ بکەن، کە دەبێ لەگەڵ کەلتووری تورکی تێکەلاْوبن، لەبەرئەوەی نابێ ئەو جۆرە لێکدانەوەیە هەبێ کەوا بتوانرێ سەرلەنوێ تورکەکانی تورکیا تێکەڵ بەیەکتری بکرێنەوە. لەبەر ئەوە ئێمە ناچارین دەربارەی ئەو دانیشتووانانەی کەوا تورك نین لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین. لەشیکردنەوەی وتارەکەی پێشوودا بۆمان روون دەبێتەوە، کە ئەو دانیشتووانانە کەسێك نین تەنها کورد نەبێ، ئەوەی ئاشکرایە پێویستە لەسەرمان دەربارەی ئەو هەرێمانە بدوێین کە کورد تیایدا بۆ دەرەوەی کوردستان "بۆ ئەو هەرێمانەی کە تورکی تیادا دەژی" دەردەکرێن. ئەمەش بۆ ئەوەیە تاکو سیمای تورکایەتی هەڵبگرن. لەڕاستیدا ئەو هەرێمانە تەنها ناوچەکانی ئەنادۆڵی تورکی و ئەدەنە دەگرێتەوە. ئەگەر بتوانین بڵێین کۆڕەکانی زمانەوانی تۆرانی کە بۆمان پارێزراوە و ماوەتەوە ، هەر بۆ ئەوە بووە کە فێری زمانی تورکی ببین.

٣- هەرێمی ژمارە ٣: بریتیە لەو زەویانەی کەوا دەتوانرێ ئەو کۆچ کردووانەی خاوەن رۆشنبیری تورکین تیایاندا نیشتەجێ بین بەبێ یارمەتیدانیان لەلایەن دەسەلاْتدارانەوە، جا حکومەتی ئەنقەرە بەشێوازە تایبەتییەکانی خۆی کۆچ کردووە تورکەکان دەگوازێتەوە بۆ ئەو شوێنانەی کوردی لێدەرکراوە" کوردستان" ئەمەش بە پێدانی پارەو پوڵ بۆ نیشتەجێبوون. حکومەت وا بیر دەکاتەوە کە هەرچەندە

خاوەن شێوازی خۆیەتی، بەڵام کوردستان چەند ناوچەیەکی هەردەم بەچۆڵی دەمێنێتەوە، جا بە دڵفراوانییەکی زۆرەوە دەرگاکانی کوردستان بۆ هەموو تورکەکانی جیهان دەکرێتەوە، ماوەشیان پێ دەدرێت بەئازادی خۆیان بێنە ناوەوە بەمەرجێ پارەو پوڵ لەسەر کیسەی خۆیان بێ.

٤- هەرێمی ژمارە ٤: بریتیە لەو زەویانەی کە دەیانەوێ بە چۆڵی بمێنێتەوەو هەر جۆرە نیشتەجێ بوونێکی تیادا قەدەغەیە. ئەمەش لەبەر هۆیەکانی تەندروستی و ماددی و رۆشنبیری و سیاسی و..هتد. ئەو زەویانە بریتین لە هەرێمە پێچاو پێچ و سەختەکانیکوردستان، بەهۆی کەش و هەواوە کەس ناتوانێ لەوێ ژیان بباتەسەر، تەنها هاووڵاتیە رەسەنەکانی ئەوێ نەبێ "کورد"، جا کوردیش لەوێ دەردەکرێن. بەڵام دەربارەی کۆچ کردووە تورکەکان ئەمە بۆ ئەوان دەبێتە گۆڕستانیان. بەکورتی هیچ کەسێ ناتوانێ لەوێدا ژیان بباتەسەر، جا هەر مرۆڤێك بێت.

ئەو شیکردنەوەیەی بۆ ئەو هێما نادیارەی کەلتووری تورك و هەرێمەکان بەئاشکرا روونی دەکاتەوە، مەبەست لەمە تەنها کوردستان و هەرێمەکانی تورکە. لەڕاستیدا هەرێمەکانی ١-٣-٤ بریتین لەو زەویانەی کەوا خەڵکێکی زۆری تیادا نیشتەجێن، کەوا سەر بە کەلتوورو رۆشنبیری تورکی نین. هەرێمی ژمارە ٢ بریتیە لەو زەویانەی کە تورکەکان تیایدا نیشتەجێن و دەکەوێتە کیشوەری ئاسیاو ئەوروپا، هەرێمەکانی ١-٣-٤ یش کوردی لێ دەربەدەر دەکرێت، لەهەردوو هەرێمی ١ و ٣ تورکەکان لەجیاتی کوردەکان

نیشتەجێ دەکرێن. بەڵام دەربارەی هەرێمی ژمارە ٤ کوردی لێ دوور ناخرێتەوە، بەڵام ماوە بەکەسیش نادرێت تیایدا بمێنێتەوە. هەرێمی ژمارە ٢ دەمێنێتەوە ئەویش ناوچەکانی تورکیان، کە کوردی بەسەردا دابەش دەکرێت. ئێمە بەروونی دەبینین کەوا حکومەتی تورکیا لەم رێگەیەوە وڵاتی دابەش کردووە بۆ هەرێمەکانی دوو جۆرە چین و ، بەهەمان شێوەی بەڕێوەبردن کە لە دوای ساڵی ١٩٢٥ گرتبوویە بەر، واتە هەرێمەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا، یاخود هەرێمەکانی کوردو تورك. هەرێمی رۆژهەڵات یاخود هەرێمی کورد لە سنوورەکانی ئێران و قەوقازەوە دەست پێدەکات و درێژ دەبێتەوە هەتا دەگاتە چیاکانی سیواس و هەرێمەکانی (خەربوت و مەلاتیە). هەرێمی رۆژئاواش لە رۆژئاوای هەرێمی ژمارە یەکەوە دەستپێدەکات و درێژدەبێتەوە هەتا دەگاتە(ئەدرنە) کە تورك نشینە. جیاوازی بنەڕەتی لە نێوان ئەم دوو هەرێمەدا بەم شێوەیە دیاردەکەوێ: هەرێمی رۆژهەڵات بە رێگەیەکی تایبەتی بەڕێوەدەبرێت، هیچ کەسێ،تەنانەت هاووڵاتیانی تورکیش ناتوانن لە رۆژئاواوە بەرەو دۆزەخی رۆژهەڵات بچن بەبێ ماوە پێدانی وەزیری ناوەخۆ. رۆژهەڵاتیش لە گەمارۆدانێکی بەردەوام دایە، پشکێنەرێکی گشتی بەڕێوەی دەبات لەگەڵ چەند فەرمانبەرێکی بچووك لە بەڕێوەبەرایەتی شارستانی خۆجێی، ئەو دەسەڵاتەیان پێدراوە هەر کوردێك بکوژن ئەگەر لە شارێکەوە بچێتە شارێکی دیکە، چونکە ئەوان بە زیندانی و دەستبەسەر دادەنرێن لەلایەن جەندرمەکانەوە. لێرەدا ئەوەی پێویست بێ ئەوەیە ئاماژە بەو کاروبارە کتوپڕیانە بکەین کە لە کوردستاندا پیادە کراون. دامودەزگا رۆشنبیرییە گشتییەکان لە هەرێمەکانی رۆژهەڵاتدا لە ساڵانی

دواییدا بەرەو نەمان دەڕۆیشتن. لەگەرمەی شۆڕشی ١٩٢٥ دا حکومەتی ئەنقەرە سیاسەتێکی دەربارەی رۆشنبیریی گشتی گرتەبەر کە بەتەواوەتی دژبوو لەگەڵ سیاسەتی ئەمڕۆیدا. لە دوای شۆڕشی باسکراودا بۆچوونی پترکردنی ژمارەی قوتابخانەکانی لە کوردستاندا گرتەبەر. ئەمەش لە پێناوی دابینکردنی بڵاوکردنەوەی زمانی تورکی لە نێوان دانیشتووانی کورد دا، ئەوانەی کە دەبێ لەگەڵ تورکەکاندا ببن بەیەك، بەڵام گەنجانی کورد ئەوانەی بە زمانی تورکی دەیانخوێند و تورکانە پەروەردە دەکران، لە جیاتی ئەوەی شوێنکەوتەیی رێگەی گەورەی (تۆرانی) ببن و بەهۆی ئەو تروسکە روناکییەی کە بەدەستیان گەیشتبوو، دەستیانکرد بەلێکۆڵینەوە لە ناخی بیری نەتەوەیی خۆیان، تا ئەو راستییانە ببینن کەتاکو ئێستا لای کوردە نەخوێندەوارەکان دیارنەبوو. خۆشەویستی نیشتمان و سەربەرزی نەتەوەیی مافی هەموو گەلانە، لەبەرئەوە گەنجانی کورد لە کتێبە تورکییەکاندا فێری ئەوە دەبوون کە پێویستە لە سەریان وڵاتی خۆیان خۆش بوێ و شانازی بکەن بە رەگەزی خۆیان. بۆیە وڵاتی کوردیان خۆشدەویست و شانازیان بە رەگەزەکەیان دەکرد، رەگەزی کورد و کوردایەتی. بەرامبەر بەم کارە حکومەتی ئەنقەرە یەکسەر پلانەکانی دەربارەی رۆشنبیریی گشتی لە کوردستاندا گۆڕی. بە گوێرەی سەرژمێریە فەرمیەکانی وەزارەتی رۆشنبیری گشتی لە ئەنقەرەدا ژمارەی قوتابیان لە ناوچەکانی تورک گەیشتبووە (٣٣٪) ی رێژەی دانیشتووان. کەچی ژمارەی قوتابیانی ناوچەکانی کوردنشین نەگەیشتبووە (٥,٢٪). لەو هەرێمانەی باسمانکرد ئیش و کاری سەرکوتکردنەوەی کورد جێبەجێ دەکرێت، ئەوانەی کە دانراون بۆ هەڵگرتنی

رۆشنبیری تورکی. لەهەرێمی رۆژهەلاتی باسکراو کورد دەگوێزرێنەوەو دابەش دەکرێن لەنێوان ئەو تورکانەی کە لەهەرێمی رۆژئاوادا دەژین.لەوشوێنانەی کەوا کورد چۆڵیان کردووە،تورکەکانی هەرێمی رۆژئاوا یاخود ئەوانەی لەولآتانی بیانی دێن، لەویٚ نیشتەجیٚ دەبن. وەکو لەپێشوودا بینیمان کورد لەهەرێمی ژمارە (٤) دووردەخرێنەوە کە یەکێکە لەسیٚ چینەکەی هەرێمەکانی رۆژهەلاتی لیٚ پێکهاتووە لە کوردستاندا، بەلآم ماوە بەکەس نادرێت لە شوێنەکانیاندا بمێننەوە. پرۆژەکەش چەند هۆیەکی تەندروستی و سیاسی باس دەکات بۆ ئەم قەدەغە کردنە. جا دەبیٚ ئێمە ئەم خالّە روون بکەینەوە. هەرێمی ژمارە (٤) بریتیە لە زەوی شاخاوی و تاشە بەردییەکان، هەر لە سروشتیی خۆیەوە بۆ نیشتەجێبوون دەست نادات، تەنها بۆ ئەو کەسانە نەبێت کەلەویٚ لەدایك بوون. لەکاتێکدا ئەگەر تورکەکان لەو هەرێمانە ژیان ببەنەسەر، گومانی تیانییە بەزووترین کات تووشی خەسارەتمەندی دەبن. لەبەر ئەمە ناتوانین تورکەکان بۆ ئەویٚ بگوازینەوە. لەگەلّ ئەمەشدا دەبیٚ ئەو هەرێمانەی کە کەوتوونەتە کوردستان چۆلّ بکرێن، چونکە کورد تیایدا نیشتەجێن، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەشەوە لەکاتی ئەنجامدانی کارە سەربازیەکانی سوپای تورك خەسارەتێکی گەورە بە تورکەکان دەگات. لە یەکیٚ لەم کارانە لە (ئارارات) سالّی(١٩٣٠) سوپایەکی پێکهاتوو لە (٤٠) هەزار چەکدار بۆ ماوەی زیاتر لە چوار مانگ لەگەلّ چەند نەفەرێکی کورد شەڕی کرد، دوا جار نەیانتوانی ئەو شوێنەی کە ململانێی لەسەرە داگیری بکەن، تەنها پاش ئەوە نەبیٚ کەزانیان فارسەکان پالّپشتیان لیٚ دەکەن. لەگەلّ ئەوەشدا هەندیٚ لە کوردە دەرکراوەکانی سەر لوتکەکانی چیای

(ئارارات) توانیان بگەڕێنەوە شوێنی کۆنی خۆیان، چونکە لەگەڵ یەکەم گێژەلووکەی بەفردا توانیان سوپای تورک لە دەربەندی چیاکان دەربکەن. لەلایەکی دیکەوە یاسای دوورخستنەوە فەرمان دەدات بە لێسەندنەوەو داماڵینی هەموو موڵك و سامان و زەوی و زاری ئەم گەلەی کەفەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرچووە، هەروەها هەڵوەشاندنەوەی ڕێکخراوەکانی هۆزەکان و چاکسازی لە ناویاندا. ئەگەر بە خێرایی سەیرێکی ئەمە بکەین، بۆمان دەردەکەوێ ئەو کەسایەتیە دیارو بەهەیبەتەی کە ئەوان دەیانەوێ لە هۆزەکانی بسەننەوە تەنها لە موڵکە گشتییەکان دایە کە لە یاسادانانی نەتەوە پێشکەوتووەکان دەردەکەوێ. ئەوەی روون و ئاشکرایە ئەم پرۆژەیە ئامادەکراوە بۆ دڵنیابوون لە نەهێشتنی نەتەوەیەك بەتەواوی، چەند ڕێگایەك دەدۆزرێتەوە و بەکاریدەهێنێ کە ماوەیان نادات بەشێوەیەکی پەرت و بڵاویش بژین، بەشێوەی چەند کۆمەڵەیەك کە ژمارەیان لە(١٠-١١) کەس بێ و بێ ئاگابن لە کەلتووری باب و باپیرانیان، تاکە تاوانی ئەم گەلە ستەمدیدەیە تەنها ئەوەیە چونکە ئاری و کوردن، گوناهیان ئەوەیە چونکە ئاری رەگەزن و تۆرانی نین. ئەم یاسایە هەموو کاروبارێکی پێویستی گرتەبەر بۆ گەیشتن بەئامانجی دیاریکراو. بۆ نموونە کورد قەدەغە دەکرێن بەگوێرەی ئەو برگەیەی کە دەڵێ(ئەو کەسانەی کە زمانیان تورکی نییە) هیچ کۆڕو کۆبونەوەیەك پێك بهێنن، هەتا ئەگەر کارەکە بەهاوبەشیش بێ لەگەڵ هەرێمەکانی تورك نشین، کە بەزۆرەملێ کۆچیان پێکراوە و لەوێ نیشتەجێ کراون لە شوێنی لەدایکبوونیان. ئەوەی روون و ئاشکرایە ئەو کوردە دەرکراوانەی کە لەمردن رزگاریان بوو بوو، بەشێکی کەمیان ئەوانەی

گەیشتبوونە جێی مەبەستیان نەیاندەتوانی ژیانی خۆیان دابین بکەن، تەنها لەرێگەی کاری بەکۆمەڵ نەبێت. ئەم یاسایە چەند بڕیارێکی هەیە کە کاریگەریەکی پاشگەزبوونەوەی تیایە وەکو سزادانان کەوا تەمبێ کردن کەم دەکاتەوە. یەك لەم بڕیارانە ئەمەیە کە پەیوەندیدارە بەقەدەغەکردنی دروستکردنی لادێ یاخود پڕۆژەیەکی نوێ بۆ ئەو کەسانەی کە زمانەکەیان تورکی نییە. ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کەپێش دەرچوونی یاساکە هەبووینەو لە دواییشدا پەرت و بڵاو دەکرێن. ئەم وتەیە خراوەتە ناو یاساکە بۆ سەرخستنی پرۆسەی پەرتەوازەکردنی ئاوەدانیە گەورەکانی کورد کە لەناو جەرگەی هەرێمە تورکییەکان دان، وەکو ئاوەدانی (خایمانا) و کۆمەڵگە گوندیەکانی دیکە، ئەو سەربازگانەش کە دروستکراون لە هەرێمە هەمەجۆرەکان تورکیا لەکاتی ئەنجامدانی کارەکانی دوورخستنەوەی پێشوو.
پاش ئەوەی حکومەتی ئەنقەرە ئەم رێگایەی گرتەبەر بۆ هەموو بارودۆخێکی گونجاو، لەهەمان کاتیشا گرنگی دا بەو تاکە کەسانەی کە لە دەرەوەی ئەم بارودۆخانەن، بەوتەیەکی تایبەتی بە یاساکردنی تاوانێکی گشتی وەك بەڵگەیەك پیشانی دەدات لەم چەرخەدا کەوا دانپیانراوەو هیچ جۆرە نرخێکی نەماوە لە بەیاساکردنیدا لەبەرامبەر ئەو بەڵگانەی کە راست و زیاتر بابەتین و دەخرێنە پاڵ هەموو کەسێکەوە. ئەوانەی گومانی سیخوڕیان لێدەکرێت مەبەست لەوەنیە ئەوکەسانەی کاری سیخوری ئەنجام دەدەن ،یاخود ئەوانەی کەبۆیان روون بۆتەوە کاری سیخووری دەکەن، بەڵام لەو کەسانەیە کەگومانیان لێ دەکرێت پێی هەڵبەستن، دەشبێ گومان لەهەموو کەسێ بکەن، ئەوجۆرە گومانەی کەپێویست نییە لێکۆڵینەوەی لەسەرکرابێ.

یاخود بە بەڵگەیەك پاڵپشتی لێوەبكات. بەشی كۆتایی ئەم یاسایە بریتیە لەچەند لێبوردنێكی پەیوەست بەكۆچ كردووەكان، سوودو قازانج بۆ توركەكانەو زیانیش بۆ كورد، لەگەڵ ئەمەدا لێرەوە خاڵێك هەیە كەسەرنج راكێشە، كە باس كردنەكەمان بۆ تاوتوێ دەكات، ئەو كەسانەی كە لەهەرێمەكانی ژمارە (٢) دەژین و ئەوانەی لەژمارە (٣) دەژین بە یەك شێواز هەڵسوكەوتیان لەگەڵدا دەكرێت. هەرێمەكانی ژمارە (٢) دەكەونە هەرێمەكانی توركەكانەوە كەكوردەكانیان بۆ دەبردرێن، هەرێمەكانی ژمارە (٣)دەكەونە ناو هەرێمەكانی كوردەكانەوە كەتوركەكان تیادا نیشتەجێ دەكرێن. جا هۆیەكە دەبێ چی بێ هەمان هەڵسوكەوت بەرانبەر و كوردو تورك دەكرێت؟ بائەوە باس بكەین هەرێمەكانی ژمارە (٣) ئەوە هی كوردانە، سەربەستیەكی تەواوی تێداهەیە بۆ نیشتەجێبوون بەبێ یارمەتی وپاڵپشتی دەسەڵاتداران، شتێكی زۆر سروشتیە هیچ توركێك بەئارەزووی خۆی نایەوێت شوێنی باوك و باپیرانی جێبهێڵێ و بڕوات لەم هەرێمانەدا نیشتەجێ ببێت كە هی كوردەو دووریشە لەخاكی توركان و، بەبێ یارمەتیدانی دەسەڵاتداران.

بۆیە دانیشتووانە وەهمیە نوێكانی توركەكان لەو هەرێمانەی كە لە تورك چۆڵكراون، لە بێ بەختی خۆیان وەكو كورد هەڵسوكەوتیان لەگەڵ دەكرێت. لەو بڕوایە داین بەو بیرو بۆچوونانەی كە پێشكەشمان كرد بەپێی پێویست مەبەست و ئامانجەكانی یاسای رۆشنبیریی ئەنقەرەمان روونكردەوە. ئەوەش سوودێكی دەبێ ئەگەر چاوێ بخشێنین بە رووداوەكەو ئەگەر دوورخستنەوەكە بەختی سەركەوتنی هەبێ بە گوێرەی شێوازی ماددی و دارایی. با نەخشەی ناوچەكە بێنینە بەرچاومان و سەیرێكی چەند

ناوچەیەکی نێوان کوردستان و ناوچە تورکییەکان بکەین، دەبینین بەگوێرەی هێلی ڕاست بە خەملاندن لە نێوان ئەو ناوچانە کە دووری نێوان جۆلەمێرگ و سمێرن نزیکەی ١٥٥٠ کیلۆمەترە ، هەروەها نێوان ئامەد (دیاربەکر) و بروس نزیکەی ١١٥٠ کیلۆمەترە ، نێوانی بایەزیدو ئەدرنەش ١٧٠٠ کیلۆمەتر دەبێت، خاربوت و کالیبولی نزیکەی ١٢٠٠ کیلۆمەترە. بەهۆی باری سروشتی زەویەکان و پێچاوپێچی ڕێگاکانیش لەبەر چەند هۆیەکی ئابووری و ئیداری و هی دیکەش، دەبینین ئەم دووریانە بە شێوەیەکی بەرچاو پتر دەبن. با وای دابنێین بە ڕادەی چوار یەکی دووریەکە پتر دەکات، بەمەش ژمارەکانی پێشوو ئاوای لێدێت: ( ١٩٣٧ کم- ١٤٣٧کم- ٢١٢٥کم -١٥٠٠کم) کەواتە ژمارەی مامناوەندی بۆ ئەم چوار دووریانە دەبێتە نزیکەی ١٧٥٠ کم. ئەم ژمارەیە ئەم دووریە دەردەخات کە دەبێ هەر کوردێکی دوورخراوە بیبڕێت بۆ ئەوەی بچێتە ناوچە تورکییەکان. بەگوێرەی سەرژمێری فەرمی تورکیا، کۆی ژمارەی دانیشتووانی تورکیا ١٤ ملیۆن کەس دەبێت، (ساڵی ١٩٣٤ -وەرگێڕ) ئەگەر دامانناا ژمارەی دانیشتووانی کورد لەکۆی ژمارەی دانیشتووانی تورکیادا ٣ ملیۆن کەس بێت، ئێمە واتێدەگەین زێدەڕۆییمان لەم ژمارەیە نەکردووە، هەتا ئەوەمان لەلابێ کە ژمارەی ئەو کەسانەی کە دوور دەخرێنەوەو ناچار دەکرێن دووری ١٧٥٠ کم ببڕن. با هەوڵ بدەین بۆ زانینی ئەو بڕە پارەیەی کە پێویستە بۆ بەجێگەیاندنی ئەم فەرمانە، با وای دابنێین گواستنەوەی هەر کوردێك بە ئازووقەو نیشتەجێکردنەوە ٥٠ سەنتیم دەبات بۆ هەر کیلۆمەترێك، ئەوا بۆ بڕینی دووری ١٧٥٠ کم بۆ هەر دوورخراوەیەکی کورد پێویستی بە ٨٧٥ فرەنك هەیە. با وای لێکبدەینەوە کەوا

دوورخراوەکانی کورد بەشێك لە دووری ئەم ڕێگایەدا بەپێ دەبڕن، چەندین جاریش لەسەر زەوی دەخەون، یاخود زۆربەی جار پارەی تایبەتی خۆیان سەرف دەکەن. جا ئێمە چوار یەکی ژمارەی پێشوو لادەبەین، واتە کەمکردنەوەی ژمارەی ٨٧٥ فرەنك بۆ ٦٥٦ فرەنك. وامان داناوە کە منداڵان گواستنەوەو خواردەمەنیان پارەیەکی کەمتری دەوێت لە کەسی گەورە، دیسان لەم ژمارەیەی دواییدا ٥٦ فرەنك کەمدەکەینەوە، ژمارەی ٦٠٠ فرەنك دەمێنێتەوە، ئەم ژمارەیە لەگەڵ ٣ ملیۆن کەژمارەی دوورخراوەکانە لێدەدرێت، کۆی پێداویستیەکان دەکاتە ١,٨٠٠,٠٠٠,٠٠٠ فرەنك. پێویستە دان بەوەدا بنێین کەوا خەرجیەکانی گواستنەوەی کەلوپەلی هەر دوورخراوەیەك بۆ هەر یەك کیلۆمەتر نزیکەی ٢٠ سەنتیمە، ئەمەش ئەوە بەدەست دەدات کە دووری ١٧٥٠ کم بۆ سێ ملیۆن کوردی دوورخراوە، بۆیە کۆی هەموو خەرجیەکان دەکاتە ١,٥٠,٠٠٠,٠٠٠ فرەنك. کۆی ئەم ژمارەیەش لەگەڵ کۆی خەرجی دوورخراوەکان دەبێتە ٢,٨٥٠,٠٠٠,٠٠٠ فرەنك. ئەمە ژمارەی نزیك کراوە کە پشت دەبەستێ بە کەمترین ڕادەی خەملاندنەکان بۆ چۆڵکردنی کوردستان لە دانیشتووانە ڕەسەنەکەی. ئاشکراشە کە دەبێ ئەوەش لەبەرچاو بگیرێ ئەو خەرجیە پێویستیانەی کە سەر لە نوێ بۆ نیشتەجێکردنەوەی کوردستان دەدرێت و لە کۆچپێکردووە تورکەکان.بە واتایەکی دیکە ناچارین ئەوە قەبووڵ بکەین کەوا حکومەتی ئەنقەرە لەسەر ئەو بڕیارەیە کە سێ یەکی خاکەکەی بەچۆڵی بەبێ دانیشتووان بمێنێتەوە. ڕازیبوون بەم کارە سەختەو کارێکی نە ژیرییەو نە دانایە، کە لە کوردستان ژمارەی دانیشتووان کەم بێ و،کەچی ژمارەیەکی زۆرو چڕ لەخەڵکی

بگوازرێتەوە کە پترپێ لە کوردستانییە دوورخراوەکان. بەڵام بۆ ئەوەی بە بەردەوامی لە کەمترین رادە بمێنینەوە، وای دادەنێین کەوا ژمارەیەکی یەکسان لە دانیشتووان دەنێرن بە ژمارەی دانیشتووانە دوورخراوەکان، ئەوەی ئاشکرایە خەرجیەکانی کۆچ پێکردنی تورکەکان گەلێ پتر دەبێ لە خەرجیەکانی دوورخراوە کوردەکان. چونکە ناتوانن هەمان توندوتیژی بەرامبەر تورکەکان بەکاربهێنن کە داوایان لێ دەکرێت کوردستانی فراوان ئاوەدان بکەنەوە. بەپێچەوانەوە ئەوان ناچارن تورکەکان رازیبکەن شوێنی لەدایکبوونیان جێبهێڵن و بڕۆن بۆ کوردستان. لەلایەکی دیکەشەوە ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە ئەوان ناتوانن ئەو کۆچ کردووانە بەجێبهێڵن بەبێ یارمەتیدانیان لە بڕینی دەشت و چیاکانی کوردستان. ئەوان ناچارن هەموو رێگەیەکی هێمنی و ئاسایشی ژیانیان بۆ دابین بکەن هەتا ئەو رۆژەی کە خۆیان دەتوانن شت بەرهەم بهێنن، بەواتایەکی دیکە چارەنووسیان تەنها مردن نابێت. لەئەنجامدا وا دادەنرێت کە خەرجیەکانیان دوو ئەوەندەی خەرجیەکانی دوورخستنەوەی کورد دەبێت، بەمەش خەرجیەکانیان خۆی لە ٥,٧٠٠,٠٠٠,٠٠٠ فرەنك دەدات، ئەوبڕە پارەیەش دەخەینە سەر ٢,٨٥٠,٠٠٠,٠٠٠ فرەنك کە خەرجی دوورخستنەوەی کوردانە، لەئەنجامدا دەگەینە ئەو بڕە پارەیەی خوارەوە ٨,٥٥٠,٠٠٠,٠٠٠ فرەنك. ئەمەش ئەو بڕە پارەیە کە پێویست دەبێ بۆ ئەنجامدانی پرۆسەی کۆچ پێکردنی تورکەکان بۆ وڵات و زێدی کوردان، ئەو بڕە پارەیەش ناگرێتەوە کە بەکاردەهێنرێت بۆ رێکخستنە نائاساییەکان کە پێویست دەبێ بۆ ئەنجامدانی ئەو پرۆسەیە، وەکو نووسینگەکانی دوورخستنەوەو، مووچەی ئەو فەرمانبەرانەی کە لەم

نووسینگانە دادەمەزرێن، لەگەڵ حیسابی ئەو پاسەوانانەی کە لەگەڵ دوورخراوەکان دەبن. ئەم حیسابە سەرپێییە بەجوانی روونی دەکاتەوە کە ئەگەر ئەو پرۆژەیە لەگەڵ هیچ بەربەستێك رووبەڕوو نەبێتەوەو، کوردیش بۆ دوورخستنەوەیان بەرخودان نەکەن و، بەئاسانیش ئەو ژمارە تورکە بدۆزینەوە کە روو لە ولاتی کوردان بکەن. ئەوا تێچووی ئەو برە پارە زۆرە بۆ ئەنجامدانی ئەو پرۆسەیە وا دەکات ئەم پرۆژەیە سەرنەگرێت. هەرچەندە بەهیچ شێوەیەك ناتوانین بڵێین وای دادەنێین کەوا کورد کە هەرچەند هیچ جۆرە چەکێکیشیان بەدەستەوە نەبێ، ملکەچ دەبن بۆ ئەم دوورخستنەوەیە، هەروەها ژیریش نییە ئەگەر وا بیربکەینەوە کە تورکەکانیش بە ئارەزووی خۆیان رازی دەبن لە جێهێشتنی شوێنی لەدایکبوونیان، بۆ ئەوەی لە شوێنێك بژین کە کەشێکی سەخت و دژواری هەیە. با بڵێین کورد رازی دەبن وەك مێگەلە مەڕێك بە نێو دەشت و چیاکاندا بگواسترێنەوە بەبێ هیچ بەرخودانێك،لێرەدا پێویستە بەدوای شوێنێك بگەڕێین کە ئەو کوردانە لەخۆ بگرێت و سەرلەنوێ جێگیر بکرێنەوە. ئایا دەتوانین بڵێین جوتیارێکی تورکی هەژار لە ئەنادۆلدا کە بە هەوجارەکەی خەریکی پەیداکردنی پاروەوە نانێکە بۆ ژیانە پڕ لە نەهامەتیەکەی خۆی و چارەنووسی پێ بەسترایەتەوە، ئایا ئەو جوتیارە رازی دەبێ کەسێکی بیانی بێت و نیوەی نانەکەی ببات؟!. هەروەها دەربارەی ئەو تورکانەی کە دێن لە کوردستان نیشتەجێ ببن، لەکوێ دەتوانرێ بدۆزرێنەوە؟ با تەتارو دوبدیماو تورك لەبەچاو بگرین، ئایا ئەو جۆرە کەسانە دەتوانن ولاتەکەیان جێبهێلن و کۆچ بکەن بۆ شوێنێك کە هیچ جۆرە سوودێکی بۆیان نییە ، ئەگەر ئەم کارەش بکەن، ئایا دەتوانن

بەرگەی کەش و ئاووهەوای کوردستان بگرن؟!. ئەو تاقیکردنەوەیەی بۆ بیانیەکانی ( کریت) لەساڵی ١٩٠٢ ئەنجامدرا بەباشی بەدیاری خست کە ئاووهەوای کوردستان تەنها بۆ دانیشتووانە رەسەنەکەیان دەگونجێت و بۆ بیانیەکان هەرگیز گونجاو نییە. کۆچ کردووەکانی کریت یارمەتی و هاوکاری حکومەتیان رەتکردەوەو بە چاکتریان زانی لە سەر ئەرکی خۆیان نیشتەجێبن لە ئەنادۆل نەك بێنە کوردستان و لە زێی فورات تێپەڕن. ئەگەر بۆ ساتێکیش وای دابنێین کە نیازی حکومەتی ئەنقەرە دوورخستنەوەی بەشێکی تورکەکانی ئەنادۆل و ئەدرنەیە بۆ کوردستان، ئەوا ئەو پرۆژەیە سەرناگرێت، چونکە ئەم تورکانە نەك هەر ئەمڕۆ بەڵکو سەدان ساڵە شارستانینەو لەشارەکان دەژین، هەروەها لەکاتی گواستنەوەیان لەرۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا بە هیچ شێوەیەك لە کوردستاندا نەماونەتەوە، بەڵکو بەتەنها پێیدا تێپەڕیون و لە هیچ شوێنێکی کوردستان جێگیر نەبووینە. ئەو شیکردنەوەو لێکدانەوەیەی کە لەسەرەوە کردوومانە، دەمانگەیەنێتە ئەنجامێکی ئاشکرا کە پشت بە ژمارە روون و دیارەکان دەبەستێت. پرۆسەی ئاوەدانکردنەوەی کوردستان پێویستی بە داراییەکی زۆر گەورە هەیە، ئەمەش وا دەکات کە پرۆژەکە بە ئاسانی جێبەجێ نەکرێت، ئەمەش نەك بۆ تورکیا کە هەمیشە بوودجەکەی کێشەو گرفتی هەیە، بەڵکو بۆ ئەو وڵاتانەش کە بوودجەکەیان رێکو پێکە کارێکی سەخت و زەحمەتە. ئەگەر وای دابنێین ئێمە دەتوانین ئەو برە پارەیە بەدەست بهێنین، هێشتا ئەو پرۆژەیە هیوای جێبەجێبوونی نییە، چونکە ئێمە پێویستمان بە شوێنێکی بەتاڵ هەیە بۆ ئەوەی چی

لەکوردستان هەیە لایەرین. ئێمە لە هەموو شوێنێ لەم جێگایە گەڕاین، بەلاّم هەرگیز دەستمان نەکەوت،

لەلایەکی دیکەوەش بینیمان بۆ ئەوەی کوردستانی چۆلکراو پڕبکەینەوە پێویستە لەسەرمان کەلوپەلی ئامادەکراو پەیدا بکەین، بە دوای ئەم کەلوپەلانە گەڕاین بەلاّم هیچمان بە دەست نەکەوت.لە ئەنجامدا ئێمە ناچارین بە هۆشمەندییەوە بڕیار بدەین کەوا ئەم یاسایە ناتوانرێ جێبەجێ بکرێت. چارەنووسی کوردە دوورخراوەکانی بە ئاسانی دیاریکراوە، ئێمە گومانمان لەوەدا نییە کە لێپرسراوانی ئەنقەرە بە تەواوی نەشارەزا نین لەوەی کە ئەم یاسایە هەروەك خۆی ناتوانرێت جێبەجێ بکرێت. ئەی بۆچی ئەم یاسایە دەرکرا یاخود دانرا؟ تەنها بۆ پاساو هێنانەوەیە دەربارەی ئەو کردەوە ناشیرنانەی کە بەردەوام لە کوردستاندا ئەنجام دەدرا، لەوە دلّنیاین کە ئەم یاسایە نابێتە پاساوێك بۆ ئەم کردەوە دڕندانەیە، هەتا لای ئەو کەسانەش کە یاساکەیان داناوە، لای ئەوانەش کە هەتا ئێستا گرنگی دەدەن بە پاراستنی تورکیای(مستەفا کەمال پاشا). ئێمە وتمان یاساکە لە پێنجی ئایاری سالّی ١٩٣٢ دەرچووە، پاش ماوەیەکی کەم لە دەرچوونەکەی دژایەتییەکی بەهێز لە کوردستان سەریهەلّدا و حکوومەت لەوە ترسا سەرلەنوێ شۆڕشی کورد دەست پێبکاتەوە. جا بۆ ئەوەی رای گشتی هێور بکاتەوە. لەبەر ئەوەی نەیدەتوانی ئەوەی لە یاساکەدا هاتووە بە راستی دانەنێت، جا هیچ لێدوانێکی فەرمی بۆ دەرنەکرد. بەلاّم لە ناو خەلّکاندا وا بلاّوکرایەوە، کە ئەم یاسایە تەنها پڕۆژەیەك بوو لە ژێر لێکۆلّینەوەدا بوو، گفتوگۆ لەسەر جێبەجێکردنەکەی کرا کە بە ١٠ سالّ تەواو ببێت. بەلاّم

بەردەوام بوو لە چەککردنی دانیشتووان، چونکە کورد لەبەر ئەو مەترسییەی کە شەوو رۆژ تیایدا دەژیان، هەموو شتێکی خۆیان فرۆشتبوو، بۆ ئەوەی خۆیان چەکدار بکەن و بەرگری لە خۆیان بکەن دژی ئەو کارە دوژمنکاریانەی کە ئەوان تیایدا مەبەست بوون لەلایەن دەسەڵاتدارانی تورکەوە. ئێستا لێرەدا پوختەی چەند برگەیەکی وتارێك بڵاو دەکەینەوە بە ناونیشانی(دژایەتی کورد لە یاسای دوورخستنەوە) کەلە رۆژنامەیەکی عەرەبی لە دیمەشق دەرچووبوو، رۆژنامەی(القبس)لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٣٤، کە ئەو رووداوانەی دوایی بڵاو دەکاتەوە کە پەیوەندیان بە کێشەی کوردەوە هەیە لە کۆماری تورکیادا.(سێ ساڵە حکوومەتی تورکی یاسای دوورخستنەوەی کوردی دەرکردووە لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵات بۆ ئەنەدۆڵ و ئەدرنە،بۆ ئەوەی لە شوێنی ئەوان تورکەکانی(بەلقان)دابنێت. تا ئێستا ئەم یاسایەی جێبەجێ نەکردووە، بەبۆنەی سەردانی شای ئێران بۆ ئەنقەرە، هەردوو حکوومەت رێککەوتن لەبارەی کێشەی کورد لە یەك کاتدا کە هەیە لە تورکیا و ئێراندا. پاش ئەم رێککەوتنە حکوومەتی ئەنقەرە بەهانەیەکی گونجاوی دەستکەوت بۆ جێبەجێکردنی یاسا کە. بۆ ئەوەی هەر یارمەتییەك لە کورد قەدەغە بکەن، کە دەیانویست بۆ دەرەوە رابکەن، لە هەمان کاتدا لەگەڵ فەرەنسا و ئینگلیز رێککەوت بۆ داخستنی سنوورەکانی سوریا و ئێراق لەبەردەم ئاوارە کوردەکان، ئەوانەی کە دەیانویست پێیدا تێبپەڕن، ئەمەش بە بەکارهێنانی سوپا. پاش ئەوەی حکوومەتی ئەنقەرە دڵنیابوو لە هاوکاریکردنی وڵاتانی دراوسێ، لە هەرێمی(بۆتان)دەستی بە کارکرد، کە هەرێمێکی شاخاوییەو دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا و، هاوسنوورە

لەگەڵ سوریاو ئێراق و ئێران، ئەم شوێنە لە کاتی کارەکانی گواستنەوەدا بەشێوەیەکی فراوان جێگەی ئەوە بوو کە ببێتە پەناگە و خاڵێکی بەرهەڵستکاری کوردەکان و، ئەوانەی هەڵاتوون لەو پرۆسانەی کە دەکرێت لە هەرێمەکانی باکوور. تا بەم شێوەیە ئەنقەرە هەرێمەکەی چۆڵکردو خستیە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، ئەو هەرێمەی کە لەوانەیە چەند بەرژەوەندییەکی ستراتیژیی بۆ کورد هەبێ. لە هەمان کاتدا دانیشتووانیان ناچارکرد بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ دوورخستنەوە، سوپای تورکی پێشتر گەیشتبووە(جزیرەی بۆتان)(ابن عمر)، داگیرکردنی ناوچەی(شرنەخ)کوردیش بەرامبەر فەرمانی دەسەڵاتداران هیچ چارەیەکیان نەبوو، تەنها ئەوە نەبێ رووبکەنە چیا و لادێیە بچووکەکانی هاوینی و چاوەڕوانی چارەنووسیان بن.(کەنعان پاشا)سەرۆک فەیلەقی دیاربەکر بۆ(شرنەخ)گواسترایەوەو، سەرکردایەتی پرۆسەکەی گرتە دەست، کاتێ سەرکردەکە هەستی بەوە کرد کەوا کورد بە پەنابردنیان بۆ چیاکان توانیان لە سوپا رابکەن. لە(جزیرە)وە تۆپخانەیان هێنا کە پێشتر ئامادەکرابوو بۆ ئەو شوێنەو، سەنگەرەکانی کورد تۆپ باران کران. لە قەزای رووباری دیجلە لە سوریا کە هاوسنووری هەرێمی بۆتانە بەتایبەتی لە شەودا هەر لە دوورەوە دەنگی تۆپ و رەشاش دەبیسترا. چەندان کۆمەڵە فرۆکە بۆ تێکدانی گوندەکان بەشداریان کرد، ئەمەش چوار پێنج رۆژی خایاند. لە دوای کاری تۆپباران کردندا هێزی پیادە فەرمانی پشکنین و بەدواگەڕانی پێگەیشت، تا لەم کاتەدا کورد راستەوخۆ رووبەڕووی سوپای تورک بوونەوە. لەبەر ئەوە ئەو کوردانەی کە رێگەی مردنیان هەڵبژاردبوو لە شوێنی لە دایك بوونیان دا، لە جیاتی ئەوەی بۆ بڕینی هەزاران

کیلۆمەتر خۆیان لە دەست بدەن، زۆر بە توندی شەڕیان دەکرد، توانیان دوو(سرییە)ی پیادەی تورک بە دیل بگرن، ئەمەش چەك و ئازووقە و تەقەمەنی بۆ پەیداکردن، تاکو بەردەوام بن لەسەر پارێزگاری کردنی ژیانیان. کاتیّ هۆزەکانی دەورووبەریش هەستیان بە هاتنی مەترسی کرد، بڕیاریاندا پشتیوانی لە هاوولاتیانی خۆیان بکەن و هاتن بۆ رزگارکردنیان. جارێکی دیکە لە ١٥ ی ئابی ساڵی ١٩٢٤، شەڕ دەستیپێکرد لە نێوان سوپاکانی تورك و ئەو کوردانەی کە دانراون بۆ دوورخستنەوە، لەبەر ئەوەی شوێنی جەنگەکە تاشە بەردو پێچاوپێچ بوو، کە لەگەڵ هەڵسوکەوتی سوپایی رێکخراودا ناگونجێت، تورکەکان زیانێکی زۆریان لێکەوتو، ژمارەیەکی زۆر تەقەمەنی جەنگیان بەجێهێشت و کەوتە دەست کوردەکانەوە. ئەم رووداوانەی کە لە کوردستاندا هاتە پێش(شۆڕش)نەبوو، هەروەکو هەندیّ لە رۆژنامەکان نووسیبوویان. بەڵکو دەیانویست لە شوێنی لە دایکبوونیان بەرەو رۆژئاوا دووریان بخەنەوە. رستەی کۆتایی لە وتاری رۆژنامەی(القبس)ماوەمان پێدەدات کەوا چەند وشەیەك بڵێین دەربارەی ئەوانەی کە بە شۆڕشی کوردی ناودەبەن کە چەند رۆژنامەیەك ناوە ناوە باسی دەکەن. لە کوردستاندا شۆڕش و جولانەوەی میللی و گەلیّ جەنگ روویداوە، گومانی تێدانییە کە لە دوارۆژیش دووبارەو نویّ دەبێتەوە، لەبەر ئەوەی کورد نەیانتوانیوە هەبوونێکی نەتەوایەتی بۆ خۆیان دابین بکەن. بەڵام ئەوەی رۆژنامەکان بڵاوی دەکەنەوە راست نییە. ئەوانە شۆڕشی رێکوپێك نین کە سەرکردە کوردەکان رێبەری بکەن، ئەمانە تەنها پێگەیەکن بۆ بەرگریکردن و پارێزگاری لەخۆکردن دژی دەسەڵاتدارییەك کە بەبیّ دوودڵی پێی داگرتووە لەسەر

لەناوبردنی هاوولاتیانی خۆی. ئەوەی یاساکانی سروشت بەشێوەیەکی راست و خۆشویستنی ژیان لێکبداتەوە و، ئەوەی لە یاساکانی سزادان دەزانرێت ئەوەیە کەوا ئەمە بەرگرییەکی رەوایە و دروستە. سەرکردە راستەقینەکانی کورد ئەوانەی کە بڕیاریان داوە لە پێناو سەربەخۆیی ولاتەکەیان خوێنی خۆیان و میللەتەکەیان بکەنە قوربانی، ئەوان هەر دڵۆپێك لەم خوێنەیان لەلا زۆر گرنگە، خوێن دەڕواو بێ ئەوەی ئامانج بێتەدی، ئێمە خوێن نارێژین ئەگەر خۆراکی بۆ ژیانی نەتەوەی کوردی تێدا نەبێ. لەلایەکی دیکەشەوە باری دژوار گونجاوە و سوودی بۆ ئەنقەرە هەیە، کە بە دوای بیانوویەك دەگەڕێ بۆ رشتنی خوێنی کورد. ئەوەی کە باش تێیگەیشتووین ئەوە لە بەرژەوەندی حکوومەتی ئەنقەرە دایە، کە هەندێجار شێوەی شۆڕش بدات بە سەرهەڵدانی ئەم رووداوانە. جا بۆ ئەوەی کارە دڕندایەتیەکانیان بەدیار بخەین، هەندێ لەونامەیە دەدوێم کە لە ناوەوەی ولات بە دەستم گەیشت لە بەرواری ١٨ ئەیلوولی ١٩٣٤، بۆ ئەوەی بتوانم دەربارەی ئەم شۆڕشانە بیرۆکەیەك بخەمە بەردەست. (مەفرەزەیەکی سەربازی کە پێکهاتبوو لە ٢٠ سەرباز، چوونە ماڵی(ئیبراهیم ئاغا)ئەویش کوڕی مامی(محەمەد عەلی یونس)ە، بەبیانووی گەڕان بە دوای چەکدا، ئەمەش پێش چەند رۆژێك، کاتێ خاوەن ماڵ بینی مەفرەزەکە گەیشتۆتە ناو ماڵەکەی، هەوڵیدا ماڵەکەی جێ بهێڵێ و خۆی لە ماڵی یەك لە راوسێیەکان بشارێتەوە، سەربازەکان تەقەیان لێکردو کوشتیان. یەکسەر دوو پیاو لە خزمەتکارەکانی بۆ شوێنی رووداوەکە رایانکرد، بەلام هەردووکیان درانە بەر قامچی، کاتێ خزم و کەسوکاری کوژراو بەم هەواڵەیان زانی، سەیریانکرد مەترسی لێیان نزیك بۆتەوە، خۆیان چەکدار

کردو هەوڵیاندا لادێ جێ بهێڵن. مەفرەزەکەش شوێنیان کەوتن و تەقەیان لێکردن. کورد دژە هێرشیان دەستپێکرد عەریفێك و دوو سەربازیان کوشت. پاشان گەیشتنە شاخ، دەسەڵاتداران بەم هەواڵەیان زانی و چەند مەفرەزەیەکی دیکەیان هەنارد. ئا ئەمەیە پێی دەڵێن شۆڕشەکانی کورد. سەرکردە کوردەکانیش بەوە تاوانبار دەکەن کە بوونەتە هۆی پاشگەزبوونەوەی هاوولاتییەکانیان. با بگەڕێینەوە لای مەبەستی بابەتەکەمان. پاش رووداوەکانی(بۆتان)بە تەواوی نازانین بۆچی سەرۆك فەیلەقی لە ناکاو گەڕایەوە بۆ دیاربەکر و کارە سەربازییەکان وەستێنران؟!. بەشێوەیەکی بەردەوام و بەشێوەیەکی تایبەتی دانیشتووانی بێ چەك لە ئافرەت و پیرو منداڵان ئەنجامەکانی ئەم کارە سەربازییە پڕ نەهامەتییە دەبووە بارگرانی بەسەریاندا. لە شەوی ٢٦/٢٧ی ئەیلوول سی و دوو پیاوی ماقوڵی هەرێمی بۆتان دەست بەسەرکران، نەیان هێشت کەس بیان بینێ، هەتا ماوەی ئەوەشیان پێ نەدان لە کاتی گرتنیاندا دوا قسەیان بۆ نزیکترین کەسیان بڵێن، لە هەمان شەودا ئەم پیاوە ماقوڵانە نێردران بۆ دیاربەکر. بەگوێرەی ئەو زانیاریانەی کە لە چەند شوێنێکی هەمەجۆر لە بۆتانەوە پێمان گەیشت، دەیان کوردی دیکە دەست بەسەرکران و بەرەو رۆژهەڵات نێردراون، بە تۆمەتی ئەوەی هەستی نەتەوەیی دانیشتووانیان وروژاندووە بە وتنی گۆرانی و سروودی پاڵەوانییەتی سەرکردە کوردە شۆڕشگێڕەکان کە لە گۆڕەپانی شەرەفدا گیانیان سپارد. پاش ئەوەی پیاو ماقوڵانی بۆتان گەیشتنە دیاربەکر، یەکسەر ئازاد کران، لە رۆژی دواییشدا کەنعان پاشا بۆ ئەنجوومەنی سەربازی دیاربەکر بانگی کردن لە کاتژمێری پێنجدا، بەرێزەوە

پێشوازی لێکردن، وەك چەند کۆنە هاوڕێیەك. کاتێ سەرۆك فەیلەق هەستی پێکرد کە پێویستە لەوە زیاتر ڕێزیان لێ بگیرێت، ئەوانی بۆ سینەمای خێزانی ئەفسەران بانگهێشت کرد، لە ڕۆژی دواییدا دوورخراوەکان گەیشتە شوێنی نیشتەجێبوونیان بێ ئەوەی چاوەڕوانی داوەت نامەیەکی دیکە بکەن. دوای ئەویش سوپاسی خاوەن داوەت نامەکانیان کرد. لەم ماوەیەدا چی ڕوویداوە کەوا دەسەڵاتداران ناچار بکات لە ناکاو هەڵوێستی خۆیان بگۆڕن؟، ئەوە مەترسی هەڵسانەوەی چەکداری و بەرپاکردنی شۆڕش، هەواڵی دوورخستنەوەی ئەم پیاوە ماقوڵانە کە بە بەشێکی کوردستاندا تێپەڕین بۆ گەیشتن بە دیاربەکر، یەکسەر لە هەموو وڵاتدا ئەمە زانرا. ڕای گشتی دەستی بە وروژان کرد و خەڵك دەربارەی شتی پڕ مەترسی دەدوان، دەربارەی خۆ ئامادەکردن بۆ بەرگری گیانیان خستووە سەردەست لە پێناو ئەرکی نەتەوایەتی. هەرچەندە چەند ساڵێك بوو چەك داماڵین پیادە کرابوو، کاتێ حکوومەتی ئەنقەرە ترسا لەوەی هۆکارێ دروست ببێ بۆ هەڵسانەوەی چەکداری، وای بەباشزانی کە ڕازی ببێ بەو چەندان قوربانییە نوێیەی کە لە بۆتاندا لە دەستیداوە. جا فەرمانی گەڕاندنەوەی دانیشتووانی جزیرەی بۆ بۆتان دەرکرد. وەها دەردەکەوێ حکوومەتی ئەنقەرە چۆن یاسای دوورخستنەوە جێبەجێ دەکات کە پیادەکردنەکەی دژوارە. ناوە ناوەش هێرشی دەکرد سەر هەرێمە کوردییەکان. ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە هیچ کاتێ حکوومەتی ئەنقەرە لە ناوبردنی میللەتی کوردی لە بیر نەکردووە، هەتاکو ئەم چەوسانەوەیەش چەندان ساڵی دیکە بەرێت. بۆ بەختەوەری لێپرسراوانی ئەنقەرە هەردەم بۆ شەرکەرەکانی گۆشتی تازەی مرۆڤیان هەبوو لە

دانیشتووانە بێ چەك و بێ تاوانەکان، بۆ ئەوەی لە خوێنی ئەم کوردە بێ تاوانانە گەرماو ساز بکەن. ئەوەی لێرەدا هەموومان پیشاندا، زۆر بە ئاشکرایی دەبینین یاسای دوورخستنەوە تەنها بیانوویەکی نوێیە کە چەند رێگایەکی نوێ پێك دەهێنێ بۆ لێپرسراوانی ئەنقەرە بۆ چەوساندنەوەی میللەتی کورد. لە سەردەمێکدا دەبینین ئاژەڵان پارێزگاریان لێ دەکرێت لە هەموو شێوە دوژمنکاری و قەسابخانەییدا. بەڵام دەربارەی ئارمانجی سەرکردە کوردەکان، ئەمە زۆر سادە و ساکارە، ئەویش دابینکردنی هەبوونی نەتەوەیی میللەتەکەیان بوو کە دووربێت لە هەر کارێکی دوژمنکاری، سەرکردە کوردەکان لە هەموو شوێنێ راوەدوو دەنرێن، لەوانەیە تووشی تەنگ و چەڵەمەش بووبن، بەڵام هیچ کاتێ نائومێد نەبووینە. ئەوان سادە و ساکارن، دەزانن چیان دەوێ. سووریشن بۆ ئەوەی بەدەستیبهێنن. ئەوان بۆ شەهیدانی میللەتەکەیان دەگرین، لەوە دڵنیان کە(راستی هەنگاو دەنێ و هیچ شتێ ناتوانێ بیوەستێنێ). بۆ ئەوەی دوانەکە کۆتایی پێبهێنین، چەند دێرێکی کۆتایی وەردەگرین لە وتەی فەرهەنگی دیبلۆماسی کە دوا رستە بێ بۆ ئێمە. لێکدانەوەی(باسل نیکیتین)دەربارەی کێشەی کورد. لە کۆتایی لەم چەند باسە کورتەدا دڵنیابوونی خۆمان روون دەکەینەوە کە(هەر پێشهاتێك رووبەڕووی کێشەی کورد ببێتەوە، لەلایەنی رەوشتییەوە، لە ویژدانی نێودەوڵەتیدا ماوە نادرێت رەنگ و رووخسارە راستەقینەکەی پشتگوێ بخرێت. لەلایەنی دادوەرییەوە هەرگیز ئەوە نابێت کە ئەم کێشەیە ناپەسەند و ناشیرین بکرێت. دەبێ بخرێتە جۆرە چارەسەریەکی راست و شایستە بەو تێگەیشتنانەی کە کەلتووری هاوچەرخ و نوێی مرۆڤ پێکدەهێنن.

پەراوێزەکان:

١ ـ کۆنگرەی سیڤەر لە ١٢ ی ئابی ١٩٢٠ بەسترا. ئەمەش دەقی تەواوی ئەو بەندانەیە کە پەیوەندی بە کوردستانەوە هەیە:ـ

مادده ژمارە(٦٢):

پێویستە لەسەر لیژنەی سێ قوڵی کە سەردانی ئەستەنبوڵ دەکات، کە پێکهاتووە لە نوێنەرانی حکوومەتی بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتاڵیا، لە ماوەی شەش مانگدا دەست بکرێت بە پیادەکردنی کاریگەری ئەم رێککەوتننامەیە و ئامادەکاری بۆ دامەزراندنی فەرمانڕەوایی خۆجێیەتی بۆ ئەو هەرێمانەی کە زۆرینەی کوردن، کە لە رۆژهەڵاتی(فورات)ەوە درێژ دەبێتەوە بۆ سنوورەکانی باشووری ئەرمینیا. کە پێویستە لە دواجاردا لەگەڵ باکووری سنوورەکانی سوریا و تورکیا، هەروەها ئەوەی لە نێوان (دوو زێ) کەدا یەکبگرێتەوە، بەگوێرەی ئەو باسکردنەی کە هاتووە لە بەندی ٢٧ بڕگەی (دوو، سێ)، لەباری رێکنەکەوتنی بە کۆی دەنگ تایبەت بە هەر کێشەیەك لە نێوان ئەندامەکاندا ئەوەی دوایی لەلایەن ئەندامانی لیژنەکەوە بۆ حکوومەتەکانیان بەرز دەکرێتەوە کە نوێنەرایەتیان دەکەن. پێویستە ئەم پرۆژەیەش بریتی بێ لە دابینکردنی هەموو جۆرە مافێکی ئاشوورییەکان و کەسانی دیکە لە کەمایەتی رەگەزی و تایفە ئاینییەکان. لە ناو ئەم هەرێمانەدا –بۆ ئەم مەبەستە، پێویستە لەسەر لیژنەی کە پێکهاتووە لە نوێنەرانی بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتاڵیا و نوێنەرانی فارس و کورد لە کاتی پێویستیدا سەردانی شوێنەکان بکەن، بڕیاریش بدەن لەسەر دەسکاریکردنی

پێویست لەسەر سنوورەکانی تورکیا لەو هەرێمانەی کەوا لەتەك سنووری ئێرانن، بەگوێرەی بەندەکانی رێککەوتنی ئێستا.

ماددەی ژمارە(٦٣):

حکوومەتی عوسمانی لە ئێستا بە دواوە پابەند دەبێت بە داننان و جێبەجێکردنی بڕیارەکانی ئەو دوو لێژنەیەی کە دامەزراون بەگوێرەی مادەی ٦٢ لە ماوەی سێ مانگ لە کاتی راگەیاندنی دا، ئەمەش زۆر پێویستە کە تەواو ببێ.

ماددەی ژمارە(٦٤):

لە بارەی گەڕانەوەی دانیشتووانە کوردەکان بۆ هەرێمەکانیان کە ئاماژەیان بۆ کراوە لە ماددەی٦٢ لەو رێککەوتننامەیەدا، بۆ ماوەی ساڵێك لە کاتی کار پێکردنی رێککەوتننامەکە بۆ ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان، ئاماژە بەمە بکەن کە زۆرینەی دانیشووانی ئەم هەرێمانە ئارەزووی جیابوونەوە لە تورکیا دەکەنە لەو کاتەدا ئەگەر ئەنجوومەن بینی دانشیشتووانەکە تواناو بەهرەی ئەم سەربەخۆییەیان هەیە، ئەویش پێشنیاری ئەوەیان بۆ دەکات کە پێیان بدرێت. تا لەم کاتەدا تورکیا هەر لەم بەروارەوە پابەند دەبێت بەم پێشنیارەو وازهێنان لە هەر ماف و دەسترۆییەك کە لەم هەرێمانەدا هەیەتی.وردەکارییەکانی ئەم وازهێنانە ماددەیەك پێکدەهێنن لە پەیمانێکی تایبەتی نێوان وڵاتانی هاوپەیمانی بنەڕەتی و تورکیادا، ئەگەر ئەم وازهێنانە بەراستی جێبەجێکراو و وڵاتانی هاوپەیمانی گەورە و بنەڕەتی هیچ جۆرە لارییەکیان دژی لکاندنی کوردەکان پێشکەش نەکرد، کە ژیان دەبەنە سەر لە ئەو بەشەی کوردستان کە تا

ئێستاش سەر بە ویلایەتی مووسڵە، هیچ رێگرییەك نییە بۆ لكاندنیان بە ئەم دەوڵەتە سەربەخۆیە.

٢ پەیماننامەی لۆزان ٢٣ ی تەمموزی ١٩٢٣:

بەندی(٣٨):

حكوومەتی توركیا پەیمان دەدات بۆ دابینكردنی بەرگریكردنێكی تەواو كاریگەر لە ژیان و سەربەستی هاووڵاتیان، بێ جیاوازیكردن لە رەگەز و نەتەوە و بنەچەكە یاخود ئایین.

بەندی(٣٩):

هیچ جۆرە پێوەندییەك ناخرێتە بەردەم هەر هاووڵاتییەكی توركیایی دەربارەی بە ئارەزوو دوان بە هەر زمانێك بێت، ئەگەر ئەمە لە پەیوەندییە تایبەتییەكان بوو یاخود بازرگانی، یاخود لە بواری ئایین و راگەیاندن و یان چاپكراوە هەمەجۆرەكان یان لە كۆڕو كۆبوونەوە گشتییەكاندا.

(٣) هراكول ئازیزان ـ أبوا جەمشید– میری بۆتان ـ بلەج شێركۆ ـ گەشتوان ئەم نازناوانەی بەكاردەهێنا كە میر جەلادەت بەدرخان ناوی هێنابوون.

# کورد و کوردستان

وەرگێڕانی لە فارسییەوە
پ.ی.د.هیمداد حسین

بنەچەو سەرچاوەی نـژادی کـورد بۆتـە هـۆی گفتوگـۆو لێـدوان لـەلای زانایـان نیکـتین Nikitineلـە کتێبـی LesKurdes وای نووسـیوە:(دەربـارەی ڕیـشەی نـژادی کـورد هـەتا ئێـستا دوو تێورلـە ئارادایە.یەکەمیان ئەوەیە کە ئێرانین ولە سـەدەی حەفتـەمی پـێش زایـین لـە دەوروبـەری دەریاچـەی (ورمـێ)دا نیـشتەجێ بوونـەو لـەوێوە بۆناوچـەکانی دیکـەی کوردسـتان کۆچـیان کـردووە).تێۆرەکـەی دییان،لـەو باوەڕەدایە"کـە کوردەکـان وەك میللـەتانی دی ئاسـیایی، وەك خالدییـەکان ،گـورجی، ئەرمەنیەکان نژادێکی سەربەخۆیان هەیەو دوایێ چونکێ زمانەکەی خۆیان لـە نێوچـووە زمـانی ئێرانییـەکانیان بـەکارهیناوە. دەربـارەی مێـژووی دێرینـی سـەرزەمینەکانی ئاسـیای رۆژئـاوا شـتێکی ئـەو تـۆ دیـار نییـە،دەبێ روون بکرێنەوە، ئەوەی کە ئاشکراو روونە ئەوەیـە:لـە بـەرایی مێـژوودا ، خـەڵك لـە کێوە بەرزەکانی لای دەشتایی(بین النهرین)داژیاون و لەگەڵ دەشتنشینەکانی وێندەرێ لە لێدان و کوتاندا بوونە . لـەم بەیەکدا چوونەشیاندا هەنـدێ جار چـیا نـشینەکان شکـستییان هینـاوەو هەنـدێ جـاریش سـەرکەوتوون .بـە

هەرحاڵ چ بە هۆی کۆچکردنی نیشتەجێ بووەکانی پێش خۆیان بووبێ یان بە هۆی ئەم لاو ئەولا کردنیخۆیان بوو بێ لە سەدەی حەفتەمی پێش زاینیدا، ئەم دەستەیە کوردستانیان داگیرکردووە .ئەم داگیر کەرە تازانەش، تیرەو هۆزی هاو خوێنیو هاونەژادی کوردەکانی ئێستا بوونە. بۆ یەکەمین جار دوای سەر کەوتنی عەرەب بەسەر ئێرانیاندا (لە سەدەی حەفتەمی زاینیدا ) لەکاتی ساخکردنەوەی نەتەوەکاندا ، ناوی کوردیش هاتۆتە نێو ناوانەوە. ناوەی کوردستان، کە نسبەتە بۆ سەر زەمینی کوردەکان بۆ یەکەمین جار لە سە دەی ١٢ی زاینییدا لە زەمانی فەرمانڕەوایی سوڵتان(سنجر)دا بەکارهاتووە . ناوبراو ناوچەیێکی پانوپۆری بەم ناوە ناو بردووە.لە سەدەی پازدەهەمدا ئەم سەرزەمینە فرەوانە لێکجودابۆتەوەو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ،ئەو بەشەی، کە کوردەکان زۆرینەیان لێپێکهێنا بوو ،لە ئێران جیاکردەوەو ناوی نا( کوردستان).دوای کەوتنی (نە ینەوا) لەسالی ٦١٢ ی پێش زاینیدا کە ئێرانی یەکان ئیمپراتۆریەتی ئاشورییان لە نێو برد، تاجەنگی (چالدێران) لە ساڵی ١٥١٤ ی زایینی کوردستان لە باوەشی ئێراندا مایەوە . لەو کاتە بەدواوە دابەش بوو بۆ سەردوو بەش و بەشی زۆرینەی کەوتە ژێر دەستەلاتی دەوڵەتی عوسمانییەوە . کوردەکان لە رووی مەزهەبیەوە ، بەرۆژ پەرستی ، زەردەشتی ، مەسیحی ، مانگ پەر ستیدا تێپەریون و سەرەنجام بە ئاینی ئیسلام گیرساونەتەوە.لە رووی فەرمانڕەواییەوە ، لەم چەند هەزار ساڵە، هەندێ جار ڕابەرانی وا هەبوونە لە نێو عەشیرەتە کوردە کانەوە هەلساونەتەوەو فەرمانڕەواییان پێکهێناوەو یەك دوو سەدە بەردەوام بوونەو ئاقیبەت یان خۆیان بەدەست دەوڵەتە

گەورەکان داوە یان بەهۆی عەشیرەتەکانی دییەوە لەنێو چوونە .

لـەنێو خانـەدانانی شـاهان، لـە هـەموو یـان نـاودارتر خانـەدانی ئەیوبییەکانە ، بە تایبە تی کەسیەتی (صلاح الدین)، بـە درێـژایی مێـژوو بـۆ کوردستان ،هەر یـەك شـتەو نـەگۆڕاوە ، خـەڵکی بەرامبـەر بێگانـە ئـازایی و نەبەردییان نواندووە و دژی داگیر کـەر راپـەڕیون .لـە کـاتی لاوازی دەوڵەتـە داگیرکەرەکاندا ، سەرۆکەکان ئۆتۆنۆمیـان وەردەگـرت وخۆشـحاڵ دەبـوون . کاتێ ئیمپرا تۆریش بە هێز بووایە ئـەو دەسـتەیەی گـەورەکان ، کـە لـە مـێر ئۆتۆنۆمییـان وەرنـەگرتبوو، دژی ئـەو دەسـتەیەی ، کـە ئۆتـۆ نۆمییـان وەر گرتبوو رادەپەڕین و حکومەتەکـەی ئـەوانیان لـە نێـو دەبـرد ، چـونکە بـەلای سەرۆکە کوردەکانەوە سەر بەحکومەتێکی دەرەوە ، ئاسانتربوو لە وەی، کـە یـەکی لـە نـەیارانی خۆیـان فـەرمانڕەواییان بکـات. لەسـەرەتای سـەدەی شازدەهەمی زاینیدا ، ئێران و تورکیا ، بە دوو هێزی گەورەی ئاسیای رۆژئـاوا دەژمێردران . ئەم دوو هێزە مەزنە ، نیوەی زێتری ساڵانی ١٥١٤ -١٦٣٩ ی زایێنی لەگەڵ یەکدا لە جەنگدا بوون . لە رووی بنکەوە ، کوردەکان دەبووایە لەم ماوەیەدا یەکدیگر بونایەو تـەرازووی ئـەم هێزانـەیان لاسـەنگ نەکردایـە . بەڵام بەهۆی دوو روویی لە نێوانیاندا پەراگەندە بوون .لە هەمووشیان خراپتر ئەوەبوو، کە (حەکیم ئیـدریس) حـاکمی (پتلـیس) پـەیمانی لەگـەڵ دەوڵـەتی عوسمانیـدا بەسـتبوو لەگـەڵ ئۆتۆنۆمییەکـەی خـۆی، سـنورەکانی دەوڵـەتی عوسمانی لە گورجستانەوە تا باشوری کێوەکانی زاگرۆس بپارێزێت .ئەو کاتە بە نەریتی ئاسایی پارەی بەناوی خۆیـەوە چـاپ کـردو لـە خوتبـە نـاوی ئـەو دەخوێندرایـەوە. ئـەم ئاکـارە یـەك دوو سـەدە بـەردەوام بـوو. لـە ئێـرانیش

بارودۆخ بە هەمان شێوە بوو ، لەگەڵ ئەوەی، ، کە کەریم خانی زەند لە کوردەکانیش بوو، دروشمی یەکگرتنی هەڵنەگرتبوو. لەدوای کەریم خان ، چونکێ دەستەڵات کەوتە دەست لوتف عەلی خان، سەرۆکە کوردەکانی ئەردەڵان بەشدارییان لەگەڵ ئەو یەکیەتییەدا کرد ، کە لە باکووری وڵات دژی لوتف عەلی خەباتی دەکرد. ساڵی ١٨٢٦ سولتان مەحموودی دووەم بەنیازی فراوان کردنی دەستەڵاتی خۆی، خۆی گەیاندە نێو کوردستان ، لەو کاتەدا کوردەکان بەرامبەر تورکە عوسمانیەکان راپەڕین و پیاوانە پێیان داگرت ، نێزیکەی چارەکە سەدەیەك شەڕو شۆڕ بەردەوام بوو . سەرەنجام شۆڕش دامرکایەوەو کوردەکان لەو مافانەی ، کە پێشترێ هە یانبوو بێبەش بوون . هۆی ئەم شکانەیان ئەوەبوو ، کە سەرۆکە کوردەکان دەستەڵاتی خۆیان لە نێو جووتیاران وخەڵکی رەشو رووتدا بە زۆر سە پاندبوو و نەیانتوانی کۆیان بکەنەوە .

لەگەڵ ئەوە شەوە بە درێژایی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم شۆڕش لە کوردستانی عوسمانی بەردەوام بوو . ساڵی ١٨٤٣ میر بەدرخان لە (جزیرە ابن عمر) لە بۆتان راپەڕی بۆ ئەوەی ئازادییەکی زۆرتر وەدەست بێنێ و لە زەبری بەندیەتی تورکانی عوسمانی رزگاری ببێ . شۆڕشی میر بەدرخان دەتوانرێ بە یەکەم کۆشش و راپەڕینی نەتەوایەتی دابندرێت . چونکێ میر بەدرخان داوای دەکرد حکومەتێکی کۆنفیدرالی لە کوردستاندا بێنێتە کایەوەو خۆی سەرۆکایەتی بکات. شەڕەکانی میر بەدرخان چوار ساڵ درێژەی کێشا . دەربارەی رێڕەو و رێبازی حکومەتەکەی میر بەدرخان کۆمیسیۆنی ئەمەریکایی رایگەیاندووە ، کە بە چاکی بە عەدالەت لەگەڵ

خەڵکی رەفتاری کردووە . میر بەدرخان لەگەڵ دۆست و یارەکانی دی ، کە لە کوردەکانی ئەردەلان بوون ، هێزێکی گەورەی پێکەوەناو (باب عالی) خستە مەترسیەوە . چونکە ئێرانییەکان توانای ئەوەیان هەبوو پارێزگاری لە کوردەکان بکەن و مەسەلە قووڵ بووەوە، بۆیە باب عالی بە پەلە عوسمان پاشای رووبەروو کردنەوە . بەدرخان ، کە ئەوندە یارو دۆستەی نەبوون بەرامبەر عوسمان پاشا خۆیان بگرن بۆیە دوای چەند تێیکهەڵچونێك سەرەنجام لە ساڵی ١٨٤٧ دا خۆی بەدەستەوە دا عوسمان پاشا ، میر بەدرخانی لە کوردستان دوور خستەوەو شۆڕشەکەی بەبێ ئەنجام کۆتایی پێهێنا .لە ساڵی ١٨٤٩ دا سوڵتانی عوسمانی حکومەتی کوردیی (پتلیس) . کە حەکیم ئیدریس دایمەزراند بوو ، حکومەتی (بابانی)ی سلێمانی و گشت حکومەتە ناو خۆییەکانی دیکە ، کە لە سەرەتای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ئۆتۆنۆمییان هەبوو ، بۆ ئێجگارەکی خستنیەوە ژێر فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە . هەرکە دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ رووسیای تەزاری لە (کریمە) کەوتە شەڕ، کوردەکان بە هەلێکی چاکیان زانی و لە (هەکاری) کەوتنەوە شۆڕشکردن . لە هەمان کاتدا (نەستوریەکانیش) لەگەڵ کوردەکاندا یەکیان گرت و ئاژاوە لە ناحیەی(وان )ەوە تا بەغدا تەنییەوە ، سەرئەنجام رابەری راپەریوەکان ، کە (یەزدان شێر)ی ناوبوو دەستگیربوو و رەوانەی ئەستمبوڵیان کرد . لە ساڵی ١٨٨١ دا شێخ (عبیداللّەی نەهری) بە هاندانی دەوڵەتی عوسمانی هێرشی کردبووە سەر ئێران ، لە ئاکامدا ئەو دەوڵەتە (دەوڵەتی عوسمانی وەرگێر) لە ژێر کارتێکەری رووسیاو ئینگلستان ناچار بوو هاوکاری ئێران بکاو شێخ عبیداللّە بۆ (مەککە)دوور بخاتەوە.لە

ساڵی ١٨٩٢دا دەوڵەتی عوسمانی ، چەند کوردێکی رەوانەی خوێندنگاکانی (عەشایری) لە ئەستمبوڵ کرد ، مەبەستی تورکیا ئەوەبوو، کە کوردەکان و عەرەبەکان بە هۆی خوێندنی سووپایی بەرامبەر بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەرسی وەفاداریان بدرێ ، پایەی سەربازییان بدرێتێ ، بەلام ئەم تاقیکردنەوەیە پایەدار نەمایەوەو لە نێو چوو. شێخ عبیدللّە، کە لە (مەککە)، لە دوورخراوەیی ژیانی بە سەر دەبرد ، لە ساڵی ١٨٧٨دا نامەیەکی بۆ جێگری کۆنسولی ئینگلیز نووسیووەو ئەوەی وەدرخستووە: (کورد میللەتێکی جیایە ، فەرهنگ و داب ونەرێتی لەگەڵ هی دیکە جیایە).ئایدیای سیاسی ناسیونالیستی رۆژئاوایی ، کە هەر میللەتێك دەبێ لە ناوچەکەی خۆی سەربەخۆبێ ، لە ئەورووپاوە بۆ ئاسیای رۆژئاوا شۆڕ دەبۆوە . شێخ عبیدللّە ، کە خۆی یەکێ لە خاوەن زەوی و فێودالە گەورەکان بوو ، لە ڕووی ماددیو مەعنەوییەوە لە نێو خەڵکیدا دەستەلاتی هەبوو ، بەلام قسەکانی دەربارەی ناسیونالیستی بە پێچەوانەو دژی ڕێ و شوێنی ئیسلامی و ئاکاری خەلیفەی عوسمانی بوو . ئیسلام لە رۆژی هەوەڵیەوە ، لەگەڵ ئەوەی، کە ڕێزی مافەکانی خەڵکی گرتووە ، بڕوای وایە ، کە هەموو موسلمانان دەبێ لە ژێر سایەی یەك کۆمەڵ و یەك حکومەتدا بن . دەزگای خیلافەتی عوسمانی ، کە بە چاکیی لەم بابەتە تێگەیشتبوو ، بەم پێیە کاری خۆی دەکرد . حوکمڕانانی کوردیش خۆش باوەڕبوون وایان دەزانی ئەگەر ئۆتۆنۆمییان هەبێ ، دەتوانن لە باوەشی حکومەتی عوسمانیدا بژین . کاتێ حکومەتی عوسمانیی بڕیاری هاتنە ناوەوی کوردستانی داو ویستی سەرکردە تورکەکان لەوێ دابمەزرێنێ ، نارەحەتی دەستی پێکرد ، ئەم کارە دەست درێژی بوو

بۆ سەر ئازادی و فیکری نەتەوەی کورد ، بۆیە کوردەکان ڕێگەیێکی دیکەیان نەما جگە لەوەی ڕوو لە ئەندێشەی نیشتیمانپەروەری نەکەن و بە ناچاری ئەم ڕێگەیان هەڵبژارد . لە دوای شۆڕشەکانی ١٩٠٨ دا لاوەتورکەکان چەندان ئەنجومەنییان لە ژێر چاودێری ڕۆشنبیران ، لە ئەستەمبوڵ و موسڵ و بەغداو دیار بەکر و گشت ناوچەکانی دی پێکهێنا . ئەو کوردانەی ، کە ئەم تاقیکردنەوەیان لە ئەستەمبوڵ بینی ، ئەوانیش بە بۆنەی دوورخرانەوەی خانەدانانی (بەدرخان ) و (بابان ) بۆ سویس و فرەنسەو هەندێ هۆی دی ، چەند ئەنجومەنێکیان بۆ خۆ یان دامەزراند . خاوەن زەویەکان و فێوداڵی دێهاتەکان ، ڕوویان نەدایە ئەم ڕۆشنبیرانە. سەرۆك هۆزەکانیش بە بێ دین و شۆڕشگێریان دادەنان و بە بەدگومانییەوە تێیان دەڕوانین . پەرلەمانی تازەی ئەستەمبوڵ لە ڕووی پێوەندی سیاسییەوە هیچ سوودێکی بە کوردەکان نەگەیاند . سەرئەنجام ، مانۆرە سیاسییەکان ڕۆشنبیرەکانی ڕووبەڕووی چالاکی سەڕبازی ببوونەوەو ڕۆشنبیرەکان هیچیان بە دەستەوە نەمابوو. هەتا کارێکی زۆر بچووکی سیاسییان لە ئەنجومەنەکان بکردبایە خەڵکی یەکسەر پێیان دەزانی ، چونکێ حکومەتی عوسمانی زۆر بە وردی چاودێری دەکردن ، تا لە ساڵی ١٩٠٩دا لە نێوچوون .لە ساڵی ١٩١٠دا ئەنجومەنی قوتابیان و یاساناسان دامەزرا . لەم بوارەشدا چاودێری هۆزگەریەتی دەستی بە سەر مەبەستی نەتەوایەتیدا گرت . کار گەیشتە ئەوەی، کە لایەنگرانی (بەدرخان)و (عبدالقادر) لە یەکتری کەوتبوونە کاری سیخوڕی و کاربەدەستە توورکەکانیش لە پشت پەردەوە ئاگایان لە هەموو شتێك هەبوو.

ئەمە بوو سەرئەنجامی بزووتنەوە (ناسیونالیست)ە نەتەوایەتییەکان، کە لە کۆتاییدا بووە هۆی سڕینەوەی ناوی ئیمپڕتۆریەتی عوسمانی لەسەر رووی رۆژگار . دەوڵەتی عوسمانی جەنگی جیهانی بە جەنگێکی پیرۆز لە قەڵەم دەداو جاڕی خۆبەخت کردن(جیهاد)ی رادێرا . کوردە دڵسافەکان بە دڵخۆشییەوە پێشوازییان لە بانگی خۆبەخت کردن کردو خۆیان بۆ گیان بەخت کردن لە پێناو خەلیفەی موسڵمانان ئامادە کرد . بەشێك لە کار بەدەستە ئاینییەکانی کورد ، ئەم جەنگەیان بە جەنگی خۆبەخت کردن(جیهاد) دا نەناو بە پێچەوانەوەی ئەوە هەڵسانەوە. ڕۆشنبیرەکان جەنگیان بە هەلزانی بۆ بیری (ناسیۆنالیستی) خۆیان ، بەڵام کوردەکان هیچ سوودێکیان لە جەنگ نەبینی . لەگەڵ ئەوەی ڕووسیا کوردەکانی بە ئومێد کردبوو ، بە هەموو وەختەکێ ، بەڵام شێوەی سیاسی ئەم وڵاتە (ڕووسیا –وەرگێڕ) پشتیوانی ئەرمەنییەکانی لە سەر حسێبی کوردەکان دەکرد . ڕووسیا هیچ کاتێك رووی رەزامەندی لە کوردەکان نەکردۆتەوە ، بەڵام جار جار بۆتە هۆی ڕاپەڕینیان .

ملیۆنێك ئەرمەنی هەڕەشەیان لە (باب عالی) دەکرد . سوڵتانی عوسمانییش کوردەکانی بۆ لە نێوبردنی ئەرمەنییەکان بەکار دەهێنا . کاتێ جەنگ دەستی پێکرد، کوردەکان ، لە پێناو سودی دەوڵەتی عوسمانی هاتنە مەیدانەوە . هێزەکانی رووس، کە لە ساڵی ۱۹۰۹ دا لە ئێران بوو ، وەك لێشاو بەرەو کوردستان شۆڕبونەوەو ئەو ناوچەیەیان داگیرکرد، لەوە بەدوا کوشتاری کورد ، لەلایەن رووس و ئەرمەنی و ئاسوورییەوە دەستی پێکرد . قات و قڕی و نەخۆشی و تاعون بڵاوبووەوە . کوشت و کوشتاری ئەو رۆژگارە سەختەو کۆچکردن ، بووە بەشی هۆزە کوردەکان و بەناوی خۆبەخت کردن و بە

شانازییەوە لە پێناو سوڵتان خۆیان بە کوشت دەدا .ساڵی ١٩١٥ ، هێشتاش (لاوە تورکەکان) باوەڕیان وابوو ، کە وڵات رووی لە سەرکەوتنە، لە بەر ئەوە ئەم تێڕوانینە سیاسەتی دەوڵەتی پێشوو نسبەت بە میللەتانی نێو ئیمپراتۆریەت بە چاکی پشتگیری دەکرد ، سەرەڕای ئەوە لاوە تورکەکان نەخشەو پلانێکی وایان دانایەوە کوردەکانیان ناچار کرد بەرەو رۆژئاوای (ئەنادۆڵ) کۆچ بکەن و یەك سەر بە (تورك) لە قەڵەمیان بدەن . لە مارتی ١٩١٨ دا برست لیتۆفسك **Brst Litovsk** کۆتایی بە جەنگی ڕووسیاو عوسمانی هێنا . سوپای ڕووس، کە هیچی بە سەر هیچەوە نەمابوو ، بەهۆی تێکۆشانی (مصگفی کمال) لە ئەرمەنستان و کوردستان دەستەلاتیان لەو شوێنانە نەماو هەروەها ئەو دەوڵەتە (ڕووسیا – وەرگێر)خۆیشی لە ناوەوە گرفتاری شۆڕش بوو . ئیمپراتۆری عوسمانییش ، کە لە ڕووی سوپاییەوە بارودۆخی تەواو نەبوو ، ڕۆژی ٣١ ی ئۆکتۆبەری ١٩١٨ لەسەر کەشتی ئاگامینۆن **H.M.Agmenon** کە سەرپەرشتی دەریای (بۆسفۆر)ی دەکرد ، بڕیاری شەڕی لەگەڵ هاوپەیمانەکان ئیمزا کرد، ئەوەی کە لە بڕیارەکەدا هاتبوو و هەردوولا لە سەری رێکەوتبوون ئەوە بوو (ئەو سەر زەمینانەی ، کە تا ڕۆژی ٣٠ی ئۆکتۆبەر داگیر نەکراوە ، بە هیچ شێوەیێك نابی دابەش بکرێ) لە گەڵ ئەوەشەوە، هێزەکانی ئینگلیز لە سێی نۆڤەمبەر (موسڵ)یان هینایە ژێر دەستەڵاتی خۆیانەوە (واتا زێتر ئەو ناوچانەی، کە ئەوڕۆ پێیان دەوترێ کوردستانی عێراق) .تورکەکان بەرامبەر ئەو کارەی ئینگلیزەکان نارەزاییان دەربڕی و پێیان گوتن، کە ئەم کارەیان دژی شتی (ڕۆحی)یە ، وە هەروەها بە ئینگلیزەکانیان ڕاگەیاند ، کە خەڵکی کوردستان حەز دەکەن سەر بە یەکێ لە

پارێزگاکانی تورکان بن و لە ژێر ئالاّی ئەم ولاّتەدا بژین ،چونکە هەڵوێستی تورکیا ئاشکرا و ڕوون نەبوو، کوردەکان بەرامبەر بە پایەی ئاینی خەلیفە وەفادار مابوونەوە . تورکەکانیش بۆ سەرنج ڕاکێشانی کوردەکان هەموو کۆششێکیان پشتگوێ نەدەخست بۆئەوەی جێگای باوەڕی کوردەکان بن . لە لایەکی دیکەوە تورکەکان بە زیرەکی کاریان ڕادەپەراند، بەرپەرچی هەبوونی خەڵکی (کورد)یان دەدایەوەو وایان رادەگەیاند ، کە ئەو شوێنانەی داگیر نەکراون تا ڕێکەوتی ٣٠ی ئۆکتۆبەر نیشتەجێ بووەکانیان موسڵمانی عوسمانین و لە ڕووی (نژاد) و(ئاین)ەوە وەك یەکن . ملیۆنێك کورد ، کە لە دەرەوەی تورکیا بوون ، داوای ئۆتۆنۆمی خاکی کوردستانیان دەکرد ، چونکە ئەو کات کوردەکان بەرژەوەندی هاوبەشییان لەگەڵ ئەرمەنییەکاندا بوو، جیاوازییەکانی نێوان خۆیان وەلا نابوو بە ئاشتییەوە دەژیان . ئەو کوردانەشی ، کە داوای ئۆتۆنۆمییان دەکرد لە بنەچەوە (وێلسن) Wilson سەرۆکی ئەمریکا بۆی ڕێکخستبوون بەندی پازدەهەمی ویلسن ، کە لە کانوونی دووەمی ١٩١٨دا دەربارەی کەمە نەتەوایەتییەکانی نێو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لێکۆڵینەوەی ئەنجامدەدا ، لەم بارەیەوە دوابوو. یەك دوو لیژنەی ڕاگەیاندن کە لە هەمان ساڵدا لە نێو ئینگلیزو فرەنسەدا بلاّوبۆوە و پشتگیری ئەم بەندەیان کرد. لە ساڵی ١٩١٩دا سوپای فرەنسە لە(سوریا)و (سیلسیا)دا جێی سوپای ئینگلیزی گرتەوە، بەلاّم موسڵ هەر لە ژێر دەستەلاّتی ئینگلیزدا مایەوەو سنووری نێوان (سووریا – فرەنسە) و (عێراق– ئینگلیز) بە دڵی هەردوو لایان (فرەنسە – ئینگلیز) دەستنیشان کراو سەر زەمینی (جزیرە)شیان پێشکێش بە سوریا کرد. کاتێك پەیمانی ئاشتی

(سـیڤەر Seveles ) ئیمـزا کـرا ، کۆمیـسۆنێك لـە نێـوان هاوپەیمانەکانـدا ڕێکخـراو مەسـەلەی (ئۆتۆنـۆمی کـورد)یـان لـە ڕۆژهـەڵاتی فـورات و باشـووری ئەرمەنـستان و بـاکووری سـووریاو میـسۆپۆتامیا پێـڕەوی کـرد . حکومـەتی ئەستەمبوڵیش بەڵێنی دا کە لەم بارەوە کۆشش بکاو بڕیـاری کۆمیـسیۆن جـێ بەجێ بکات (هەڵبەتە بە شـێوەیەك ، کـە زۆربـەی کوردەکـان داوای دەکـەن و ئەنجومەنی دەوڵەتانیش دانی پێ دابنێ) . چونکە بەپێی پەیماننامەکە ، یەکێ لە ماددەکانی دیکەی ئـەوەبوو، کـە دەبووایـە تورکیـا ببێتـە کۆلۆنیـالی وڵاتـە گـەورەکان . بۆیـە ملیۆنێـك تـورك بەڕابەریـەتی مـستەفا کـەمال دژی کـارە وەستان و ئیمزایان نـەکردو جـەنگ لەگـەڵ هاوپەیمانـەکان هەڵگیرسـێنرا .لـەم جەنگە تورکەکان بەسەرکەوتن وهاوپیمانکانیـان ناچـار کـرد پیمـان نامەیـەکی دیکە لەگڵ تورك ببەستن و لە پەیماننامەی نوێ ، کە لە (لۆزان)دا ئیمـزا کـرا ، هیچ یەك لەم دوو لایەنە باس ئۆتۆنۆمی کوردیان نە کرد . مـصگفی کمـال وای بە خەیاڵدا هات ،کە کوردستان بـە زۆر بکاتـە تـورك سـوودێکی زۆری دەبـێ . وەڵی ئەو شتانەی کـە ڕووی دا بـوو چارەسـەرکردنی مەسـەلەی موسـڵ بـوو ، پەیماننامەی لۆزان هەر وەك خـۆی مایـەوە تـا سـنوری نیـوان عێـراق وتورکیـا دەستنیشان کرا ئەوجا ئەو کێشەیەش چارەسەر کرا .(مەبەستی تورکیا ئـەوە بوو ، کە بزانێ تا چ ڕادەیەك دەتوانێ کوردستان بخاتـە ژێـر ڕکێفـی خۆیـەوە) توورکەکان بە هیچ شێوەیەك ئامادە نەبوون ولایەتی موسڵ لە دەست خۆیـان بدەن ، چـونکە : کانـەکانی نـەوتی عێـراق لـە ولایـەتی موسـڵ بـوون ، دووەم لەبەرئەوە بوو مەترسی هـەموو جـۆرە هانـدانێکیان لـەوێ دەکـرد ، کـە ببێتـە هۆی ئەوەی ئاژاوە بخاتە نێو کوردەکانی تورکیـاوە . دەوڵـەتی ئینگلیـز ، کـە

هەولێـدەدا حکومـەتێکی کـوردی دابمـەزرێنێ ، بـەڵام لـەم کۆشـشەیدا هیـچی دەست گیرنەبوو بارودۆخەکە هەر وەك پێشتری مایـەوە . کوردەکـانی عێـراق نەبوونە هۆیەك بۆ هاتنەکایەوەی ئەم حکومەتە، بەڵام بەشێوەیەك، کە وەك لە دواییدا دەیبینین ئەم کۆششە بەهۆی کوردەکانی تورکیاوە شتێکی هاتەجێ .

ڕوونکردنەوەی وەرگێر

(١) کـاتێ Derk Kennane نـاوی کـەریم خـانی زەنـدی هێنـاوەو بـە کوردی لە قەڵەمداوە. وەرگێری فارسی کتێبەکـە لـە پـەراوێزدا نووسـیویەتی : (کەریم خانی زەند لە تایفەی لوری ئێرانییـە لێـرەدا نووسـەر بـەهۆی ئاشـنایی نەبوونی لە مێژووی ئێراندا ئەوی (واتا : کەریم خان – و)بە کـوردی زانیـوە) . مەبەسـتی ئـەم وەرگێـڕە (جـواد هـاتفی– و) زۆر ئاشـکرایە دیـارە ، کـە ویستویەتی تایفەی لوڕ لە کورد دابڕێ و بە فارسیان لە قەلەم بدات . ئەمەش هەستێکی شۆڤێنییەو هیچی دی .

(٢) هەروەها وەرگێڕی فارسی کتێبەکە لە سەرەتای ئەم گوتارەدا دەربـارەی تیـۆری دووەمـی نـژادی کـورد ، کـە نیکیـتین لێـی دواوە . لـە پـەراوێزدا نووسیویەتی : ( ئەم تیۆرە بە تەواوی بێ پایەو بنچینەیە چونکە کوردەکان لە نژادی پاکی ئێران دەژمێردرێن .)بە هەرحاڵ ، ئەمە جگە لە مەرایی زێتر هیچی دی نییە .

(٣) لـە بـەر بێئاگـایی بـێ یـان هـەر هۆیـەکی دیکـە بـێ نووسـەر Derk Kennane ، کە باسی شۆرش و ڕاپەڕینـەکانی کـردووە ، کـەم و زۆر بـاس ڕاپەڕینی ڕەواندزو ڕاپەرینی میرنشینی پاشای گەورەی نەکردوە، کـە زۆر بـەر لـە ڕاپـەرینی بـەدرخان پاشـاو (شـێخ عبیدللـە )یـش کـەوتووە . لـەو

ڕۆژهەلاتناسانەی بە ڕێزەوە باسی ڕاپەڕینی ڕەواندوزی کردبێ ، (ن . أ . خالفین ، لە کتێبی خەبات لە ڕێی کوردستاندا )یەو هەروەها د. کاوس قەفتان لە کتێبی (چەند لێکۆلینەوەیێك لە مێژووی بابان.. سۆران.. بۆتان) باسی کردووە . هەروەها حسن ارفع لە کتێبی (کردها و یك برسی تاریخی و سیاسی ، لندن ، چاپ دانشگده اکسفرد ، ١٩٦٦)دا باسی کردووەو لەگەڵ چەندان سەرچاوەی هەمەجۆری دیکە .

نووسەر **Derk Kennan** ، ئەویش تا ڕادەیەك مەرایی بۆ دەولەتەکەی خۆی ئینگلیستاندا کردووەو دەڵێ : (دەولەتی ئینگلیز ، کە هەولی دەدا حکومەتێکی بۆ کورد دابمەزرێنێ) ، بەلام ڕاستییەکەی هەر یەکێك لەم دەولەتانە هەولیان دەدا کورد بکەن بە داردەستی خۆیان و بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی بەکاریان بێنن . لەم ڕووەوە خالفین دەڵێ : (پێویستە ئەوەمان لە بیر نەچێت ، کە ڕاپەرینە کانی ڕەواندوز لە ئەنجامی بەرزبوونەوەی هێزی بزووتنەوەی نیشتیمانیدا هاتەکایەوە ، هەروەها ئەوەشمان بۆ دەردەخات ، کە ولاتە مەزنەکان ، بە تایبەتی ئیمپراتۆریەتی ئینگلیزی هەولیان دەدا ، کە دەست بخەنە کاروباری کوردستانەوە و هۆزە کوردەکان بۆکاری جەنگی و سیاسیی خۆیان بە کار بهێنن)(خەبات لەڕێی کوردستاندا ، ل )٧٢.

# دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ئەمەریکا و دۆزینەوە جوگرافییەکانی ئەوروپا لە ئەمەریکا و کاریگەرییان لەسەر دامەزراندنی کۆمەڵگەی ئەمەریکی

و: توانا رشید کریم

## دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ئەمەریکا:

بەر لە دۆزینـەوەی هـەردوو ئەمـەریکا(بـاکور و باشـور) کۆمـەڵێك نەتـەوە لەهەردوو ئەمەریکا دەژیان، پسپۆڕان و زانایان وادەیخەملێنن ئەم نەتەوانە لە ڕێگای تەنگەبەری (بەهرنك)ەوە، لەشێوەی چەند شەپۆلێکی یەك بە دوایەکدا لە ئاسیاوە بۆ ئەمـەریکای باشـوور کۆچیان کـردووە. ئـەم نەتەوانـە لـە پلـە وئاستی پێشکەوتنی شارستانی و ژیاری لە ئاسـتی لێـك جیـاواز وجودابـوون، گەرچـی بەشـێوەیەکی گـشتی ئەمانـە کـەمتر پێـشکەوتوتربوون لەچـاو شارسـتانیەتە پێـشکەوتووەکانی جیهـانی کـۆن، ڕەنگـە فاکتـەری ئەمـەش بگەڕێتەوە بۆ ئەو گۆشەگیرییەیی ئەوان تێکەوتبون، وێـڕای ئـەوەش توانیـان چـەند کۆمەڵگەییـەکی جیـاواز لـە فەرهـەنگ بخـولقێنن وکۆشـك تـەلاری پێـشکەوتوو بنیـات بنـێن. لەوانـەش دوای بڵاوبوونـەوەیان بێـت لـە هـەردوو ئەمەریکا (باکور و باشوور).

بەشێوەیەکی گشتی هەموو ئەو گەلانە کشتیاری و بەخێوکردنی هەندێ لە گیانـدارانی وەك سـەگ و پەلـەوەر وگیانـداری لامـا و لامـاری وشـکایی وەك

گیانداریماڵی ناسیوە و ماڵیکردوە. و هەروەها ئانکاش زیوی بە مادەییەکی کانزایی بۆ سازکردنی کەرەستە زانیوە، سەرباری ئەوەش ئاگایی وزانیاریان لەمەڕ بەکارهێنانی دراو ئاسن نەبووە.

لەماوەی دۆزینەوە جوگرافییەکاندا، بۆ ئەورووپییەکان دەرکەوت شارستانیەتی ئەزەتیك (یەك لە هۆزەکانی ئەنهۆی گەورە) زۆر پێشکەوتوو بوە لەڕووی ڕۆشنبیری و کۆمەلآیەتی. و مەڵبەندی شارستانیەتەکەشیان لە دۆڵی (ئاناهواك) لە مەکسیك بووە و شاری "نولتك "یان بنیات ناوە، زانایان وا دەدەنێن کۆچیان کردووە لە دروست کردنی ئەو شارەدا زانیاری بیرکاری و گەردونیان تێدا بەکارهێناوە. لەلایەکی تر ئەم شارستانیەتە پەیوەندییەکی تۆکمەی هەبوو لەگەڵ نەتەوەکان و شارستانیەتەکانی تری وەك مایا(ئەو شارستانیەتەی کە لەسەدەی(١٣) زاینی گەیشتە لوتکەی پێشکەوتنەکانی خۆی. و بەلآم هێندەی نەبرد ئەم شارستانیەتە ڕووی لە دارمان و ڕووخان کرد).

بەدوای ئەمەدا فەرهەنگ و ڕۆشنبیری (شبشا) دێت. ئەو شارستانیەتەی پێوەندی هەیە بەگەیشتنی ئەزەتیك بۆ دەریاچەی تزکوکو لەساڵی(١٣٢٥ز). ئەم شارستانیەتە خاوەن ڕژێمێکی سیاسی بوو، کە پایتەختەکەی (سنوشینتلاف)ە. ئەوەش پەیوەستە بە پێکهاتەی ڕژێمی سیاسی و سەربازی ڕاوەستاو لەسەر هاوپەیمانیەتی هۆزەکان. توانی لەو ڕێگایەوە کۆنترۆڵی ناوچەییەکی بەرفراوان بکات کە لە ناوەڕاست و باشوری مەکسیك لەدوورگەی مەکسیکەوە درێژدەبێتەوە تا ئۆقیانوسی هێمن. و ژمارەی ئەو خێزانانەی کە لەژێر سایەی ئەم شارستانیەتەدابوون بە دەوروبەری شەش

هەزار خێزان مەزەندە دەکرێت و ژمارەی دانیشتوانەکەشی خۆی لە پێنج ملیون کەس دەدا.

شارستانیەتی ئەزەتیك ڕژێمێکی سیاسی ناوەندی دامەزراند و تێدا پاشا بەڕیگای هەڵبژاردن دیاری دەکرا، گەرچی هەڵبژاردنی پاشا لە خانەوادەی پاشایەتی قۆرخ ببوو، هاوکات ئەنجومەنێکی حوکم کە هاوکاری پاشای دەکرد لەڕێگای لێکۆڵینەوە و ڕاپۆرتی کاروبارە گرنگەکان، بە پێشکەشکردنیان لە کۆبونەوە خولیەکانی خۆیاندا. وە ڕژێمێکی دادوەریش وەك تەواوکەرێك بۆ یەکلاکردنەوەی کێبەرکێی و ڕکابەرییە ناوخۆییەکان. هەروەها سوپایەکی مەزن و زەبەلاح و بەتوانا دگەل بەهەندوەرگرتنی شوێنگە وپێگەی تاکەکانی سوپا کە هاوتای پێگەی کاهن و پیاوانی ئاینی بوو بەمەبەستی پارێزگاریکردنی دەوڵەت لە جەنگەکانی دەرەکی.

سوپاش لە فێرگە سەربازییەکاندا بۆ ماوەی چەندساڵێك دابەشی دوو جۆر لە تاکی ڕاهێنەر دەبن. تێایاندا ڕۆشنبیرییەکی بالاْ مەرج بوو لەلایان. ئەمانە لەکاتی جەنگدا ڕاپێچی ڕاژەی سەربازی دەکران. و ئەو ڕاژە سەربازییەش هەموو ئەوکەسانە دەگرێتەوە کە توانای شەڕیان هەبوو لەگەڵ توانستی سەربازی لەبەرچاو گرتن. لەپاڵ ئەمانەشدا ئارەزووی خوێنڕیژیان نەبوو لەساتی جەنگدا بە ئەندازەی سود وەرگرتن و ئارەزووکردنی دەستکەوتی دیلیان دەکرد بە ئامانج و مەبەستی پێشکەشکردنی بۆ پەیکەر و پەرستگاکان.

شارستانیەتی ئەزەتیك جۆرێك لە پێشکەوتنی لە بواری کشتوکاڵ و بازرگانی و پیشەگەری و هەندێ پیشەسازی سادەی لەنمونەی ئاڵتون و زیو و

